# مێژووی ناودارانی کورد

## عارفان، زانایان، وێژەوانان، شاعیران

بەرگی یەکەم

نووسینی: **بابە شێخی مەردۆخڕۆخانی**
وەرگێڕانی: **ماجدی مەردۆخڕۆحانی**

١٣٨٩ ک.ھ. (٢٠١١ ز.)

## فهرستنویسی

سرشناسه : مردوخ روحانی، محمدماجد، ۱۳۳۷ -

عنوان و نام پدیدآور : تاریخ مشاهیر کرد ـ جلد اول (مێژووی ناودارانی کورد ـ بەرگی یەکەم)

مشخصات نشر : سنندج: محمدماجد مردوخ روحانی، ۱۳۸۹.

مشخصات ظاهری : ۲ج. شابک: : دوره:۹۷۸-۹۶۴-۰۴-۶۳۱۸-۵ ؛: ج.۱:۹۷۸-۹۶۴-۰۴-۶۳۱۶-۱ ؛ :ج.۲ :۹۷۸-۹۶۴-۰۴-۶۳۱۷-۸

وضعیت فهرست نویسی : فیپا / یادداشت : کردی . / موضوع : مشاهیر -- ایران-- کردستان -- سرگذشتنامه

رده بندی کنگره : DSR۲۰۴۷ / ر۴۲۵م۹ ۱۳۸۹ / رده بندی دیویی : ۹۵۵/۴۲۰۹۲۲ / شماره کتابشناسی ملی : ۷۰۴۵۶۱۲

## ناسنامە

مێژووی ناودارانی کورد (بەرگی یەکەم)
بابەشێخی مەردۆخ ڕۆحانی
وەرگێڕ: ماجدی مەردۆخڕۆحانی
پیتچنی و ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان: وریا دیوانی
ڕووبەرگ: حەمیدڕەزا زەڕی
چاپی یەکەم: ۱۳۸۹ ک.هـ. (۲۰۱۱ ز.)
تیراژ: ۳۰۰۰ بەرگ

## پێشەکی وەرگێڕ

ئەم کتێبە، کورتە ژیاننامەی گەلێک لە کەڵەپیاوان و گەورەژنانی کوردزمانە، لە سەرەتای مێژووی ئیسلامییەوە تا ئەم دواییانە. بۆ بەرهەمهاتنی ئەم بەرگـە لـە ناسـنامەی گـەلی کـورد، مرۆیـەکی ئەویندار، پتر لە چل ساڵ، بە گـەڕان و ڕاسـپاردن و تـەنانـەت ڕوونـان و بـە کتێبخانـەی ماڵانـدا سەرکێشان، حەولیداوە و کتێب و نووسراوەی لە هەمەبابەتی پشکنیوە؛ بـەو نیـازە کوردێـک، لـە عارف و زانا و وێژەوان و شاعیر، یان میر و خوونکار بدۆزێتەوە؛ یان شتێکی لێ بخوێنێتەوە؛ یاخود شوێنێک بۆ زیاتر ناسینەوەی کەسێکی وا، ببینێتەوە.

خوێنەری هێژا ئەگەر چاوێک بە پێڕستی سەرچاوەکان، لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بخشێنێ، بـۆی دەردەکەوێ کە گەڕان بە دەیان و سەتان کتێبی وەک *«لُغَتنامه»*ی عەللامەی دیهخودا، *«الأعلام»*ی زرکلی، *«الکامل فی التأریخ»*ی ئیبنوئەسیر، *«وفیات الأعیان»* و *«کشف الظنون»* و ... واتـا خوێنـدن و بە وردی پشکنینی دەیان و سەتان هەزار لاپەڕەی کۆن و نوێی دەسنووس و چاپی، بە کـوردی و فارسی و عەرەبی، کارێکی ئاسایی نییە و کەسێ کە وێراوێتی خۆی لە وەها کـارێ بـدا، دەبـێ چ دڵێکی ئەویندار و چ ئەوینێکی ئاورینی هەبووبێ؛ بەتایبەت کە پاش ڕووخـانی کۆمـاری مـەهاباد، دەستی بۆ ئەم کارە بردبێ؛ کە ئەو سـەردەمە لـە ئێرانـدا، نـاو بـردن لـە کـورد و کوردسـتان، تـا ڕادەیەک بڤە ببوو، نەشیدەوێرا ـلای کەمـ بە ڕاشکاوی کارەکەی بکا.

بەم شێوە بەرهەمی ئەو ساڵانە و ئەو عومرێک ڕیازەتکێشانە، بوو بە کتێبێک کە دەتـوانین بـە دڵنیاییەوە بێژین: هاوشانی، لە باری بەرفراوانیی و زانستییەوە، لە کتێبخانـەی دراوسێکانیشـماندا دەست ناکەوێ.

لەم کتێبەدا گەلێک کەسایەتی مەزن دەناسینەوە کە عەرەب و فارس، بە لای خۆیاندا کێشاوە و هەرکام بە کەلەپووری خۆیانی دەزانن و شانازی پێوە دەکەن؛ کە چی دەبینین لە ڕاسـتیدا کـورد بوون و خۆیان یان باب و کاڵیان، لە کوردسـتانەوە سـەریان هەڵـداوە و بەڵگەکەشـی لـە کۆتـایی

کورتە ژینامەکەیدا، بە وردی، ئاماژەی پێ کراوە.

ئەم کتێبە بۆمان دەردەخا ئێمە ـ پێچەوانەی ئەوەی نەیارانمان خستوویانەتە شوێنمان ـ چەند زانای لەزەبر و بلیمەتی لە هەموو بابەتێکمان تێدا هەڵکەوتووە و لە باری زانستی و ئایینییەوە، چەندمان خزمەت بە شارستانییەتی مرۆڤ کردووە و بەتایبەت گەلانی جیرانمان، لەم بارەوە چەندەمان پێ قەرزدارن.

وەک دەزانین ئەم مێژووە بە زمانی فارسی نووسراوە و «*تاریخ مَشاهیر کُرد*»ی ناوە و یەکەم جار دەوری بیست و پێنج ساڵی پێش چاپ کرا و هەر لە چاپ دەرهات، کەسانێک دەیانپرسی: باشە کتێبی مێژووی وێژەی کورد، بۆ دەبێ بە فارسی بێ؟! کە نووسەرەکەی هەموو جارێک بە کزێکەوە وەرامی دەداوە: با کوردەکان بتوانن بیخوێننەوە!

ڕاستە؛ لەو سەردەمانە، لە دە کوردی خوێندەواری ڕۆژهەڵات، یەکیشیان کوردی نەدەزانی. ڕێ بۆ کوردستانی باشووریش وا بەسرابوو، پەلەوەر دەرنەدەچوو؛ چ جای کتێب. بەو پێیە، بێجگە بە فارسی نووسینی، چارێکی تر نەبوو.

ئێستا دنیاکە گەلێک گۆڕاوە و ماوەیەکە فریشتەی بەختی کوردیش چاوی کردۆتەوە و لە خەوی هەزاران‌ساڵەی هەستاوەتەوە. حوکمەتی هەرێم دامەزراوە و کوردی، ئەوڕۆکە زمانێکی دیوانییە و چاپی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی زۆر باوە. دیارە کوردی ڕۆژهەڵاتیش لەو خێروبێرە بێ‌بەش نەماوە و زۆر قوتابخانەی نافەرمی کوردی، لە شار و دێهاتیدا دامەزراوە و زۆرێک لاوی کورد، ڕوویان لە کوردی خوێندن و بە کوردی خوێندنەوە ناوە. کەوابوو ئەمجار جێی خۆیە ئەگەر بپرسین: باشە چۆن دەبێ مێژووی وێژەی کورد، بە کوردی نەبێ؟

بێ شک ڕووی ئەو پرسیارە، زۆرتر لە منی بە تەمەن پیری لە ئەزموونی وەرگێڕاندا، کرچ و کاڵە؛ کە لە سەرەتای لاویمەوە، بۆ بەرهەم هاتن و چاپی «*مَشاهیر*»، بەردەستیی نووسەرەکەیم کردووە و تەنانەت بەرگی سێهەمیشی بە من ئەسپارد؛ کە جارێ کاری مابوو؛ بەڵام لەبەر نەخۆشی، خەریک بوو بەجێی‌دەهێشتین.

ڕاستییەکەی، ئەو کارە ببووە کێوێکی گەورە لە سەر دڵ و لە بەر چاوم. دەقە فارسییەکەی، پەخشانێکی تایبەتە؛ بێ گرێ و ڕەوان و هاسان و جوان. هەرچێکی بخوێنیەوە، ماندوو نابی؛ بەڕاستی سەرکەوتووە. جا وەرە بیکە کوردی و مەرجمان ئەوە بێ ئەو تام و بەرامەشی نەفەوتێ. زۆری لێ ترسابووم و تا ماوەیەک هەر بە لایدا نەدەچووم. دەوری حەوت ساڵی پێش، وەکوو تاقی‌کردنەوەیەک، چەند لاپەڕەم لێ کردە کوردی و نیشانی چەند کەسێکی سەردەرچووم دا. لێیان وەرگرتم و تەنانەت هێندێکیش دڵخۆشییان‌دامەوە. وردە ـــ وردە و بە هومێدێکەوە، دەستم‌پێکرد و هاوکات لەگەڵ کاری فەرهەنگە فارسی ـــ کوردییەکەی «*دانشگاه کردستان*»،



جاروبارە لاپەڕەیەک و دوان لەمیشم دەست بۆ دەبرد.

کە کاری فەرهەنگ هێندێک سووک بوو، شانم لێ شل کرد و تا بەرگی یەک و دوو، باسی عارفان، زانایان، وێژەوانان و شاعیرانم تەواو نەکرد، لام لە هیچ کارێکی‌تر نەکردەوە.

ئێستا ئەوا بەرهەمی ئەو کارە؛ بە چەند تێبینییەوە:

١. **نووسینی ناوە عارەبییەکان**: وەک دەزانین لە ڕێنووسی کوردیدا، چەند پیتی تایبەتی زمانی عەرەبی، واتا «ث»، «ذ»، «ص»، «ض»، «ط» و «ظ» سڕاونەتەوە. ئەوجار لەو زمانەدا، هێندێک تەنوین و ئەلیف‌لام و شەددە و چی و چی هەن، بە زمانی‌تر دانانی، وا کە بخوێنرێتەوە، هەیهاتە. لەم کتێبەدا، بۆ نووسینی ئەو ناوە بیانییانە ـ کە ناشکوری نەبێ کەمیش نین ــ لەگەڵ ئەوەدا دەستمان لە ڕێنووسەکەی خۆمان بەرنەداوە، تا دەستی دابێ، نێزیک لە شێوازی خوێندنەوەی دامانگرتووە. وەکوو: موحەممەد، عەبدوڵڵا، مەنسوور، عەبدوسسەمەد و ... دیارە بۆ چەند ناوی ڕۆژاوایيش هەر لە سەر ئەو دەستوورە ڕۆیوین.

٢. **ناونامە**: گرفتێکی کتێبە فارسییەکە، دۆزینەوەی ئەو کەسانەیە ناویان لێ براوە و ژینامەیان نووسراوە؛ کە لە کتێبەکەدا، بە تەرتیبی ساڵی لە دنیا چوونیان ڕێز کراون و شەرت نییە خوێنەر ڕاست ئەو ساڵە بزانێ و بەو شێوە بۆی بچێ. ڕاستە لە ناونامەکەیدا، وەک باوە، ڕیزی ئەلفبایی لە بەر چاو گیراوە و کارەکە ئاسانکارییەکی تێدا کراوە؛ بەڵام بە دوو بۆنەوە: یەکەم، ئەگەر خوێنەر نەیزانی ئەو کەسەی لە دووی دەگەڕێ لە کام چەرخدا ژیاوە، تووشی زەحمەت دەبێ و نازانێ لە کام بەرگدا بیبینێتەوە. دووهەم، بۆ کەسێکی چەند ناو و لەقەمی هەیە، دوور نییە خوێنەر شوێنی ناوێک بگەڕێ، کەچی بە ناوێکی تر لە ناونامەکەدا نووسرابێ؛ نایدۆزێتەوە و وادەزانێ لەبیرکراوە!

بە هۆی ئەم ئەزموونەوە، لەم پاچڤە کوردییەیدا، جارێ ژمارە لاپەڕەی بەرگی دوومان بە شوێن بەرگی یەکدا و لە ٤٤٥ەوە دەسپێکردووە؛ کە وابوو ناونامەی هەردوو بەرگ بۆتە یەکێک و ئەو گرفتە بۆ فارسییەکە ئاماژەمان پێ‌کرد، لێرەدا باسی نییە. ئەوجار ئەگەر کەسایەتییەک بە دوو یان چەند ناوەوە ناوازە بێ، یەک‌بەیەکمان لە جێی خۆیدا نووسیوە. بەو پێیە چیتر خوێنەر سەری لێ ناشێوێ و ئەگەر ئەو کەسە بۆی دەگەڕێ ناوی لە کتێبەکەدا هەبێ، هەر دەیدۆزێتەوە.

لەمەڕ ناونامە کوردییەکەوە خاڵی تر ئەوەیە کە هێچکام لە سەرناوە باوەکان وەک: سەید و شێخ و مەلا و حاجی و مەولانا و عەللامە و میر و ... نەچوونەتە ناو ڕیزبەندی ناوەکانەوە و ڕاستە نووسیومانن، بەڵام بە قەڵەمێکی ناسک‌تر؛ واتا بۆ دۆزینەوەی ژمارە لاپەڕەی ئەوی بۆی دەگەڕێ، ئەو سەرناوە لەبەرچاو مەگرە!

**لێرەدا تێبینییەک هەیە**: ناوەدوانەی وامان هەن بەشێکی وەک سەرناو دێتە بەرچاو، کەچی یان هەر لە سەرەتاوە ناوی ئەو کەسە وا نراوە، وەک «حاجی قادر»، یا دوایی وا تێکەڵی ناوەکەی بووە،

کەس وا نەبێ نایناسێتەوە؛ وەکوو «کاک ئەحمەدی شێخ». بۆ ئەوانە ـکە زۆریش نین ـــ سـەرمان لە خۆمان و لە خوێنەرانیش نەشێواندووە و لێکمان جوێ نەکردوونەتەوە.

٣. بۆ بەسەریەکەوە یان بەجیا نووسینی وشە لێکدراوەکان، بیر و بۆچـوون زۆرە و لێـرەدا جێـی شیکردنەوەی ئەو قسە و باسانە نییە. زۆر بە کورتی ئەوە بزانین کە لـە هـەموو گرنـگتـر، شـێوە نووسینێکە، هاسان و درووست بخوێنرێتـەوە؛ واتـا خوێنـەر تووشـی زەحمـەت نـەکا و لـە بـاری ماناشەوە، لێڵی نەخولقێنێ و واتای تری لێ هەڵنەکرێ.

دەزانین ڕێنووسی کوردی بـە شـێوەیەکە وشـە لـەت دەکـا. جـا بـەو پێیـە بـە مـەرجێک لـە خوێندنەوەدا تووشـی گرفـت نـەبین، وا باشـە وشـەکان زیـاتر لێـک نەکەینـەوە و بەسـەریەکەوە بیاننووسین. لەم کتێبەشدا، ئەو شێوازەمان ڕەچاو کردووە.

٥. وەک دیارە، مەبەسـتی ئـەم کتێبـە، تـەنیا ناسـاندنی کەسـایەتییە مەزنـەکانی کـوردە، لـە مێژوویەکی هەزار و چوارسەدساڵەدا و بە دەگمەن ئەگـەر ڕسـتەیەک لـە شـێوەی لێکۆڵـینەوەی مێژوویی تێدا نووسرابێ. بۆچی؟ بۆ ئەوەی کاری تۆژینەوە لە مێـژوو، کـارێکی تـرە و جێگـای لـە کتێبێکی تردایە. بەو حاڵەش لە زۆر شـوێنان هەسـت پـێکـردن و بینـینی بـارودۆخی هێجگـار نالەباری کۆمەڵگاما ئیسلامییەکان بەگشتی، تایبەت لەم شەش چەرخی دواییـەدا، بـۆ خوێنـەری هێژا دژوار نییە.

* * *

بریا بمتوانیبا هەست و حاڵی خۆم بنووسم، کاتێ کە بیر لە منداڵیم دەکەمـەوە و بـابم دێتـەوە بەرچاو کە چۆن لەو کاتە تەنگانەدا کە لە هـەموو لایەکـەوە گـەلخۆران خۆیـان لێمـان هەڵـنابوو، دەدانیان لێ چێڕ دەکردینەوە، ئەو، نیوەشەوان تا مەلابانگدان، لە بەر چرایەکی کزەوە، کـە لـە دەر دیار نەبێ، پەڕەپەڕەی ئەم کتێبەی دەنووسی و بەرە ـ بەرە لاوی و ساغی و سۆمای چاوی دادەنا. ئەوجاریش کە گەورە بووم و لە دایکم و کاکم پرسی، زانیم ئەوە حیکایەتێکی چل ساڵەیە.

وەک بێژی کاری گەورە و گرانی سڕینەوەی تۆزی فەرامۆشی لە سەر ڕوومەتی پیـاوان و ژنانـێ کە لەو ڕۆژگاری زۆربێژی و ملهوڕی و ئاورباران و خوێنڕژانەدا ، ئاکاری بەرز و زانست و هێژاییيان وەردەگرت و فێری بەرەی داهاتوویان دەکرد و بۆ مێژووش، ناوی میللەتێکیان پێ بەرز دەکردەوە، خۆ بەخت کردنێکی سەروماڵی دەوێ.

جا کە دەبینین دانەری ئەم کتێبە، دوای ئەو هەموو ماندوو بوونە، ئاوا لە خۆی دەبێتەوە و بە بێ مەرایی و لەوپەڕی خاکەساریدا، پێ لە کەم و کووڕی کارەکەی دەنێ[١]، بۆ منێک کە چاوم لەو بووە

١. بڕوانە بۆ پێشەکی نووسەر لە لاپەڕەی داهاتوودا.

و خۆشم دەبینم کە لە حاندی ئەودا، هیچم بە هیچ نەکردووە، چم هەیە بێژم؟

* * *

بۆ بەرهەم هاتنی ئەم دوو بەرگە لە مێژووی ناودارانی کورد، چەند کەسێ، هەرکام لە کاری خۆدا شارەزا و هەموو لە نیشتماندۆستیدا بێ گەرد و گرێ، یارمەتییان دام؛ بەدڵ سپاسیان دەکەم:

کاک **وریای دیوانی**، هەر لە پیتچنینەوە تا ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان و حەولدانی بۆ ڕێکوپێک و جوانتر دەرچوونی کتێبەکە.

کاک **حەمەژیانی ئەمینی**، کە بەوردی سەرلەبەری دەقە کوردییەکەی خوێندەوە و لەگەڵ فارسییەکەیدا بەرامبەری کردەوە و گەلێک خاڵی بایەخداری وەبیرم هێناوە.

مامۆستا **د. هادی مورادی**، بۆ خوێندنەوە و ڕاستکردنەوەی شیعر و ڕستە عەرەبییەکان.

**ماجدی مەردۆخ ڕۆحانی**

سنە، پاییزی ١٣٨٩ ک. هـ. (٢٠١٠ز.)

## پێشەکی نووسەر

بسم‌الله الرحمن الرحیم

الحمدُلله الّذی رَفَعَ بمقتضی حکمتهِ شَؤنَ بعضِ‌العباد و أعلی بجمیلِ رحمتهِ مراتبَ جماعة و آحاد. فَخَصَّصَ فَریقاً منهُم بالعلم و القلم و آخرین بالسَّیفِ و العَلَم و مَیَّزَ آحاداً بالتّقویً و الزَّهادة و أفراداً أمجاداً بالسّیادة و السَّعادة و فَضَّلَ علی جمیعهم خاتم‌النَّبیین، سیدنا وَ مولانا محمداً الأمین؛ صلَّی‌الله تعالی وَ سَلَّمَ علیه و علی آلهِ و أصحابهِ المُجاهدینَ فی‌الدّین و خیار اُمَّتِهِ المُکَرَّمین. رضوانُ‌الله تعالی علیهم أجمَعین. اللهمَّ بکَ أستغیثُ و لَکَ أستَکین و مِنْکَ أسْتَمِدُّ و أسْتَعین. فَأمِدَّنا بالخیر و أدفع عَنا الضُّر ئ الضَّیْر. إنَّکَ علی ما تَشاءُ قدیر و بالإجابةِ جدیر. و بَعد

روزی که به أمر حق جهان شد ایجاد — و آدم شد خلق و آدمیزاده بزاد

مهر وطن و محَبَّت قوم و نژاد — در طینت مردم به ودیعت بنهاد[1]

نیشتمان‌دۆستی و خۆشەویستی زاگە و بەرە، لە سەرەتایی‌ترین تایبەتمەندییەکانی مرۆڤە و وەکوو وازی زارۆ لە دایکی، ئەوینێکە بە شێرەوە دێ و بە گیانەوە دەچێ. بەو بۆنەوە، لەمێژە هۆز و بەرە و میللەتانی لە هەمەڕەنگ، بۆ مەردم و وڵاتی خۆیان، ژینامە و مێژوویان نووسیوە؛ بەتایبەت لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، هەر لە سەرەتای شارستانییەتی ئیسلامەوە، پێڕای چالاکی ئایینی و زانستی و ئەدەبی، کۆکردنەوە و نووسینی مێژووی ناوداران و ژینامەی ناسراوان، باوی ساند و لە هەر سەردەمێکدا، ئەم کارە بایەخدارە، بەرچاوی

---

[1]. ڕۆژێ کە بە ئەمری خوا جیهان دامەزرا — بابادەم و بنیادەمی لێ بوو پەیدا

خۆش‌ویستنی زێد و نیشتمان و کەس و کار — تێکەڵ بە هەوێنی گیانی کرد و پێی دا

تاقمێک لە زانایان کەوت و زۆر کتێبی هێژا، بۆ ئاگاداری داهاتووان دانرا.
بەشێک لەم ژینامە و مێژوانە، هەموانین؛ وەکوو: «تاریخ طبری»، «تاریخ الکامل»ی ئیبنووئەسیر، «مُعجَمُالأدبا»ی، «وَفَیاتالأعیان»ی ئیبنووخەلیکان، «طبقات»ی شێخ ئەبووئیسحاقی شیرازی، «طبقات»ی شێخی شەعرانی، «لبابالالباب»ی عەوفی، «تذکره»ی نەسرابادی و «تُخفە»ی سامی. بەشێکیش تایبەت بە شوێن و ناوچەیەکن؛ وەک: «محاسن الشّام»، «تاریخ بغداد»، «تاریخ قاهره»، «تاریخ اربِل»، «تذکرەی شوشتر»، «تذکرەی شعرای اصفهان»، «مراةُالفصاحه» بۆ شیراز، «سُخنوران یزد» و «دانشمندان آذربایجان».
بە کڕوکاشێکی وردتر، دەیان و سەتان لەم شێوە کتێبانەمان دێتە بەرچاو کە کتێبخانەی میللەتانی پێ ڕازاوەتەوە. شاعیران و ناودارانی زۆر شوێنی گەورە و پچووک و گرنگ و سووک، لە زۆرێک لەو ژینامە هەموانیانەدا، ناویان هاتووە و کەم تا زۆر لە سەریان نووسراوە و ناسراون. لەم ناوانە تەنیا شوێنێک لەبیرکراوە یان بێبەش ماوە و لە گەورەکانی ـ بە ناوی خۆیانەوە ـ کەمتر ناوێک براوە یا خود بە ئێمە نەگەیشتووە، سەرزەمینی پان و بەرینی کوردستانە.
«حدیقەی أمانُاللهی»، نووسراوەی میرزا عەبدوڵلای ڕەونەقی سنەیی، لەو نموونە دەگمەنانەیە کە بە درێژایی دوازدە چەرخ، باسی چەند کەسێک لە شاعیران و وێژەوانانی کوردی کردووە و نموونە شیعر و بەرهەمیانی هانیوە؛ بەڵام لە ناوانی سنە و دەوروبەری دوورتر نەچووە.[2]
جا ئەگەر یەک\دوو ژینامەنووسی تر، وەک: ڕەزاقولی خانی هیدایەت و دیوانبەیگی، چەند کەسکیان ناو لێ بردووە، سەرچاوەیان هەر کتێبەکەی ڕەونەق بووە.
ئەڵبەت نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە بە درێژایی مێژووی ئیسلامی، لە نێوان زانایان و وێژەوانانی کوردیشدا، کەسانێک هەڵکەوتوون کە لەمەڕ نیشتمان و هاووڵاتانی بەناوبانگیانەوە، شتیان نووسیبێ؛ بەڵام بە داخەوە ئەو نووسراوانە هەرکام بە جۆرێ لەناو چوون و ئێستا هەر ناوێکیان لە لاپەڕەی کتێباندا لێ بەجێ ماوە و بەس. بۆ نموونە: کتێبی «تذکرةُالنّسَب»، لەمەڕ بنەماڵەی کوردی بادینانەوە، بە زمانی عەرەبی؛ «تذکرةُالاجناد فی مُحاربةالاتراك و الاکراد»، کە لە کتێبی «نورالانوار»دا ئاماژەی پێ کراوە؛ «تاریخُ الأکراد»، نووسینی خوسرەو بەگی مونشی؛ «مُعجَمُالادبا»ی مەستوورە خانم، شاعیر و مێژوو نووسی

---

2. ئەم کتێبە بە تێکۆشانی خوالێخۆشبوو خەییامپوور، وەختی خۆی زانستگای تەورێز چاپی کرد.

بـەناوبانگی کـورد؛ «تـاریخ اورامـان»، هـی قـازی مـەلا عەبـدوڵای هـەورامانی؛ «حدیقـەی ناصریّە»ی میرزا عەلیئەکبەری سادیقولمولک، نازناو ئەفسەر و ...

کۆنترین کتێبی لە چاو باقی، پوخت و پاراو، کە لە بارەی کوردەوە نووسراوە، «شـرفنامەی بدلیسی»، یادگاری بایبداری ئەمیر شەرەف خـانی بدلیسـی، لـە مـیرانی هێـژا و نـاوداری کوردە، کە ساڵی ١٠٠٥ ک. م. دایناوە و بۆخۆی ساڵی ١٠١١، دەستی بە یەکجاری لە دنیا بەرداوە.[٣]

ڕاستە شەرەفنامە کتێبێکی زۆر بەرز و بەڵگەیەکی مێژوویی یەکجار نایابە؛ بەڵام حەیفی بە تەنیا باسی مەڵەمیران و میرنشـینانە و لـە نـاودارانی زانسـت و ئـەدەب و عیرفـان، چەنـد کەسێک نەبێ، باسێک نییە.

* * *

تا ئەم ساڵانەی ڕابردوو، نووسین بە زمانی کوردی کەمتر باو بووە و شـاعیران و نووسـەرانی کورد، بێجگە تاک و تەرایەک، بە عـەرەبی و فارسـییان نووسـیوە. لـە سـەرەتای چـەرخی چاردەوە، وردە ـ وردە، لە ناو کوردانی هەرچوار پارچەدا، نووسین بە زمـانی زگمـاک هاتـە مەیدانی وێژەوانی و پەرەی ساند و گەلێک کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە، بە کرمانجی بـاکوور و باشوور، هاتنە نووسین و بڵاو بوونەوە.

لەو سەروبەندانە، چەند نۆسەرێکمان، زۆریان خزمەت بە وێژە و مێژووی گەلەکەیان کـرد و لەو بزووتنەوەی باسمان کرد، بەشێکی باشیان بەر خۆ خست؛ مامۆستایانی وەک:

١. خوالێخۆشبوو موحەممەد ئەمین زەکی بەگ، خاوەنی «مێـژووی کـورد و کوردسـتان»، «تاریخ الدّول و ألإمارات الکردیّە»، «مێژووی سلێمانی و میرانی»، «کوردانی بەناوبانگ» و ...

٢. خوالێخۆشبوو سەید حوسەین حوزنی موکوریانی، نووسەری «کوردسـتانی موکوریـان»، «لاپەڕەیەکی کوردستانی موکری و نـاودارانی کـورد» و ... مامۆسـتا حـوزنی هـەروەها لـە بواری چاپ و ڕۆژنامەوانیشدا، گەلێک خۆی ماندوو کرد و لە ڕاستیدا ڕچەی شکاند.

٣. خوالێخۆشبوو عەلائەدین سەجادی، کە زۆر ساڵان بە زمـان و وێـژەی کـورد خزمـەتی کرد و یەک لە بەرهەمە بەبایەخەکانی «مێژووی ئەدەبی کوردی»یە.

---

[٣] دەقی ئەم کتێبە فارسییە و دوایی بە چەند زمانی تریان وەرگێڕایەوە و زۆر جاران لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوادا چاپ کراوە. ئەم دواییانەش، زانای هاوچەرخمان، مامۆستا هەژار، کردیە کوردی؛ کە ئـەویش تـا ئەوڕۆ دوو جار لە چاپدراوەتەوە.

## کاری ئەم کتێبە لە سەرەتاوە

ساڵی ١٣٢٥ ک. هـ. (١٩٤٦ ز.) بۆ یەکەم جار بە بیرمدا هـات ژیاننامەیـەکی تـا ڕادەیـەک بەرفراوان، بۆ ناساندنی شاعیران و ویژەوانانی کورد پێک بێنم. سەرەتا، لە هەر لاوە کەوتمە گەڕان و کۆ کردنەوەی بەڵگە و کتێبـان و هـەروا کـە خـەریک دەبـووم، تێگەییشـتم ئـەم هەویرە ئاوێکی زۆر هەڵدەگرێ و بۆ کارێکی پڕ و پەرداخت لـەم بـارەوە، پێویسـتە زیـاتری پێوە بچم. بەو پێیە لێبڕام ئەوی کورد بووە و وەختی خۆی ناوێکی دەرکردووە، لە عـارف و زانا و شاعیر و هەروەها میر و گەورەی هۆز، تا بـۆم دەسـت بـدا، بـۆی بگـەڕم و بیناسـم و ژینامەی بۆ بنووسم. جارێک کارەکەم کرد بە دوو بەشی جیاوازەوە: بەشێک میر و خوونکار و بەشێکیش عارف و زانا و وێژەوان و شاعیر.

ساڵ لە دووی ساڵ هات و چوو؛ لاماڵێک فیش و یاداشت کۆ ببوونەوە؛ بـەڵام هـەر دڵـنیا نەببووم و جارێ کارەکەم بە شیاوی لەچاپدان نەدەزانی. لەم سـاڵانەدا جاروبـار کتێبێکـی تازەم دەسکەوتووە و وەکـوو سـەرچاوەیەکی تـر، پێـدا گـەڕاوم و فیشـم لـێ هەڵـگرتووە. ئەگەرچی هەرچی زۆرتر چوومەتە پێشەوە، کەم و کووڕی کارەکەم زیاتر هاتۆتە پێش چاو. گەلێک ناوی کوردی بەناوبانگم لە لاپەڕەی کتێبان چاوپێکەوتووە کە شتێکی وام لە ژیان و بەسەرهاتیان نەدۆزیوەتەوە.[٤] تەنانەت دڵم لەسەر کورد بوونی هەندێکیش ـکە بە کوردیـان ناو لێ بردوون ـ دانەمەزراوە.[٥]

---

٤. وەک: میرزا مستەفای کوردستانی، خاوەنی هۆنراوەی «*خورشید و خاوەر*»، کە ساڵی ١٣٦٩ ک. م. لـە بەغـدا چـاپ بـووە؛ حەیـدەر بـەگ، بەسـتەبێژی کـوردی هەوشـار (ئەفشـار)ی ئازربایجـان؛ وەحشـەتی کوردستانی، کە چەند شیعر و بەرهەمی بە سۆرانی لێ بەجێ ماوە؛ ئیلبەگی جـاف؛ شـێخ یۆسـف کـوڕی حەمزەی شارەزووری؛ مەستوورە خاتوونی زەند؛ عەبدوڵڵا سوڵتانی زەند و ...

٥. کەسانی وەک: حوسامەدین حەسـەن، کـوڕی موحەممـەدی چەلـەبی، مریـد و پەسـندەری مـەولانا جەلالەدینی ڕۆمی، خاوەنی مەسنەوی و شێخ موحەممەد زاهیدی کوڕی حوسامەدین؛ موحەممەد کـوڕی سیرین، کەسناو ئەبووبەکر، خەون لێدەری بەناوبانگ؛ کە دەڵێن خەڵکی گونـدێکی بـە نـاو «باڵـە» لـە ←

ئەوا بوو بە چل ساڵ و وەک دەبینم، کات درەنگە و مەوداکە تەنگە. تا دەرفەتێک ماوە و دەستی ئەجەل، دەفتەری ژیانمی هەڵنەپێچاوە، بە ناعیلاجی ئەم کتێبە کە لە سەرەتای لاویمەوە تا سەردەمی پیریم، لێکم نەنابوو، دەبەستم و بەرهەمی کاری خۆم پێشکەش دەکەم. هیوادارم کەسانی‌تر شوێنی ئەم کارە بگرن و ئەوانەی کە من لەبەر بێ دەستەڵاتی و نابەڵەدی ناوم لێ نەبردوون، بناسێنن و ژینامەیان بۆ دەربێنن.

پێچەوانەی ئەوەی گوتوویانە: «کەس زارۆی خۆی پێ ناحەز نییە»، ئەمن بە دەسکورتی خۆم دەزانم و پێ بە کەم و کووڕی کارەکەمدا دەنێم. تەنیا ئەوەندە هەیە، بە ئەرکی سەر شانی خۆم زانی بۆ هاوولاتییان و هاو زمانەکانم، ئەوەندەی لە وزەمدا هەبێ، کارێک بکەم؛ دەستم بۆ ئەو کارە برد و دیارە لەوە زیاتریشم لێ نەهاتووە.

| | |
|---|---|
| «بسیار سالها بەسر خاك ما رود | کاین آب چشمه آید و باد صبا رود» |
| ما خاك گشتەایم ولیکن تلاش نسل | بهر دوام جامعە بیانتها رود |
| دارم دُعای خیر زخوانندە انتظار | بر خاطر عزیزش اگر یاد ما رود |
| یارب مگیر بر من مسکین و دست گیر | کز تو کرم بر آید و از ما خطا رود |

* * *

لە بەسەرچوونی ساڵ و مانگدا، جار و بار شتی وا ڕوو دەدا ، جێی سەرسووڕمانە. کاری ئەم کتێبەش لەو ساڵانەی پێوە ببووم، هێندێک حیکایەتی سەیری ساز کرد کە گەڕاندنەوەی چەند دانەیان، وەکوو بیرەوەرییەک، بێ خێر نییە.

١. هاوینی ساڵی١٣٣٨ ک. ه. (١٩٥٩ ز.)، بۆ چاپی کتێبانی شەرعییاتی قوتابخانەکانی کوردستان، لە سنەوە هاتبووم بۆ تاران و هێندێک کتێبێکیشم پێ بوون؛ یەکیان دەسنووسێکی ئەم مێژووە. چەند ڕۆژ لە ماڵی دۆستێکم میوان بووم. کەسێک سازمانی ئەمنییەتی ئەو سەردەمە (ساواک)ی تێگەیاندبوو. پاش نیوەڕۆی ڕۆژێکیان، دوو ئەفسەری

➲کوردستانی باشوورە؛ ئیمام ئەبووبەکری شاشی؛ سائینەدین ئەبووحەزمی ماکسینی زەریری نەحوی جزیری مووسڵی، کە ساڵی ٦٠٣ ک. م. لە دنیا چووە؛ شێخ موحەممەدی عەبدۆ، موفتی میسر، کە ساڵی ١٣٢٣ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە و دەڵێن باب و کاڵی لە کوردستانەوە بۆ میسر کۆچیان کردووە؛ عەباس مەحموود عەقاد، نووسەر و بیرمەندی ناوداری میسری و مستەفا مەحموود عەقادی برای؛ قورئانخوێنی بەناوبانگ، شێخ عەبدولباسیت عەبدوسسەمەد؛ ئەمیر فەغفووری ڕەسمی، لە پیاو ماقووڵان و زانایانی لاجان (لایجان) لە ئازربایجان، لە دنیا چووی ساڵی ١٠٢٨ ک. م. و ...

سازمانی هاتنە سەرم و دوای شێرێ لێرە و ڕێوییەک لەوێ، بردیانە سەر باسی مێژووی ناودارانی کورد و داوایان کرد پێیانی بدەم بیبەن، پاش تاوتوێ کردنێکی سازمان، ئیجازەی چاپی بۆ وەربگرن. گوتم ئیجازەم ناوێ. ئەمن بۆ دڵی خۆم کردوومە و بیریشم لە چاپی نەکردۆتەوە. سوێندیان خوارد مرازێکی خراپیان نییە و نایانەوێ پێش بە کاری من بگرن. سازمان بەنیازە ئەم کتێبە چاپ بکرێ و لەم سۆنگەوە خزمەتێک بە هاوولاتییانی کورد بکا! دیسان ڕەزام نەدا. سەرەنجام قسەی ئاخریان کرد و گوتیان ئێمە دەستوورمان هەیە هەرچۆنێک بووە بەو کتێبەوە بگەڕێنەوە. کردیانە زۆر و بردیان. سێ ساڵی ڕەبەق کتێبی بێ تاوان لە زیندانی ساواکیان بوو. لەو ماوەدا زۆرم گوت و کەمیان بیست. ئاخری بە کەسێکدا ڕایانگەیاند: چەند شتێک هەیە، ئەگەر لێ زیاد دەکا، بۆخۆمان بۆی چاپ دەکەین. جوابم داوە: ئێستا کە نامدەنەوە، تاقە داخوازێکم هەن: وەرن لەبەرچاوی خۆم لە ئاوری بخەن و بیسووتێنن؛ با هەم من و هەم کتێبەکە لەم گێچەڵە خەلاسیمان بێ. ئەم قسەیان زۆر لا گران هاتبوو؛ کتێبیان وەک چۆن بوو، بۆم ناردەوە و کەسمان لە کەس.

٢. پاش گەڕان و ڕاسپاردنێکی زۆر، هێندێک کتێبی سەرچاوەم دەسکەوتبوو؛ بۆ کارەکەم یەکجار بەکەڵک بوون. شناسێکی ئەمەگ نەناس، کە بە بۆنەی هاودەرس بوونی لەگەڵ کوڕێکمدا، زۆر هاتوچووی دەکردین و تەنانەت پرسیاری دەرسەکانیشی لای من دێنا، هەمووی لێ دزیم. دوایی هەرچی حەولم دا، دەستم نەکەوتنەوە. بڕێکیان بریتی بوون لە: بەرگی دووهەمی «کوردانی بەناوبانگ»، «مێژووی ئەدەبی کوردی»، «لباب‌الالباب»، «تاریخ سیستان»، «تحفەی سامی»، «بهترین اشعار» و ...

٣. سەردەمێک وەزارەتی پەروەردە، لە مەزرینگە ژێردەستەکانی لە پارێزگاکاندا، داوای کردبوو بانگێشتنی مامۆستایانی سەردەرچوویان بکەن با پێکەوە کتێبێک سەبارەت بە بارودۆخی زانستی و مێژوویی و جوگرافیایی و ئابووری پارێزگاکەیان بنووسن و بۆ پاتەختی بنێرن؛ کە کۆ بوونەوە، سەرجەمی چاپ بکرێت و لە ولاتدا بلاو ببێتەوە. لە کوردستان تاقمێکان بانگ کرد؛ منیش لە خزمەتیاندا بووم. پاش دوو مانگ، کتێبێکی ٣٠٠ لاپەڕە بەرهەم هات و درایە پەروەردە، بۆ تارانی بنێرێ.

چەند مانگێک پاش ئەم باسە، لە کەلاسێکمدا، قوتابییەک چەند ژمارە لە ڕۆژنامەیەکی نیشانم دا کە زنجیرە وتارێک بە ناوی «معرفی دانشمندان کُرد»ی تێدا چاپ کرابوو. پرسی ئەم وتارانە ئێوە بۆ ئەو ڕۆژنامەیە دەنێرن؟ کە خوێندمەوە، دەبینم من نووسیومە؛ بەلام هیچ خەبەرم لەو کارە نەبووە!

دوایی دەرکەوت پەروەردەی کوردستان کەمتەرخەمی کردووە و کتێبەکەی نەناردووە و لـە سووچێکی داخستووە. هەرکەسێکی پێدا گەیشتووە، بە ئیشتیای خۆی پـاژێکی لـێ وەبـن بـاڵ داوە و چـی پـێ کـردووە، کردوویـە. بەرپرسـی ئـەو ڕۆژنامەیـەش لـە سـنەدا ـکـە هاوکاریشمان بووـ بەشێکی دەسکەوتبوو، بەو شێوە فرۆشتبووی!

٤. زۆر جـاران ئاشـنا و غـەوارە دەهـاتن و هـەرکام بـە نـاوێ، فیشـەکانم لـە یاداشـتیان هەڵدەگرت و بۆ نووسینی کتێب یان گوتاریان، بەهرەیان لـێ دەبـرد. تەنانـەت جارێکیـان قوتابییەکی زانستگا هاتبوو، وەک مەشقی منداڵان، لە ڕووی دەنووسییەوە و خاڵیشـی لـێ دانەدەخست! نیو ساعەتێک خەریک بوو؛ منیش دەنگم نەدەکرد. سەرەنجام دۆستێکم کە دانیشتبوو، تاقەتی نەهێنا و هەستا کتێبی کۆ کردەوە و هێندێک بەسەریدا هات.

وەک خوالێخۆشـبوو مامۆسـتا موجتـەبا مینـەوی دەفـەرموێ: «دەسـتەیەکی حـازرخۆر، ڕەنجی مێرووئاسای کەسانیتر بە لای خۆدا دەدەن و بێ زەحمـەت و مەینـەت، سـووک و هاسان، لە دووی نان و ناون.»

گـــر دامـــن قصـــه زی درازا رفـــت — وانـــدر نظـــر تـــو نابجـــا کـــردم

ســـطری ز حـــدیث درد خـــاطر بـــود — طومـــار شـــکایتی کـــه وا کـــردم[٦]

## پاژبەندیی ئەم کتێبە

ئەم مێژووە، وەک ئاماژەم پێ کرد، لە دوو بەشدایە:

**بەشی یەکەم**: باسی عارفان، زانایان، وێژەوانان و شاعیران؛ لە دوو بەرگدا

**بەرگی یەکەم**: لە سەرەتای مێژووی ئیسـلامییەوە تـا کۆتـایی چـەرخی سـێزدەی کـۆچی ـ مانگی

**بەرگی دووهـەم**: چەرخی چاردە و سەرەتای پازدە، تا ئەوکاتە دەرفەتی شوێنگرتنی ئەم کـارە نەفەوتاوە.

**بەشی دووهـەم**: لەمەڕ میران و خوونکاران و گەورەماڵان و هەروەها سەرۆکی عەشایرەوە، لـە

---

٦. ئەگـــەر زۆرم گـــوت و دەردیســـەرم دای — بـــە ڕای تـــۆ ئـــەم قســـانە ناحەســـاون

لـــە خەمنامـــەم بەشـــێکی ناتـــەواو بـــوو — ئـــەوی ئـــاوا لـــە تۆمارێـــک بـــڵاون

مێژووی ئیسلامیدا.

لە کۆتاییدا بە دڵ سپاسی دۆستی هێژا و پایەبەرزم، زانای هەژی، مامۆسـتا هـەژار دەکـەم کە بۆ چاپی ئەم کتێبە ئەوپەڕی دڵسۆزی و پشتیوانی نیشاندا و لە زۆر شوێنان هەڵەی بۆم ڕاستکردەوە و پەڵەی لێم سڕییەوە.

**بابە شێخی مەردۆخ ڕۆحانی**

تاران، خەرمانانی ١٣٦٤ (١٩٨٥)

# ناونامە

## ح

## د



## ڕ



تایبەت ترین بنکەی کتێبی کوردی
کوردیکا
@kurdica

## ش

## غ



## ف

## گ



## ل



## م


کوردیکا
@kurdica

## و

# چەرخی یەکەم

## گاوانی[1] ئەسحابە

گاوان (جابان) سەحابییەکی گەورەی پێغەمبەری ئیسلام (د) و بێژەری فەرمایشەکانی، واتا: ڕاوی حەدیس بووە.

بەپێی ئەوەی حافیزی کوڕی حەجەری عەسقەلانی[2]، لە کتێبی *«الاصابة فی اسماءالصّحابة»* و ئالووسی‌زادەی بەغدادی، ڕاڤەکاری بەناوبانگ، لە تەفسیری *« روحُ‌المعانی»*دا نووسیویانە، بۆ تاقمێ لە کوردان ئەو هەلە ڕەخساوە لە خزمەتی پێغەمبەردا ببن؛ یەکیان جابانی بابی مەیموون بووە.

لە کتێبی *«اصابە»* لە ژێر سەردێڕی «جابان والدُ میمون»دا، ئاوا نووسراوە:

«رَوی ابنُ منده من طریق ابی‌سعید مولی بنی‌هاشمٍ عن أبی‌خلده: سمعتُ میمونَ بنَ جابان الکردی، عن أبیه أنه سَمعَ النبی (ص) حتی بَلغَ عشراً. و قدً اخرج نحوه الطبرانیُ فی المُعجِم الصغیر عن میمون الکردی عن أبیه أیضاً و هو أتَمُ منه و لفظه: سمعتُ رسول‌الله صلی‌الله علیه و سلّم یقول: ایما رجل تزوجَ امراة علی ما قل‌المهر أو کثر و لیس فی نفسه أن یُؤَدّی الیها حقّها خَدَعها فمات و لم یودّ الیها حقها، لَقی‌الله یوم‌القیمه و هو زانٍ. و أیما رجلٌ استدان دیناً لا یرید أن یودی إلیه دینه، لقیَ الله و هو سارق.»[3]

---

١. «**جابان**» هەر «**گاوان**»ە، لە زمانی عەرەبدا؛ چۆن «**گورجی**» بۆتە «**جُرجی**» و «**گورگانی**» کراوەتە «**جُرجانی**». و

٢. حافظ بن حَجَر عَسقلانی.

٣. تەبەرانی لە کتێبی موعجەمی چکۆلەیدا، لە زمانی مەیموونی کوردی دەگێڕێتەوە کە گوتوویە: « لە گاوانی بابم بیست دەیگێڕاوە پێغەمبەر (د) فەرموویە: هاتوو کەسێ ژنێک لەسەر هەندێک مارەیی ـ کەم یان زۆر ـ مارە بکا و نەیهەوێ بیدا و بە فێڵ و فەرەج تا دواکاتی ژیانی نەیدا، لای خودا زیناکار دێتە ئەژمار. هەروەها کەسی پارەیەک قەرز بکا و بەنیاز نەبێ بە خاوەنەکەی بداتەوە و بەو حالەوە بمرێ، دوخمانی بارەگای خودایە.»

## ئەبووبەسیر، مەیموونی گاوانی

مەیموون کوڕی جابان، لە تابعین و ڕاوی حەدیس دێتە ئەژمار و وەک لە تەفسیری «*روحُ‌المعانی*»دا نووسراوە، نازناوی «ابوبصیر» بووە.

*الاصابة فی اسماءالصّحابة. روحُ‌المَعانی.*

## پیرشالیاری هەورامانی (یەکەم)

هەورامان ناوچەیەکی شاخاوی و سەختەتە لە کوردستان کە پێشتر، خەڵکی دەور و بەری بە هەڵکەوت هاتوچووی هێندێک لە گوند و شارۆچکەکانیان بکردایە. بەپێی ئەو بارودۆخەوە، خەڵکەکەی مەردمێکی بێ فرِوفێڵ و ساف و سادە بوون و هەموو پێداویستێکی ژیانیان، لە خورد و خۆراک و بەرگ و پێڵاو، بۆخۆیان بەرهەمیان هێناوە. خواردنیان زۆرتر لە گۆشت و شیر و میوەی چەند دارێکی وەک گوێز و توو و هەمرۆ و هەنار و بنی برێ گیای خۆڕسکی ئەو کێو و لاپاڵانە بووە و جل و بەرگیشیان هەر لە بەنی خوری یان پەمووی ڕێسراو دەسچن کراوە.[1] هەروەها کاڵە و پاڵاشیان دەسکاری خۆیان بووە.[2] بەم بۆنەوە بە پێویستیان نەزانیوە تێکەڵیی و ئاموشۆیەکی وەهایان لەگەڵ دراوسێکانیاندا هەبێ. ئەو خەڵکە کاریان بەسەر ڕووداوی بەدەر لە ناوچەکەیانەوە نەبووە و زۆرتر بە ژیانی خۆیانەوە خەریک بوون و بۆ پاراستنی داب و نەریتی کۆمەڵگاکەیان تێکۆشیون. خودای ئەم مردمە ئەهوورامەزدا بووە و لەمێژەوە بە ئایینی زەردەشت ڕاهاتوون.

پاش هێرشی عەرەبی موسوڵمان بۆ ئێران و لەناوچوونی دام و دەزگای پاشایەتی ساسانی و پەرەگرتنی دینی پیرۆزی ئیسلام لەو سەرزەمینە پان و بەرینە، خەڵکی هەورامان تا ماوەیەکی درێژخایەن دەستیان لە ئایینی خۆیان بەرنەداوە و ئەگەر کەسێکیش بۆ ڕانان و نیشاندانی دینی نوێ چووبێتە ناویان، ئاوڕێکیان لێ نەداوەتەوە.

یەک لە موغان و پێشەوایانی گەورەی دینی زەردەشت لە هەورامان، پیرشالیار (پیرشەهریار) کوڕی جاماسب بووە؛ پیاوێکی زانا و تێگەیشتووی خاوەن هەست و هۆنەر کە کتێبێکی بە ناوی «*ماریفەتوو*

---

١. تەنانەت ئەوڕۆکەش پۆشەنی زوربەی خەڵکی هەورامان و ژاوەرۆ و هێندێک ناوچە و مەڵبەندی تری کوردستان، دەستکاری خۆیانە. بەتایبەت بۆ پیاوان، بەرگێکی یەکجار ڕازاوە لە بەرگنی بزنی مەرەز بەرهەم دێنن کە «چۆخە و ڕانک»ی پێ ئێژن.

٢. زستانان «کاڵە»یان لە پێ کردووە کە کەوشێکی لە پێستی گیانەوەران بووە، بە شێوەیەکی تایبەت چنراوە و ئێستا زۆر باوی نەماوە؛ بەڵام پێڵاوی هاوینان (کلاش)، ئێستاکە لە هەموو کوردستان جێ خۆی کردۆتەوە.

*پیرشالیار*»، بە زمانی کوردی هەورامی هۆنیوەتەوە؛ بریتی لە ئامۆژیاری و قسەی نەستەق، هاوڕێ لەگەڵ داکۆکی لەسەر پاراستن و بەڕێوەبردنی داب و دەستووری ئایینی کەونارا. بەرگ و ڕوونووسی ئەم کتێبە ئێستا بە دەستەوە نەماوە و تەنیا تاک و تەرا، بەیت و ڕستەی لێوە بە سەر زاری خەڵکەوە هاتووە و ئێستاش جاروبارە وەکوو پەندی پێشینان، قسە و باسی خۆیانی پێی دەڕازێننەوە.

لەو هەڵبەستەدا، هەموو جارێ پاش دوو بەیت، ئەم چامە دووپاتە بۆتەوە:

گۆشت جە واتەی پیرشالیار بۆ! هۆشت جە کیاستەی زانای سیمیار بۆ!

**واتا**: گوێ بگرە بۆ قسەی پیرشالیار و هۆش بدە بۆ تێگەییشتن لە نووسراوەی زەردەشتی زانا.

ئەوا پاژێک ـ دوان لەو هۆنراوە:

داران گیانـدارەن، جـەرگ و دڵ بەرگـەن گایێ پڕبـەرگـەن، گایـێ بـێبـەرگـەن

کەرەگ جە هێڵێن، هێـڵێ جـە کەرگـەن ڕواس جـە ڕواس، ورگـەن جـە ورگـەن

**واتا**: دار و دەوەن گیانیان هەیە و جەرگ ودڵیان گەڵایە؛ جاروبارە پڕگەڵان و جارــجاریش ڕووت و قووتن. مریشک لە هێلکەیە و هێلکە لە مریشک. ڕێوی لە ڕێوی و گورگیش لە گورگە.

وەورێ وەوارۆ، وەورەوەرێنـــە وریسە بڕیـۆ، چوارسەرێنـە

کەرگێ سیاوە، هێڵێش چەرمێنـە گۆشلێ مەمرێـۆ، دوێ دەرێـنە

**یانی**: بەفرێ دەبارێ بەفرەخۆرەیە! گوریس کە پچڕا چوارسەرەیە! پەلەوەری ڕەش هێلکەی سپییە! تیانە کون بوو، دەرکی بوو بە دوو!

چەند کەسێک لە زانایانی کورد لەسەر ئەو بڕوایەن کە پیر شالیار لە ئاخر و ئۆخری ژیانیدا هاتۆتە سەر ئایینی ئیسلام و هەوڵیداوە خەڵکیش بێنێتە سەر ئەو ڕێبازە؛ کەچی سەرنەکەوتووە و لە بڕانەوەی چەرخی پێنجەمی کۆچیدا، کۆچی دوایی کردووە. بەڵام بە پێی هەموو شوێن و نیشانەیەک، وا دەردەکەوێ کە ئەم پیرشالیارە لە بڕانەوەی چەرخی یەکەمدا ژیاوە و تا دوامین ساتی ژیانی لەسەر داب و نەریتی کۆنی خۆی ماوە و دەستی لە ئایینی زەردەشتی بەرنەداوە؛ دەنا لە چەرخی چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا، دینی ئیسلام سەرانسەر هەورامانی گرتبووە بەر و هەموو هەورامان موسوڵمان ببوون. لە سەرینەی ئەوەشدا ئەگەر پیر شالیاری هەوەڵ بۆتە موسوڵمان، چۆن هیچ دەستێکی لە مەنزوومەکەی نەداوە و هەموو دەقێکی هەروا لەسەر بیر و بڕوای مەجووسی و ئاورپەرسی ماوە و باسێکی ئایینی تازەی تێدا نەکراوە؟ دیارە دەبوو ڕاسپێری و مۆچیارییەکانی بێنێتە سەر دابی تازە و ئەوی سەر بە دینی زەردەشتە لێی بسڕێتەوە و شیعر و هۆنراوەکانی بە گوێرەی داب و دەستووری ئیسلام بڕازێنێتەوە؛ هەر وەک پیرشالیاری دووهەم ـ کە موسوڵمان بووە ـ وای کردووە.

*تاریخ کردستان*، مردوخ. *کرد و پیوستگی نژادی و تاریخی او*، رشید یاسمی.



# چەرخی دووهەم

## ئەبووسولەیمان یۆنسی کاتیب

ئەبووسولەیمان یۆنس، کوڕی سولەیمان، کوڕی کورد، کوڕی شەهریاری کوردی، نووسەر و شاعیر و مووسیقارێکی گەورەی دەورانی خۆی بووە. بابی لە ناوچەیەکی کوردەوارییەوە بەرەو شاری مەدینە باری کردووە و یونس لەویٚ لە دایک بووە و خوێندنی دوایی‌هێناوە و لە بواری نووسەری و شیعر و شاعیریدا هەڵیداوە و ئیشی دەبیری دیوانی میری مەدینەی پیٚ سپێراوە. هاوکات ژەندنی ساز و خوێندنی ئاوازی لە لای مامۆستایانی وەک «مَعبد» و «ابن‌محرز» خوێندووە و فێریان بووە. سەفەرێکی بۆ شام کردووە و وەلیدی کوڕی یەزید زۆری خۆش‌ویستووە و کە بۆتە فەرمانڕەوا، لە مەدینەوە هێناویەتە لای خۆی و تا هەبووە لە پەنای خۆی ڕاگرتووە و کە کوژراوە[1]، یونس گەڕاوەتەوە مەدینە.

ئەبولفەرەجی ئەسفەهانی، خاوەنی کتێبی «*الأغانی*» ، دەنووسیٚ: «یونس دەنگی خۆش بوو؛ لە هونەر و زانستی مووسیقادا نوێکارییەکی تایبەت بە خۆی هەبوو؛ شیعری جوان دەهۆنییەوە و ڕا و بۆچوونی لە بواری مۆسیقادا جێی متمانەی هەموان بوو؛ یەکەم کەسێکە دەزگاکانی مووسیقای کردۆتە کتێب و ڕست و ڕێسای بۆ داناون.»

کۆچی یەکجاری ئەبووسولەیمانیان دەوری ساڵی ١٣٥ک. م. نووسیوە.

*الأغانی*، أبوالفرج إصفهانی، چاپی٦، ب٤، ل١١٣- ١١٨. *الأعلام*، زرکلی، ب٩، ل٣٤٤. *تاریخ ادبیات ایران*، جلال همایی، ب٢، ل١١٩.

## سیتتە لوبابەی کوردی

خاتوونێکی زانا و لەکارزان، کچی یەکێک لە فەرمانڕەوایانی دەسچووی کوردی موسڵ و دایکی مەروان، کوڕی

---

١. ماوەی دەسەڵاتداری وەلید تاقە ساڵێک بووە (١٢٦- ١٢٧ ک. م.).

محەمەد، کوڕی مەروان، کوڕی حەکەم، لە پاشایانی ئەمەوییە کە لە نیوەی هەوەڵی چەرخی دووەمدا ژیاوە.
*خیراتٌ حِسان*، ب٣، ل٤٩.

## ئەبوو یەحیا مەهدی کوردی (بصری)

ئەبوویەحیا مەهدی، کوڕی مەیموون، زانایەک لە کۆچەرانی کوردە کە لە ساڵی ١٧٢ ک. م. لە شاری بەسرەدا ژیاوە و حافیزی حەدیس بووە و کەسانی وەک «شعبە» و «ابن‌حنبل» شایەتییان لەسەر ڕاستی و ئەمانەتداری ئەو داوە.

ئەوی ئەبویەحیا لە فەرمایشی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، لە «صِحاح ستە»دا نووسراوە.
*الأعلام*، زرکلی، ب٨، ل٢٥٩.

## مووسا کاتیبی بەغدایی

مووسا، کوڕی عیسا، نووسەر و وێژەوانێکی کورد بووە کە بەرەو بەغدا باری کردووە و بە بەغدادی ناوبانگی دەرچووە و ساڵی ١٨٦ ک. م. دنیای بەجێ هێشتووە. دوو کتێبی: «*حُبُّ الأوطان*» و «*مُناقضات*» لە بەرهەمەکانی ئەون.

وەک ئیبنونەدیم لە «*الفهرست*»دا دەڵێ: مووسا لەو کوردە ئێرانییانەیە کە لە وەرگێڕانی کتێباندا (لە زمانی فارسییەوە بۆ عەرەبی)، بەشێکی بەرچاوی هەبووە.

*لغتنامەی دهخدا*، ژمارەی٢١٥، ل٨١.

## ئەبولئەکرادی سائیغ

ئەبولحەسەن عەلی کوڕی مەیموون، ناسراو بە «ابوالأکراد صائغ» مامۆستایەک لە زانایانی حەدیس و بێژەری ئەخبارە کە لە بڕانەوەی چەرخی دووهەمی کۆچیدا ژیاوە. بەو بۆنەوە « صائغ»یان پێ گوتووە، بابی زێڕکار بووە.

*شعب‌المقال فی احوال الرِّجال*، حاج میرزاابواقاسم نَراقی، یزد، ١٣٦٧ک. م. ل ١٥٢.

## حەفسەی کوردی

ژنێکی پارێزکار بووە کە ژیانی بە هاودەنگی و خزمەتی «شعوانە»[1] ڕابواردووە و لە پیتی ئەو خاتوونە پیرۆزە،

١. ژنێکی عارف و لەخواترس بووە کە لە چەرخی دووەمدا ژیاوە و کەڵەپیاوانی وەک «ابوعلی فُضَیل بن عیاض» شایەتییان لەسەر پلە و پایەی بەرزی خواناسی و پارێزکاری ئەو داوە. *طبقات*، شیخ شعرانی، ب١، ل٦٦.

بواری «فنای نفس» و دەست بەردان لە دنیای تێپەڕاندووە و گەیشتۆتە پایەی «صفای قلب» و «حضور» و بـۆ پارێزکاری و لە خواترسی ناوی دەرکردووە.

حەفسە تا کۆتایی چەرخی دووەم ژیاوە.

*نفحات الأنس*، عبدالرحمن جامی، ل ٦١٨.

# چەرخی سێهەم

## ئەبولحەسەن عەلی جزیری

ئەبولحەسەن عەلی «عدوی شمشاطی» جزیری لە مەشایخی جزیر و بۆتانە کـە لـە ڕیـزی هۆزانـان و وێژەوانانی سەرەتای چەرخی سێهەم دێتە ئەژمار. کتێب و نووسراوەی، بەتایبەت لە بـواری شـیعر و وێژەوانیدا زۆر بووە.

*شعب المقال فی احوال الرّجال*، حاج میـرزا ابواقاسم نَراقی، یزد، ١٣٦٧ک. م. ل ٢١٨.

## مەجدەدین نیشابی ئەربیلی (هەولێری)

مەجدەدین نیشابی لە هۆزانان و شاعیرانی کوردی چەرخی سێهەمە کە لە دام و دەزگای مـیری هـەولێردا ژیاوە و زۆرچەلان لە لایەن میرەوە بۆ بارەگای پاتشایان چووە و هەموو جارێک سەرکەوتووە و ڕێز و قـەدری زۆرتر بووە.

کۆچی دوایی مەجدەدینیان لە نیوەی دووهەمی چەرخی سێهەمدا نووسیوە.

*مشاهیر الکرد*، ب٢، ل١٢٥. بە گێڕانەوە لە قاموس *الأعلام*.

## ئەبوونەسر موحەممەد ئیبنولکوردی

ئەبوونەسر موحەممەد، ناسراو بە «ابنُ الکُردی»، لە بێژەرانی حەدیسە کـە ماڵـی لـە بەغـدا بـووە و شـاگردیی ئەبووبـەکری مـەروەزی، هاوکـاری ئیمـام ئەحمـەدی حەنبـەل (١٦٤-٢٤١ک. م.)ی کردووە.

ئەبووبەکر موحەممەدی ئاجوری، لە ئەبوونەسر ڕەوایەت دەگێڕێتەوە.

*تاریخ بغداد*، ب٣، ل١٩٥.

## جابیری کوردی

ئەبولعەباس جابیری کوردی، زانایەک لە بێژەرانی چەرخی سێهەمە کە لە سامەڕا ژیاوە و جێی متمانەی بێژەرانی حەدیس لە پاش خۆی بووە. ئەم مامۆستایە پێشتر لە واسیتدا بووە و بەو بۆنەوە «واسیتی»شیان پێ گوتووە.

*تاریخ بغداد*، ب٧، ل٢٣٨.

## ئەحمەدی حەناتی کوردی

ئەحمەدی «حناط»، کوڕی موحەممەدی کوردی، لە زانایانی بەناوبانگی «علمُ‌الحَدیث»ە کە لە چەرخی سێهەمدا ژیاوە و نیشتەجێی بەغدا بووە.

لەوانەی حەدیسیان لە حەنات گێڕاوەتەوە، یەکیان ئیبنوشاهینە.

*تاریخ بغداد*، ب٥، ل٨٣.

## ئیبنوقوتەیبەی دینەوەری[1]

ئیمام ئەبووموحەممەد عەبدوڵلا، کوڕی موسلیم، کوڕی «قُتیبە»ی دینەوەری، ناسراو بە «ابن‌قُتَیبە»، لە گەورە وێژەوان و نوسەرانی بەناوبانگە کە لەساڵی ٢١٣ک. م. لە بەغدا هاتۆتە دنیا و لەوێ دەرس و خوێندنی تەواو کردووە و ساڵی ٢٧٦ک. م. هەر لەو شارە، دنیای بەجێ‌هێشتووە.

ئەبوومحەممەدی دینەوەری ماوەیەک لە بەغدا و چەند ساڵێک لە کووفە دەرسی گوتۆتەوە و هێندێکیش لە زێدی خۆی (دینەوەر) پایەی دادوەری هەبووە.

ئەم پیاوە زانایە کتێبی بایەخداری زۆری نووسیوە کە بڕێکیان بریتین لە:

١. *الشّعر و الشُعراء*
٢. *أدب‌الکاتب*
٣. *المعارف*
٤. *کتاب‌المعانی*
٥. *عیون‌الأخبار*
٦. *الإمامة و السّیاسة*
٧. *الرّدُ علی‌الشّعُوبّیه*

---

١. **دینەوەر** ناوچەیەکی سەر بە کرماشانە لە باشووری سونقوڕ، لە سەرڕێی هەمەدان. ئێستاکە شاری **سەحنە** ناوەندییە.

٨. *الرّجُل و المنزل*

٩. *مُشكل القرآن*

١٠. *المشتبه من الحديث و القرآن*

١١. *العربُ و علومُها*

١٢. *المسائل و الاجوبّة*

١٣. *غريبُ القرآن*

١٤. *طبقات الشّعراء*

١٥. *الاشربه* و ...

*الأعلام*، ب٤، ل ٢٨٠.

## ئەبووجەعفەری شارەزووری

وێژەوانێکی زانا و شاعیرێکی توانا بووە لە کوردانی شارەزوور کە لە چەرخی سێهەمی کۆچیدا ژیاوە.

خوا لێ خۆشبوو عەباسی ئیقباڵی ئاشتیانی، لە گۆڤاری *یادگار*دا هێناویە کە ڕەحمەتی عەللامەی قەزوێنی، بۆ ڕستەی شاهید لە مەڕ وشەی «سَفینە»وە، بە مانای «جۆنگ» واتا دەفتەری هەمەڕەنگە، لە کتێبی *خاص الخاص*، نووسراوەی سەعالیبی[1]، ل ١٤١، ئاوای نووسیوە: « ابو جعفر الشّهرزوری، من ملحه التی کتبها عنه الصّاحب[2] بیده فی سفینه...»[3] ئەمجار دوو شیعرە عەرەبییەکەی شارەزووریشی هێناوە.

گۆڤاری *یادگار*، ساڵی چوارەم، ژمارەی٤، ل ٧٠.

## ئەبوموحەممەد جەعفەری کوردان

ئەبوموحەممەد جەعفەر، کوڕی ئەحمەد، کوڕی مبارەک، ناسراو بە کوردانی خەلقانی، زانایەکی حەدیس و جێی بڕوا و ڕێز و متمانە بووە کە ساڵی ٢٧٧ ک. م. لە دنیا دەرچووە و لە شاری بەغدا نێژراوە.

ئەم مامۆستایە برای ئەحمەدی کوردانە، کە لە جێی خۆیدا باسی ئەویش دەکەین.

*تاریخ بغداد*، ب٧، ل ١٨٤.

---

١. ابومنصور ثعالبی (عبدالملك بن محمّد)، لەدایک بووی ٣٥٠ و لە دنیا دەرچووی ٤٢٩ک. م.

٢. ساحیب کوڕی عوبباد (٣٢٦ – ٣٨٥ ک. م.) وێژەوانی تێگەیشتووی ئێرانی، وەزیری «رکن الّدوله دیلمی».

٣. **واتا**: لە شیعرە خۆش و دڵگەشێنەکانی شارەزوورییە کە ساحیبی کوڕی عیباد بە دەستی خۆی لە جۆنگێکدا نووسیویەتەوە.

## ئەبووحەنیفەی دینەوەری

ئەبووحەنیفە ئەحمەد کوڕی داودی دینەوەری، لە زانایـانی گـەورەی دینــەوەر بـووە کـە لـە زمـان و وێـژە بەتایبەت نەحو و واژە و هەروەها مێژوو، جوغرافی، ئەستێرەناسی و گیاناسیدا زانیارییەکی قووڵی بـووە و بـە پلەی پسپۆڕی گەیشتووە.

سەید جەلالەدینی تیهرانی لە گاهنامەی ساڵـی ١٣٠٧ هەتاویـدا، نـاوی ئەبووحەنیفـە وەکـوو یـەک لـە ریازیزانەکانی چەرخی سێهەم دەبا کە لە ئەسفەهان ئاسماندۆزی کردووە و زیچی بەرهەم هێناوە.

**لە نووسراوەکانی:**

١. *الاخبار الطوال* (مێژووی گشلایی)
٢. *کتاب الجبر و المقابله*
٣. *إصلاح المنطق*
٤. *أنساب الأکراد*
٥. *کتاب النبات*
٦. *کتاب الانواء*
٧. *کتاب الکسوف*
٨. *کتاب الفصاحه*
٩. *کتاب الشّعر و الشّعراء* و...

ئەبوو حەنیفەی دینەوەری وەکـوو هەڵـکەوتەیەکی هـۆزان و بیرمەنـدێکی گـەورەی بـواری وێژەوانیـی عەرەب، ناوی لێ براوە. لە «*مُعجَم الادباء*» و «*الأعلام*»دا ساڵی کۆچی دوایی ئەو، ٢٨٢ ک. م. نووسراوە[١].

*گاهنامەی تهرانی*، ١٣٠٧، ل ١١١-١٣١. *الأعلام*، زرکلی، ب ١، ل ١١٩.

## ئەبووعەلی ئەحمەدی کوردی

ئەبووعەلی ئەحمەد، کوڕی مەزیدی کوردی، زانایەکی جێ بڕوای حەدیسە کە تـاقمێکی گـەورە لـە کـۆڕی دەرسی بەهرەیان بردووە؛ یەک لەوانە: ئەبووبەکر موحەممەد کوڕی شازانە.

ژیانی ئەبووعەلی لە نێوان چەرخی سێهەمدا بووە و ساڵی ٢٨٦ لە بەغدا، ئەم دنیایەی بەجێهێشتووە.

*تاریخ بغداد*، ب٥، ل٢٢٨.

١. مێژوونووسان ساڵی مەرگی ئەبووحەنیفەی دینەوەرییان ٢٨١، ٢٨٢، ٢٨٣، ٢٨٤، ٢٩٠ و ٢٩١یش نووسیوە.

## موحەممەدی عەبدوڵڵای دینەوەری

موحەممەد کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی میهرانی دینەوەری، لە زانایانی دینەوەری کوردستانە کە دوای تەواو کردنی دەرس و دەور، نیشتەجێی بەغدا بووە و لەو شارە دەرسی حەدیسی گوتووە و ساڵی ٢٨٨ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

*تاریخ بغداد*، ب٥، ل٤٣٢.

## ئەبووعەلی ئەحمەدی نەحوی دینەوەری

ئەبووعەلی ئەحمەد، کوڕی جەعفەری دینەوەری، لە مامۆستایانی هەڵکەوتەی نەحوی عەرەبی لە چەرخی سێهەمی کۆچی و زاوای سەعلەب، زانای بەناوبانگ بووە.

ئەبووعەلی لە دینەوەرەوە سەری هەڵداوە و بۆ بەغدا و بەسرە چووە و لای مازنی و ئەبولعەباس (مُبَرّد)، «*الکتاب*»ی سیبویەی خوێندووە؛ پاشان بەرەو میسر ڕۆیوە و تا دوایین کاتی ژیان (٢٨٩ یان ٢٩٠ ک. م.) لەوێ خەریکی دەرس‌گوتنەوە بووە.

**لە نووسراوەکانی**: «*إصلاح المنطق*»، «*المهذّب فی النحو*» و «*ضمائر القُرآن*».

*الأعلام*، ب١، ل١٠٢. *معجم الادباء*، ب٢، ل٢٣٩ و ٢٤٠.

## بەسسامی کورد

بەسسام، یەکەم شاعیری کوردە کە بە فارسی شیعری گوتووە و لە سەردەمی دەسەڵاتداریی یەعقووب لەیسی سەففاریدا ژیاوە. کتێبی «*تاریخ سیستان*» لەم بارەوە دەڵێ:

«بسّام کُرد از آن خوارج بود که به صلح نزد یعقوب لیث آمده بودند. چون طریق وصیف بدید اندر شعر، شعرها گفتن گرفت و ادیب بود و حدیث عَمّار اندر شعری یاد کند:

هر کـه نبـود اُوی بـه دل متّـهم — بـر اثـر دعـوت تـو کـرد نَعـم

عُـمر ز عَـمّـار بـدان شـد بـری — کُـاوی خـلاف آورد تـا لاجـرم

دید بلا بـر تـن و بـر جـان خـویش — گـشـت بـه عـالم تـن او در اَلَـم

مکّه حَـرَم کـرد عـرب را خـدای — عهـد تـو را کـرد حَـرَم در عجـم

هر کـه در آمـد همـه بـاقی شـدند — بـاز فـنا شـد کـه ندیـد ایـن حـرَم

**واتـا**: «بەسسامی کورد یەک لەو غەوارەیانە بوو کە بە خۆشی خۆی هاتبووە لای یەعقووب‌لەیس و لە شیعردا ڕێبازی ڕازاوەی دیتەوە و زۆری شیعر گوت. وێژەوان بوو؛ لە شیعرێکدا باسی داستانی عەمماری کردووە:

ئەوی دەغەزێکی لە دڵدا نەبوو، کەوتە شوێن فەرمانی تۆ.

عەممار لەبەر ئەوە لە گیان بێبەش بوو، سەرپێچی تۆی کرد و گیان و لەشی کەوتە چۆرتم و دەردەوە.
خودا مەککەی کردە حەرەم بۆ عەرەب؛ دەورانی تۆشی کردە حەرەم بۆ عەجەم.
ئەوانەی هاتنە ریزی تۆوە، مانەوە و نافەوتێن. کەچی فەوتا ئەوی ئەم حەرەمەی نەدیتەوە.»
خوا لێخۆشبوو «ملک‌الشّعرا»ی بەهار، لە کتێبی «*سبک‌شناسی*»دا دەڵێ:
«قدیم‌ترین اشعار فارسی که در خراسان و سیستان، از طرف حَنظَلَەی بادغیسی و محمد بن وصیف سکزی و بسّام کُرد خارجی و غیرهم گفته شده، به زبان فصیح دری بود.»

**یانی**: کۆنترین شیعری فارسی کە لە خوراسان و سیستان، حەنزەلەی بادغەیسی و وەسیفی سەکزی و بەسسامی کوردی بیانی گوتوویانە، بە زمانی پاراوی دەری بووە.
کە وابوو بەسسام زیاد لەوەی یەکەم کوردێکە بە فارسی شیعری گوتووە، دووهەم یان سێهەم کەسێکیشە لە ئێرانییەکان کە شیعری فارسی هۆنیوەتەوە.

*تاریخ سیستان*، چاپی یەکەم، تاران، ل٢١١. *سبک‌شناسی*، ب١، ل٢١.

## ئەحمەدی کوردان

کوڕی ئەحمەد، کوڕی مبارەک، لە زانایانی ناوداری حەدیس لە ئاخر و ئۆخری چەرخی سێهەمە کە تاقمێکی زۆر لە ئەهلی حەدیس خزمەتی گەیشتوون و لێوە ڕەوایەتیان کردووە.

*تاریخ بغداد*، ب٤، ل٣٥٧.

## ئەبووبەکری شارانی[1] شارەزووری

عارفێک بووە لە مەڵبەندی شارەزوور کە لە بڕانەوەی چەرخی سێیەمدا ژیاوە و دوای کۆتایی هێنان بە خوێندن و قوتابخانە، ڕووی لە خانەقا کردووە و ڕێگای سۆفیەتی هەڵبژاردووە و بۆ گەییشتن بە ئامانجی خۆی، کەوتۆتە گەشت و گێڵ و دواییش لە شیراز گیرساوەتەوە و سەری یەکجاری ناوەتەوە.
شێخ ئەبووعەبدوڵڵای خەفیف کە ژینامەیەکی عارفانی نووسیوە، خزمەتی شارانی گەیشتووە و ئاوای پێدا دەڵێ: «ما رایتُ مُتَخَلیاً من‌الدّنیا اَصدقَ ظاهراً مِن اَبی‌بکرِ الشّعرانی».
**واتا**: کەسم نەدی لە ئەبوبەکری شەعرانی پشت‌کردووتر لە دنیا، کە بە ڕواڵەتیشیدا دیاربێ.
دیسانەکە و ئەمجار بە فارسی دەڵێ:
«روزی به زیارت آن مرد عارف رفتم؛ در آن وقت او در اصطخر فارس اقامت داشت. شب هنگام به نزد او

١. زوربەی ژینامە نووسان «**شعرانی**»یان نووسیوە؛ کە هەڵەیە و «**شاران**» ناوچەیەکە لە شارەزوور.

رسیدم. از حال من جویا شد و گفت: ای عبدالله! امشب به برکت صحبت تو، غذای چربی خواهیم خورد. آنگاه برخاست و در دیگ سُفالینی که داشت، مقداری آب و کمی گوشت خُشک ریخت و بر آن نمک پاشید و بر آتش نهاد؛ تا اینکه پخته شد. بعد مقداری ریزەنان آورد و ترید کرد و گفت: بِسم‌الله! بفرما تا بخوریم! و من از آن ترید بخوردم و او می گفت گوشت بخور و من نمی‌خوردم. وقتی که خواستم از وی جدا شوم، گفتم: مرا وصیّتی بفرما! گفت: به هرچه پیش آید راضی باش! لباس ظاهر را بر اشخاص کافی مدان! و از هرکس آن قدر که داند فراگیر! تا دنیا و آخرت بر تو نیکو گذرد. آنگاه از او وداع کرده راه شیراز را پیش گرفتم ».

**یانی**: ڕۆژێک چووم بۆ زیارەتی ئەو پیاوە عارفە؛ لەو کاتەدا لە ئیستەخری فارس بوو. شەو گەیشتمە لای. لە حاڵ‌وباڵی منی پرسی و گوتی: ئەی عەبدوڵڵا! ئەوشۆ بە بۆنەی تۆوە چێشتێکی چەور دەخۆین. ئەمجا هەستا و مەنجەڵێکی سواڵەتی هەبوو، هێندێک ئاو و نەختێ قاورمەی تێخست و خوێی بەسەردا کرد و نایە سەر ئاور؛ تا کوڵا. پاشان لاگوێلێک وردەنانی هانی و تێکوشی و گوتی: دەجا فەرموو با بخۆین. من دەستم بۆ تریتەکە دەبرد و ئەو دەیفەرموو گۆشت بخۆ! منیش نەمدەخوارد. کاتێ ویستم بڕۆم، گوتم: ئامۆژیارییەکم بفەرموو! گوتی: ئەوەی دێتە پێشەوە، پێ دڵنیا بە! ڕواڵەتی خەڵکی بەرچاوت نەگرێ! لە هەرکەس ئەوەندەی دەزانێ، فێربە! تا دنیا و سەلات لێ خۆش‌وگەش بێ. ئەوجار مالاواییم لێ کرد و بەرەو شیراز ڕێم گرتە بەر.

*نَفَحاتالأُنس*، ل٢٣٧. *طبقات شعرانی*.

## مەمشادی دینەوەری

مەمشاد عارفێکی تەرکەدنیای خەڵکی دینەوەر بووە کە لە چەرخی سێهەمی کۆچیدا ژیاوە و ساڵی ٢٩٧ ک. م. ئەمری خوای بەجێ هێناوە. لە ڕستە عارفانەکانییە: «طریقُ‌الحقِ بَعیدٌ و الصّبرُ مع‌الله شدیدٌ».

بۆساڵی مەرگی ٢٩٨ و ٢٩٩شیان گوتووە.

*طبقات‌الکُبری*، شیخ شَعرانی، ب ١، ل١٠١. *نَفَحاتُ‌الأُنس*، عبدالرّحمن جامی، ل٩٢.

## ئەبووبەکری کەسائی دینەوەری

عارفێکی بێ‌نیاز، دەرباز لە بەندیواریی دنیا، کە دوای کۆتایی هاتنی دەرس و دەور، بۆ دەس‌کەوتنی پیت و پیرۆزی، زۆر شوێنان گەڕاوە و خزمەتی زۆر پیاوچاکان چووە و لە ئاکامدا عارفی پایەبەرز شێخ جونەیدی بەغدایی (٢٩٧ ک. م.) لە بەغدا بینیوە و نیشتەجێ ئەو شارە بووە و سەرەنجام لە بڕانەوەی چەرخی سێهەمدا دنیای بەجێ هێشتووە.

مەولانا جامی لەمەڕ ئەو پیاوەوە دەڵێ:

«ابوبکر کسائی از قهستان[١] عراق بوده به دینور. مردی بزرگ است از قُدما و اصحاب جُنَید و اقران وی. او را ریاضت بسیار و سفرهای معروف است. جُنید گوید: اگر نه ابوبکر کسائی دینوری بودی، من در عراق نبودمی. جُنید را با او مکاتبات است و رسائل نیکو؛ پیش از جُنید برفته از دنیا. شیخ ابوبکر عسقلانی گفته: که چون ابوبکر کسائی در خواب شدی، از سینه‌ی وی آواز قرآن خواندن شنیدندی.»

**واتا**: ئەبووبەکری کەسائی لە دینەوەری سەر بە کوێستانی عیراق، گەورە پیاوێک بووە لە ڕابردوان و یاران و نزیکانی جونەید. ڕیازەتی زۆری کێشاوە و زۆر گەڕاوە. جونەید دەڵێ: ئەگەر لەبەر ئەبووبەکری کەسائی دینەوەری نەبوایە، ئەمن لە بەغدا نەدەبووم. جونەید لەگەڵیدا نامەگۆڕینەوە و نامیلکەی باشی هەیە و پێش جونەید لە دنیا دەرچووە. شێخ ئەبووبەکری عەسقەلانی گوتوویە: ئەگەر ئەبووبەکری کەسائی خەوی لێ دەکەوت، لە سینگیەوە دەنگی قورئان خوێندن ئەهاتە بەرگوێ.

١. «**قَهستان**» عارەبی کراوی «**کوهستان**»ە، واتا «**کوێستان**». لە چەند چەرخی هەوەڵی ئیسلامیدا، ناوچە شاخاوییەکانی کوردستانیان بە «**قَهستان**» یان «**جَبَل**» ناو لێ بردووە.

# چەرخی چوارەم

## ئەبوجەعفەر ئەحمەدی دینەوەری

ئەبووجەعفەر ئەحمەد، کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی موسلیم، کوڕی قوتەیبە، دادوەری شاری بەغدا بـووە و زۆرتـر ژیانی بە نووسین و ویژەوانی رابواردووە و کتێب و نووسراوەی باوکی شەرح کردووە. کوتوویانە ٢١ کتێب لـە کتێبەکانی باوکی لەبەر بووە و بە دەرس‌دان دەرسی داوە. ساڵی ٣٢١ ک. م. چووە بۆ میسر و لەوێ کە بـە پلەی زانایی و ڕادەی هەڤیازییان زانیوە، لە هەموو لاوە قوتابیان ڕوویان لێ کردووە و بەهرەیان لێ بردووە.

ئەبووجەعفەر ساڵی ٣٢٢ ک. م. لە میسر لە دنیا چووە.

*وفیات‌الأعیان*، ابن‌خلکان، ب ١، ل ٢٥١. *الأعلام*، زرکلی، ب ١، ل ١٤٩.

## زەڕڕابی دینەوەری

ئەبووبەکر ئەحمەد، ناسراو بە «ضرّاب»، خەڵکی دینەوەر بووە کە پاشان بۆ بەغدا چووە و لەوی دوای ئـەوەی زانستێکی باشی دەس‌کەوتووە، بابەتی حەدیس و ئەخباری دەرس گوتووە و لە ڕاویانی حەدیس بووە.

کۆچی یەکجاری ئەبووبەکر ساڵی ٣٢٨ ک. م. لە بەغدا ڕووی‌داوە.

*تاریخ بغداد*، ب ٤، ل ٤٢٧.

## ئیبنوتاهیر

ئەبووبەکر عەبدوڵڵای ئەبهەری، ناسراو بە «ابن‌الطّاهر»، عارفێکی ناودار و زانایەکی خاوەن ئیتوار بووە لە کوردانی ئازربایجانی و لە نێزیکانی شیبلی و هەوالانی یۆسف کـوڕی حوسـەینی ڕازی و ئـەبوو مـوزەفـەری کرماشـانی (قەرمسینی)[1] کە ساڵی ٣٣٠ ک. م. کوچی دوایی کردووە.

---

١. **قَرمسین** عەرەبی‌کراوی «**کرماشان**»ە و عەرەب پێشتر «**کرماشان**»یان **قَرمسین** گوتووە.

*طبقات شعرانی*، ب١، ل١١٢.

## ئەبووحەفس عومەری دینەوەری قەرمسینی

ئەبووحەفس عومەر، کوڕی سەهل، کوڕی ئیسماعیل، لە زانایانی بەناوبانگی سەرەتای چەرخی چوارەمە کە قورئان و حەدیسی لەبەر بووە و ماوەیەک لە دینەوەر و هێندێک لە کرماشان ژیاوە و چەند کتێبی لەمەڕ عیلمی حەدیسەوە داناوە و ساڵی ٣٣٠ ک. م. دەستی یەکجاری لە دنیا بەرداوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٨١.

## موزەفەری قەرمسینی

لە گەورە مەشایخانی کوردی هاوچەرخ و هاوپلەی عارفی پایەبەرز، ئەبوومحەممەد عەبدوڵڵا کوڕی موحەممەدی خەڕڕازە. ئەم سارستەیە لەوی دەگێڕنەوە: «الصّوم علی ثلثه اوجه: صوم الّوح بقصرالامل و صوم العقل بخلاف الهوی و صوم النّفس بالامساک عن الطعام و الشّراب و المحارم». دیسان قسەی ئەوە: «الفقیر هوالّذی لا یکونُ له الی الله حاجه».

بەپێی نووسراوەی خواجە عەبدوڵڵای ئەنساری، موزەفەری قەرمسینی هەموو جارێ ئەم دوو بەیتەی لەبەر خۆوە خوێندۆتەوە:

قد لَسَعَت حَیّهُ الهوی کَبدی        فلا طبیب لها و لا راقی

غیر الحبیب الذی شَغَفتُ به        فَعندَه رُقیتی و تریاقی

**یانی**: ماری ئەوین جەرگی گەستووم و بێجگە یار ــ کە دەوا و دەرمانی من لای ئەوە ــ هیچ بژیشک و نوشتەنووسێک چاری ناکا.

*طبقات‌الکبری*، شیخ شَعرانی، ب١، ل١١٢.

## سائیغی دینەوەری

ئەبولحەسەن عەلی کوڕی موحەممەد، کوڕی سەهل، لە مەشایخی گەورەی دینەوەرە کە لە دوو بواری زانست و عیرفاندا ناوی دەرکردووە؛ مامۆستای شێخ ئەبولحەسەنی قەرافی و ئەبووعوسمانی مەغریبی بووە و خۆیشی لە خزمەتی عەللامە سەیدەلانی خوێندوویە.

ئەبووعوسمان وای پێدا هەڵگوتووە: «لە مەشایخدا کەسم نەدیوە بەهەیبەت‌تر لە سائیغی دینەوەری». وەک جامی دەڵێ، دینەوەری بەجێ‌هێشتووە و لە میسر دانشتوە و هەر لەوێ ساڵی ٣٣٠ یان ٣٣١ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

*نفحات الانس*، عبدالرحمن جامی، تاران ١٣٣٧ ک. ھ .، ل١٦٢.

## ئەبووئیسحاق ئیبراھیمی قەرمسینی

ئەبووئیسحاق ئیبراھیم، کوڕی شەیبانی قەرمسینی (کرماشانی) لە مەشایخ و پارێزکارانی ڕۆژگاری خۆی بووە و لەگەڵ ئیبراھیمی خەواس (٢٩١ ک. م.) و ئەبووعەبدوڵلا مەغریبی، دۆست و ھاودەنگ بووە و لە فەرمانی قورئان و چاوبڕینە سوننەتی پێغەمبەر نەترازیوە و بەو بۆنەوە لە تەریقەتی خۆیدا بۆتە تاقانەی مەشایخ. شەوی کردۆتە سێ بەشەوە: بەشێکی نوێژی کردووە؛ بەشی تری قورئانی خوێندووە و بەشی سێھەم خەریکی نزا بووە و گریاوە. وتەیەکی ئەوە: «العارفُ من جَعَل قلبه لمولاه و جَسَده لخلقه».

**یانی**: عارف کەسێکە دڵی لەگەڵ خودای و لەشی لە ڕێی خزمەت بە بەندەی خودایە.

ئەبووئیسحاق ساڵی ٣٣٢ ک. م. بۆ دیداری پەروەرندەی چووە و دنیای بێ بەقای بەجێ ھێشتووە.

*طبقات شَعرانی*، ب ١، ل١٦٢. *نفحات الانس*، ل٢١٨.

## ئەبووبەکر حوسەینی ئەرمەوی

ئەبووبەکر حوسەین، کوڕی عەلی یەزدانیاری ئەرمەوی، لە ناودارانی سۆفیان و عارفانی شاری ورمێ (اُرومیّە) دێتە ئەژمار کە تەریقەتێکی تایبەتی ھەبووە و تاقمێک لە مەشایخی وەکوو شیبلی، حاشایان لێ کردووە و ئەویش بەرھەڵستی قسە و باسی دەستەیەک لە مەشایخی عیراقی بووە.

جامی لە «*نفحات الانس*»دا باسی دەکا و لە قسەکانی ئەمەی ھێناوە: «می‌بینید مرا کە سخن می گویم بر صوفیّە، واللە کە برایشان سخن نمی گویم مگر از جھت غیرت برایشان؛ کە اَسرار دل را بە غیر اھل آن گفتەاند و اگر نە ایشان سادات عالمند و بە محبّت ایشان تقرّب می‌جویم بە حق سُبحانە».

**واتا**: ئەگەر دەبینن ئەمن بەسەر سۆفیاندا دێمەوە و باسیان دەکەم، بە خودای بێجگە بۆ خێرخوازییان نەبێ بۆ ھیچی‌تر نییە؛ کە دەبینم نھێنی دڵ بە لای غەوارەوە دەدرکێنن. دەنا ئەوان گەورەی عالەمن و بە خۆشەویستی ئەوانەوە داوای نزیکبوونەوە لە خوای پاکی توانا دەکەم.

ئەبووبەکر حوسەین لە ساڵی ٣٣٣ ک. م. لە ورمێ کۆچی دوایی کردووە.

*طبقات‌الکبری*، چاپی میسر، ب١، ل١١٣. *دانشمندان آذربایجان*، تاران، ل٤٠١.

## ئەحمەدی مەروانی دینەوەری

ئەبووبەکر ئەحمەد، کوڕی مەروانی مالیکی دینەوەری، لە زانایانی حەدیسە کە ماوەیەک لە ئوسوانی میسر

پلەی دادوەری بووە و دواجار لە قاهیرەدا (ساڵی ٣٣٣)[١] کۆچی دوایی کردووە.

*الأعلام*، ب١، ل٢٤١.

## ئەبولعەباس ئەحمەدی دینەوەری

لــە مەشــایخی پایەبــەرز و پارســایانی نــاوداری ڕۆژگــار بــووە و ماوەیــەکی زۆر خزمــەت و هــاودەنگی گەورەپیاوانێکی وەکوو یۆسف کوڕی حوسەین، عەبدوڵڵای «ابـن‌الخـرّاز»، ئـەبوو موحەممـەدی جـەریری و ئەبولعەباس کوڕی عەتای کردووە، تا بە دەرەجـەی کـەماڵ گەیـشتووە. ئـەمجار لـە شـاری نەیـشابوور بـە مۆچیاری و ڕێنوێنی خەڵکەوە خەریک بووە و لە ئاخر و ئۆخری ژیاندا، بۆ سـەمەرقەند چـووە و ساڵـی ٣٤٠ ک. م. هەر لەوێ کۆچی یەکجاری کردووە.

ئەبولعەباس ئەحمەد کوڕی موحەممـەدی دینـەوەری چەنـد کتێـب و نووسراوەشـی هـەبووە؛ یـەکیان کتێبێکە بە ناوی«*القناعة*».

*طبقات‌الکبری*، چاپی میسر، ب١، ل١٢١. *نفحات الانـس*، چـــاپی تـــاران، ل١٤٤. *کـــشف‌الظنـــون*، ب٢، ل٢٩٥.

## شێخ ئەحمەد، ئەسوەدی دینەوەری

پارسایەکی پایەبەرز و عارفێکی ناوازە و پێشەنگی ڕێبازی سوورەبەردی (سُهرَوَردیّە) و مرید و موجازی شـێخ مەمشادی دینەوەری بووە کە لە سەرەتای چەرخی چوارەمدا ژیاوە.

*مناقب احمدیّه*، چاپی سنه، ١٣٢٣ ک. ه، ل٢٦٧.

## ئەبووعەلی ئەحمەد، دەقاقی کوردی

کوڕی موحەممەد، کوڕی بەنان، لە ڕاویانی حەدیسە کە ساڵی ٣٠١ ک. م. لە سەر دنیا بووە.

*تاریخ بغداد*، ب٤، ل٤٠٠.

## ئەبووبەکر داودی دینەوەری

یەک لە ئەولیایانی گەورەی کـوردە کـە بـۆ شـام چـووە و لـەوێ ژیـاوە و لەگـەڵ ئەبووبـەکری ڕەقـاقی و ئەبووعەبدوڵڵای جەلائدا دۆستی و هاودەنگی بووە. چاوی لە دەستی کەس نەبـڕیوە و لـە بەرهـەمی کـار و

١. لە «*کشف‌الظّنون*» چاپی تاران، ب ٣، ل ١٥١٩، ساڵی مردنی ٣١٠ و لە «*هدیّة‌العارفین*» ب١، ل٥٥، ساڵـی ٣٩٢ (دوای ٨٤ ساڵ ژیان) نووسراوە.

ماندووبوونی خۆی بەڕێوەچووە.

واتەی ئەبووبەکرە کە مەولانا جامی لە «*نفحات‌الأُنس*»دا هێناویە: «معده محل طعام است؛ اگر حلال در وی افکنی، قوّت طاعت یابی و اگر به شبهت بود، راه حق پوشیده کند و اگر حرام بود، از آن معصیت زاید». هەروەها: «ترک معصیت انسان را اولی است از عبادت؛ چه ترک معصیت خود سبب توفیق است و سبکباری و دور نیست که عبادت به ریا کشد و آن خود معصیتی است بزرگ».

**واتا**: گەدە جێی خواردنە؛ ئەگەر حەلاڵی تێ بکەی، هێزی فەرمانبەریت دەس‌دەکەوێ و ئەگەر جێی گومان بێ، ڕێگەی سەرڕاست دادەپۆشێ و کە حەرام بێ، سووچی لێ بەرهەم دێ.

دەس لە تاوان کێشان بۆمرۆ باشترە تا بەندایەتی؛ لەبەر ئەوەی ئەو بۆخۆی هۆی سەرکەوتنە و بارسووکی؛ بەڵام ئەم، دوور نییە مەرایی لێ شین ببێ کە بۆخۆی تاوانێکی گەورەیە.

یەکێ پێی گوت: بەنیازم لە سووچێک دانیشم و پارێزکاری بکەم. ئەبووبەکر جوابی داوە: واز لە سووچ بێنە، کە بۆخۆی پارێزکارییەکی گەورەیە.

ئەبووبەکری دینەوەری دەوری سەد ساڵ ژیاوە و تا ماوەیەک پاش ساڵی ٣٥٠ ک. م. ماوە .

*نفحات الانس*، ل ٢٠٠. *طبقات‌الکبری*، ب١، ل١١٩.

## ئەبووعەلی ئیسماعیل، قالی مەلازگردی

ئەبووعەلی ئیسماعیل کوڕی قاسم، لە ویژەوانانی چەرخی چوارەمی کۆچییە کە ساڵی ٢٨٨ ک. م. لە ناوچەی مەلازگردی سەر بە دیاربەکر لە دایک بووە و ٣٥٦ لە دنیا دەرچووە. حەدیسی لە مووسڵ، لای ئەبوویەعلاوە خوێندووە و پاشان بۆ بەغدا چووە (٣٠٥) و لەوێ تا ساڵی ٣٢٨ لە خزمەت مامۆستایانی فیقهـ و ئوسوول و وێژەوە خوێندوویە و ئەمجار کەتۆتە گەڕان و ساڵی ٣٣٠ گەیشتۆتە قەرتەبە و لە خوێندنگەیەکی ئەو وڵاتەدا، بۆ دەرس‌گوتنەوە، دامەزراوە.

**کتێبەکانی**: «*کتاب‌البارع*»، «*کتاب الأمالی*»، «*کتاب‌المقصور و الممدود*»، «*کتاب فَعَلتَ و اَفعَلتَ*»، «*کتاب فی‌الابِل و نتاجها*»، «*کتاب مقاتل‌الفرسان*»، «*شرح‌القصائد*» و «*المعَلّقات*».

نازناوی ئەبووعەلی بەو بۆنەوە بە «قالی» دەرچووە کە لە بەغدا زۆرتر هاتوچۆی بازرگانان و ڕێبوارانی خەڵکی قالیقلای[1] کردووە.

*وَفَیاتُ الأعیان*، ب١، ل٧٤. *لُغت‌نامەی دهخدا*، چاپی ١٣٢٥، پیتی الف، ل٦٧٩.

١. «**قالیقلا**» ناوچەیەکی سەر بە دیاربەکر بووە. لە برێ کتێبی مێژوو، وەک شەرەفنامەدا، «**قلیقیلیا**» نووسراوە.

## ئیبنوسوننی دینەوەری

ئەبووبەکر ئەحمەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئیسحاقی دینەوەری، ناسراو بە «ابنُ‌السّنّی»، لە حەدیس‌زانان و زانایانی ناوداری ئەخباری بووە کە ساڵی ٣٦٤ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**کتێبەکانی**: *«الا یجاز فی الحدیث»، «کتاب القناعه، عَمَل الیوم و اللیله».*

*لُغت‌نامەی دهخدا*، چاپی ١٣٢٥، پیتی الف، ل١٢٧٢. *هدیة‌العارفین*، ب١، ل٦٦.

## ئەبولحەسەن عەلی قەرمەسینی

ئەبولحەسەن عەلی کوڕی هاروون، کوڕی نەسری قەرمسینی (کرماشانی) نەحوی، لە شاگردی عەلی کوڕی سلێمانی ئەحفەش و مامۆستای عەبدوسەلامی بەسری بووە.

ئەبولحەسەن ساڵی ٢٩٠ ک. م. لە دایک بووە و ٣٧١ لە دنیا دەرچووە.

*مُعجَم‌البُلدان*، ب١٥، ل١١١.

## عەلی بەدیهی شارەزووری

عەلی بەدیهی کوڕی موحەممەد، ناسناو ئەبولحەسەن، شاعیرێکی خەڵکی شارەزوور بووە کە لە بەغدا ژیاوە و بەو بۆنەوە کە زۆر وریا و لەسەرباد بووە و قەت بۆ شیعر دانەماوە، «بەدیهی»یان پێ گوتووە.

بەدیهی لەگەڵ ساحیب کوڕی عیباد دۆستایەتی بووە و شیعرێکی پێدا گوتووە. ئەم بەیتە مەشهوورەش هی ئەوە:

أتَمنّی علی‌الزّمان مَحالا　　　أن تَری مقُلتایَ طلعه حُرّ

**واتا**: ئەگەر لە ڕۆژگار داوا بکەم کە چاوم بە دیتنی سەر و سیمای جوامێرێک بگەشێتەوە، داوایەکی نەشیاوم کردووە!

*الأعلام*، ب٥، ل١٤٣.

## ئەبووبەکر موحەممەد بورهانی دینەوەری

موحەممەدی دینەوەری، کوڕی عەلی، کوڕی حەسەن، کوڕی عەلی، ناسناو «ئەبووبەکر»ی ناسراو بە «بورهان»، لە زانایانی گەورەی حەدیس‌زان بووە کە ساڵی ٣٤٩ ک. م. بۆ بەغدا چووە تا ئاخری ژیانی لەوێ ماوەتەوە.

*تاریخ بغداد*، ب٣، ل٨٢.



## ئەبووعەبدوڵڵای بابوونی[1]

لە عارفانی چەرخی چوارەمی کۆچی بووە کە ڕستەی ناسراوی «امسَیتُ کُردیّاً وَ اصبَحتُ عَربیّاً»، وەپاڵ ئـەو دراوە. لەمەڕ ئەم عارفەوە وایان نووسیوە کە دەرسێکی نەخوێندووە و عەرەبی نەزانیوە و وەک دەڵێن ئـۆمی بووە؛ بەڵام بەبۆنەی ڕیازەت و خۆپارێزی و پارێزگاری زۆرەوە، بەرچاوی ڕوون بۆتەوە و کەشـف و کەرامـەتی لێوە دەرکەوتووە؛ تا ئەو ڕادە کە خوازیارانی زانست و تامەزرۆیانی عیرفان، لە هەموو لایەکەوە بۆ تێگەیـشتن و پێگەییشتن، ڕوویان تێکردووە.

لە واتەکانی: «هر که عافیت خواهد گو میانەرو باش!» و «ترقی مُرید در تمکین است و ترقی مُرشد در تَعَیُّن و تَعیین» و «به سه چیز مرد آسایش دنیا و آخرت می‌یابد: اوّل نجُستن عیـب دیگـران، دوم دلجـویی از دوسـتان و سوم رافت با محرمان و خویشان».

**واتا:** «ئەوی خوازیاری ساغییە، با میانەڕۆ بێ» و «سـەرکەوتنی مریـد، بـە سـەردانەواندن و بەرزبوونـەوەی مورشید، بە شان و شاندانە» و «بە سێ شت پیاو لە دنیا و دواڕۆژدا دەحەسێتەوە: یەکەم نەچوون لە شـوێنی شوورەیی دیتران؛ دووهەم دڵدانەوەی دۆستان و سێهەم دلۆڤانی لەگەڵ مەحرەمان و خزمان.

ئەبووعەبدوڵڵا بابوونی ئاخر و ئۆخری چەرخی چوارەم لە شیراز ئەمری خوای بەجێ هێناوە.

*نَفَحاتُ‌الانس*، چاپی ١٣٣٧ تاران، ل ٣٢٠.

## ئەبوومحەممەد جەعفەری دینەوەری

ئەبوومحەممەد جەعفەر، کوڕی هاروون، کوڕی ئیبراهیم، زانایەکی بەناوبانگی نەحو بووە کە ئیبنوشازان لـە ٣٤٤ ک. م. دا، لێی ڕەوایەتی کردووە.

*مُعجَم‌الادبا*، ب٧، ل٢٠٥.

## ئەبووعەبدوڵڵا موحەممەدی دینەوەری

کوڕی عەبدولخالەقی دینەوەری، لە گەورە عارفان و پارێزگارانی چەرخی چوارەمە کـە خاوەنـانی «*طبقات*» وایان لە بارەوە نووسیوە: «هوَ من اجَل‌المشایخ و اکبرهم حالاً و افصحِهم فی علوم هذه‌الطّائفه».

ئەبووعەبدوڵڵا لە دینەوەر چاوی هەڵێناوە و پاشان بە شـوێن دەرس و تەریقەتـدا، ڕێگـای زۆری بـڕیوە و شوێنانی زۆری دیوە و دواجار گەڕاوەتەوە دینەوەر و هەر لەوێ لە نێوان ساڵانی ٣٧٠ و ٣٨٠ ک. م. ئـەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

---

١. **بابوون** گوندێک بووە لە دەوروبەری بەغدا.

له قسه‌کانی: «صُحبت خُردان با بزرگان، ازجمله‌ی توفیق‌الله است مَر خُـردان را و از بزرگـی ایـشان اسـت و رغبت بزرگان به صحبت خُردان، علامت خِذلان بزرگان و حماقت و بی‌خردی ایشان است».

**واتا**: هاوقسه‌یی بچووک له‌گه‌ڵ گه‌وره‌دا به‌شێکی خوداییه بۆ بچووک و له مه‌زنی وییه؛ به‌ڵام وازی گه‌وره بۆ هاوده‌نگی پچووک، نیشانه‌ی سووکی و چرووکی و ئاوه‌زبه‌تاڵی ئه‌وه.

*طبقات شعرانی*، چاپی میسر، ب١، ل١٢٥.

## حوسه‌ینی بوشنه‌وی

شاعیرێکی کوردی هۆزی بوشنه‌وییه که له ده‌رباری باز ئه‌بووشوجاعی مه‌روانی (کوژراو لـه ساڵـی ٣٨٠ ک. م.)دا بووه. ئیبنوئه‌سیر له مێژووه‌که‌یدا، وای له باره‌وه نووسیوه: کاتێ کـه ئـه‌بووتاهیر و حوسـه‌ین، کـوڕانی حه‌مدان به‌سه‌ر مووسڵدا زاڵ بوون، باز ئه‌بووشوجاع ـ سه‌رۆکی خانه‌دانی کوردی به‌نی‌مه‌روان ـ که‌وته ته‌مای ئه‌وێ و له‌شکرێک له شه‌ڕڤانانی کوردی پێک هێنا که پیاوانێ له هۆزی کوردی بوشنه‌وییه‌شی تێـدا بـوون. حوسه‌ینی بوشنه‌وی شاعیری به‌نی مه‌روان ـ کـه ڕه‌گه‌ڵـیان بـووه ــ له‌مـه‌ڕ ئـه‌م شـه‌ڕه‌وه قه‌سـیده‌یه‌کی هۆنیوه‌ته‌وه و هۆزی خۆی به پشتیوانی باز ئه‌بووشوجاع ناو لێ بردووه؛ که ئه‌وا سێ به‌یتی:

| | |
|---|---|
| البُشنَویّه أنصارٌ لِدَولتِکُم | وَلَیسَ فی ذاخفاً فیالعُجم و العَرَب |
| انصارُ باز بارجیش و شیعته | بظاهرالحَلَب الحدباء فی العَطب |
| بباجَلایا جَلَونا عنه غمغمةً | وَنَحنُ فی الرَّوع جلاّونَ للکُرب |

**واتا**: هۆزی بوشنه‌وی پشتیوانی ده‌وڵه‌تی ئێوه‌یه و ئه‌م ڕاسـتییه لـه عـه‌ره‌ب و عه‌جـه‌م ڕوونـه. یـاران و هاوڕێیانی باز، وان له ئه‌رجیشدا و هێزی ئه‌و له ده‌ره‌وه‌ی شاری حه‌له‌ب خـه‌ریکی قه‌ڵـتوبـڕن. ئێمـه لـه باجلایادا به پشتگری له باز، باش به‌شه‌ڕهاتین و گاڵه‌مان کرد. ئێمه‌ین که له جه‌نگه‌ی پێکـدادان و تـرس و دڵه‌ڕاوکێدا، ئاوری شه‌ڕ داده‌مرکێنین و ئاژاوه دوایی پێ دێنین.

*کامل ابن‌اثیر*، چاپی میسر، ب٩، ل٢٩.

## ئیبنوومیهرانی دینه‌وه‌ری

ئه‌بووبه‌کر ئه‌حمه‌د، کوڕی حوسه‌ین، کوڕی میهرانی دینه‌وه‌ری مالیکی، ناسراو به میهران، پیاوێکی پارێزگـار و له خواترس و له مامۆستایانی قه‌رائه‌ت و ته‌جوید و وه‌ک ده‌ڵێن «مُقری» بووه و ساڵی ٣٨١ ک. م. کـۆچی دوایی کردووه.

**له کتێبه‌کانی**: *«الشّامل فی‌القرآت»، «الغایة فی‌القرآت و کتابُ سجودِالقرآن»*.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٦٧.

## ئەبوونەسر ئەحمەدی فەلاس

کوڕی موحەممەدی کوردی، زانایەکی حەدیس‌زانە کە لە بەغدا دانیشتووە و ساڵی ٣٢١ ک. م. زیندوو بووە.
*تاریخ بغداد*، ب٥، ل٨٣.

## ئەبولحەسەن عەلی لەوکەری

«لەوکەر» گوندێکە لە ئەفغانستان. لەو ڕۆژگارەدا ڕۆژهەڵاتی ئێران (ئەفغانستان و خوراسان و سیستان) هۆز و بەرەی کوردی زۆر لێ بوون. لە «*تاریخ سیستان*» لاپەڕەی ٢١٨، لە ژێر سەردێڕی هانابردنی عەبدوڕڕەحیمی خاریجی بۆ یەعقوب لەیسی سەففاری، دەڵێ: «یەعقووب حوکمی دایە و میرایەتی ئەسفەراز[١] و بیاوانان و کوردانی پێ ئەسپارد.»

یەک لە پێشووترین شاعیرانی کوردی فارسی‌بێژی دوای بەسسام ـ کە باسی کراـ ئەبولحەسەنی عەلی، کوڕی موحەممەدی غەزوانی لەوکەرییە کە هەزار ساڵ لەوەپێش، لە سەردەمی سامانییاندا ژیاوە.

لەوکەری، شناسی ئەبولحەسەن عوبەیدوڵڵا، کوڕی ئەحمەدی عەتەبی، وەزیری سامانیان بووە و بەو بۆنەوە ئابادی لەوکەری بەجێ‌هێشتووە و بۆ بوخارا، پاتەختی سامانیان چووە. پاش ماوەیەک هەوای نیشتمان لە سەری داوە و خۆی پێ نەگیراوە و گەڕاوەتەوە لەوکەر و لەوێ بۆ پاسای کارەکەی، قەسیدەیەکی داناوە و ناردوویەتە خزمەتی وەزیر؛ کە چەند بەیتی ئەمەیە:

عبیدالله بن احمد وزیر شاه سامانی همی تابد شعاع داد از آن پُر نور پیشانی
به صورت آدمی آمد، به معنی نور سُبحانی خدایا چشم بدخواهم، کَزان صورت بگردانی
بُخارا خوشتر از لوکر خداوندا همیدانی ولیکن کُرد نشکیبد از دوغ بیابانی

عەوفی لە ژیننامەی «*لُباب الالباب*»دا، لەمەڕ لەوکەری و شیعری وییەوە ئاوا دەڵێ:

«ابوالحسن... از فضلا بوده است و ازمقبولان شُعرا و شعرش را طعم شهد و طیب مُشک و طراوت گُل و لطافت نسیم است. قصیده‌ای می گوید در مدح امیر رضی ابوالقاسم نوح، بن منصور، بن نوح سامانی (٣۶۵–٣٨٢) که ابیات زیر از آن قصیده است:

**واتا**: ئەبولحەسەن... لە هێژایان و شاعیرە باشەکانە کە شیعری تامی هەنگوین و بەرامەی میسک و نەرم و ناسکی گوڵ و خۆش و گەشی شنەبای هەیە. قەسیدەیەکی بە باڵای ئەمیر ڕەزی (ئەبولقاسم) نۆح، کوڕی مەنسوور، کوڕی نۆحی سامانی(٣٦٥–٣٨٢)دا گوتووە کە ئەوا چەند بەیتی:

نگار من آن گُرد گوهر پسر که زَین است و حُسن از قَدَم تا به سَر

١. «**ئەسفەراز**» یان «**سفراز**» شارێ بووە لە سیستان، لای هەرات.

ز عنبـــــر زره دارد او بـــــر سَـــــمَن  ز ســــنبل گـــــره دارد او بـــــر قمـــــر
چـــو برداشـــت جَـــوزا کمر گـــه مگـــر  بجـــست و بیـــست از فلاخـــن کمـــر
بـــرون بُـــرد از چـــشم ســـودای خـــواب  درآورد در دل هـــــــــوای ســـــــــفر
بـه ره کـرد عـزم آن بُـت خـوش‌خـرام  گـــره کـــرد بنـــد ســـر آن خـــوش سـَیر
بتاییـــد ســـخت و بپیچیـــد سُـــست  بـــه گـــرد کَمَر گـــاه دســـتار ســـر
شـــتابان بیامـــد ســـوی کوهـــسار  بـــه آهـــستگی کَـــرد هـــر ســـو نظـــر
بـــر آورد از آن وهـــم پیکـــر میـــان  یکـــــی زرد گویـــــای نـــــا جـــــانور
نـــه بلبـــل، ز بلبـــل بـــه دســـتان فـــزون  نـــه طـــوطی، ز طـــوطی ســـخنگوی‌تـــر
چـــو دوشـــیزگان زیـــر پـــرده نهـــان  چـــو دوشـــیزه سُـــفته همـــه روی و بَـــر
بریـــده ســـر و پـــای او بـــی گنـــه  ز مالیـــــدنش شـــــادمانه پـــــسر
ز بُـــسَّد بـــه زَرّینـــه نَـــی در دمیـــد  بـــــه ارســـــال نَـــــی داد دم را گُـــــذر
بـــه رُخ بـــر زد آن زلـــف عنبرفـــروش  بـــه نَـــی بَـــر زد انگـــشت وقـــت سَـــحَر
هَمـــو گفـــت در نَـــی کـــه ای لـــوکری  غـــم خـــدمت شـــاه خـــوردی، مَخُـــور»

لُباب‌الالباب، عَوفی، ب٢. لُغت‌نامه‌ی دهخدا، چاپی ١٣٢٥، پیتی الف، ل٤١٢.

# چەرخی پێنجەم

## ئەبولقاسمی دینەوەری

قازی ئەبولقاسم، یۆسفی گەچی دینەوەری، کوڕی یۆسف، کوڕی ئەحمەد، زانایەکی ڕێبازی ئیمام شافیعی و خاوەنی زانستی باڵا و ئاکاری بەرز بووە و بە بۆنەی ئەوەوە، دینەوەر وەکوو ناوەندێکی زانست و زانیاری لێ هاتووە و مامۆستایان و قوتابیان، دەستە ـ دەستە لە دوور و نێزیکەوە، بۆ فێر بوون و فێرکردن، ڕوویان تێکردووە و کەسانی وەک: «ابن‌القطان» و «ابوالقاسم دارکی» و «ابوحامد مروزی» لە هاودەنگی و ئاموشۆی بەشدار بوون.

وەک نووسراوە: کاتێ کە ئەبووعەلی حوسەین، کوڕی شوعەیبی سەنجی لە خزمەتی شێخ ئەبووحامیدی ئەسفەراینی گەڕاوەتەوە، لە دینەوەر چاوی بە قازی ئەبولقاسم کەوتووە و بە دەریای بێ‌بنی زانست و پیتۆڵی ئەوی زانیوە، گوتوویە: مامۆستا! زانیاری زۆر و زەبەند لای تۆیە و ناو و ناوبانگ هی شێخ ئەبووحامیدە!

قازی جوابی داوەتەوە: ئەو بەغدا ناوی بەرز کردۆتەوە و ئەمن دینەوەر ئاوا کەس‌نەناس هێشتوومیەتەوە.

قازی کتێب و نووسراوەشی زۆر بوون؛ یەکیان کتێبی «تجرید»ە لە فیقهدا و هەروەها بێجگە لە دەرس‌گوتنەوە، ماوەیەکیش لە دینەوەر دادوەری کردووە. بەوبۆنەشەوە ئاوەڵناوی «گەچی» هەبووە کە باپیری گەچکار یان گێچفرۆش بووە.

ئەم مامۆستایە سەرەنجام لە ٢٧ی ڕەمەزانی ساڵی ٤٠٥ ک. م. لە دینەوەر بە دەستی چەند کەسێک لە «مَلاحده» شهید کراوە.

*وفیات‌الأعیان*، ابن‌خلکان، ب٢، ل٣٤٨. *الأعلام*، ب٩، ل٢٨٤.

## ئەبوعەلی حەسەنی گۆرانی

قازی ئەبووعەلی حەسەن، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئیبراهیمی گۆرانی، مامۆستایەکی سەردەرچوو لە فیقه و ئوسوول و دۆستی شێخ ئەبووحامیدی ئەسفەراینی بووە و بە پارێزکاری و ترس لە خودا و هەروەها



هزر و بیری زۆر بەقەوەت، ناوبانگی دەرکردووە. زۆر ساڵان لە شاری ئەهواز نیشتەجێ بووە و لـە سـەرەتای چەرخی پێنجەمدا ژیاوە.

*طبقات*، ابواسحق شیرازی، چاپی بەغدا، ل١٠٩.

## ئەبووسەعدی دینەوەری

ئەبووسەعدی نەسر، کوڕی یەعقووبی بەغدادی، پیاوێکی وێژەوان و سەردەرچوو لە لێکدانەوەی خەونان بووە و دەور و بەری ساڵی ٤١٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.[١]

ئەبووسەعد لە کەڵەپیاوانی ڕۆژگاری خۆی بووە؛ ماوەیـەک لـە شـاری نەیـشابوور لـە دەربـاری سوڵـتان «یمین‌الدّولە» مەحموودی سـەبوکتەکین(٣٣٧–٤٢١) ژیـاوە و دانی مووچـەی دیـوانی و حەواڵـە و دیـاری سوڵتانی لە ئەستۆ گرتووە و دەگەڵ ئەوەشدا دەفتەر و نقیسیاریی دیوانی بەڕێوە بـردووە و تـەنیا ئـەو جـێ متمانەی سوڵتان بووە نامە بۆ خەلیفەی بەغدا، «القادرُبالله» (٣٨٩–٤٢٢) بنووسێ.

**هێندێک لـە نووسـراوەکانی**: «*ثمـار الانس فـی تـشبیهات الفُـرس*»، «*روائـع التّوجیهـات فـی بـدائع التّـشبیهات و تعبیر القادری*».

*الأعلام*، ب٨، ل٣٥٢. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٤٩٠.

## ئەبووبەکر موحەممەد موقری دینەوەری

ئەبووبەکر موحەممەد، کوڕی موزەففەر، کوڕی عـەلی دینـەوەری، لـە مامۆسـتایانی قەرائـەت و تەفـسیر و حەدیس بووە کە لە ساڵی ٤١٥ ک. م. لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

*تاریخ بغداد*، ب٣، ل٢٦٥.

## عەلی تەرمووکی[٢]

لە مامۆستایانی وێژەی کوردی بووە کە خزمەتی زۆری بە زبانی کوردی کردووە. شیعری چاکیشی گوتـووە و بەپێی گوتەی مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە *مێژووی ئەدەبی کورد*، لە چەرخی دە و یـازدەی زایـینی، بەرامبەر بە چەرخی پێنجەمی کۆچی‌ـمانگیدا ژیاوە.

وەک توێژەری کورد، مامۆستا ئەمین زەکی‌بەگ دەڵێ، تـەرمووکی کتێبێکـی لـە بابـەت ڕێزمـانی کوردیـوە

---

١. لە «*هدیةالعارفین*»دا ساڵی مردنی ئەبووسەعدی دینەوەری ٣٩٧ ک. م. نووسراوە.

٢. «**تە رمووک**» گوندێکە لە نێوان هەکاری و ماکۆدا و تەرمووکی خێڵێکی ناسراون لە خێڵاتی دەور و بەری هەکاری.

نووسیوە و بۆ ئەم کارەی پێشتر بــە زۆر ناوچــە و مەڵــبەندی کوردســتاندا گــەڕاوە و گــوێی لــە زۆرێــک زاراوە و بنزاراوەی کوردەواری گرتووە. دواجار بیرەوەرییەکانی خۆی لەو سەفەرانە نووسیوە و کتێبێکی لێ بەرهەم هێناوە.

کامران عالی بەدرخان، زانای بەناوبانگی کورد، بە هاوکاری لویس بول مارگریتی فەڕانسی کتێبێکی لەمەڕ پەند و قسەی نەستەقی کوردیوە نووسیوە و ساڵی ١٩٧٣ ز. لە پاریس لــەچــاپیداوە. لــەو کتێبــەدا، چەنــد جاران شیعری عەلی تەرمووکی وەکوو شایەت هێناوەتەوە.

*خلاصةالکُرد و الکُردستان*، ل٣٥٤. *مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٧٩.

## ئەبووعەلی حەسەنی بندەنیجی

ئەبووعەلی حەسەن، کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی یەحیا، لە زانایانی کوردی بندەنیجی (مەندەلی ئێستا)یــە کــە پێشتر لە بەغدا بووە و کاری فتوا و دادوەری کردووە؛ بەڵام پاشان گەڕاوەتــەوە زێــدی خــۆی و هــەر لــەوێ ئەمری خوای بەجێهێناوە.

*الأعلام*، ب٢، ل٢١٢.

## ئەبوومحەمەد عەبدوڵلای زۆزانی[1]

ئەبوومحەممەد عەبدوڵلا، کوڕی موحەممەد، کوڕی یۆسف، خەڵکی زۆزان، وێژەوانێکی پیتۆڵ و شاعیرێکی وردبین بووە کە لە سەرپلبێژی و بۆ قسە دانەماویــدا ناوبــانگی دەرکــردووە؛ وڵاتی زۆر گــەڕاوە و گەیــشتۆتە خوراسان و هاوڕێیی و هاودەنگی میرێکی ئەوێی دەس‌کەوتووە و لــە ئاکامــدا ساڵــی ٤٣١ ک. م. ڕووی لــە شاری خامۆشان ناوە.

ئەم چەند بەیتە شیعری ئەون:

لَمّــا رَأیــتُ الزّمــانَ نکــسا وَلَـیس فـی الـصّحْبَة انتفـاعُ
کــلُ رئــیس بــه مَــلال وَ کُــلُّ رَأس بــه صُــداعُ
وَ کُــلُّ نَــذْل لَــه ارتفــاعٌ وَ کُــلُّ حُــرّ بــه اتّــضاعُ
لَزمتُ بیتی وَصُنْتُ عرْضاً بــه عَــن الــذِّلّــة امْتنــاعُ
أشْرَبُ ممّا ادَّخَرْتُ راحاً لَهــا عَلــی راحَتــی شُــعاعُ
لــی مــنْ قَواریرهــا نَــدامی وَ مــنْ قَراقیرهــا سَــماعُ
وَ أجْتَنــی مــن ثمــار قَــوْم قَــدْ أقْفَــرَتْ مــنْهُم البقــاعُ

---

١. «**زۆزان**» گوندێکی سەر بە شارۆچکەی زاخۆیە.

**واتا**: کاتێ کە دیتم کاری زەمانە پێچەوانەیە و هاودەنگی خەڵک بێ کەڵکە و ئـەوی  مـیر و خانـە، بـاری گرانە و هەموو سەرێ تووشیاری دەردێکـە و ئـەوی لارە، سـوارە و کـێ جـوامێرە، لـە ژێـرە، گردەنـشینیم هەڵبژارد و خۆم لە پەستی و بێئابڕوویی بوارد و شەرافتم پاراست. هەرچی لەو هەموو ساڵەدا لـە زانـست و ئەدەب کۆم کردووتەوە، وەکوو شەرابێکی بێخەوشە کە دەینۆشم و هەست بە هێمنی دەکـەم. ئـەو جامـە شەرابانە ئاودەنگیلەی منن و دەنگی لێک کەوتنیان بەستە و گۆرانیمە. من ئێستاکە لەتەچنی خەرمانی ئـەو زانایانەم وا بەجێیان هێشتوین.

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٤٩.

## ئەبوونەسر ئەحمەدی دینەوەری

شێخ ئەبوونەسر ئەحمەد، کوڕی حوسەینی دینەوەری ناسراو بە «کسار مُقری»، لـە مامۆسـتایانی قـەرائات و تەفسیر بووە کە ساڵی ٤٣٣ ک. م. لە دنیا چووە. هێندێک کتێبی نووسیوە کە یەکیان ماوەتەوە بـە نـاوی: «*المُنَبه فی القرائات*».

*کشف الظُنون*، چاپی ئوفسێتی تاران، ب٢، ل١٨٨٦.

## ئەبوونەسر ئەحمەدی سەلیکی

ئەبوونەسر ئەحمەد، کوڕی یۆسـفی سـەلیکی مـەلازکوردی، زانـا، نووسـەر، شـاعیر و وەزیـری ئەبوونەسـر ئەحمەد، کوڕی مەروان، حاکمی دیاربەکر و میافارقینە. لەگەڵ ئەبولعەلا مەعەڕڕیدا قـسە و بـاس و گێـرە و کێشەی سەیریان بووە کە لە مێژووی ئیبنوخەلیکاندا هاتووە.

ئەبوونەسر کتێبێکی زۆری کۆ کردۆتەوە کە دواجار هەمووی بەخشیوەتە کتێبخانەی جامیعی میافـارقین. دیوانی شیعرێکیشی هەبووە و ساڵی ٤٣٧ ک. م. لە دنیا چووە.

*لُغت نامەی دهخدا*، چاپی ١٣٢٥، پیتی الف، ل٨٩٤ و ٩١١.

## ئەبووبەکری دینەوەری

ئەبووبەکر موحەممەدی قاری، کوڕی عەلی، کوڕی ئیـبراهیم، زانایـەک لـە ڕاویـانی حـەدیس و شـارەزای قەرائات و مرۆیەکی پارێزکار و لە خودا ترس بووە کە ساڵی ٣٧٣ ک. م. هاتۆتە دنیاوە و ٤٤٩ ئەمری خـوای بەجێ هێناوە و لە شاری بەغدا نێژراوە.

*تاریخ بغداد*، ب٣، ل١٠٦.

## باباتاهیری عوریان[١]

باباتاهیری هەمەدانی، شاعیر و عارفێکی ڕەببانی بووە کە دەستی لە دنیا بەرداوە و تەکی بە لای خواوە داوە و ئەگەرچی لە بارەی خۆی و چۆناوچۆنی ژیانییەوە شتێکی دانەناوە، بەڵام لە برێ کتـێبی سـۆفیاندا باسـی کراوە و لەمەڕ پلە وپایەی بەرزی خواناسی و پارێزگاری و دەروێشییەوە، بابەتی جۆراوجۆر نووسراوە.[٢]

نازناوی باباتاهیر بەو بۆنەوە بۆتە «عوریان»ە کە زۆر بە دنیا بێمبـالات بـووە و قـەت بـەرگی تـازەی لەبـەر نەکردووە و بە شڕەباری گەڕاوە و بە سەڵتی ژیاوە. گیرۆدەییەکی لەڕادەبەدەری بە کێوی ئەڵوەن بووە و زۆر ڕۆژان لە لووتکەی بەرزی ئەوکێوە بە ڕاز و نیازی ڕابواردووە و زۆر شەوان لە پاڵداوێنیدا، بەدەم نـزاوە خـەوی لێ کەوتووە.

باباتاهیر لە شاعیرانی خاوەندڵی سۆفیانە کە ئەزموونی جۆراوجۆری دەروونی خۆی بە زمانێکی هاسان و جوان و ئاهەنگێکی دڵبزوێن و ڕەوان دەربڕیوە و ئەو مانـا بەرزانـەی لـە توێکـڵێکی سـاکاری دەروێـشانەدا جێ کردۆتەوە و لە سروشت دوور نەکەوتووتەوە. زوربەی شیعرەکانی باسی خۆر و مانگ و کێـو و دەشـت و باخ و بێستان و گوڵ و دیمەنی سروشتییە؛ وەک دەڵێ:

گلـــی کـــشتم پـــی اَلونـــد دامـــان اوَش از دیـــده دادم صـــبح و شـــامان

بــه وقــت آن کــه بــویش وامــو آیــو بَــرَه بــادش، بَــرَه ســامان بــه ســامان

**یـانی**: لە داوێنی ئەلوەن گوڵێکم کێڵا. بەیانی و شەو بە فرمێسکم ئاوم دا. ئەو کاتە دەبێ بەرامەی بۆ مـن بێ؛ با هەڵدەکا و ئاقار بە ئاقار دەیبا.

قسەی بابا وا بە دڵی هاوزمانانییەوە نیشتووە کە زۆرێک لە شاعیرانی کورد و لوڕ، چاویان لێ بـڕیوە و بـەو بۆنەوە لە نێو خێڵاتی عەشایردا دووبەیتییەکی زۆر بەدی هاتووە.

خوا لێخۆشبوو مامۆستا ڕەشید یاسەمی، پێشەکییەکی تێر و تەسەل و تەڕ و پاراوی بـۆ کتـێبی «*دیـوان باباطاهر*» نووسیوە؛ وا لێرەدا کورتەیەکی چاولێدەکەین:

«باباتاهیر شاعیرێکی نەناسراوە کە ئاهەنگی ئـەوینی خـاوێنتـر و دڵـگرتر لـە پێـشینیانی هۆنیوەتـەوە و

---

١. «**عوریان**» واتا ڕووت و ڕەجاڵ.

٢. کەشف و کەرامەتی سەیر و سەمەرەیان لێ گێڕاوەتەوە؛ دەڵێن: لە سەرەتاوە کابرایەکی ساویلکەی بێسـەواد بـووە. ئەگەر فەقێ و قوتابی بینیوە خەریکی دەرس و دەورن، لێیانی پرسیوە دەبێ چ بکا فێـری خوێنـدن و نووسـین ببـێ؟ فەقێیان کە بە حاڵ و باڵیان زانیوە، گوتوویانە ئەگەر بتوانی ئەو بەستەڵەکە بشکێنی و بچیە نێـو حـەوزەکـەوە، تـەواوە! بابایش بڕوای کردووە و شەو درنگانێک یەخی حەوزی شکاندووە و خۆی تێ خـستووە؛ کـە هاتۆتـە دەرەوە، بـەرچاوی کراوەتەوە و دیویە سەوادی هەیە و بە خۆشییەوە سەڵای داوە: «اَمسَیتُ کُردیّاً و اَصبَحتُ عَرَبیّاً».

ئەڵبەت ئەم ڕستە بۆ حوسامەدینی چەلەبی و ئەبووعەبدوڵڵای بابوونی و بابا ئەفزەلی کاشانیش گوتراوە.

ترووسکەیەکی لە باسی ئەویندا داخستووە کە کەڵەشاعیرانی چەرخی شەش و حەوت، زۆر خەرمانیان پێ هەڵگیرساندووە و دنیایەکیان پێ سووتاندووە. ئەورۆ کەسێ کە سەنایی و حافیز و ... دەبینێ کە هۆی شانازی زمان و وێژەن، بە بیریدا نایە کە بۆ سەرهەڵدانی ئەو شکۆ و جوانییە، چ کەسانێک پێش‌تر ڕەنجیان داوە و ژێرپا بوون؛ کەچی ناوێکیشیان لێ بەجێ نەماوە. کە وابوو ئاسایییە شیعری لە ئەژمار بەدەر و بێ هاوتای وەکی باباتاهیر، دانەدانەیەک نەبێ، نەمێنێتەوە و تەنانەت لەو تاقمە زۆر و زەبەندە، بێجگە ڕووت و ڕەجاڵی هەمەدان [بابا تاهیر]، کەسمان بە بیردا نەیە... کێشی دووبەیتی، ناسکی و دڵبزوێنی شیعری بابای زۆرتر کردۆتەوە. خاوەنی کتێبی *«المُعجَم فی مَعاییر اَشعار العَجَم»*، کە لە سەرەتای چەرخی حەوتەمدا ژیاوە، چەند جێ سەبارەت بە کێشی جۆراوجۆری ئەم شێوە شیعرانە (فَهلَویّات) باسی عەرووزی کردووە و سەرەنجام کێشی /مەفاعیلون، مەفاعیلون، مەفاعیل (هَزَج مُسَدّس مَحزوف)/ی خۆشترین کێش بۆ ئەم شێوە شیعرانە زانیوە کە ئاهەنگ‌ناسان «ئەورامەنان»یان پێ گوتووە... شاعیرانی فارسی زبانیش جارو بارە خۆیان لەم شێوازە شیعرە داوە ـ وەکوو سەعدی و بنداری ڕازی و ئەبووئیسحاقی ئەتعەمە و کێ و کێ ـ بەڵام ئەوی بێژەرانی کورد و لوڕ دایانناوە، لەبارتر و بە دڵەوە نزیکترە. شیعری ئایینی و عیرغانی مەلا پەرێشانی لوڕ، مەولەوی کورد، غەزەلی سەید یەعقووبی مایدەشتی و شیعری مەلا موستەفای بێسارانی و نالی و مەحوی و فیکری و سەیدی وا بەسەر زارانەوەیە و ئاودەنگیلەی پیر و جوانە؛ بەڵام بەو حاڵەش دووبەیتی باباتاهیر پتر لە هەمووان بەرچاوە».

باباتاهیر لە شاعیرانی چەرخی پێنجەمی کۆچی و هاوچاخی توغرول‌بەگی یەکەم، پاتشای زنجیرەشایانی سەلجووقییە و ئەو دووە دەوری ساڵی ٤٤٧ ک. م. لە هەمەدان  چاوپێکەوتنێکیان بووە.

وادیارە هاتنە دنیای بابا لە بڕانەوەی چەرخی چوارەم و ناودەرکردنی لە نێوانی چەرخی پێنجەمدا بووبێ. بارەگای باباتاهیر کەوتۆتە لای ڕۆژاوای شاری هەمەدانەوە و مەزارێکی پیرۆز لای دڵ‌ئاگایانە.

لەم عارفە گەورە، بێجگە دیوانی دووبەیتییەکانی، کۆمەڵێک قسەی نەستەق بە زمانی عەرەبی ماوەتەوە بە ناوی «*کلمات قصار*» کە دوای خۆی کەسانی تر شرۆڤەیان کردووە؛ یەک لەوانە ڕاژەیەکی عەرەبییە بە ناوی عەینولقوزاتی هەمەدانییەوە؛ یەکێکی‌تر بە فارسییە لە مەلا سوڵتان عەلی گونابادی، کە ساڵی ١٣٢٦ک. ه. چاپ کراوە.

«*کلمات قصار*» بۆخۆی ٢٣ بابە کە ساڵی ١٣١١ک. م. وەکوو پاشکۆی دیوانەکەی، لە چاپخانەی گۆڤاری «*ئەرمەغان*»ی تاراندا لە چاپ دراوە.

ئەوا چەند ڕستە لە «*کلمات قصار*»: «العلمُ اشفاق و الواجدُ احراق. العلمُ دلیل‌امعرفه، تَدُلُّ علیها، فَاذا جاءَالمعرفةُ سقط رویهُاالعلم و بقی حرکات‌العلم بالمعرفه. کان الله و لا شیء معه و یکون الله و لا شیء معه؛ فَوجودالخلق بین‌الحالین، دلایل و اسباب‌المعرفه. العلم ظاهرُهُ ظریفٌ و باطنُهُ ظریفٌ. النفس سِجُن‌الروح و الدُنیا سِجنُ‌النفس ».

**چەند دووبەیتی**:

شــب تاریــكْ و سنگــستان و مــو مَــست
نگهدارنـــــدەاش نیکـــو نگـــەداشـــت
قَـــدَح از دســـت مـــو افتـــاد و نشکـــست
و گرنـــه صـــد قَـــدَح نفتـــاده بشکـــست

*

دلـــی دیـــرُم چـــو مـــرغ پاشکـــسته
همـــه گوینـــد «طـــاهر» تـــار بنـــواز
چـــو کـــشتی بـــر لـــب دریـــا نشـــسته
صـــدا کـــی مـــی‌دهـــد، تـــار گســـسته

*

شَـو تـار اسـت و گرگـان مـی زَنَـن مـیش
از آن کُـــنج لبـــت بوســـی بـــه مـــو ده
دو زُلفونـــت حمایـــل کـــن بْـــورَه پـــیش
بگـــو راه خـــدا دادم بـــه درویـــش

*

مُسَلـــسَل زلـــف بـــر رو، ریتـــه دیـــری
پریـــشان چـــون کَـــری آن تـــاز زُلفـــان
گُـــل و ســـنبل بـــه هـــم آمیتـــه دیـــری
بـــه هـــر تـــاری دلـــی آویتـــه دیـــری

*

عزیـــزا کاســـەی چـــشمُم سَـــرایت
از آن ترسُـــم کـــه غافـــل پـــا نهـــی بـــاز
میـــون هـــر دو چـــشمُم جـــای پایـــت
نـــشینه خـــار مُژگـــونُم بـــه پایـــت

*

خوشــا آنــان کــه هــر شــامان تَــه وینند
گـــرم دَسْـــرس نَبـــی آیـــم تَـــه ویـــنُم
سُـــخن واتَـــه کَـــرَن، واتـــه نـــشینند
بـــشُم آنـــان بُـــوینم کـــه تَـــه ویننـــد

*

غـــم عـــشقت بیـــابونپَـــرورُم کـــرد
بـــه مُـــو گفتـــی: صـــبوری کـــن صـــبوری
هـــوای بخـــت بـــی‌بـــال و پـــرُم کـــرد
صـــبوری طُرفـــه خـــاکی بـــر ســـرُم کـــرد

*

مـــرا نـــه ســـر، نـــه ســـامون آفریدنـــد
پریـــشونخـــاطرون رفتنـــد در خـــاك
پریـــــشونم، پریـــــشون آفریدنـــــد
مـــرا از خـــاك ایـــشون آفریدنـــد

*

خداونـــدا بـــه فریـــاد دلُـــم رس
همـــه کـــس داره، «طـــاهر» کـــس نـــداره
کـــس بـــی‌کـــس تـــوی، مُـــو مونـــده بـــی‌کـــس
خُـــدا یـــار منـــه، چـــه حاجـــت کـــس

*

وَی آن روزی کـه در گـورم کـرن تنـگ
دریـژن بـر سـرُم خـاك و خَـس و سـنگ
نــه پــای آن کــه از مــاران گُریُــزم
نـه دسـت آن کـه بـا مـوران کـنم جنـگ

*

دلا غافــل ز سُــبحانی، چــه حاصــل
مطیــع نفــس و شــیطانی، چــه حاصــل
بــود قــدر تــو افــزون از ملائــك
تــو قــدر خــود نمــی‌دانــی، چــه حاصــل

*

مُــــو آن آزرده‌ی بــــی‌خانمــــانُم
مُــو آن محنــت‌نــصیب ســخت‌جــانُم
مُــو آن سرگــشته خــارُم در بیــابون
کــه هــر بــادی وزه، پیــشش دوانُــم

*

چــو مُــو یــك سُــوتَه دل،پروانــه‌ای نــه
بــه عــالم همچــو مــو، دیوانــه‌ای نــه
همــه مــاران و مــورون لانــه دیــرن
مــن دیوانــه را ویرانــه‌ای نــه

*

ز دســت دیــده و دل هــر دو فریــاد
کــه هــر چــه دیــده بینــه دل کُنــه یــاد
بــسازُم خنجــری نیــشش ز پــولاد
زنُــم بــر دیــده تــا دل گــردد آزاد

*

خوشــا آنُــون کــه پــا از ســر ندوننــد
میــون شــعله، خــشك و تــر ندوننــد
کنــشت و کعبــه و بُتخانــه و دَیــر
ســرایی خــالی از دلبــر ندوننــد

*

وَی از روزی کــه قاضــیمان خــدا بــو
ســر پــرد صــراطم مــاجرا بــو
بــه نوبــت بگــذرن پیــر و جوانــان
وَی از آنــدم کــه نوبــت زان مــا بــو

*

از آن روزی کــه مــا را آفریــدی
بــه غیــر از معــصیت چیــزی ندیــدی
خداونــدا بــه حــق دوســتانت
ز مُــو بگــذر، شــتر دیــدی، ندیــدی

**غەزەل:**

مُــو آن سُــوته دل بــی پــا سرســتم
کــه دل سُــوته ز عــشق دلبرســتُم
بــه دل از لالــه‌رویــان داغ دیُــرم
همــه انــدر رگ جــان نــشترستُم
مُــو آن نخجیــر وحــشم تیرخــورده
کــه در دام زمانــه مــضطرستُم
بجــز مهــرت اگــر در دل گــزینم
بــه هفتــاد و دو ملــت کافرســتُم

در ایـــن آماجگـــه، دنیـــای فـــانی یکـــی بشکـــسته تیـــر بـــی‌پرســـتُم
نـــه کـــار آخـــرت کـــردم نـــه دُنیـــا یکـــی بـــی‌ســـایه نخـــل بـــی‌بَرســـتُم
بـــه ســـان کـــافرُم، در مؤمنـــستان بـــه ســـان مـــؤمن انـــدر کافرســـتُم
بـــه ملـــك عـــشق روح بـــی‌نـــشانُم بـه شـهر دل یکـی صـورت پرسـتُم
اگـــر روزی دوصـــد بـــارت بـــوینم بـــه جـــان مـــشتاق بـــار دیگرســـتُم
همـه مـوجم همـه مـوجم چـو دریـا بـه گرمـی، چـون فـروزان آذرستُم
مـــن از روز ازل طـــاهر بـــزادم از آن رو نـــام «باباطـــاهر»ســـتُم

مقدمەی *دیوان باباطاهر*، رشید یاسمی، ١٣١١. مجلەی *ارمغان*، س٩، ژ١٠، ل٥٦٩-٥٨٤. *تاریخ ادبیات ایران*، دکتر رضازاده شفق، ١٣١٣، ل٦١.

## ئەبووعەبدوڵڵای مەروانی

زانایەکی سەردەرچووی ڕێبازی شافیعی بووە کە لە دەرباری «نصرُالّدوله أبونَصر مَروانی ٤٠٢-٤٥٣ ك. م.»، میری دیاربەکر و میافارقین و جەزیرەی ئیبنوعومەر (جزیر و بۆتان)دا ژیاوە و شێخولیسلامی ئەوێی پێ دراوە و لە پەرەگرتنی ڕێبازی شافیعی لە کوردەواریدا بەشێکی باڵای هەبووە.

شێخولیسلام ئەبووعەبدوڵڵای مەروانی لە جزیردا ژیاوە و هەر لەوێش مردووە و نێژراوە.

*تاریخ الکامل*، ابن اثیر، ب٩، ل١٤٤، ب١٠، ل١٠.

## ئەبووساڵەح شوعەیبی ئازربایجانی

قازی ئەبووساڵەح شوعەیب، کوڕی ساڵەح، کوڕی شوعەیب، لە کوردانی ئازربایجان و هاوچەرخی دەسەڵاتداریی ئەبوومەنسوور وەهسەودانی ڕووادی(٤١٠-٤٤٦)، زانایەکی پارێزکار و لەخواترس بووە کە وەکوو ئەولیایەکی گەورە ناویان لێ بردووە و دادوەری شارەی تەورێزی لە ئەستۆ گرتووە.

قازی کاتی کردنەوەی مزگەوتی جامیعەی تەورێز(٤٣٣ ك. م.)، لەوێ بووە.

*دانشمندان آذربایجان*، ل٢٦.

## ئەبولحەسەنی ئامیدی

ئەبولحەسەن عەلی ئامیدی حەنەفی، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەبدوڕڕەحمانی حەنەفی، لە مەلایان و

زانایانی چەرخی پێنجەمە کە ساڵی ٤٥٠ ک. م. لە ئامید (دیاربەکر) کۆچی دوایی کردووە.[١]

**لە نووسراوەکانی**: «*عُمدَةُ‌الحاضر* و *کفایَةُ‌المُسافر*»، لە فورووعی فیقهی حەنەفییە، لە چوار بەرگدا.

*الأعلام*، ب٥.

## عەلی حەریری

شاعیرێ بووە کە لە نێوان ساڵانی ٤٠٠ تا ٤٠٧[٢] لە شارۆچکەی حەریری سەر بە هەولێردا ژیاوە و دیوانی شیعرێکی بە زاراوەی کوردی حەریری داناوە. وەک خواڵێخۆشبوو ئەمین زەکی‌بەگ دەڵێ، زۆربەی شیعرەکانی غەزەل و باسی ئەوینداریيە، تەژی لە ناسکی و ڕەوانی و شۆر و شەیدایی. حاجی قادری کۆیی لە بەیتێکدا پلە و پایەی شیعری عەلی حەریری و عەلی بەردەشانی ستایش دەکا و وەکوو حەسسانی کورد ناویان لێ دەبا؛ دەڵێ:

دوو عەلین شاعیرن وەکوو حەسسان    بەردەشـان و حەریرە مەسکەنیان

بە داخەوە بێجگە دوو بەیتی ڕەق نەبێ، شیعرێکم لەم شاعیرە دەس نەکەوت، لێرەدا بۆ نموونە هەبێ.

*خلاصةالکرد و الکردستان*، ل٣٥٤. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٧٥.

## ئەبوویۆسف یەعقووبی لوغەوی

ئەبوویۆسف یەعقووب، کوڕی ئەحمەد، کوڕی موحەممەدی کوردی، ویژەوانێکی وشەزان بووە کە لە کوردستانەوە بۆ نەیشابوور چووە و لەوێ دانیشتووە. هێندێک شیعر و نووسراوەی لێ بەجێ‌ماوە و هەروەها خەتیشی خۆش بووە.

ئەبوویۆسف ساڵی ٤٧٤ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

**لە کتێبەکانی**: «*جونَةالّند*» و «*البلغة المترجمة فی‌اللغه*».

*الأعلام*، ب٩، ل٢٥٤. *لغتنامەی دهخدا*، ١٣٢٥، پیتی ی، ل٢٠٢.

## فیرووزشای کوردی سنجاری

فیرووزشا ناسراو بە «زرّین‌کُلاه»، کوڕی موحەممەدی شاهی، کوردێکی سنجار، باپیری حەوتەمی شێخ

١. لە *کشف‌الظّنون*، چاپی ئوفسیتی تاران، ب٢، ل١١٦٦، ساڵی ٤٦٧ ک. م. نووسراوە.

٢. لە *مێژووی ئەدەبی کوردی*دا دەورانی ژیانی عەلی حەریری، نێوان ساڵانی ١٠١٠ و ١٠٧٧ز. نووسراوە.

سەفی هەردەوێڵی[١] و لە عارفانی چەرخی پێنجەم بووە.

خوالێخۆشبوو عەللامەی دیهخودا لە کتێبی«*لُغَتنامە*»دا بە تێروتەسەلی باسی سەفەوی دەکا و لەمەڕ باب و کاڵی ئەم بنەماڵەوە لە کتێبێک بە ناوی «*صفوةُالّصفا*» نووسراوی دەروێش تەوەککولی، ناسراو بە ئیبنوبەزاز، لە مریدانی شێخ سەدرەدین، کوڕی شێخ سەفی دەگێڕێتەوە. دوو ڕوونووس لەم کتێبە بەرچاوی مامۆستا دیهخودا بووە؛ یەکیان لە ساڵی ١٣٢٨ ک. م. لە شاری بەمبەئی هیدووستان چاپ کراوە و ئەوی‌تریان دەسنووسێکی کۆنە.[٢]

ئەم کتێبە دەردەخا کە بێ‌شک شێخ سەفی و باب و باپیری کوردی سنجار و سوننی شافیعی بوون و فیرووز یان پیرووز، جەدی حەوتەمی، لە ئاخر و ئۆخری چەرخی پێنجەم، یانی دەورانی پاشایەتی سەلجووقیاندا ژیاوە و جگە لە باری شێخیەتی و بڕشت و دەستەڵات، سامانێکی زۆر و زەبەندیشی بووە.

لە ژمارەی ٢٥٧ی ڕۆژی سێزدەی گوڵانی ساڵی ١٣٤٠ک. هـ. ڕۆژنامەی «سَحَر»، وتارێک بە ناوی «چارەنووسی کوردی تورکیە»، بە قەڵەمی مامۆستای گەورەی مێژووزان و توێژەری بەناوبانگ، ئوستاد موحیتی تەباتەبایی نووسراوە کە بەشێکی سەبارەت بە بنەماڵەی سەفەوی و باس لەسەر ڕەگەز و ئایینی شێخ سەفی و باب و کاڵییە؛ کە ئاوا دەڵێ: «سێهەمین حکوومەتی بەهێز کە لە بنچینەی کوردەوە لە ئێران دامەزرا، دەوڵەتی سەفەوی بوو. باپیرانی شائیسمایل لەگەڵ هۆزی کوردیاندا لە ڕۆژاواوە، لە ناوچەی گوشتاسبی و هەردەوێڵەوە هاتنە گەلخۆران و لەوێ نیشتەجێ بوون. شێخ سەفی بۆخۆی بە کوردی زاراوەی ئازربایجانی قسەی دەکرد و ئە دووبەیتییانە لێی ماوەتەوە، لەسەر زمان و نەژادی شایەتن. هەروەها شێخ سەفی و سەدرەدینی کوڕی، وەک باقی کوردان، لەسەر مەزهەبی شافیعی بوون؛ بەڵام نەبیرەکەی

---

١. شیخ صفی‌الّدین اَردبیلی.

٢. ئەوا دەقی «صفوەالصّفا» لە زمانی لوغەتنامەوە: «شیخ صفی‌الدّین اسحق، بن امین الدّین جبرائیل، بن‌الصّالح، بن قطب‌الدّین احمد، بن صلاح‌الدّین رشید، بن محمد الحافظ، بن عوض الخواصّ، بن فیروزشاه زرین کُلاه سنجاری، بن محمد، بن شرف شاه، بن محمد، بن حسین، بن محمد، بن ابراهیم، بن جعفر، بن محمد، بن اسمعیل، بن محمد، بن احمد اعرابی، بن ابومحمد قاسم، بن ابوالقاسم حمزه، بن امام موسی الکاظم علیه‌السلام». ئەوجار دەڵێ: «وقتی کە لشکر کُرد با پادشاهی از فرزندان شیخ ارباب طُرُق، ابراهیم ادهم قُدّسَ سرُه، از سنجار خروج کردند و آذربایجان را بکلّی بگشادند، سُکّان مُغان و مردم آران و الیوان و داربوم، تمامت کافر بودند. چون استیلای این لشکر اسلام بر این اقالیم شد، این مواضع را تعلیم اسلام کردند و در مسلمانی آوردند و چون تسخیر این نواحی مُیَسّر شد، ولایت اردبیل و توابع آن، بر فیروزشاه ـ رحمه‌الله علیه ـ مقرر داشتند و فیروز مردی متموّل و صاحب ثروت و مکنت بود و از صامت و ناطق حظّی وافر داشت.»

لە شوێنێکی‌تری ئەو کتێبە، ئاوا ناوی فیرووز دەبا: «الکُردیّ السّبحانی، پیروزشاه، زرّین‌کلاه» کە ڕوونووسان بە هەڵە، لەجێ «سنجاری»، «سُبحانی»یان نووسیوە.



(عەلی سیاپۆش) چوو بۆ حەلەب و لەوێ مایەوە و بوو بە خاوەنی ژن و منداڵ و ماڵ و سامانی پێکەوە نا و دۆست و پێوەندی پەیدا کرد و لە سونگەی دۆستایەتی لەگەڵ نەسیریان و شیعەیانی ناوچەی حەلەبەوە ـ کە ئەورۆکە «عەلەوی»یان پێ ئێژن ـ بوو بە شیعە و ئیبراهیمی کوڕی ئەم میراتەی لەگەڵ خۆی هاوردەوە بۆ ئێران و کەسانێ کە پاشان بنەڕەتی پاشایەتی سوڵتان حەیدەر و شائیسمایلی کوڕیان دانا، هەر ئەو خێڵە ترکە نەسیری مەزهەبە سەفەوی تەریقەتانەی ناوچەی فورات بوون کە سوڵتان عەلی سیاپۆش کردیانیە پێشمەرگە و گەردوونی بنەماڵەی خۆی.»

*لغتنامەی دهخدا*، ١٣٢٥، پیتی ف، ل٢٥٦-٢٦٢.

## شێخولیسلام ئەبولحەسەنی هەکاری

ئەبولحەسەن عەلی، کوڕی ئەحمەد، کوڕی یۆسف، کوڕی جەعفەری هەکاری مووسڵی، لە زانایانی پارێزکار و لەخواترسی چەرخی پێنجی کۆچی دێتە ئەژمار کە زۆر گەڕاوە و لە کۆڕی دەرسی زۆرێک لە مامۆستایانی گەورەی ئیسلامیدا دانیشتووە و لە هەر مامۆستایەک شتێک فێر بووە و کاتێ کە بەشێکی باشی لە زانست دەس کەوتووە، گەڕاوەتەوە زێدەکەی خۆی و دەرس و وانەی گوتۆتەوە. فەقێ و قوتابی لە هەموو لاوە ڕوویان لەوێ ناوە و شتی لێ فێر بوون.

ئەبولحەسەنی هەکاری لە زۆربەی زانستە ئیسلامییەکان، بەتایبەت لە فیقهـ و حەدیسدا مامۆستای بێ‌قسەی ڕۆژگاری خۆی بووە. لەدایک بوونیان ساڵی ٤٠٩ ک. م. و دوامین کۆچیان ٤٨٦ لە هەکاریدا نووسیوە.

لە زار و زێچی ئەم مامۆستایە، زانا و تێگەیشتووی زۆر هەڵکەوتوون کە لە داهاتوودا باسی چەند کەسێکیان دەکەین.

*وفیات‌الأعیان*، ابن‌خلکان، ب۱، ل۳٤٦. *الکامل فی‌التاریخ*، ب۱۰، ل۹۳.

## ئەبووئەحمەد قاسمی شارەزووری

ئەبووئەحمەد قاسم، کوڕی مزەفەر، کوڕی عەلی، کوڕی قاسمی شارەزووری، گەورەی بنەماڵەیەکی بەناوبانگە کە زۆر ساڵان لە شارەزوور و مووسڵ و شام دادوەرییان کردووە.

ئەبووئەحمەد ماوەیەک لە هەولێر و هێندێکیش لە سنجار پارێزدار بووە؛ زانایەکی باش و شاعیرێکی چاک بووە و ئەم دوو بەیتە بە ناوی ئەوەوە ناسراوە:

همّتی دُونَها السُّها وَالزُّبانی          قَد عَلَتْ جُهْدها فَما تَتَدانی
فَأَنَا مُتْعَبٌ، مُعَنًّی الی اَنْ          تَتَفانَی الأیّامُ اَوْ نَتَفانی

ئەبووئەحمەد ساڵی ٤٨٩ ک. م. لە شاری مووسڵدا لە دنیا دەرچووە و هەر لەوێ نێژراوە.

*وفیات‌الأعیان*، ابن‌خلکان، ب١، ل ٤٢١. *الأعلام*، ب٦، ل ٢٠.

## جەلیسی دینەوەری نەحوی

ئەبووعەبدوڵڵا حوسەین، کوڕی مووسا، کوڕی هەیبەتوڵڵای نەحوی، ناسراو بە جەلیسی دینەوەرییە کە دەوری ساڵانی ٤٩٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە نووسراوەکانی**: «*ثمار الصناعة و الحروف السبعة من الکلام*».

*کشف‌الظنون*، ب١، ل ٥٢٣. *هدیة‌العارفین*، ب١، ل ٣١١.

# چەرخی شەشەم

## ئەبوونەسر ئەحمەدی دینەوەری

ئەبوونەسر ئەحمەد فەرەج، پیاوێکی زانا و وێژەوانی خەڵکی دینەوەر بووە کە هەموو کەس، لە گەورە و پچووک ڕێزیان لێ گرتووە و لە ساڵی ٥٠٦ ک. م. لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە.

فەخروننیساء شەهدەی دینەوەری ـکە لە داهاتوودا باسی دەکەین ـ کچی ئەبوونەسرە.

*وفیات‌الأعیان*، ابن‌خلکان، چاپی میسر، ب١، ل٢٢٦.

*الکامل فی‌التّاریخ*، ابن‌اثیر، ب١٠، ل٢٠٨.

## ئەبوومحەممەد عەبدوڵڵای شارەزووری

کوڕی ئەبووئەحمەدی قاسم، کوڕی مزەفەر، ناسراو بە «مُرتَضی»، لە بنەماڵەی شارەزوورییان و لە ناودارانی بواری وێژەوانی و وتاربێژی و شیعر و زانستە کە بۆ دەمپاراوی و قسەجوانی، لەو سەردەمەدا، کەمتر وەکوو خۆی هەڵکەوتبێت. ماوەیەک لە بەغدا دەرسی فیقهـ و حەدیسی گوتۆتەوە و پاشان گەڕاوەتەوە مووسڵ و لەوێ کورسی دادوەری هەبووە. شیعری لەوپەڕی ڕەوانی و تەڕی لە چێژی سۆفییانەیە.

لە شیعرە ناسراوەکانی یەکیان قەسیدەیەکە بە ناوی «مَوصلیّە» بریتی لە ٤٤ بەیت، کە ئەوا چوار بەیتی:

لَمَعَتْ نارُهُم وَ قَدْ عَسعَسَ اللّیْـ ـلُ وَ مَلَّ الحادی وَ حار الدّلیلُ
فَتَأمَّلْتها وَ فکْری مِنَ البیـ ـنِ عَلیلٌ وَ لَحْظُ عَیْنی کَلیلُ
وَ فُؤادی ذاکَ الفُؤادُ المُعَنّی وَ غَرامی ذاکَ الغَرامُ الدّخیلُ
ثَمَّ قابَلْتُها وَ قُلْتُ لِصَحْبی هذه النّارُ نارُ لیلی، فَمیلُوا

**واتا**: ئاوری بنە و باری خێڵی لەیلا لە دوورەوە دەرکەوت؛ لە حاڵێکدا شەو هاتبووە سەردا و سارەوان شەکەت و بەڵەد سەرگەردان بوو. ئەمن لێی وردبوومەوە. ئەگەرچی بیرم لەبەر دەردی دووری ئاڵۆز و چاوم [لەبەر گریان] لێڵ و کز ببوو، بە دڵێکی پڕ دەرد و بریندارەوە و ئەوینێک کە تا ڕادەی لێوەیی بردبوومی،

ڕووم لە لای ئاورەکە کرد کە دەدرەوشایەوە و بە هاوڕێیانم گوت: ئەوا خۆیەتی؛ ئاورەکەی لەیلایـە! لادەن و دابەزن!

ئەبوموحەممەد ساڵی ٤٦٥ ک. م. لە دایک بووە و مەرگیشیان لە ٢١ی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ٥١١، لـە مووسڵ نووسیوە. ئەم مامۆستایە برای «قاضی‌الخافقین»ە کە لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین.

*وفیات‌الأعیان*، ابن خلکان، ب ١، ل ٢٥٣.

*طبقات‌الشّافعیّة*، ب٤، ل٢٣٥. *الأعلام*، ب٤، ل٢٥٣.

## ئیبنولخازینی دینەوەری

ئەبولفەزل ئەحمەد، کوڕی موحەممەد، کـوڕی فـەزل، کـوڕی عەبـدولخالیق، ناسـراو بـە «ابـنُ‌الخـازن»، لـە نووسەران و شاعیران و خۆشنووسانی ناودارە کە چەند جاران کتێبی «مَقامات حَریری» بـە دەسـتی خـۆی نووسیوەتەوە.

شیعری ئیبنولخازین لەوپەڕی ناسکی و جوانی و ڕەوانیدایـە؛ دیوانەکـەی بـە نـاوی «*دیـوانُ ابـن‌الخـازن*»، نەسروڵڵای کاتیبی کوڕی[1] کۆی کردۆتەوە.

ئەمەش دوو نموونە لە شیغرەکانی:

مَــنْ یَــستَقمْ یُحْــرَمْ مُنــاهُ وَ مَــنْ یَــزغْ یَخْـــتَصُ بالإسْـــعاف وَ التّمکـــین
أُنظُـــرْ الَـــی الألـــف اسْـــتَقامَ فَفاتَـــهُ عُجْـــمٌ و فـــازَ بـــه اعْوجـــاجُ النُّـــون

**واتـا**: درووستکار لە گەیشتن بە ئاواتی بێبەشە؛ بەڵام ناڕاست خۆشبەخت و کامەرانە! وەک چـۆن پـیتی «ا»، کە ڕاستە، خاڵی نییە؛ کەچی «ن»ی چەماوەی ناڕاست هەیەتی!

اَیــا عـــالمَ الأسْـــرار انّـــکَ عـــالمٌ بــضَعْف اصــطباری عَــنْ مُــداراة خُلقــه
فَفَتّـــرْ غَرامـــی فیـــه تَفْتیـــرَ لَحْظـــه وَ أحْـــسنْ عَزائـــی فیـــه تَحْـــسینَ خَلَقـــه
فَحَمْــلُ الرَّواســی، دُونَ مــا أنَــا حامــلٌ بقَلْبـــی المُعَنَّـــی مـــنْ تَکـــالیف عـــشْقه

**یانی**: ئەی خودای ئاگا لە نادیاران! تۆ دەزانی ئەمن بەرگەی خۆی توند و تیژی ئەو ناگرم. سا دامرکـانێکم لەم هەمووی شپرزی و شێواویە، لە حاندی دۆستدا پـێ ببخـشە! هـەر وەک چـۆن چـاوی ئـەوت خـەون و خوماری پێ بەخشیوە. ئۆقرە و ئارمێکم پێ بدە! وەک چۆن جوانی و ڕازاوەییت بەو داوە.

ئیبنولخازین ساڵی ٥١٢ یان ٥١٨ ک. م. لە تەمەنی ٤٧ ساڵیدا دنیای بەجێهێشتووە.

---

١. نەسروڵڵای کاتیب، ناوبراو بە ئەبولفـەتح، وەکـی بـابی لـە نووسـەرانی بـەناوبانگ بـووە و بـەپێ نووسـراوەی قـازی ئیبنوخەلیکان لە ٥٧٥ ک. م. ژیاوە.

*وفيات‌الأعيان*، ابن‌خلكان، ب١، ل٤٦. *كشف‌الظّنون*، ب١، ل٧٦٥. *الأعلام*، ب١، ل٢٠٨.

## شێخ ئەبووتاهیری کوردی سۆفی

شێخ ئەبووتاهیری کورد کە خواجە ئەبووتاهیریشیان پێ گوتووە،[1] لە مەشایخی سۆفیانە کە لە چەرخی پێنجەم تا سەرەتاکانی چەرخی شەشەمدا ژیاوە و هاودەوران و هەواڵی شێخولیسلام ئەحمەدی نامیقی (٤٤١-٥٣٦) بووە.

*لُغت‌نامەی دهخدا*، چاپی ١٣٢٥، پیتی الف، ل٥٦٢. بە گێڕانەوە لە: *نامەی دانشوران*، ل ٣٨٩ و *نفحات‌الأُنس*، ل ٣٦٦.

## عەلی سنجاری

شێخ عەلی کوڕی وەهەب، شێخێکی پارێزکار و عارفێکی ڕێزداری سنجارە کە لە سەرەتای چەرخی شەشدا ژیاوە و زۆرێک لە پیرانی وەک شێخ سوێدی سنجاری و شێخ ئەبووبەکری جاری خزمەتی گەیشتوون.

شێخ عەلی هەر لە سنجاردا کۆچی دوایی کردووە و بارەگای هەرلەوێیە.

*طبقات‌الكبرى*، شَعرانی، ب١، ل١٣٨.

## شێخ ئەبولوەفای کوردی

شێخ ئەبولوەفا ناسراو بە «تاجُ‌العارفين»، لە مەشایخی پایەبەرز و عارفانی گەورەی چەرخی شەشەمە کە کەراماتێکی زۆریان لێوە دیوە و تاقمێکی بەرچاو لە ئەولیای ئەو سەردەمە، بە ودمی هاودەنگی ئەو بەرز بوونەتەوە؛ بۆ وێنە شێخ مەتەری بازرانی کە بۆخۆی پیرێکی گەورە بووە.

شێخ عەبدولقادری گێلانی ـ نوور لە قەبری بارێ ـ وای پێدا دەڵێ: «ليس علی باب‌الحقِ تعالی كردیٌ مثل اَبی‌وفاء».

حەکیم سەنایی غەزنەوی لە قەسیدەیەکدا ناوی لێ دەبا؛ ئەوا چەند بەیتی:

برگ بی‌برگی نداری، لاف درویشی مزن    رُخ چو عیّاران نداری، جان چو نامردان مَكَن

تا دەڵێ:

روزها باید كه تا یک مُشت پشم از پُشت میش    زاهدی را خَرقه گردد، یا حماری را رَسَن

---

١. ئەم بێجگە ئەبووتاهیری بدلیسییە کە لە سەرەتای چەرخی نۆیەمدا ژیاوە.

ماهها باید که تا یک پنبەدانه ز آب و خاک     شاهدی را حُلّه گردد، یا شهیدی را کَفَن
سالها باید که تا یک سنگ اصلی ز آفتاب     لعل گردد در بَدَخشان، یا عقیق اندر یَمَن
عمرها باید که تا یک کودکی از روی طبع     عالمی گردد نکو، یا شاعری شیرین‌سخن
قرن‌ها باید که تا از پُشت آدم نطفه‌ای     «بُوالوفای» کُرد گردد، یا شود «وَیس» قَرَن

لە قسە نەستەقەکانی ئەوە: «التّسلیم ارسال النفس فی میادین و ترک الشّفقه علیها مِنَ‌الطّوارقِ».
شێخ ئەبولوەفا ساڵی ٥٣٠ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*طبقات‌الکبری*، شَعرانی، ب١، ل١٣٤. *دیوان سَنائی*، چاپی مەروی، ل٤٨٦.

## بەهائەدین ئەبولحەسەنی شارەزووری

قازی بەهائەدین ئەبولحەسەنی عەلی، کوڕی ئەبووئەحمەدی قاسم، لە زانایانی بەناوبانگی بنەماڵەی شارەزوورییە کە ساڵی ٥٣٢ لە شاری حەڵەب کۆچی یەکجاری کردووە.

قازی لە کۆڕی دەرسی مامۆستایانێکی وەک ئەبووغالیب محەممەد، کوڕی حەسەنی باقلانی بەهرەی بردووە و دوایی کە پێگەیشتووە، بۆتە دادوەری مووسڵ؛ ماوەیەکیش لە شام و سەرەتێک لە جزیر ئەو ئیشەی هەبووە.

*وفیات‌الأعیان*، ابن‌خلکان، ب١، ل١٩٣. *طبقات‌الشّافعیّة*، ب٤، ل٢٨٠.

## ئەحمەدی دینەوەری حەنبەلی

ئەحمەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئەبیبەکری دینەوەری حەنبەلی، لە زانیارانی چەرخی شەشەم و شۆنەڕایانی ڕێبازی ئیمام ئەحمەدی حەنبەل و مامۆستایانی خاوەن بیر و ڕا بووە کە ساڵی ٥٣٢ ک. م. بەرەو دنیای هەتاهەتایی چووە.

لە نووسراوەکانی: «*التّحقیقُ فی مسائل التّعلیق*».

*الکامل فی‌التّاریخ*، ابن‌اثیر، ب١، ل٣٠. *هدیة‌العارفین*، ب١، ل٨٣.

## ئەبووئەحمەدی شارەزووری

ئەبووئەحمەد، کوڕی ئەبوومحەممەدی قاسم، کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی ئەبووئەحمەدی قاسم، کوڕی موزەفەر، کوڕی عەلی، لە زانایانی بنەماڵەی ناوازەی شارەزوورییانە کە نیشتەجێی مووسڵ بووە و لەوێ دەرسی داوە و دادوەری کردووە و لە ڕۆژی چوارەمی مانگی شەوالی ساڵی ٥٣٣ ک. م. هەر لەو شارەدا دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*طبقات الشّافعيّة*، ب٤، ل٢٩٥.

## ئیبنو شارەزووری[1]

ئەبولحەسەن عەلی، کوڕی موسلیم، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەلی فەرەزی شافیعی، ناسراو بە «ابن الشّهرزوری»، زانایەکی شارەزا بووە و نووسراوەی هێژای لە تەفسیر و فیقهدا لێ بەجێماوە؛ وەکوو کتێبێ *«احکام الخُنثی»*.

ئیبنوشارەزووری ساڵی ٥٣٣ ک. م. لە شاری دمشقدا، کاتی نوێژ خوێندن ڕووی لە دنیای دوای مەرگ ناوە.

*هدیة العارفین*، ب١، ل٦٩٦.

## ئەبوولحەسەن عەلی دینەوەری

ئەبولحەسەن عەلی، کوڕی موتەهەری دینەوەری، پیاوێکی زانا و پارێزکار و لە شاگردانی ئیمام غەززالی بووە کە ساڵی ٥٣٣ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*طبقات الشّافعيّة*، ب٤، ل٢٨٤.

## ئەبووجەعفەر موحەممەدی سوورەبەردی

ئەبووجەعفەر موحەممەد، کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی موحەممەد، برای شێخ ئەبوونەجیب و لە مامۆستایانی چەرخی شەشەمی کۆچییە کە لە بەغدا لای ئەسەدی میهەنی، فیقهی خوێند و شارەزای بوو؛ پاشان گەڕاوە کوردستان و پیشەی دادوەری وەئەستۆ گرت و ساڵی ٥٣٧ ک. م. شهید کرا.

*طبقات الشّافعيّة*، ب٤، ل٧٦.

## ئەبووبەکر موحەممەدی ئەرمەوی

ئەبووبەکر موحەممەد، کوڕی حەسەن، کوڕی عومەری ئەرمەوی، خەڵکی ورمێیە کە ساڵی ٤٥٦ بۆ درێژەدان بە خوێندن، بۆ بەغدا چووە و خزمەتی شێخ ئەبووئیسحاق و ئەبووحوسەینی فەقوور و مامۆستایانیتر گەیشتووە و زانیارییەکی تەواوی دەسکەوتووە.

مەلایانی وەک ئەبوو موعەممەری ئەنساری و ئیبنوسەمعانی، لە ڕیزی شاگردانی ئەم مامۆستایەن.

---

١. ڕەوانشاد دیهخودا لە *«لغت‌نامه»*، ژمارە زنجیرەی ٨٥، ل٢١٠، لە «مُعجم‌المولفین»، ب٧، ل٢٤١، دەگێڕێتەوە و لە جێی «ابن‌الشهرزوری»، «ابن‌السهروردی» پێ دەڵێ و جێناویشی «جَمال‌الاسلام» دەنووسێ و وەکوو زانایەکی فیقهـ و ئوسوول و تەفسیر و ریازی ناوی لێ دەبا و بە شاگردێکی ئیمام موحەممەدی غەززالی (٤٤٠ ٥٠٥ ک. م.) دەیناسێنێ.

ئەبووبەکری ئەرمەوی ساڵی ٥٣٧ ک. م. ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە و لە گەڕەکی کەرخی بەغدا نێژراوە.

*طبقات الشّافعيّة*، ب٤، ل٦٧.

## ئەبووبەکر موحەممەدی شارەزووری

ئەبووبەکر موحەممەد، کوڕی ئەبووئەحمەدی قاسم، کوڕی مزەفەر، لە مامۆستایانی پیتۆڵ و ڕاویانی حەدیس و شاگردانی شێخ ئەبووئیسحاقی شیرازی بووە کە لە زۆر وڵات، بەتایبەت جزیر و مووسڵ و شامدا دادوەری کردووە؛ بەم بۆنەوە «قاضیُ الخافقَین[1]»یان پێ گوتووە.

هاتنە دنیای قازی ساڵی ٤٥٣ یان ٤٥٤ لە هەولێر و کۆچی یەکجاری لە بەغدا، ساڵی ٥٣٨ ک. م. ڕوویداوە.

*طبقات الشّافعيّة الكبرى*، چاپی میسر، ب٤، ل٩٥.

## ئەبوومەنسوور مزەفەری شارەزووری

برای «قاضیُ الخافقین»ە کە ساڵی ٤٥٧ ک. م. لە هەولێر لە دایک بووە و کە پێ گەیشتووە، پێشەکی لە زێدی خۆی و پاشان لە مووسڵ خوێندوویە و دوایی بۆ بەغدا چووە و ماوەیەک لە کۆڕی دەرس و دەوری فەقیهی گەورەی ئەو چەرخە، شێخ ئەبووئیسحاقی شیرازی دانیشتووە و دوای کۆتایی هێنان بە خوێندن، گەڕاوەتەوە مووسڵ و لەوێ بۆتە قازی سنجار.

ئەبوومەنسوور لە نیوەی هەوەڵی چەرخی شەشەمدا لە دنیا دەرچووە.

*تاريخ ابن خلكان*، ب١، ل٢٥٢.

## ئیبنوموسهیری ئامیدی

«مُهَذّب الدّين» ئەبولحەسەن عەلی، کوڕی ئەبولوەفای سەعد، کوڕی ئەبیلحەسەن عەلی مووسڵی، ناسراو بە «ابن مُسهِر»، شاعیرێکی زانا لە گەورەماڵانی دیاربەکر بووە کە بە زۆر ناوچە و مەڵبەندی مووسڵدا گەڕاوە و بە باڵای میران و دەسەڵاتدارانی هاوچەرخیدا هەڵگوتووە. دوو بەرگ دیوانی شیعری بە عەرەبی هەیە و ساڵی ٥٤٣ ک. م. مردووە.

شیعرێکی کە بۆ دۆستێکی نەخۆشی نووسیوە:

وَ لَمّا اشْتَكَيْتَ اشتَكى كُلُّ ما     عَلَى الارض وَ اعْتَلَّ شرقٌ و غربُ

---

١. «**خافِقَین**» واتا: ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا.

لأنَّــكَ قلــبٌ لجــسْمِ الزّمـــان وَ مـا صـحّ جـسْمٌ اذَا اعْتَـلَ قَلْـبُ

**واتا**: لە ناڵەی تۆ ئەوی لە سەر زەوینە دێتە نکە و ناڵە و هەموو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا دەردەدار دەبن. ئاخر ئەتۆ دڵی بۆ لەشی زەمان و ئەگەر دڵ و گیان نەخۆش کەوت، چۆن لەش ساغ دەبێ؟

ئەم قەتعەیەش هی ئیبنوموسهیرە:

اذا مـا لـسانُ الـدّمع نَـمَّ عَلَـى الهَـوى فَلَـيس بِـسرٍّ مَـا الـضُّلوعُ أجَنّـت

فَـوَ الله مـا أدْرى عَـشيّةَ ودَّعَـتْ أناحَـت حَمامـاتُ النّـوى اَمْ تَغَنَّـت

و أعجَبُ من صَبْرى القَلُوصُ الّتى سَرَتْ بهَودجـك المزْمُـوم، أنّـى أسْـتَقَلّت

أُعاتـبُ فيـك الـيَعملات عَلَـى النّـوى وَ أسْـألُ عَنْـك الـرِّيحَ مـنْ حَيْـثُ هَبّـت

**یانی**: کاتێ زبانی فرمێسک بکەوێتە قاودانی ئەوین، تازە ئەوی دڵ لای خۆی هەڵیگرتووە، نهێنی نییە. نازانم کاتی شەوان کە یار ماڵاوایی کرد و بۆ سەفەر چوو، کۆترەکانی وڵاتی ئەیانناڵاند یان دەیانخوێند؟ سەیرتر لە بڕستی من، وزەی ئەو وشترەیە کە کەژاوەکەی دەبرد! چۆنی دەتوانی؟ لۆمەی وشتران دەکەم کە بوونە هۆی دووری. هەر با هەڵکا، شوێنی تۆی لێ دەگرم.

*الأعلام*، ب٥، ل١٠١. *تاریخ ابن‌خلکان*، ب١، ل٣٦١.

## نەسروڵڵای دوینی

ئەبولفەتح کەمالەدین نەسروڵڵا کوڕی مەنسوور، زانایەکی خەڵکی دوین (گوندێکی کوردنشینی ئازربایجان) بووە کە لە بەغدا، سەردەمێک لای ئیمام ئەبووحامیدی غەززاڵی خوێندوویە و پاشان بۆ خوراسان ڕۆیوە و ماوەیەک لە نەیشابوور، هێندێک لە مەرڤ و چەلێک لە بەلخ، وانەی گۆتۆتەوە و دواخری هەر لەم شارە دواینە، کۆچی دوایی کردووە.

ئەبولفەتح بەتایبەت لە حەدیسدا شارەزاییەکی تەواوی هەبووە و کەسانی وەک ئەبووسەعدی سەمعانی، گوێدێری حەدیس‌گوتنەوەی بوون.

*طبقات‌الشّافعیّةالکبری*، چاپی میسر، ب٤، ل٣١٩.

## ئەبولفەزل موحەممەدی ئەرمەوی

کوڕی عومەر، کوڕی یۆسف، لە کوردانی خەڵکی ورمێیە کە ساڵی ٤٥٩ ک. م. هاتۆتە دنیا و خوێندنی باڵای لە بەغدا لای ئەبووجەعفەر، کوڕی موسلیمە و ئەبووحوسەین، کوڕی موهتەدی بیللا و عەبدوسسەمەد، کوڕی مەئموون بووە و ماوەیەکیش لە خزمەتی عەللامەی گەورە، ئەبوئیسحاقی شیرازی خوێندوویە.

قازی ئەبولفەزل فەقیهێکی سەردەرچوو بووە و لە «دەیر عاقوول» دادوەری کردووە و سەرەنجام مانگە



ڕەجەبی ساڵی ٥٤٧ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*طبقات الشّافعيّة الكبرى*، چاپی میسر، ب٤، ل٩٢.

## شێخ سوێدی سنجاری

لە مەشایخی پایەبەرز و خاوەن کەرامەت و دارا لە باری شەریعەت و بواری تەریقەت بووە کە لە ناوەڕاستەکانی چەرخی شەشەمدا ژیاوە و پاش کۆچی دوایی مامۆستا و مورشیدەکەی (شێخ عەلی، کوڕی وەهب) لە سنجاردا، شانی داوەتە ژێر باری بەڕێوەبردنی خانەقا و بارهێنانی مریدان.

بارەگای شێخ سوێد لە سنجار، ئێستاش جێی زیارەتی دڵزیندوانە.

*طبقات الكبرى*، ل١٥٠.

## شێخ ئەبولفەزلی ئوشنەوی

شێخ ئەبولفەزل عەبدولعەزیزی ئوشنەوی شافیعی، کوڕی عەبدوڕڕەحمان، کوڕی عەلی، زانایەکی خەڵکی شنۆیە، لە شاگردانی شێخ ئەبووئیسحاقی شیرازی و ئەبووجەعفەر کوڕی موسلیمە[1] کە خوێندنی لە بەغدا تەواو کردووە و پاشان گەڕاوەتەوە زێدی خۆی خەریکی خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە بووە.

کۆچی دوایی شێخ ئەبولفەزل ساڵی ٥٥٠ ک. م. ڕوویداوە.

**لە کتێبەکانی**: «*الكفاية في فرائض و توريث*».

*طبقات الشّافعيّة*، ، ب٤، ل٢٥٤. *هدية العارفين*، ب١، ل٥٧٩.

*كشف الظّنون*، ب٢، ل١٨٠. *الأعلام*، ب٤، ل١٤٧.

## مبارەکی شارەزووری موقری

ئەبولکەرەم مبارەک، کوڕی حەسەن، کوڕی ئەحمەد، کوڕی عەلی، کوڕی فەتحانی شارەزووری، ناسراو بە«شَيخ القُراء»، پیاوێکی پارێزکار و خێرخواز بووە و لە زانایان و مامۆستایانی قەرائەت و تەجوید و حەدیسە؛ کە ساڵی ٤٦٢ هاتۆتە دنیاوە و ٥٥٠ ک. م. لە بەغدا لە دنیا دەرچووە.

مامۆستایانی لە حەدیسدا، ئەبووفەزل ئەحمەد، کوڕی حەسەن، کوڕی جەیروون و لە قەرائەتدا،

---

١. عەللامە دیهخودا دەڵێ: فیقهی بە لای ئەبووئیسحاق ئیبراهیم، کوڕی عەلی فیرووزئابادییەوە خوێند و لە ئەبووجەعفەر، کوڕی موسلیمە حەدیسی بیستووە.

*لغتنامەی دهخدا*، زنجیرە ژمارەی ٥٨، ل٢٧٠١.

ئەبوومحەممەد جەعفەر، کوڕی موحەممەدی سەڕڕاج بوون.

**لە کتێبەکانی**: «*المصباحُ الزّاهر فی القرآت العَشر البواهر و الذخائر فی القرآت*».

جارێک کاتی خوێندن لای مامۆستا ئەبوومحەممەد جەعفەری سەڕڕاج، دڵ‌ئێشانێکی لێ پەیدا دەبێ و بەغدا بەجێ دێڵێ. مامۆستا ـ کە یەکجاری خۆش‌ویستووە ـ چەند بەیت بۆ دڵدارێکی خەیاڵی دەهۆنێتەوە و پێی ڕادەگەیەنێ کە شارەزووری بەجێی‌هێشتووە و زۆری بۆ بەتاسەیە. چ دەبێ ئەگەر بە میهرەبانییەوە بگەڕێتەوە و چاوی پێ بکەوێتەوە و ژەنگی سەردڵی بشۆرێتەوە. ئەمجار ڕوونووسێکی بۆ شارەزووری دەنێرێ. شارەزووری هەر کە چاوی پێ دەکەوێ، بە هەڵەداوان ڕێگای بەغدا دەگرێتەبەر و ئەچێتە خزمەتی مامۆستا سەڕڕاج و تا دواکاتی خوێندن لای بەجێ ناهێڵێ.

*مُعجَمالأُدَبا*، ب١٧، ل٥٢. *تاریخ بغداد* ، ب٧، ل١٥٧.

*لغتنامەی دهخدا*، ب٢، ل١٣٢٥,١٧٠٦، پیتی م، ل٢٠٧.

*الأعلام*، ب٦، ل١٤٩. *کشف الظّنون*، *هدیة العارفین*، ب٢، ل٢.

## شێخ مەتەری بازرانی[1] کوردی

شێخی شەعرانی لەمەڕ ئەوەوە وای نووسیوە: «هوَ من اَجَلّ مَشایخِ العراق وَ ساداتِ العارفین. اَجمَعَ العُلَماءُ عَلی جَلالَته وَ زُهده وَ مَهابَته. وَ کانَ شیخُهُ تاجُ العارفینَ اَبولوَفاء الکُردی، المُتوفّی ٥٣٠ھ یقولُ: الشیخ مَطَر، وارثُ حالی وَ مالی وَ کانَ من أَخَصّ خُدّامه».

هەرچۆنێک بێ، شێخ مەتەر لە ڕیزی عارفانی پایەبەرزی ئیسلامە کە لە گوندێکی باکووری کوردستان لە دایک بووە و پاشان بە شوێن خوێندن و تەریقەتدا چووە و بە وڵاتانی ئیسلامیدا گەڕاوە و سەرەنجام لە ساڵی ٥٥٠ ک. م. بە یەکجاری دەستی لە دنیا بەرداوە.

**لە قسە عیرفانییەکانی**: «هۆزانی (حکمَت)، دۆزینەوەی ڕاستەقینەیە و ئەگەر لە دڵدا جێی کردەوە، ژەنگی لێ دەسڕێتەوە و شوورەیی لە دەروون دەشۆرێتەوە.

*طَبَقات شَعرانی*، ب١، ل١٤٦.

## سەدیدەدین ئەعوەری کرماج (کرمانج)

خوالێ‌خۆشبوو هیدایەت لە ژیان‌نامەی «مَجمَع الفُصَحا»دا، لە ژماری شاعیرە گەورەکانی دادەنێ کە هاوچەرخی «اثیرالدّین اَخسیکتی» بووە و دەگێڕێتەوە لە نێوانیاندا شەڕەشیعری زۆر ڕوویداوە؛ بۆ وێنە ئەم

---

١. لە «*طبقات شَعرانی*»دا «**بازرانی**» نووسراوە؛ بەڵام دوور نییە هەڵەیەک ڕوویدابێ و ڕاستەکەی هەر «**بارزانی**» بێ.

چوارینه، ئەسیرەدین بە سەدیدیدا گوتووە:

قلب تو ز نور معرفت، عُور چراست — بینی تو بر روی تو چون گور چراست
ابلیس اگر نیستی ای مردک زشت — پس راست بگو، چشم چپت کور چراست

ئەمەش جوابی سەدید:

گفتی تو مرا کُور و همه خلق شنید — گفت تو چه حاجت است چون هست پدید
چشم دگر ار کور بُدی، شایستی — تا روی تو زن جَلَب نبایستی دید

دیسان لە سەدید:

گویند که بردمید از گُل خارش — جُرمی است که می‌نهند بر گُلزارش
چون صورت او همیشه بر چشم من است — عکس مژەی من است بر رخسارش

سەدید ساڵی ٥٥٠ ک. م. هێشتا بەشی بەسەر ئەم دنیایەوە هەبووە.

*مُجمَع الفُصَحاء.*

## تەنزی دیاربەکری

موعینەدین ئەبولفەزل یەحیا تەنزی شافیعی، کوڕی سەلامە، کوڕی حوسەین ناسراو بە «خَطیب حَصکفی»، لە شارۆچکەی تەنزەی سەر بە دیاربەکر هاتۆتە دنیاوە و خوێندنی لە حسن‌کیفا (شرناخ) دەسپێکردووە و بە دوویدا بۆ بەغدا چووە و لای ئەبووزەکەریا خەتیبی تەوریزی و مامۆستایانی‌تر، ئەدەبیاتی خوێندووە و پاشان لای زانایانی فیقهـ ئەم زانستەشی بە تەواوی وەرگرتووە و ئەمجار گەڕاوەتەوە کوردستان و پاش ماوەیەک بۆتە وتاربێژ و موفتی میافارقین (سلیوان).

خەتیبی حەسکەفی لە شاعیران و وێژەوانانی بەناوبانگە کە لە نەحویشدا خاوەن بیر و ڕایە. دیوانی شیعر و سەرجەمی نامیلکەکانی ئەم مامۆستایە، شاندەری ڕادەی بەرزی دەمپاراوی و ڕەوانبێژی ئەون.

**نموونەیەک لە شیعرەکانی:**

أشَكْوُ إلَى الله مِنْ نارَيْن: واحِدَة — فِي وَجْنَتَيْه، وَأُخرى مِنْهُ فِي كَبِدى
وَمِنْ سَقامَيْن: سُقْمٌ قَدْ أحَلَّ دَمِي — مِنَ الجُنُون، وَسُقْمٌ حَلَّ فِي جَسَدى
وَمِن نَمومَيْن: دَمْعِي حِينَ أذْكُرُهُ — يُذيعُ سِرّى، و واش مِنه بالرَّصَد
وَمِنْ ضَعيفَيْن: صَبْرى حِين أذكُرُهُ — وَوُدُّهُ، و يَراهُ النّاسُ طَوْعَ يَدى
مُهَفْهَفٌ رَق حَتّى قُلْتُ مِن عَجَب — أخصْرُهُ خنْصَرى، اَمْ جلدُهُ جَلَدى

خەتیبی حەسکەفی ساڵی ٤٥٩ ک. م. لە دایک بووە و ٥٥١ لە دنیا دەرچووە.

*الأعلام*، ب٩، ل١٨٣. *مُعجَم الأُدَبا*، ب٢٠، ل١٨. *لغتنامەی دهخدا*، پیتی ح،

ل٧٠٥. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٢٠. *کامل ابن‌اثیر* ، ب١١، ل١٠٧.

## فەرزی شارەزووری

ئەبوومزەففەر محەممەد،کوڕی عەلی، کوڕی حەسەن، کوڕی ئەحمەدی «فَرضـی» شـارەزووری، بـابی لـە کوردستانەوە چۆتە بەغدا و ئـەو سالّـی ٤٩٧ ک. م. لـەوێ هاتۆتـە دنیـا و کـە پێگەیـشتووە، لـە خزمـەت مامۆستایانی وەک حوسەین، کوڕی ئەحمەد، کوڕی تەلحە و ئەبولفەزل، کوڕی جەیروون و ئەبووخـەتتاب و حافیز ئەبووئەسعەدی سەمعانی، خوێندوویە و لە زانستی ریـازی و فـەرائیز و مەواریـسدا گەیـشتۆتە پلـەی ئوستادی.

ئەبوومزەففەر لە بازارچەی ڕەیحانیدا چاوەدووکانێکی هەبووە، بەهارات و هەزوێڵەی فرۆشتووە و بە داهاتی ئەو دووکانەوە ژیاوە و قوتابیان هەر لەو شوێنە خزمەتی گەیشتوون و خوێندوویانە.

ئەم مامۆستایە سەرەتی دواییینی ژیانی چۆتە شـاری خـەلات و سالّـی ٥٥٥ ک. م. لـەو شـارە، کـۆچی یەکجاری کردووە.

*طبقات‌الشّافعیّةالکبری*، چاپی میسر، ب٤، ل٨٧.

## ئەبووتاهیر یەحیای شارەزووری

قازی تاجەدین، کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی قاسم، لە بنەماڵەی شارەزوورییان و لە زانایانی فـیقهـ و وێـژە دێتـە ئەژمار کە لە ناوچەی جزیر و بۆتانەوە سەریهەڵداوە و پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، هـەر لـەوێ وانـەی گوتۆتەوە و دادوەری کردووە و سـەرەنجام ڕۆژی دووشـەمبە، نـۆزدەی ڕەمـەزانی سالّـی ٥٥٦ ک. م. (بـە واتەی«*طَبَقات*»)، یان ٥٥٠ (وەک« ابن‌اثیر» دەڵێ)، دنیای بەجێهێشتووە.

*تاریخ الکامل*، ابن‌اثیر ، ب١١، ل٩١. *طبقات‌الشّافعیّة*، ب٤، ل٣٢٢.

## ئەبووعەبدوڵلا حوسەینی شارەزووری

ئەبووعەبدوڵلا حوسەین، کوڕی عەلی، کوڕی قاسم، کوڕی مزەفـەری شـارەزووری، لـە زانایـانی بنەماڵـەی شـارەزوورییانە کـە لـە مووسـڵ هاتۆتـە دنیـا و لـە بەغدانیـشتەجێ بـووە و دادوەری دیـوانی دەسـەڵات (دارُالخلافە)ی بەغدای لە ئەستۆ گرتووە و سەرەنجام سالّی ٥٥٧ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

ئەبووعەبدوڵلا لە حەدیسدا شـارەزاییەکی تـەواوی هـەبووە و لـەم بابەتـەدا، بـە شـاگردی ئەبولبـەرەکات موحەممەد، کوڕی خەمیسی جەهنی ناوی لێ براوە.

*طبقات‌الشّافعیّة*، ب٤، ل٢١٤.

## شێخ عەدی (ئادی) هەکاری

شەرەفەدین ئەبولفەزائیل عەدی، کوڕی مسافر، کوڕی مووسا، لە زانایان و مەشایخی دامەزرێنەری تەریقەتێکی سۆفییانە کە دواجار بە ناوی خۆیەوە «عەدەوییە»ی پێ گوترا.

شێخ عەدی هاوقسەی شێخ عەبدولقادیری گەیلانی و زیائەدین ئەبووجەنب عەبدولقاهیری سوورەبەردی بووە و ماوەی چوارساڵ لە مەدینە لانشینی کردووە و ئەمجار چۆتە هەکاری و لەوێ خانەقایەکی بۆ عیبادەت و فێرکاری تەریقەت کردۆتەوە و هەر لەوێ ساڵی ٥٥٧ یان ٥٥٨ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

تەریقەی شێخ عەدی هەر لە سەردەمی ژیانی خۆیدا پەرەی ساند و لە ناو هەموو چینێکی خەڵکدا پێشوازی لێ کرا و مەردمێکی زۆر سەریان پێ ئەسپارد. بەڵام دوای لە دنیا دەرچوونی، تاقمێک لە شوێنکەوتوانی لە پەسن‌دانیدا ڕادەیان ڕانەگرت و قەبریان کردە قیبلەی نیاز و داخوازان و لە تاکەپەرستی لایان دا.

شوێنگرانی تەریقەتی عەدەوییە ئەوڕۆکە زۆرتر لە ناوچەی سۆران و دەوروبەری مووسڵ و سنجار و باشووری کوردستاندان و گوندی «لالەش» ناوەندیانە و «یەزیدی»یان پێ دەڵێن.

لەمەڕ بیر و بڕوای یەزیدییان یان «ئیزەدی»یانەوە قسە و باس زۆرە و وێدەچێ تێکەڵێک بێ لە لە چەند ئایین، بە دەستتێوەردانێکی تایبەتەوە.

شێخ عەدی (ئادی) ساڵی ٤٦٧ ک. م. لە دایک بووە و ٥٥٧ لە دنیا دەرچووە.

*تاریخ ابن خلکان*، ب١، ل٣١٦. *طبقات شَعرانی*، ب١، ل١٣٦. *الأعلام*، ب٥، ل١١. *هدیة العارفین*، ب١، ل٦٦٢. *شەرەفنامەی بدلیسی*، وەرگێڕانی هەژار، ل٢٣.

## ئیبنولبەزری[1] جزیری

ئەبولقاسم عومەر، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئەحمەدی جزیری، نازناو «جمالُ‌الاسلام» و ناسراو بە «ابنُ‌البَزری»، لە زانایانی ناودار و مەلایان و حافیزانی پایەبەرز و پێشەوایانی ڕۆژگاری خۆی بووە کە لە زۆربەی وڵاتە موسوڵمانەکانەوە، پرسیاری دینییان لێ کردووە و فتواکانیان بە گیان و دڵ وەرگرتووە.

مامۆستا ئیبنولبەرزی خوێندنی لە زێدی خۆی (جزیر)، لە خزمەت شێخ ئەبولغەنائیم موحەممەد، کوڕی فەرەجی فاریقی دەسپێکرد و پاشان چوو بۆ بەغدا و لە کۆڕی دەرسی زانایانی وەک «کیاهراسی» و حوجەتولئیسلام ئەبووحامیدی غەززالی بەهرەی گرت و ئەمجار گەڕایەوە جزیر و تا دوا کاتی ژیان بە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە و فتوادانی ڕابوارد.

---

١. بەزری، سەر بە «**بە زر**» واتا: «**کەتان**». بەو بۆنەوە بابی جووتیار بووە وایان پێ گوتووە.

**لە کتێبەکانی**: « *الاسامی و العَلَل مِن کتاب المُهَذَّب و الفَتاوی*» .

*طبقاتُ الشّافعیّة*، ب٤، ل٢٨٨. *الأعلام* ، ب٥، ل٢٢٢. *تاریخ الکامل*، ابن اثیر، ب١١، ل١٤٤. *تاریخ ابن خلکان*، ب١، ل ٣٨٠.

## ئەبووسەعید موحەممەدی جاوانی (گاوانی)[1]

ئەبووسەعید موحەممەد ناسراو بە «ابنُ اَبی الهیجاء» کە ناسناوی «اَبوعبدالله»شیان پێ داوە، کوڕی عەلی، کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی ئەحمەد لە هۆزی گاوان، زانایەکی هەڵکەوتە و وێژەوانێکی هێژا بووە کە لە بەغدا لای مامۆستایانێکی وەک ئیمام غەززالی و شاشی و کیاهراسی خوێندوویە، لە ئەبولقاسم قوشیری، حەدیسی وەرگرتووە ، «مَقامات حَریری» لە خزمەت نووسەرەکەیدا دەور کردەۆتەوە و بە کورتی لە هەموو بارێکەوە شارەزایی دەسکەوتووە.

**لە کتێبەکانی**: « *التّبیان، الذّخیره لاهل البصیره*»، «*عُیون الشّعر*»، «*شرحِ مَقامات حریری*»، «*الفرق بین الرّاء*»، « *العین*» و دیوانی ئەشعار.

*طبقات الشّافعیّة*، ب٤، ل٨٨. *کشفُ الظّنون* ، ب٢، ل١٤٤ و١٨٧ و ٤٩٦. *هدیة العارفین*، ب٢، ل٩٥. *ایضاح المکنون*، ب٢، ل١٣٤ و٤٨٤.

## تاجەدین عەبدولغەففار

ناسراو بە «شمسُ الائمّه»، کوڕی لوقمان، کوڕی موحەممەدی حەنەفی کوردی، لە زانایانی چەرخی شەشەمە کە لە زێدی خۆی دەرکەوتووە و لە شاری حەلەب نیشتەجێ بووە و لەوێ دەرسی گوتووە و دادوەری کردووە و سەرەنجام ساڵی ٥٦٢ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

**لە کتێبەکانی**: « *المُفید و المزید*»، کە شەرحێکە لە کتێبی «*تجرید فی الفروع*»، نووسراوی ئەمیروویەی کرمانی حەنەفی و ڕاژەیەک لە « *الجامع الصّغیر فی الفروع*»، نووسراوەی ئیمام موحەممەدی شەیبانی و کتێبێک بە ناوی « *اُصولُ الکُردی*».

*کشفُ الظّنون* ، ب١، ل١١٦ و ٢٤٩ و ٣٧٨.

---

١. جاوان (**گاوان**)، هۆزێکی کوردە، نیشتەجێی شاری حیللە، کە زۆر پیاوی گەورە، لە زانا و ئەمیریان لێ کەوتووتەوە. بڕوانە بۆ سەرەتای کتێبەکە، باسی **گاوانی ئەسحابە**.

*لُغتنامەی دهخدا*، زنجیرەژمارەی ٦٠، ل١٤٤.

## ئەبولفەزائیل عەبدوڕڕەحیمی زەنجانی

باوکی ڕۆسەمی ناو بووە و لە کوردی دەوروبەری زەنجانن. ئەبولفەزائیل فیقهی لە بەغدا لای مامۆستای ئـەو زانستە، ئەبوومەنسووری ڕەززاز خوێندووە و پاشان بۆ دمـشق چـووە و لـەوێش ماوەیـەک خـەریک بـووە و ئەمجار بۆتە قازی شاری بەعلبەک و ساڵی ٥٦٣ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

ئەم مامۆستایە لە ئوسوول و تەجوید و قەرائەتدا شارەزاییەکی تەواوی هەبووە.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٤، ل٢٤٩.

## زیائەدینی سوورەبەردی

زیائەدین ئەبوونەجیب عەبدولقاهیر،کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەموویە، لە پێشەنگان و وتاربێژانی ناوداری سۆفیان و هەروەها لە مەلایانی بەناوبانگی ڕێبازی شافیعییە کە ساڵی ٤٩٠ ک. م. لە سوورەبەرد هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە، ڕۆیوە بۆ بەغدا و لە قوتابخانەی نیزامییە خوێندنی تـەواو کردووە و پاشان چۆتە کۆڕی سـۆفیان و بۆتـە هاوقـسەی شـێخ ئەحمـەدی غـەززالی و ماوەیـەکیش گۆشەنشینی هەڵبژاردووە. ئەمجار گەڕاوەتەوە نێو خەڵک و دەستی داوەتە وتاردان و مۆچیاری مەردم و هاوکات بانگ کراوە بۆ مامۆستایی نیزامییە (٥٤٥ ک. م.) و ژمارێکی زۆر لە قوتابیان و ڕێڕەوان، هەم لە باری زانستی و هەم لە بواری ئامۆژیارییەوە بەهرەیان لێ بردووە. چەند سەفەریشی بۆ مووسڵ و شام کردووە و هەرکوێ چووە، کۆڕی ئامۆژگاری پێکهێناوە و خەڵکێکی زۆر، بە تامەزرۆییەوە گوێیـان بـۆ شل کردووە.

ئەم مامۆستایە تا ئاخر هەر نیشتەجێی بەغدا بووە و سەرەنجام ساڵی ٥٦٣ ک. م. لەو شـارە، ئـەو دنیایـە بەجێ هێشتووە.

زیائەدین مامی شێخ شەهابەدینی سوورەبـەردییـە و پـشتی ئـەم بنەماڵـە دەگاتـەوە خەلیفـەی یەکـەم حەزرەتی ئەبووبەکر (رضی‌الله عَنهُ).

**لە کتێبەکانی**: «*آدابُ المُریدین*»، «*شرح الاسماء الحُسنی*» و «*غریب المصابیح*».

*دائرة المعارف*، فرید وَجدی، *تاریخ ابن خلکان*، ب١، ل٢٩٩.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٤، ل٢٥٦. *الأعلام* ، ب٤، ل١٧٤.

## پیرشالیاری دووەمی هەورامی

سەید موستەفا، ناسراو بە «پیرشالیاری دووەم»، خەڵکی هەورامان، پیاوێکی زانا و عارف، هاوچـەرخی قـوتبی تەریقەت شێخ عەبدولقادری گەیلانی (٤٧١-٥٦١) و لە مەنسووبانی بووە. بۆ فێربوونی زانست و وەرگـرتنی

تەریقەت، زێدی خۆی بەجێ‌هێشتووە و بۆ بەغدا چووە و پاش تێگەییشتن و پێگەییشتن، گەڕاوەتەوە هەورامان و ڕێگای ئیرشادی گرتۆتەبەر و خەڵکەکەی پتر لە پێشوو، لە ئیسلام و ئەرکی دینداری ئاگادار کردووە و هاوکات لەسەر داخوازی خەڵک، کتێبی «*مارفەتوو پیرشالیار*»، هۆنراوەی پیرشالیاری هەوەڵی دەست تێ‌بردووە؛ قسەی نەستەق و دەستەواژە و ئامۆژگارییەکانی هەروا هێشتووتەوە و چی باسی ئایینی کۆنی زەردەشتی بووە، لێی سڕیوەتەوە و فەرمانی شەرعی ئیسلامی ناوەتە جێ. ئێستاکە [بە داخەوە] ئەگەر ڕوونووسێک لەو کتێبە لە هەورامان مابێتەوە، وەرگەڕاوەکەی سەید موستەفایە.

چەند یاداشتێک لە: *مێژووی دەسنووسی هەورامان*.

## نەجمەدینی شارەزووری

قازی نەجمەدین کوڕی موحەممەد، کوڕی عەلی، پیاوێکی زانا و دیندار بووە کە تا دوامینساڵی ژیانی (٥٦٤ ک. م.) لە مووسڵ دادوەری کردووە.

ئەم بابی قازی حوجەتودین عەبدولقاهیرە؛ کە باسی ئەویش دەکەین.

*تاریخ‌الکامل*، ابن‌اثیر.

## ئەبووعەلی حەسەنی شارەزووری

قازی ئەبووعەلی، کوڕی عەلی، کوڕی قاسم، لە بنەماڵەی شارەزوورییانە کە مامۆستایەکی پایەبەرز و دادوەرێکی بەناوبانگ بووە و ساڵی ٤٩٧ ک. م. هاتۆتە دنیاوە و سێهەمی زیحەججەی ٥٦٤ کۆچی دوایی کردووە.

وەک نووسراوە، قازی ئەبووعەلی دەرسی فیقهی لای شێخ ئەبوومەنسووری ڕەززاز خوێندووە.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٤، ل٢١١.

## ئەبولعەباس، خدر (خضر)ی هەولێری

کوڕی نەسر، کوڕی عەقیل، یەک لە فەقیهانی شافیعی و مامۆستای بێ‌شکی ئوسوولە کە ساڵی ٤٧٨ ک. م. لە هەولێر هاتۆتە دنیا و ٥٦٧ هەر لەو شارە لە دنیا دەرچووە. ئەو لە بەغدا لای کیاهراسی و ئیبنوشاشی خوێندنی تەواو کردووە و پاشان گەڕاوەتەوە هەولێر.

ساڵی ٥٣٣ ک. م. ئەمیر مەنسوور، میری هەولێر، قوتابخانەیەکی بۆ دەرس‌گوتنەوەی مامۆستا بنیات ناوە کە تا ماوە، لەوێدا خەریکی بارهێنان و ڕاهێنانی قوتابیان بووە.

ئەبولعەباس لە تەفسیر و حەدیس وفیقهدا کتێب و نووسراوەی زۆر بوون؛ بۆ وێنە کتێبێکە بریتی لە ٣٦

خوتبەی پێغەمبەری ئیسلام، سەلام و دروودی خوای لێ بێ، بە بەڵگە و لێکدانەوەی خاڵە گرینگەکانییەوە.

بێجگە لە پلە و پایەی بەرزی زانستی، ئەم مامۆستایە لە باری پارێزکاری و لە خواترسیشەوە زۆر جێ بڕوای خەڵک بووە هەمووان سەریان پێ سپاردووە.

*تاریخ ابن خلکان*، ب۱، ل۱۷۱. *طبقات الشّافعیّه*، ب٤، ل۲۱۸. *الأعلام*، ب۲، ل۳٥٤.

## عەبدولقاهیری شارەزووری

قازی حوجەتودین ئەبووسەعادات عەبدولقاهیر، کوڕی قازی نەجمەدین،[۱] کوڕی موحەممەد، کوڕی عەلی شارەزووری، لە زانایانی ناوداری مووسڵ لە چەرخی شەشەمدا بووە کە دوای کۆچی دوایی بابی، هاوکات لەگەڵ دەرس گوتنەوە و وتاردان، دادوەری مووسڵیشی گرتۆتە ئەستۆ.

ساڵی لە دنیادەرچوونی قازی حوجەتودین ٥۷۱ ک. م. نووسراوە.

*هدیة العارفین*، ب۱، ل٦۰۷. *تاریخ الکامل*.

## ئەبولحەسەن موحەممەدی خاوەرانی

ئەبولحەسەن موحەممەد، کوڕی موحەممەد، خەڵکی خاوەرانی خەلات، لە زانایانی چەرخی شەشەمە کە بە شوێن زانست و تێگەیشتندا، زۆر شوێنان ڕۆیوە و لە هەر گۆشەیەک تۆشەیەک و لە هەر خەرمانێ داوێنێکی چنیوەتەوە. بۆ وێنە لە بەغدا ماوەیەک لە خزمەتی ئیمام غەززالی و عەللامە زەمەخشەریدا بووە.

**لە کتێبەکانی**: «*کتاب الادَوات*»، «*کتاب التصریف*»، «*نُخبَة الاعِراب*»، «*التلویح شرح مصابیح بَغَوی*»، «*النّقایه فی الفرائض*»، «*سیر المُلوک*»، «*النخَب و النکَت*».

خاوەرانی ساڵی ٥۷۱ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

*ایضاح المکنون*، ب۲، ل۲٤٦، ۲۸۲، ۳٤٤، ٦۲۹. *هدیة العارفین*، ب۲، ل۹۸.

## کەمالەددین موحەممەدی شارەزووری

«قاضی القُضاة» کەمالەدین ئەبولفەزل موحەممەد، کوڕی ئەبووموحەممەدی عەبدوڵڵای شارەزووری، لە ناودارانی بنەماڵەی شارەزوورییە کە ساڵی ٤۹۲ ک. م. هاتە دنیا و کە پێگەیشت، چووە بەغدا و فیقهی لای مامۆستا ئەسعەد و حەدیسی لە خزمەت ئەبووبەرەکات موحەممەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی خەمیسی

---

۱. لە «*هدیة العارفین*»دا، قازی حوجەتودینی بە کوڕی موحەممەد، کوڕی عەلی ناساندووە؛ بەڵام ڕاست ئەوەیە کە کوڕی نەجمەدینە و نەجمەدین کوڕی موحەممەدە.

مووسڵی خوێند و پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، بوو بە قازی مووسڵ و لەوێ قوتابخانەیەکی بۆ ڕاهێنـانی قوتابیان لە مەڕ فیقھ و ئوسوولی ڕێبازی شافیعی کردەوە و ماوەیەکیش لە دمشق دادوەری کرد تـا ئـەوەی کە بوو بە وەزیری نوورەدین مەحموود، کوڕی زەنگی، میری شام و کە مەحموود مرد، ئەمجار لە دەربـاری سوڵتان سەلاحەدیندا بوو بە وەزیر.

کەمالەدین پیاوێکی فەقیھ، وێژەر، نووسەر، شاعیر و دەمپاراو بووە و لە باری زانستی کـەلام و ئوسـوول و هونەری وتووێژدا شارەزاییەکی تەواوی هەبووە. لە مەدینەی پیرۆز، بە خەرجی خـۆی کاروانـسەرایەکی بـۆ ڕێبواران و نامۆیان کردۆتەوە و مەوقووفاتێکیشی بۆ داناوە و هەروەها لە چەند شاریتـریش وەک: مووسـڵ و دمشق و نوسەیبین، شوێنەواری خێری لە دووی خۆی بەجێهێشتووە.

نموونەیەک لە شیعرەکانی:

یـــا رَبِّ لا تُحْیِنـــی إلـــی زَمَـــن اَکُـــونُ کَـــلاً بِـــه عَلـــی اَحَـــد
خُـــذْ بِیَـــدی قَبْـــلَ اَنْ أقُـــولَ لِمَـــنْ ألقـــاهُ عِنْـــدَ القیـــام، خُـــذْ بِیَـــدی

**واتا**: پەروەرێنم! ئەمەندەم تەمەن مەدەیە ببمە سەرباری کەسـێک و دەسـتم بگـرە، پـێش ئـەوەی بـۆ هەستانەوە داوا لە کەسێکی بکەم. دەسا تۆخوا دەستم بگرە!

کەماڵەدین ڕۆژی پێنجشەمبە، شەشەمی مانگی محـەڕڕەمی ساڵـی ٥٧٢ ک. م. گیـانی پـاکی بـۆ لای خوای تاک گەڕاوە.

*طبقاتُ الشّافعیّة*، ب٤، ل٧٤. *تاریخ ابن خلکـان*، ب١، ل٤٧٢. *الأعـلام زرکلـی*، ب٧، ل١٠٧.

## مەحیەددین ئەحمەدی شارەزووری

کوڕی موحەممەد، کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی قاسم، لـە قازییـانی بنەماڵـەی شـارەزووری و زانایـانی نـاوداری شاری مووسڵە کە ساڵی ٥٢٧ ک. م. لە دایک بووە و ٥٧٣ کۆچی یەکجاری کردووە.

*طبقاتُ الشّافعیّةُالکبری*، ب٤، ل٥٣.

## شێخ موحەممەدی سەلماسی

موحەممەد، کوڕی هەیبەتوڵڵا، کوڕی عەبدوڵڵا، مامۆستایەکی گەورە، لە کوردانی سەلماسی لای ئازربایجانـە کە لە بواری سۆفییەتیشدا دەستێکی باڵای هەبووە و ساڵی ٥٧٤ ک. م. لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

*مشاهیرالکُرد*، ئەمین زەکیبەگ.



## شەهدەی دینەوەری «فَخرُالنساء»

چەرخی پێنجەم و شەشەمی کۆچی، لە ناو چینی ژناندا، کەسانی هێژا و تەنانەت سەرامەی زۆر هەڵکەوتوون کە لە زانست و خواناسی و عیرفاندا، بەرچاو بوون. یەک لەوانە «فَخرُالنّساء» شەهدە، کچی ئەبوونەسری ئەحمەد، کوڕی فەرەج، کوڕی عومەری ئەبری[1] دینەوەری بووە کە ساڵی ٤٨٥ ک. م. هاتۆتە دنیا. ئەم خاتوونە بەڕێزە لە فیقهو حەدیس و ڕەوایەتدا ناسراوی شاری بەغدا بووە و قوتابیان ـلە ژن و پیاوـ هەموو ڕۆژێ لە کۆڕی دەرسیدا کۆ بوونەتەوە و بەهرەیان بردووە.

شەهدە خەتیشی جوان نووسیوە و بەو بۆنەوە «شَهدةالكاتبە»شیان پێ گوتووە. لە هەموو خۆشتر ئەوەیە دەنگیشی خۆش بووە. هاوسەرەکەی پیاوێکی زانای وێژەوانی خەڵکی بەغدا بەناوی «ثِقَـةُالدّولـه» عەلی، کوڕی موحەممەد، ناسراو بە «ابن‌الأنباری» بووە.

ئەم خاتوونە پیتۆڵە سەرەنجام ساڵی ٥٧٤ لە بەغدا، کۆچی یەکجاری کردووە.

*تاریخ‌ابن‌خلکان*، ب١، ل٢٢٦. *خَیراتٌ حسان*، ب٢، ل١١٨. *الأعلام زرکلی*، ب٣، ل٢٥٩.

## ئەبولقاسم عەبدوڵڵای شارەزووری

کوڕی قاسم، کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی قاسم، لە مامۆستایان و پیاوانی تێگەیشتووی بنەماڵەی شارەزووریانە کە ساڵی ٥٧٥ ک. م. لە شاری مووسڵ کۆچی دوایی کردووە.

*طبقاتُ الشّافعیّةالکبری*، ب٤، ل٢٣٥.

## ئەبولمەحاسینی شارەزووری

«أبوالمَحاسن» موحەممەد، کوڕی حەسەن، کوڕی عەلی، کوڕی قاسمی شارەزووری، کە لە ساڵی ٥٢٠ ک. م. هاتۆتە دنیا، لە پیاوانی زانا و بەناوبانگی بنەماڵەی شارەزوورییە کە دوای ساڵیانێکی زۆر دادوەری لە وڵاتدا، سەرەنجام لە مووسڵ گرساوەتەوە و لەوێ تا دواکاتی ژیانی (٥٧٥) قازی بووە.

*طبقاتُ الشّافعیّةالکبری*، ب٤، ل٦٧.

## شێخ ڕەزی ئەربیلی

«رضی‌الدّین» یۆنس، کوڕی موحەممەد، کوڕی مەنعە، خەڵکی هەولێرە کە سەرەتا لە زێدی خۆی

---

١. «**اِبْری**»، سەر بە «**اِبْرە**»یە، واتا دەرزی. بەو بۆنەوە ئەم لەقەمیانە پێداون کە باپیرێک و هەروەها بابی شەهدە خەیات بوون.

خوێندوویە و پاشان چۆتە مووسڵ و لای تاجولئیسلام، ئەبووعەبدوڵڵا حوسەین، کوڕی نەسر، ناسراو بە ئیبنوخەمیسی کەعبی جەهنی، فێری فیقهـ بووە. ئەمجار ڕووی لە بەغدا ناوە و لە نیزامییە خزمەتی شێخ ئەبوومەنسووری سەعید، کوڕی موحەممەد، کوڕی عومەر ناسراو بە «ابن‌الرّزاز» گەیشتووە و دوای ماوەیەک ئیجازەی وەرگرتووە.

شێخ ڕەزی لەودوا لای ئەمیر زەینودین، ئەبووحەسەن عەلی، حاکمی هەولێرەوە جێگە و پێگەیەکی باشی پەیدا کردووە و لە قوتابخانەیەکی ئەوشارەدا دەرسی گوتۆتەوە و سەرەنجام ساڵی ٥٧٦ ک. م. (لە تەمەنی ٦٨ ساڵی) کۆچی دوایی کردووە.[١]

*تاریخ‌ابن‌خلکان*، ب٢، ل٤١٩.

## ئەبووتاهیر ئیبراهیمی جزیری شافیعی

ناوبراو کوڕی موحەممەد، کوڕی میهران، خەڵکی جزیر و بۆتانە کە زانایەکی پارێزکار و مامۆستایەکی خاوەن ئاکار بووە؛ فیقهی بە لای ئوستادی لەزەبری ئەم ڕشتەوە (ئیبنولبەزری) و حەدیسی لە بەغدا لە کن ئەبولفەتحی کوردجییەوە خوێندووە و لە هەر دوو زانستدا پلەی مامۆستایی دەسکەوتووە و تا ئاخری ژیانی دەرسی گوتۆتەوە و لە ئیمامانی ڕۆژگاری خۆی بووە.

لەدایک بوون و لە دنیا دەرچوونی ئەبووتاهیریان ٥١٤ و ٥٧٧ ک. م. نووسیوە.[٢]

*تاریخ‌الکامل*، ابن‌اثیر، ب١١، ل٢١٥. *طبقاتُ الشّافعیّة*، ب٤، ل٢٠٠.

## شاتانی دیاربەکری

ئەبووعەلی حەسەن، کوڕی سەعید، کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی بندار، زانایەکی وێژەوان و شاعیر بووە کە ساڵی ٥١٠ ک. م. لە گوندی شاتان،[٣] سەر بە دیاربەکر هاتۆتە دنیا. لە بەغدا لای ئەبووحەسەن، کوڕی سلێمان و قازی ئەبووعەلی فاریقی و ئەبوومەنسووری ڕەززاز، فیقهی خوێندووە و لە کۆڕی دەرسی هیبەتودینی حەسین و موحەممەد کوڕی عەبدولباقی ئەنساری، فێری حەدیس بووە. بۆ ئەدەبیاتیش چۆتە ڕیزی قوتابیانی ئیبنوسەجزی و ئیبنولجەولیقییەوە.

---

١. کەسانی‌تر لە زاروزێچی شێخ ڕەزی، پلە و پایەی زانستی و ناو ناوبانگی ئایینی و عیرفانییان دەسکەوتووە، کە لەبەرێکەوە باسیان دەکەین.

٢. لە «*طبقات‌الشّافعیّة*»دا ساڵی مردنی ٥٩٩ ک. م. نووسراوە.

٣. «*تاریخ الکامل ابن‌اثیر*» لە ناو ڕووداوانی ساڵی ٥٥٦ دا، دەڵێ: «**شاتان** گوند و قەڵایەکە لە دیاربەکر، هی خێڵێکی کورد بە ناوی جوونییە».

ئەبووعەلی دوای تەواوکردنی دەرس و خوێندن، چووە مووسڵ و ساڵی ٥٧٩[1] ک. م. لەو شارە کۆچی یەکجاری کرد.

شیعری ئەوە:

أهْدى الى جَسَدى الضَّنى فَأعَلَّهُ — وَعَسى يَرِقُّ لعَبْدِه وَلَعَلَّهُ
ما كُنْتُ أحْسَبُ أنَّ عقْدَ تَجَلُّدى — يَنْحَلُّ بالهِجْران حَتى حَلَّهُ
ياوَيح قَلْبى اَيْنَ أطْلُبُهُ وَقَدْ — نادى بِه داعى الْهَوى فأضَلَّهُ
وَأشَدُّ ما يَلْقاهُ مِنْ اَلَم الهَوى — قَولُ العَواذل أنَّهُ قَدْ مَلَّهُ

*طبقاتُ الشّافعيّة*، ب٤، ل٢١٠. *الأعلام*، ب٢، ل٢٠٦.

*لُغتنامەی دهخُدا*، پیتی الف، ل٦٧٥ و پیتی ش، ل٣٤.

## شێخ جاگیری کوردی

ناوبراو لە مەشایخی جێبڕوای چەرخی شەشەم و مریدانی تاجولعارفین شێخ ئەبولوەفای کوردییە کە بە شوێن مرادیدا، زێدی خۆی بەجێهێشتووە و زۆر شاران گەڕاوە و پاش گەیشتن بە ئاواتی، لە شاری سامەرادا گیرساوەتەوە و هەر لەوێ لە نێوان سالانی ٥٦٠ تا ٥٩٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

مەولانای جامی لە «*نَفَحاتُ الانس*»دا، لە بارەی شێخ جاگیرەوە دەڵێ: «شێخ جاگیر لە کوردان بوو، لە دەشتێک لەو دەشتانەی عیراقدا؛ لە سامەرا نیشتەجێ بوو. لەوێ دەبوو تا ساڵی ٥٩٠ لە دنیا چوو؛ زیارەتی هەر لەوێیە. ئەو دەڵێ: مَنْ شاهَدَالحَقَّ عزّوَجّلَّ فی سِرِّه، سَقَطَالکَوْنُ مِنْ قَلْبه. شێخ ئەبولوەفا پێیدا هەڵگوتووە و تاقیلەی خۆی ـبە شێخ عەلی هەیئەتیداـ بۆ ناردووە...».

*طبقات شیخ شَعرانی*، ب١، ل١٤٨. *نَفَحاتُ الأنس*، تاران، ١٣٣٧، ل ٥٣٦.

## ئەبولعەباس خدر (خضر)ی جزیری

ئەبولعەباسی خدر، کوڕی سەروان، کوڕی ئەحمەد، کوڕی عەبدوڵلای زەریری تۆماسی، خەڵکی تۆماسای جزیرە لە عیراقدا کە ساڵی ٥٠٥ ک. م. لەوێ هاتۆتە دنیا و لە میافارقین گەورە بووە و ٥٨٠ لە جزیر کۆچی دوایی کردووە.[2]

ئەبولعەباس لە موقرییانی زانا و وێژەوان و پیاوێکی عارف و دەمپاراو و شاعیرێکی بیرتێژ بووە. بە لاوی بۆ

---

١. «*لُغتنامه*» ساڵی مەرگی ئەبووعەلی حەسەنی لە شوێنێک ٥٧٩ و لە شوێنێکیتر ٥٩٩ نووسیوە!

٢. لە «*لُغتنامه*»دا بە هەڵە ساڵی هاتنەدنیای، ساڵی مەرگی نووسراوە.

بەغدا چووە و لە شەرعی شافیعیدا بۆتە مامۆستا و ئەگەرچی کوێر بووە، حەدیس و وێژەی باش زانیوە.

ئەمەش دوو نموونە لە شیعرەکانی:

مَــواعظُ الــدَّهْر أدَّبْتنــی وَ انَّمــا یــوعَظ الأدیــبُ
لَـمْ یَمـض بُـؤسٌ وَ لا نَعـیمٌ الّــا وَلــی فیهمــا نــصیبٌ

* * *

اَنْــتَ فــی غَمْــرَة النَّعــیم تَعــوُمُ لَــسْتَ تَــدْری بــأنَّ ذا لا یَــدومُ
کَــمْ رَأیْنــا مــن المُلــوك قَــدیماً هَمَــدُوا، فَالعظــامُ مــنْهُمْ رَمــیمُ
مـا رَأیْنَـا الزَّمـانَ أبْقـی عَلـی شَخْـ ـــص شَــقاءً، فَهَــلْ یَــدُوم النَّعــیمُ
وَ الغنــی عنْــدَ اَهْلــه مُــسْتَعارٌ فَحَمیــدٌ بــه و مــنهُمْ ذَمــیمُ

*مُعجَم‌الأُدَبا*، ب١١، ل٥٩ تا ٦١.

## عەممار یاسری بدلیسی

عارفی بەناوبانگ شێخ عەمماری یاسر، لە مریدانی شێخ ئەبوونەجیبی سوورەبەردی (؟- ٥٦٣ ک. م.) و مورشیدی شێخ نەجمەدینی کوبرا (؟_ ٦١٨ ک. م.) و حوسامەدین عەلی بدلیسی،[١] کەڵەپیاوێک لە کوردانی بدلیس بووە کە ساڵی ٥٨٢ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*نَفَحات‌الأُنس*، ل ٤١٧. *حَبیبُ‌السِّیَر*، چاپی خەییام، ب٣، ل٣٦. *لُغتنامەی دهخدا*، زنجیرە ژمارەی ٨٥، ل٣١٣.

## عەلی جزیری

عەلی کوڕی خەتتابی جزیری لە پارێزکارانی خاوەن کەرامەت و زانایانی ناوازەی جزیر و بۆتانە کە «الشّیخ الصّالح»یان پێ گوتووە و هاوچەرخ و هاودەنگی «ابن‌اثیر» نووسەری «*تاریخ‌الکامل*» بووە و ساڵی ٥٨٣ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*تاریخ‌الکامل*، ابن‌اثیر، ب١١، ل٢٥٦.

## موەففەقەدینی ئەربیلی

ئەبووعەبدوڵلا موحەممەد، کوڕی یۆسف، نازناو «موفّق‌الدّین»، خەڵکی هەولێر و لە پێشڕەوانی زانست و وێژە

١. باسی ئەویش لە داهاتوودا دێ.

و مامۆستای عەرووز و قافیە و شیعر و مووسیقا بووە و لە زانستەکانی تریشدا سەریدەرچووە.

کاتی خۆی بابی بۆ کار چۆتە بەحرەین و ئەبووعەبدوڵڵا لەوێ هاتۆتە دنیا و پاشان گەڕاونەوە هەولێر و کە بایباڵی داوە، ماوەیەک لەو شارە و هێندێک لە شوێنانی تری عیراق خوێندوویە و ئەوجار چۆتە دمشق و چەندساڵێکیش لەوێ خەریک بووە و ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتوە هەولێر و دەرسی داوە. یەک لە شاگردە ناودارەکانی، ئەبولبەرەکات «ابن‌المُستَوفی» هەولێرییە.

«موفّق‌الدّین» هەر لە منداڵییەوە شیعری هۆنیوەتەوە و شیعری لەوپەڕی ناسکی و جوانیدایە و یەک لەوانەی کە بە شیعری پەسنیداوە، سوڵتان سەلاحەدینی ئەییووبی بووە.

**کتێبەکانی**: *دیوانی شیعر* و *سەرجەمی نامیلکەکانی*؛ هەکیان بە عەرەبی.

*تاریخ ابن‌خَلکان*، ب٢، ل٢٤. *الأعلام*، ب٨، ل٢٣.

## زیائەددین عیسای هەکاری

مامۆستا ئەبوومحەممەد زیائەدین عیسا، کوڕی موحەممەد، کوڕی عیسا، لە کەڵەپیاوانی جێ متمانە و میرانی تێگەیشتوو و خاوەن دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەییووبیان بووە. سەرەتا لە قوتابخانەی زوجاجییەی شاری حەلەب فیقهی دەرسداوە و ماوەیەکیش پێشنوێژ و ڕاوێژکاری ئەسەدەدین شێرکۆ مامی سەلاحەدین ئەییووبی بووە و فتوای دینی بۆ داوە.

پاش مردنی شێرکۆ، لە دەورانی میری و وەزیری سەلاحەدیندا، پلە و پایەی زیائەدین زۆر چۆتە سەرتر و بۆتە ڕاوێژیاری تایبەت و جێبڕوای ئەو. کە سەلاحەدین بۆتە سوڵتان، تەنانەت لە کاروباری وڵات و لەشکریشدا پرسی پێ کردووە.

ئەبوومحەممەد زیائەدین، بەرگی چەکداری لەبەر کردووە و مێزەریشی لە سەر ناوە و سەرەنجام ڕۆژی سێشەممە، نۆهەمی مانگی زیقەعدەی ساڵی ٥٨٥ ک. م. ئەمری خوای بەجێ هێناوە و لە شاری قودس نێژراوە.

*الأعلام*، ب٥، ل٢٩٣. *تاریخ ابن‌خَلکان*، ب١، ل٣٩٧.

## مەحیەدین ئەبووحامید، موحەممەدی شارەزووری

کوڕی قازی کەمالەدین موحەممەدی شارەزووری[1]، ناسراو بە «قاضی‌القُضاة»، یەک لە ئەستێرە گەشەکانی ئاسمانی زانست و وێژەیە کە لە بەغدا خوێندنی تەواو کرد؛ پاشان بەرەو شام ڕۆی و ماوەیەک قازی دمشق

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٥٦.

بوو. ساڵی ٥٥٥ ک. م. چووە حەلەب و بوو بە جێگری باوکی لە دادوەریدا. دوای باوکی (ساڵی ٥٧٢)، لای میری حەلەب، مەلیک ساڵەح ئیسماعیل، کوڕی نوورەدینی زەنگی، جێگە و پێگەیەکی پەیدا کرد؛ بەڵام لەودوا نەیاران بە لای میرەوە بۆیان تێچاند و نیوانیان تێکدا و ماوەیەک گردەنشین بوو. سەرەنجام حەڵەبی بەجێ‌هێشت و خۆی گەیاندە مووسڵ و لەوێ کاری دەرس‌گوتنەوە و دادوەری، پێکەوە دەسپێکرد و وردە وردە لە میری ئەوێ، عیززەدین مەسعوودی زەنگی، نێزیک بۆوە و ڕێز و وەجێکی تایبەتی دەست‌کەوت.

قازی موحیەدین لە داوەریدا هەمیشە لای داد و جوامێری گرتووە و زۆرتر تاوانی تاوانبارانی هەژاری لە گیرفانی خۆی داوە. کاتی پشوودانی بە خوێندنەوە و شیعرگوتن ڕابواردووە و سەرەنجام ساڵی ٥٨٦ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە. ساڵی هاتنەدنیای ٥١٠ نووسراوە.

نموونەیەک لە شیعری:

قامَتْ بِإثباتِ الصِّفاتِ اَدلَّةٌ ... قَصَمَتْ ظُهُورَ جَماعَةِ التَّعطيلِ

وَ طَلائِعُ التَّنزيهِ لَمّا أقْبَلَتْ ... هَزَمَتْ ذَوِي التَّشْبيهِ وَ التَّمثيلِ

فَالحَقُّ ما صِرْنا اِلَيهِ بجَمعِنا ... بِأدلَّةِ الاخبارِ وَ التَّنزيلِ

مَنْ لَم يكن بالشَّرعِ مُقتَدِيا فَقَدْ ... ألْقاهُ فَرْطُ الجَهْلِ فِي التَّضليل

*الأعلام*، ب٧، ل٢٥٢. *تاريخ ابن خَلكان*، ب١، ل ٤٧٣. *طبقاتُ الشّافعيّة*، ب ٤، ل ٩٩.

## شێخی ئیشراق

شەهابەدین ئەبولفەتح یەحیا سوورەبەردی، کوڕی حەبەش، کوڕی ئەمیرەک، لە گوندی سوورەبەرد (سُهرَوَرد)ی لای زەنجان هاتە دنیا و لە شاری مەراغە ماوەیەک لە خزمەتی مەجدەدینی جیلی بەهرەی برد. ساڵی ٥٧٩ ک. م. چوو بۆ حەلەب و لە هەموو کۆڕە زانستییەکانی ئەوێدا باسی فەلسەفی دامەزراند و قسەی وای کرد کە بۆ بڕێک قوت نەدەچوو؛ لە ئاکامدا وردە ـ وردە تۆمەتی لاڕێ بوونیان لێ دا. قازی ئیبنوخەلیکان لەم بارەوە دەڵێ: زانستی شەهابەدینی سوورەبەردی بە سەر ئاوەزیدا زاڵ بوو؛ هەر ئەمە ببووە هۆی ئەوەی کە هەرچێکی لە دڵدایە بێنێتە سەر زمان و مەلایان لە خۆی هان بدا؛ تا ڕادەیەک کە سەرەنجام فتوای ڕشتنی خوێنیان دا. مەلیک زاهیری غازی ئەییووبی خستییە زیندان و سەرەتای ساڵی ٥٨٧ ک. م. لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا کوشتی. سوورەبەردی زانایەکی یەکجار زیرەک و لە حیکمەت و فەلسەفەدا تەواو شارەزا بوو؛ جارـ جار بۆ دڵی خۆی، بە فارسی و عەرەبی شیعری دەگوت.

زانای بەناوبانگی ڕیازی، فەخرەدینی ماردینی، کە ماوەیەک مامۆستای بووە، زۆرجاران بە شانیدا هاتووە و گوتوویە: «ئەمن لە ڕۆژگاری خۆمدا کەسێکی وەک ئەوم نەدی».

**له نووسراوه‌کانی**: *«التّلویحات، هیاکل النّور»، «حکمه الاشراق»، «اللّمحات»، «الالواح العمادّیه»، «مقامات الصّوفیّه و مَعانی اصطلاحاتهم»* و ...

له شیعره ناسراوه‌کانی شه‌هابه‌دین سووره‌به‌ردی، قه‌سیده‌یه‌کی عه‌ره‌بییه که ئه‌م دوو به‌یته سه‌ره‌تاکه‌یه:

أَبَداً تحنُّ إليكم الأرواحُ وَ وصالُكُمْ ريحانُها و الرّاحُ
و قلوبُ أهل ودادكم تَشْتاقكم وَ إلى لَذيذ لقائكم تَرْتاحُ

ئه‌م چوارینه فارسییه‌ش به ناوی ئه‌وه‌وه ناسراوه:

هان تا سر رشته‌ی خرد گم نکنی خود را ز برای نیک و بد گُم نکنی
رهرو تویی و راه تویی منزل تو هُشدار که راه خود به خود گُم نکنی

*تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل٢٦١. *الأعلام*، ب٩، ل١٦٩. *دائرة‌المعارف*، فریدوجدی، ب٥.

## زه‌هیره‌دین موباره‌کی شاره‌زووری

کوڕی یه‌حیا، کوڕی عه‌بدوڵڵا و برای تاجه‌دین ئه‌بووتاهیری شاره‌زوورییه که ساڵی ٥٢٥ ک. م. له دایک بووه و ٥٨٧ له شاری مووسڵ له دنیا ده‌رچووه.

قازی زه‌هیره‌دین له پیاوه ناسراوه‌کانی بنه‌ماڵه‌ی شاره‌زوورییه که هه‌م ده‌رسی گوتۆته‌وه و هه‌م دادوه‌ری کردووه.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٤، ل٢٩٩.

## عیماده‌دین ئه‌حمه‌دی شاره‌زووری

کوڕی «قاضی‌القضاة» که‌ماله‌دین و یه‌کێکی‌تر له ناودارانی شاره‌زوورییه که ساڵی ٥٦٩ ک. م. له لایه‌ن نووره‌دینی زه‌نگی، میری مووسڵه‌وه، بۆ ده‌رباری خه‌لیفه‌ی به‌غدا چووه و پێ‌سپێراوی به‌باشی جێبه‌جێ کردووه. «ابن‌التّعاویذی» شاعیری به‌ناوبانگی عه‌ره‌ب، له‌مه‌ڕ ئه‌م ڕاسپارده‌یه و خۆ و خه‌ده‌ی به‌رزی عیماده‌دینه‌وه، قه‌سیده‌یه‌کی پاراوی گوتووه که ئه‌م به‌یته سه‌رهۆنه‌که‌یه:

وَ قالُوا رسُولُ أعْجَزَتْنا صفاتُهُ فَقُلْتُ: صَدَقْتُم، هذه صفَة الرُّسْل

*تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل٤٧٣.

## وه‌جیهی کوردی

ئه‌بولعه‌باسی ئه‌حمه‌د، کوڕی عومه‌ر، کوڕی حه‌سه‌ن، ناسراو به «وه‌جیهی کوردی» زانایه‌کی خه‌ڵکی

باکووری کوردستانه که خوێندنی سەرەتایی لە زێدی خۆی بووە و پاشان بۆ تـەورێز چـووە و ماوەیـەک لـە کۆڕی دەرسی عەللامە ئەبووعومەر بەهرەی بردووە و ئەمجار ڕووی لـە بەغـدا کـردووە و دوای تـەواکردنی دەرس و دەور، لەوێ ماوەتەوە و وانەی گوتۆتەوە و مانگی زیحەججەی ساڵی ٥٩١ لە دنیا دەرچووە.

ئەبولعەباس پیاوێکی هێژای بەسام و هەیبەت و زۆر ماقووڵ بـووە و قوتابیـان لـە هـەموو شـوێنێکەوە بـۆ فێربوون و ڕاهاتن، ڕوویان لە قوتابخانەکەی کردووە.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٤، ل٤٣.

## ئەبووڕەزا سەعیدی شارەزووری

کوڕی عەبدوڵڵا،کوڕی قاسم، کوڕی مزەفەر و یەکێ لە زانایانی بنەماڵەی شارەزوورییە. لـە مووسـڵ هاتۆتـە دنیا و هەر لەوێ زانستە سەرەتاییەکانی خوێندووە. پاشان چۆتە بەغدا و لـە مامۆسـتایانی ئـەوێ بـەهرەی بردووە. ئەوجار بەرەو خوراسان ڕۆیوە و لە زانایانی ئەوێش شت فێر بووە و دواجار گەڕاوەتەوە زێدی خـۆی و دەرسی گوتۆتەوە و سەرەنجام لە مانگی جەمادیولئاخری ساڵی ٥٩٦ ک. م. دا کۆچی یەکجاری کردووە.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٤، ل٢٢١.

## شێخ مووسا زوولی ماردینی

شێخ مووسا کوڕی ماهینی زوولی ماردینی، لە پێشڕەوانی تەریقەت و عارفێکە کەشف و کەرامەتی زۆریـان لێ گێڕاوەتەوە. شێخ عەبدولقادری گەیلانی زۆری خـۆشویـستووە و بـە شـانیدا هـاتووە. لـە مـاردین لـە دایکبووە و هەرلەوێش مالاوایی دنیای کردووە.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب١، ل١٣٨.

## ئەبولفەزائیلی شارەزووری

کوڕی قاسم، کوڕی قازی تاجەدین ئەبووتاهیر، زانایەکی ئاکاربەرز، خۆشمەجلیس، بەمشوور و تێگەیشتووی بنەماڵەی شارەزوورییە کە ساڵی ٥٣٤ ک. م. هاتۆتە دنیاوە.

دەرسی حەدیسی لای ئەبووتاهیری سەلەفی و فیقهی لە کن یۆسفی دمشقی خوێند. دوای تەواوکردنی دەرس و خوێندن، لە شام گەیشتە خزمەتی سوڵـتان سـەلاحەدینی ئـەیییوبی و وردە ـوردە لێـی نزیـک بووەوە و پلە و پایەیەکی تایبەتی پەیدا کرد و چەن جاران لە لایەن سوڵتانەوە بوو بە سـەفیر و یـەک ــدوو جاریش بۆ دەرباری خەلیفەی بەغدای ڕاسپارد. پاشانیش ماوەیەک قازی شام و هێندێک دادوەری مووسڵ بوو. ساڵێ ـ دووساڵیش بە فەرمانی خەلیفەی بەغدا، بەڕێوەبردنی کاروبـاری ئـەوقافی شـافیعی و حەنـەفی

گرتە ئەستۆ؛ بەڵام دڵی لەسەری دانەمەزرا و دایەدواوە و گەڕاوە زێدی خۆی. سەرەنجام حاکمی حەمات بۆ نیشتەجێ بوون لەوێ و دادوەری ئەوێ، لە دووی نارد؛ کە لێی وەرگرت و تا ئاخری ژیانی (٥٩٩ ک. م.) لەو شارە و لەو کارەدا مایەوە.

ئەبولفەزائیل شیعری چاکیشی گوتووە و دیوانێکیشی هەبووە؛ ئەوا دوو بەیت لە شیعرەکانی:

فی کُلِّ یَوْمٍ یُری لِلْبَین آثارُ     وَ مالهُ فی التیام الشَّمل ایثارُ
یَسْطُو عَلَینا بتَفْریق فَواعَجَبا     هَلْ کانَ للبَین فیما بَیْنَنا ثارُ

**واتا**: جیایی هەر ساتێ شتێکی لێ دەبێتەوە و ڕۆژگار بۆ کۆ کردنەوەی ئەو پرژ و بڵاوییە، هیچ لە خۆی نانەوێ و دەوران بە دەلەسەی لێکبڕان، هێرشمان بۆ دێنێ. سەیرە دەڵەی جیایی تۆڵەی شتێکمان لێ دەکاتەوە!

*طبقات الشّافعيّة*، ب٤، ل٢٩٨.

# چەرخی حەوتەم

## ئەبولفەزلی ئەربیلی شافیعی

ئەبولفەزل ئەلیاس، کوڕی جامیع، خەڵکی هەولێر، پیاوێکی زانا بووە و هێندێک نووسراوە و پەراوێزی لێ بەجێماوە. لە دنیا دەرچوونی، ساڵی ٦٠١ ک. م. نووسراوە.

*هدیة العارفین*، ب ١، ل ٢٢٥.

## زیائەدینی هەزبانی

قازی زیائەدین ئەبووعەمری عوسمانی هەزبانی، کوڕی عیسا، کوڕی دەرباس، کوڕی پیران، لە خێڵی بەنیماران،[1] زانایەک لە ناودارانی فیقهی شافیعییە کە خوێندنی لای ئەبولعەباسی خدر، کوڕی عەقیلەوە دەسپێکرد و پاشان چوو بۆ دمشق و لە کۆڕی دەرسی ئەبووسەعید عەبدوڵلا، کوڕی عەسروون و ئەبولجیوشی عەساکیر، کوڕی عەلی، فیقهـ و حەدیسی خوێند. ئەمجار چوو بۆ میسر و ماوەیەک لە جێی براکەیدا (سەدرەدین عەبدولمەلەکی هەزبانی) دادوەری کرد و ساڵی ٥٦٦ ک. م. بۆخۆی بوو بە قازی میسر و هاوکات تا دواساتی ژیانی، دەرسدان و وانەگوتنەوەشی نەفەوتاند.

قازی زیائەدین شارەزای فیقهـ و ئوسوول و وێژە و زۆربەی زانستی باوەی ئەو ڕۆژگارە بووە. کتێب و نووسراوەی زۆریشی لێوە بەجێماوە؛ وەک: ڕاژەیەک لە کتێبی «*المُهَذّبَ*» لە فورووعدا، نووسراوەی شێخ ئەبووئیسحاقی شیرازی، کتێبی «*الاستسقاء لمَذاهب الفقهاء*» لە ٢٠ بەرگدا و شەرحێک بەسەر «اللّمع» لە ئوسوولی فیقهدا.

زا و مەرگی ئەم مامۆستا گەورەیە، ساڵی ٥١٦ و ٦٠٢ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب ١، ل ٣١١. *طبقاتُ الشّافعیّە*، ب ٥، ل ١٤٣. *الأعلام*، ب ٤، ل ٣٧٥.

---

١. «**بەنیماران**» لە خێڵاتە کوردەکانی باشووری مووسڵن.



## سەدرەدینی مارانی

داوەری دادوەران (قاضی‌القُـضاة) سەدرەدین ئەبولقاسم عەبدولمەلیکی مارانی هەزبانی، کوڕی عیسا، کـوڕی دەرباس، برای ئەبوعەمر عوسمان زیائەدین و لە زانایانی بەناوبانگ و مامۆستایانی گەورەی ڕۆژگـاری خـۆی بووە کە لە میسردا پلەی سەرۆکی دادوەرانی پێ دراوە.

هاتنە دنیای سەدرەدین، نێوان سالانی ٥١٦ و ٥١٧ ک. م. و کۆچی دوایی ٦٠٥ نووسراوە.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل٣١١. *لغتنامەی دهخدا*، ١٣٢٥، ل٧٦١.

## ئیبنوئەسیر، موحەددیسی جزیری

سێ برای بلیمەتی هەرکام لە زانستێکدا شارەزا (موحەددیس و مێـژووزان و وێـژەوان) کـە بـە «ابـن‌ُلأثیـر» بەناوبانگن. وا بەنۆرە باسی هەرسێکیان دەکەین؛ یەکەم:

ئەبوسـەعادەت موبـارەک، مەجـدەدین، کـوڕی ئەبولکـەرەم موحەممـەد، کـوڕی موحەممـەد، کـوڕی عەبدولکەریمی جزیری، سالی ٥٤٤ ک. م. لە جزیر هاتە دنیا و هەر لەوێ گەورە بـوو. لـەودوا بـۆ خوێنـدن گەیشتە مووسل و پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، چووە ڕیزی هاوڕێیـانی موجاهیـدەدین قایمـاز، مـیری مووسل و بوو بە مونشی دیوانی ئەو. دوای قایمازیش بە نوورەدین ئەرسەلانشای کوڕی خزمەتی کرد و وەج و حورمەتی زۆرتر بوو؛ بەلام نەخۆشی نقریس، دەست و پێی لە کار خست و لە نووسین کـەوت و تـا ئـاخر هەروا مایەوە؛ بەو حالەش زانایان و دۆستانی تەرکیان نەکرد و هەر ڕۆژێ تاقمێ لە مالیدا کۆ دەبوونەوە و لە بیری قوول و زانستی بەربلاوی بەهرەیان دەبرد.

ئەبوسەعادەت لە وێژەوانانی بەناوبانگ و دەسەلاتدارانی خۆشەویست و جێ ڕێز و متمانەی هەموو خەلک بـووە. بەرهـەمی بایەخـدار، لـە کتێـب و نامیلکـە و ڕاژە و شـیعری، زۆر هـەن؛ هێنـدێکیان بـریتین لـە: «*جامع‌الاصول فی اَحادیث‌الرّسول*» لە ١٠ بەرگدا، «*نهایە غریب‌الحدیث*» ٤ بەرگ، «*کتاب‌الانصاف فـی الجمـع بین‌الکشف و الکشّاف*» کە تەفسیری قورئانە، «*المختـار فـی مناقـب الاخیـار*»، کتێبێـک لـە بـارەی شـێوەی نووسین، «*کتاب البدیع فی شرح‌الفصول*» لە نەحودا و «*کتاب‌الشّافی*» کە ڕاژەی «*مُسنَد*»ی ئیمام شافیعییە.

ئەبوسەعادەت شاعیری چاکیش بووە. جارێـک ئەتابـەک، مـیری مووسـل، لـە هێـستر دەکـەوێ؛ ئـەو دەسبەجێ ئەم شیعرە دەلێ:

انْ زَلَّـت الْبَغْلَـةُ مـِنْ تَحْتـه      فَـإنَّ فـی زَلَّتهـا عُـذْرا
حَمَّلَهـا مـن علمـه شـاهقاً      وَمـن نَـدی راحتـه بحـرا

کۆچی دوایی ئەم مامۆستایە ڕۆژی پێنجشەمبە، دوایین ڕۆژی زیحەججەی سالـی ٦٠٦ ک. م. ڕوویدا و لەو یانەدا کە خۆی لە مووسل دروستی‌کردبوو، نێژرا.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٤٤١. *طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٥، ل١٥٣. *الأعلام*، ب٦، ل١٥٢.

## شێخ ئەبولحەسەنی کوردۆیە

زانایەکی پارێزکار لە کوردانی کۆچەری دەوروبەری پارسە کە هەم لە باری زانستی و هەم لە بواری ئاکارەوە مرۆیەکی پایەبەرز بووە و لە ئەولیای گەورەی ئاخری چەرخی شەشەم و سەرەتای چەرخی حەوتەم دێتە ئەژمار و ماوەی ٦٠ ساڵ لە شاری شیراز بە تەرکەدنیایی لە کونجی ژوورێک ژیاوە و بۆ نوێژی جەماعەت و کاری پێویست نەبووبێ، دەرنەکەوتووە.

شێخی کوردۆیە لە بڕانەوەی مانگی محەڕڕەمی ساڵی ٦٠٦ ک. م. لە شیراز کۆچی یەکجاری کردووە.

*نَفَحات‌الأُنس*،تاران، ١٣٣٧، ل٢٥٨.

## عیمادەدینی ئەربیلی

ئەبووحامید عیمادەدین موحەممەد، کوڕی یونس، کوڕی موحەممەد، کوڕی «منعە» و برای کەمالەدین ئەبولفەتح[1]و لە پێشەوایانی فیقهی شافیعی و ئوسوولی شاری هەولێر بووە. خوێندنی لای باوکیەوە دەسپێکردووە و دواجار بۆ بەغدا چووە و لە قوتابخانەی نیزامییە، لە کۆڕی دەرسی سەدیدەدین موحەممەدی سەلماسی و ئەبوومەحاسین یۆسفی دمشقی بەهرەی بردووە و حەدیسی لای ئەبووحامید موحەممەد، کوڕی ئەبووڕەبیعی غەڕناتی و کەسانی‌ترەوە خوێندووە و کە گەڕاوەتەوە هەولێر، بەرچاوی نوورەدین حاکمی ئەوشارە کەوتووە و چەند ئیشی تایبەتی پێ سپاردووە.

ئەم مامۆستایە بەرهەمی نووسراوەی زۆری هەبووە؛ هێندێکیان بریتین لە: «*المحیط فی الجمع بین المهذّب و الوسیط*»، شەرحێک لەسەر کتێبی «*وَجیز*»ی ئیمام غەززالی، کتێبێک بە ناوی «*التّحصیل*» لەمەڕ کێشەوە و کتێبێک لە بارەی بیر و بڕواوە.

ئەبووحامید جگە لە پلە و پایەی زانستی، مرۆیەکی لەخواترس و پارێزکار بووە و قەت بەرگی ڕازاوە و گرانبایی لەبەر نەکردووە.

ساڵی لە دنیا دەرچوونی ئەبووحامیدیان ٦٠٨ ک. م. نووسیوە.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٤٧٦. *طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٥، ل٤٥. *الأعلام*، ب٨، ل٣٤. *تاریخ هدیةالعارفین*، ب٢، ل١٠٨.

---

١. لە چەند لاپەڕەی‌تردا باسی ئەویش دێ.

## عەلی ئەرجیشی

کوڕی موحەممەد، کوڕی مەنسوور، کوڕی داود، لە کوردانی ئەرجیشی لای ئەرمەنستانە کە لە حەلەب ژیاوە و لەگەڵ ئەوەدا فەقیهێکی زانا هەڵکەوتووە، زۆریش خواناس و پارسا بووە و ئاخر و ئۆخری چەرخی حەوتەم کۆچی دوایی کردووە.

*طبقات الشّافعیّه*، ب٦، ل٢٤٢.

## ئەبولفەزائیلی ئامیدی

قازی ئەبولفەزائیل عەلی، کوڕی یۆسف، کوڕی ئەحمەد، مامۆستایەکی زانای چەرخی شەش و حەوتی خەڵکی ئامید (دیاربەکر)ە کە بۆ شاری واسیت چووە و لەوێ دادوەری کردووە وساڵی ٦٠٨ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

*تاریخ الکامل*، ابن اثیر، ب١٢، ل١٣٨.

## عومەری خەلیکانی ئەربیلی

عومەر، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی ئەبیبەکری خەلیکانی، برای شەهابەدین موحەممەد و مامی «قاضی القضاة»شەمسەدینی ئیبنوخەلیکانە[1] کە لە هەولێر بووە و لە ڕیزی زانایان و وێژەوانانی ئەو شارە دێتە ئەژمار و تا دوا ساڵی ژیانی (٦٠٩ ک. م.) دەرسی گوتۆتەوە.

*طبقات الشّافعیّه*، ب٥، ل١٣٠.

## ئەبولبەشائیر ئیسحاقی خەلاتی

کوڕی هیبەتوڵڵا، کوڕی سدیق، لە زانایانی شافیعی و مامۆستای فیقهـ و ئوسوولی شاری خەلات بووە کە دادوەریشی کردووە و لە زانستی کەلامدا چەند کتێبێکی نووسیوە و ساڵی ٦١٠ ک. م. لە دنیا چووە.

*هدیة العارفین*، ب١، ل٢٠١.

## شێخ ماجیدی کوردی

شێخ ئەبوموحەممەد ماجید، گەورەپیاوێک لە پێشەوایانی مەشایخی کوردستانی باشوورە کە زۆرێک لە عارفانی هاوچەرخی، ملکەچی بوون و بە پێشەنگی خۆیان داناوە.

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١٠٢.

**لە قسەکانی**: «قلوبُ‌المُشتاقینَ مُنَوَّرَةٌ بِنُورِاللە عَزَّوَجَل، وَ اذا تَحَرَّکَ فیهاالاشتیاقُ، أضاءَ نورُهُ مابینَ‌السّماء وَ الارض، فَیباهی اللە عَزَّوَجَلَّ بهم الملائکة و یقولُ أشْهِدُکُمْ اَنّی الیهم أشوَق» وتەیەکی تری: «الزّاهد یُعالجِ‌الصبرَ والمُشتاقُ یُعالجُ الشُّکرَ والوصلُ یُعالج الولایة».

شێخ ماجید، ساڵی ٥٦١ ک. م. لە ناوچەی کوێستانی حەمرین، لە باشووری کوردستان لە دایک بووە.

*طبقات شَعرانی*، ب١، ل١٤٧.

## قازی ئەبولحەسەنی شارەزووری

کوڕی ئەحمەد، کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی قاسم، ناسراو بە «عبدُ‌اللطیف»، لە بنەماڵەی شارەزووریان و قوتابیانی کۆڕی دەرسی عەللامە قازی فەخرەدین، کوڕی سەعدەدینی شارەزوورییە کە لە فیقهـ و ئوسوولدا شارەزاییەکی ئەوتۆی هەبووە و لە مووسڵ دەرسی داوە و دادوەری کردووە.

زا و مەرگی قازی ئەبولحەسەن دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٥٤٢ و ٦١٤ ک. م.

*طبقاتُ الشّافعیّە*، ب٥، ل١٣١.

## ئەمیر بەختیار، قوتبەدینی ئوشنەوی

ئەبوومحەممەد قوتبەدین، ناسراو بە «ئەمیر بەختیار»، لە کوردانی خەڵکی شنۆیە کە لەگەڵ پارێزکاری و بایەخ نەدانی بە دنیا، مامۆستایەکی هەڵکەوتە بووە و لە هەولێر ژیاوە و هەر لەوێ پاش ٦٩ ساڵ ژیان، ساڵی ٦١٤ ک. م. بە یەکجاری دەستی لە دنیا بەرداوە.

*طبقاتُ الشّافعیّە*، ب٥، ل٥١.

## پیرخدر (خزر)ی شاهۆ[1]

سەید موحەممەد زاهید، نازناو «زەهیرەدین»ی ناسراو بە «پیرخدری شاهۆ»، عارفێکی پایەبەرزی چەرخی حەوتەمە کە زۆرێک لە بنەماڵە سەیدەکانی کوردستان، وەکوو سەیدی پیرخدران[2]، پاوە، خانەگا، تاوەگۆز[3]

١. زنجیرە تۆرەمەی پیرخزر بریتین لە: سیّد (محمد زاهد، بن جعفر، بن حسین، بن محمود، بن رحمەاللە شهید، بن موسی، بن حسین، بن محمد، بن شهید ماجد، بن عبدالرحیم، بن قاسم، بن ادریس، بن سلطان جعفر، بن امام علی‌النقی).

٢. «**پیرخدران**» گوندێکە لە ناوچەی کۆماسی، سەر بە مەریوان. سەیدی چۆڕ ـکە لقێک لە زاروزێچی پیرخزرنـ پێشتر لەوێ بوون.

٣. «**تاوەگۆز**» ناوچەیەکی هەورامانە. شاعیری گەورەی کورد «مەولەوی» خەڵکی گوندێکی سەر بەم ناوچە بە ناوی «سەرشاتە» و لە پشتی پیرخدرە.

و سەفاخانە[1] لە پشتی ئەو کەوتوونەتەوە.

مەلا ئەبووبەکری موسەنیفی چۆڕی، لە زانایانی کوردی ئاخرەکانی چەرخی دەیەم، لە «سراج‌القُلوب»[2]دا دەڵێ: «سەید موحەممەد زاهید، کە ئێستا پیرخدری شاهۆی پێ دەڵێن، لە تۆرەمەی ئیمام ڕەزایە. کاتی کە لە زیارەتی مەککە، لە ڕێگای کوردستانەوە گەڕاوەتەوە، بە «گەنجەوییە»دا تێدەپەڕێ، لە «قەتلووئاباد»دا لا دەدا و چەند ڕۆژێک دەمێنێتەوە. لەو ماوەدا خەڵکەکە کەرامەتێکی زۆری پێوە دەبینن. کە ئەم خەبەر و باسە بە ئەمیر موقەڕڕیبەدین، حاکمی گەنجەوییە ـکە لە پاوە بووەـ دەگا[3]، بۆ تاقی‌کردنەوەی دەچێتە سەری و فەرمان دەدا ئاورێک بکەنەوە و سەید موحەممەد زاهیدی تێ‌دەخەن. دوای ئەوە ئاور باش دەگرێ و خۆڵەمێشێکی لێ دەمێنێتەوە، دەبینن سەید موحەممەد بێ ئەوەی گەردێکی لێ نیشتبێ، دانیشتووە و خەریکی نزا و سکاڵای خۆیە! خەڵکی کە ئەمە دەبینن، سەرسووڕماو دەڵێن: ئەمە نیشانە و کەرامەتی خدری نەبییە، لەم دەرکەوتووە و شای بەڕاستی ئەوە نەک ئەمیر موقەڕڕیب. بەو بۆنەوە گەنجەوییە بووە بە «شاهۆ» و سەید موحەممەد زاهیدیش بوو بە «پیرخدر». ئەمیریش کە ئەوە دەبینێ، قەتلووئاباد دەکاتە وەقفی ئەو و زاروزێچی و بەم جۆرە دوای هێندێک، ناوی ئەو گوندەش دەبێتە پیرخدران» یان «پیرخزران».

دەورانی ژیانی پیرخدر، لە چەرخی حەوتەمدا بووە.

*سِراجُ‌القُلوب*، ملا ابوبکر مُصنِّف . *نورالانوار*، سیّد عبدُالصّمد توداری.

## سەید حوسەینی خەلاتی

مرۆیەکی پارێزکار و زانایەکی لەزەبر و بەتایبەت لە ریازی و هەیئەتدا پیتۆڵ بووە کە خوێندنی لە کوردستان دەسپێکردووە و پاشان ماوەیەک لە تەوریز لای مامۆستایانی ئەو سەردەمە، بیرکاری و فەلسەفە فێر بووە و دوای وەرگرتنی ئیجازە، لە جزیر و بۆتان بۆتە قازی.

وەک شەرەفخانی بدلیسی لە شەرەفنامەدا باسی دەکا، سەید حوسەین لە چەرخی حەوتەمی کۆچی، سەردەمی هێرشی مەغولدا ژیاوە و بە کەڵک گرتن لەو زانستە نائاساییانە زانیویە ـوەک جەفر و ئەوفاقـ

---

١. «سەفاخانە» ئابادییەکی ناوچەی هەوشارە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. یەکێ لە کوڕانی پیرخزر چۆتە ئەوێ و سەیدی ئەو ناوچە، لەو کەوتوونەوە.

٢. «سراجُ‌القُلوب» کتێبێکە بە زمانی فارسی کە تا ئێستا چاپ نەکراوە!

٣. سەید عەبدوسەمەدی تووداری موورادی لە کتێبی «*نورالأنوار*»دا ناوەندی حوکمەتی ئەمیر موقەڕەیبەدینی «پایگلان»، سەر بە ناوچەی ژاوەرۆ نووسیوە. وێدەچی ئەم میرە لە حاکمانی ناوخۆیی بووبێ کە لە پاوە (بە قسەی مەلا ئەبووبەکر) یان پایگلان (وەک نووسەری نورالانوار دەڵێ) یا نە، پاڵنگان، کە ماوەیەک ناوەندی حوکمەتی ئەردەڵان بووە، دەسەڵاتدار بووبێ.

پاڵنگان گوندێکی گەورەیە لە پاڵداوێنی چیای زاگرۆس لە ١٢ فرسەقی شاری سنەدا و یەک لە کێوەکانی، پیرخدری شاهۆی ناوە.

پێش ئەوەی لەشکری مەغول بگاتە بدلیس و ئەخلات، لەگـەڵ تـیرە و تایفەکەیـدا بـاری کـردووە و چۆتـە میسر. ئەو گەڕەکە لە شاری قاهیرە لە میسردا کە خێڵی سەید حوسەین تێدا ژیاون، تا ماوەیەکی زۆر پاش ئەویش، هەر «تاخی ئەخلاتیان»یان پێ گوتووە.[١]

*شەرفنامەی بدلیسی*،چاپی قاهیرە، ل٤٥٩.

## یەحیا گاوانی

ئەبووشەرەف یەحیا، کوڕی حەسەن، کوڕی عەلی، کوڕی شیرزاد، نووسەر و وێژەوان و شاعیرێکی کوردە بـە نازناوی «گاوانی» کە دیوانی شیعریشی هەبووە و ساڵی ٦١٦ ک. م. لە دنیا چووە.

یەحیا گاوانی ئینشابەندی سوڵتان توغرۆل، کوڕی ئەرسەلانی سەلجووقی، میری ئازەربایجان بووە.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٢٢. *الأعلام*، ب٩، ل١٧١.

## سەلاحەدینی شارەزووری

ئەبولقاسم سەلاحەدین عەبدوڕڕەحمان، کوڕی ئەبوونەسری شارەزووری، خەڵـکی گونـدی شـیرخانی لای هەولێرە کە خوێندنی لە هەولێر و مووسڵ دەسپێکردووە وپاشان بەرەو شام چووە و لەوێ درێژەی بە کـاری داوە تا تەواو شارەزا بووە. ئەوجار بۆتە مامۆستای قوتابخانەی «اَسَدیّە[٢]»ی شاری حەلەب و تا ئـاخری ژیـانی لەوێ دەرسی گوتۆتەوە.

زا و مەرگی ئەم زانایە ٥٣٩ و ٦١٨ ک. م. ڕوویداوە.

*طبقاتُ الشّافعیّە*، ب٥، ل٦٥. *وَفَیاتُ الاعیان*، ب١، ل٣١٢.

## شەهابەدین موحەممەدی خەلیکانی

شەهابەدین موحەممەد، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی ئەبیبەکر، خەڵکی گوندی «خەلیکان»[٣]ی لای هـەولێر و لـە

---

١. مێژووزانی هێژای کورد، مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی(١٩١٢-٢٠٠٢ز) لە پەراوێزی شەرەفنامەکەی کردوویەتە عەرەبی، لـەم بارەوە دەڵێ: «وێدەچێ نیاز هەر ئەو سەید حوسەینی کوڕی یۆسف، کوڕی عەلی خەلاتی بـەناوبانگ بـێ کـە سالـی ٧٩٥ ک. م. هاتۆتە دنیا و ٨٥٩ لە مەککەدا کۆچی یەکجاری کردووە».

بەڵام شتی وا ناگونجێ، لەبەر ئەوە سەید حوسەینی ناوبراو، کاتی هێرشی چەنگیز (٦١٥-٦٢٦) لە ناوچەی جزیر و خەلاتدا ژیاوە.

٢. ئەمیر ئەسەدەدین شێرکۆی ئەییووبی درووستی کردووە.

٣. لە مێژووی «*اَلتُّحفةُ السنیّة فی تاریخ القُستنطَنیّە*»، چاپی بەیرووت، سالی ١٨٨٧ ز. نووسـراوە: «خَلیکـان، مولـد ابـن خلّکـان، المورّخ و الرّاوی المشهور، کان فی مدینە اَربل مِن کُردستان». کە وا بوو «خەلیکان» ڕاستە و دواجار گۆڕانی بەسەردا هاتووە ⊂

زانایان و مامۆستایانی بەناوبانگی کۆتایی چەرخی شەشەم و سەرەتای چەرخی حەوتەمی ئـەو شـارەیە کـە ساڵی ٦١٨ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*طبقاتُ الشّافعيّه*، سُبُکی، ب٥، ل٩ و ١٤. پاشکۆی کتێبی *وَفَياتُ الاعيان*، ابن خَلّكان، نووسراوی نـصر هـورینی، ل٤١.

## ئەبولقاسمی ئەربیلی

ئەبولقاسم «عزُّالدّین»، برازای ئەبولعەباسی خدر[١]، کوڕی نەسر، کوڕی عەقیل، لە زانایانی ناوداری هەولێرە کـە ساڵی ٥٣٤ ک. م. هاتە دنیا و لە زێدی خۆی خوێندی و پاشـان ڕۆی بـۆ بەغـدا و ماوەیـەک لـە نیزامییـە شوێنی خوێندنەکەی گرت. ئەمجار گەڕایەوە هەولێر و دوای کۆچی دوایی مامی(ساڵی ٥٦٧) لە جێـی ئـەو دەرسی گوتەوە؛ بەڵام دوای هێندێک، میری هەولێر(مەلیک موعەززەم مزەفـەرەدین) لێـی دڕدۆنـگ بـوو. ئەبولقاسم ناعیلاج ڕووی کردە مووسڵ (ساڵی ٦٠٣) و بە فەرمانی ئـەمیری ئـەوێ، دەرسدانـەوەی درێـژە پێدا و سەرەنجام لە ڕۆژی هەینی ١٣ی ڕەبیعولئاخری ساڵی ٦١٩ ک. م. دنیای بێ بنیای بەجێهێشت.

لەو کاتەدا کە ئەبولقاسم بە بۆنەی ڕوو لێ هەڵچەرخانی مەلیک موعەززەمەوە، ناچار بوو هەولێر بەجێبێڵێ، یەکێک لە دۆستانی بە ناوی «اَبوالدُر یاقوت رومـی»، شـاعیر و وێـژەوانی نـاوداری بەغـدا، قەسـیدەیەکی بـۆ دەهۆنێتەوە و تێیدا وێڕای حەیف و مخابن، ڕادەگەیەنێ تێچاندنی شۆفاران لای مەلیک موعەززەمەوە بۆتـە هۆی ئەو کارەساتە و ئەوانە وەکوو قەلەڕەشە وان؛ چۆن چاویان هەڵدێ بازی سپی ببینن؟

**سێ بەیتی ئەو قەسیدە:**

أيَـا ابْــن عُقَيْــل لا تَخَــفُ سَـطْوَةَ العــدى وَ ان أظهَــرَتْ مــا أضْــمَرَتْ مــنْ عنادهــا
وَ اَقْــصَتْكَ يَوْمــاً عَــنْ بــلادكَ فتيَــةٌ رَأَتْ فيـكَ فَـضْلاً، لَـمْ يَكُـنْ فـى بلادهـا
كَـــذا عـــادةالغربـــان تَكــرَهُ أن تَــرى بَيـــاضَ اَلْبـــزاة الـــشُّهب دونَ سَـــوادها

*تاريخ ابن خَلكان*، ب١، ل١٧١. *طبقاتُ الشّافعيّه*، ب٥، ل١٦٣.

## عومەری وەرانی مووسڵی

زیائەدین ئەبووحەفسی عومەر، کوڕی بـەدر، کـوڕی سـەعیدی وەرانی مووسـڵی حەنـەفی، مامۆسـتایەکی

➲ و بۆتە «خەللەکان». جا بەو بۆنەوە کە شەهابەدین و باقی بنەماڵەی هی ئەوێن، بە «اَبناء خَلّكان» ناسـراون؛ بـەڵام وردە ـــ وردە کەسناوی «ابن خَلّكان» بڕاوەتە سەر قازی شەمسەدین، مێژوونووسی بەناوبانگەوە؛ کە کوڕی ئـەم شـەهابەدینەیە و لـەم کتێبەدا باسی ئەویش دەکەین.

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٥٥.

عیلمی حەدیس بووە.

**کتێبەکانی**: «المُغنی عَنِ‌الحفظ و الکتاب بقولِهِم لَم یصحُ شیئٌ فی هذاالباب» و «مَعْرِفَه‌الوقوف عـن‌المَوقـوُف» هەکیان لە حەدیسدا، «استنباط المُعین فی العلل و التّاریخ» و «لابن مُعین و الجمع بین الصَّحیحین».

*الأعلام*، ب٥، ل١٩٩.

## بەهائەدین ئەسعەدی[١] سنجاری[٢]

ئەبووسەعادات ئەسعەد، کوڕی یەحیا، کوڕی مووسا، کوڕی مەنسووری سنجاری شافیعی، نازناو «بەهائەدین»، شاعیرێکی زانا و مامۆستایەکی وێژەوان بووە کە لـە دەربـاری سولـّـتان سـەلاحەدیندا ژیـاوە و جاروبـارەش کەوتۆتە گەشت و گێڵ و ئەمیران و پاشایانی تریشی دیوە و پەسنیانی داوە و خەڵاتی وەرگرتـووە. ئـەو لـە ڕیزی گەورە شاعرانە و شیعری زۆری لێ بەجێ‌ماوە؛ بۆ وێنە قەسیدەیەکی یـەکجار بەقـەوەتی لـە پەسـنی کەمالەدینی شارەزووریدا هەیە کە ئاوا دەسپێدەکا:

وَ هَـواکَ مـا خَطَـرَ الـسّلُوُّ ببالـه        وَ لأنْـتَ أعْلَـمُ فـی اَلغَـرام بحالـه
وَ مَتَــی وَشــی واش الَیْــکَ بأنَّــهُ        سـال هَـواکَ فَـذاکَ مـنْ عُذّالـه
اَوَلَـیْس للکَلَــف المعنَّــی شــاهدٌ        مـنْ حالـه یُغْنیـکَ عَـنْ تَـسْآله

بەهائەدین دۆستێکی بووە زۆر لێک نزیک بوون. جارێک نێوانیان تێکدەچـێ و بـەتایبـەت دۆسـتەکەی تەواو لێی دەبڕێ. ئەم بـۆ ئاشـتبوونـەوە، کەسـێک بـۆ لای دەنێـرێ و لەسـەر ئـەو حاڵـە لۆمـەی دەکـا. دۆستەکەی ئەم دوو بەیتەی کە وتاری پازدەی «*مَقامات حَریری*»دایە، بۆ دەنێرێ:

لا تَـزُرْ مَـنْ تُحـبُّ فـی کُـلّ شَـهْر        غیــرَ یَــوْم وَ لا تَــزدْهُ عَلیــه
فـاجتلاءُ الهـلال فـی الـشّهْر یَـوْمٌ        ثُــمَّ لا تنظُــرُ اَلعُیُــونُ الیــه

**واتا**: کەسێکت خۆش‌ئەوێ ـ وەک مانگی نۆ ـ مانگێ جارێ ببینە! با هەر بەتاسەت بێ.

بەهائەدین وای جواب دەداتەوە:

إذا حَقَّقْــتَ مــنْ خــلّ وداداً        فَــزُرْهُ وَ لا تَخَــفْ منــهُ مَــلالا
وَ کُـنْ کالـشَّمس تَطلعُ کُـلَّ یَـوْم        وَ لا تَــکُ فــی زیارَتــه هــلالا

**یانی**: کاتێ کە خۆشەویستی کەسێکت ڕاست و پاک دی، وەک هەتاو هەموو ڕۆژێ بۆ دیداری بچۆ! چـاو لە هیلال مەبڕە و لە وەڕەز بوونی مەترسە!

١. لە «*هدیة‌العارفین*، ب١، ل ٢١٢»دا بە «ئیسماعیل» ناوی دەبا.

٢. «**سنجار**» ناوچەیەکە لە جزیری کوردستان.

زا و مەرگی بەهای سنجاری، لە سنجار و سالانی ٥٣٣ و ٦٢٢ ک. م. بووە.

*الأعلام*، ب١، ل٢٩٥. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٢٠٥ و ٢١٢.

## شەرەفەدین موحەممەدی جزیری

کوڕی ئەبولفەتح نەسروڵلا «ضیاءالدّین ابن‌الاثیر» لە مامۆستایان و زانایانی ناودارە کە شیعر و پەخشانی زۆری لێوە بەجێ‌ماوە؛ بۆ وێنە: «*نزهةالابصار فی نعت الفواکه و الثمار*».

زا و مەرگی شەرەفەدینی جزیری ٥٨٥ و ٦٢٢ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخ ابن‌خلکان*، ب٢، ل١٥٨. *الأعلام*، ب٧، ل٣٤٧.

## ئیبنویوونسی ئەربیلی

شەرەفەدین ئەبولفەزلی ئەحمەد، کوڕی شێخ کەمالەدین ئەبولفەتحی مووسا، ناسراو بە «ابن‌یونس»، لە پێشەوایانی فیقهـ و گەورە زانایانی مووسڵ بووە کە ساڵی ٥٧٥ ک. م. هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە، لای بابیەوە خوێندنی دەسپێکردووە و پاشان خزمەتی مامۆستایانی‌تر چووە، تا شارەزاییەکی تەواوی پەیدا کردووە.

ئیبنویوونس مامۆستایەک بووە ئاکار جوان، بەسەر و سیما، خۆش سەروزمان، میهرەبان و خاوەن هزری یەکجار قووڵ و بیری زۆر بەقەوەتەوە کە ساڵی ٦١٠ ک. م. لە قوتابخانەی مەلیک موعەززەم، کوڕی زەینەدین، حاکمی هەولێر، دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکردووە.

ئیبنوخەلیکان لە مێژووەکەی «*وَفیاتُ‌الأعیان*»دا دەڵێ: «بابم نەمابوو؛ منیش منداڵێکی کاڵ بووم و شەرەفەدین لە قوتابخانەکەی باوکمدا لە جێی ئەو داندرابوو. ئەمن لە کۆڕی دەرسی ئەودا دادەنیشتم و بەهرەم دەبرد. کەسم لە جوان دەرس‌گوتنەوە و باش لێکدانەوە و ڕەوانبێژیدا وەکوو ئەو نەدی».

ئیبنویوونس ساڵی ٦١٧ چوو بۆ حەج و لە گەڕانەوە، لە مووسڵ لای‌دا و لە قوتابخانەی قاهیرییەدا دامەزرا و هەر لەو شارە، ڕۆژی دووشەمبە ٢٤ی ڕەبیعول‌ئاخری ساڵی ٦٢٢ لە دنیا دەرچوو.

ئەم مامۆستایە کتێب و نووسراوی زۆر بوون؛ بۆ وێنە: «*غُنیَةالفَقیه*» ڕاژەی کتێبی «*التّنبیه*» لە فیقهدا و «*مُختَصَر احیاءالعلوم*»ی ئیمام غەززالی.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٥، ل١٧. *تاریخ ابن‌خَلکان*، ب١، ل٣٢.
*الأعلام*، ب١، ل٢٤٦. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٩١.

## عوسمانی حەمیدی کوردی

عوسمان، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئەبی‌موحەممەدی حەمیدی کوردی، لە زانایانی کوردی دەوروبەری

مووسڵە کە هەر بایباڵی داوە و خۆی ناسیوە، بە نیازی خوێندن و فێربوون ڕێی غوربەتی گرتۆتەبەر و زۆر شاری عیراق و شام و میسر گەڕاوە و لە هەر شار و قوتابخانەیەک شتێکی دەسکەوتووە و کە خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە، لە میسر نیشتەجێ بووە و دادوەری شاری دەمیاتی پێدراوە. ماوەیەک لەودوا بۆتە جێگری عەبدولمەلیکی مارانی، سەرۆکدادوەرانی قاهیرە و هاوکات لە قوتابخانەی «سَیفِّیە» و «جامعُالقمر»دا دەرسی گوتۆتەوە.

عوسمانی حەمیدی بۆ بەجێهێنانی حەج بەرەو حیجاز ڕۆیوە و لە مەدینە لانشینی بارەگای پیرۆزی پێغەمبەر(د) بووە و سەرەنجام ساڵی ٦٢٦ ک. م. گیانی پاکی بەرەو جەهانی باڵا هەڵفڕیوە.

*طبقاتُ الشّافعیّە*، ب٥، ل١٢٥.

## ئیسماعیلی مووسڵی

شەرەفەدین ئیسماعیل، کوڕی ئیبراهیم، لە کوردانی دەوروبەری مووسڵ و مامۆستایانی حەنەفییەیە کە پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، چۆتە دمشق و لەوێ دەرسی گوتۆتەوە و سەرەنجام ساڵی ٦٢٩ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە. ئیسماعیلی مووسڵی هێندێک نووسراوەشی هەبووە.

زانای بەناوبانگ «سِبط ابنالجوزی» یەک لە شاگردانی ئەوە.

*الأعلام*، ب١، ل٣٠١.

## شێخ عومەری شارەزووری

شێخ شەبابەدین عومەر، کوڕی شێخ موحەممەد، لە مامۆستایانی خەڵکی شارەزوورە کە ساڵی ٥٣٩ ک. م. هاتۆتە دنیا و ٦٣٠ کۆچی دوایی کردووە.

ناوبراو زانایەکی هەڵکەوتە و تاربێژیکی توانا و مۆچیاریدەرێکی بەئاکار بووە کە بۆ بەغدا چووە و لەوێ ژیانی بە وتاردان و ئامۆژگاری خەڵک ڕابواردووە و هەموان ڕێزیان لێ گرتووە و سەریان پێ سپاردووە.

*تاریخالسُلَمانیّە وَ اَنحائَها*، بەغدا، ل٢٧٦، وەرگیراو لە کتێبی *مِرآةالزمَن*.

## ئیبنوئەسیر، مێژووزانی جزیری

ئەبولحەسەن عەلی عیزەدین، کوڕی ئەبیلکەرەم موحەممەدی جزیری، ناسراو بە «ابنالاثیر مورّخ» برای ئەبووسەعادەتی موحەددیس و ئەبولفەتحی ویژەوان، ئوستادی حەدیس، تۆرەمە و مێژوو بووە کە ساڵی ٥٥٥ ک. م. لە جزیر هاتۆتە دنیا و هەر لەوێ گەورە بووە. دواتر لەگەڵ باب و براکانیدا چوونەتە مووسڵ و لەوی نیشتەجێ بوون.



عیزەدین چەند جار بۆ بەغدا چووە و لە کۆڕی دەرسی شێخ ئەبولقاسم یەعیش، کوڕی سەدەقە، فـەقیهی شافیعی و شێخ ئەبووئەحمەد عەبدولوەهاب، کوڕی عەلی سۆفی و کەسانیتردا ئامادە بووە. بەشوێن ئـەوەدا بۆ شام وحیجازیش چووە و دیسان گەڕاوەتەوە مووسڵ و تۆژینەوە و نووسینی دەسپێکردووە.

دەرکی ماڵی ئەم مامۆستا گەورەیە هەمیشە بۆ قوتابیان و تامەزرۆیانی زانست ئاواڵە و ماڵی هـەموو کـات کۆڕی زانایان و وێژەوانان و مامۆستایان بووە.

عیزەدین لە بواری مێژووی پێشینیان و پاشهاتیان، تۆرەمە و ڕەچەڵەکی عـەرەب و ڕوداوان و ڕۆژگاریـان، لەبەر بوونی حەدیس و شارەزایی بەسەر ڕاستەقینە و پەراوێزەکانیدا، ڕەنگە هاوتای نەبووبێ.

**لە بەرهەمە پڕبایەخەکانی**: مێژوویەکە بە ناوی «*الکامل*» لە دابەزینی ئادەمەوە تا ئاخری ساڵی ٦٢٨ ک. م. کە جاری هەوەڵ، ساڵـی ١٣٠١ ک. م. لـە میـسردا چـاپ کـرا و ١٢ بـەرگی گرتـەوە، «*تُحفە العجائـب و طُرفەالغرائب*»، «*تاریخ الدول الاتابکیّە فی الموصل*»، «*اُسْدالغابە فی معرفەالصّحابە*» لە شـەش بـەرگی ڕەحلـی (گەورە)دا، «*لُباب*» کە کورتەیەکە لە کتێبی «*اَنساب*»ی ئەبووسەعد، عەبدولکەریمی سەمعانی.

قازی ئیبنوخەلیکان لە مێژووەکەیدا دەڵێ: «ئەمن ساڵی ٦٢٦ی کۆچی عیزەدین ئیبنوئەسیرم لە حەلەبدا چاو پێ کەوت. پیاوێکی یەکجار زانا، خاکەسار و بێدەمارم هاتە بەرچاو.

کۆچیدوایی عیزەدینی جزیری ساڵی ٦٣٠ کۆچی ڕوویداوە و لە شاری مووسڵدا نێژراوە.

*تاریخ ابن خَلکـان*، ب١، ل٣٤٧. *طبقاتُ سُبْکی*، ب٥، ل١٢٧.

*آداب اللّغە*، جُرجی زَیدان، ب٣، ل ٨٠. *الأعـلام*، ب٥، ل١٥٣.

## ئەبولعەباسی ئەربیلی

ئەبولعەباس سەلاحەدین ئەحمەد، کـوڕی عەبدوسـەیید، کـوڕی شـەعبانی هـەولێری، لـە زانایـان و پیـاوە ناودارەکانی چەرخی حەوتەمە کە سەرەتا پەردەداری مەلیک موعـەززەم مزەفـەرەدین، خونکـاری هـەولێر بووە؛ بەڵام دوای ماوەیەک میر لێی دڕدۆنگ دەبێ و دەیخاتـە بەنـدەوە. پـاش ڕزگـار بـوون (ساڵـی ٦٠٣) دەچێتە شام و هێندێک لای مەلیک قاهیر بەهائەدینی ئەییووبی و چەلێک لە کن مەلیک موغیسی برایـدا کاری دەفتەر و دیوان دەکا. ئەگەر مەلیک موغیس دەمرێ، ڕوو لە میسر دەنێ و لە مەلیک کامیـل نزیـک دەبێتەوە؛ بەڵان زۆری پێناچێ، ئەکەوێتە بەر غەزەبی ئەویش و لە بەند دەکرێ (٦١٨ تا ٦٢٣). ئەمجار کـە خەلاس دەبێ، بە یەکجاری کاری دیوان و نزیکبوونەوە لە میران سێتەڵاقە دەکـا و هـەموو هـزر و کـاتی خۆی لە سەر خوێندن و هاونشینی شاعیران و وێژەوانان دادەنێ و سەرەنجام ساڵی ٦٣١ ک. م. لە شـاری ڕەها ماڵاوایی یەکجاری ئەو دنیایە دەکا. ساڵی لە دایک بوونی ئەم مامۆستایە ٥٧٢ لە هەولێر نووسراوە.

ئەبولعەباس سەلاحەدین دیوانێکی لێ ماوەتەوە؛ شیعری ناسک و جوان و ڕەوانە. ئەوا چەند نموونەی:

وَ اذا رَأَيْـتَ بَنيـكَ فـاعلَم أَنَّهُـمْ | قَطَعُـوا اليـكَ مَـسافَـةَ الآجـال
وَصَـلَ البَنَـوُن الـی محـلّ اَبـيهم | وَ تجَهَّـــزَ الابـــاءُ للتَّرحـــال

* * *

إصْنعْ ما شئتَ اَنْـت اَنْـتَ المحبُـوب | مالی ذَنْـبٌ، بَلی كَما قُلْـتَ: ذُنُـوب
هَـلْ تَـسْمَحُ بالوصـال فـی لَيْلَتنـا | تَجْلوُ صَـدَءالقَلْب وَ تَعْفُـو و أَتُـوب؟

شاعیرانی هاوچەرخی سەلاحەدین ڕێز و حورمەتێکی زۆریان لێ ناوە و بە پێشەنگی خۆیان زانیوە و شیعریان لەگەڵی گۆڕاوەتەوە. ئەم دوو بەیتە شاعیرێکی دمشقی بەناو «شَرَف‌الدّین بن عُنین» بۆی نووسیوە:

أُبُثُّـكَ مــا لَقيـتُ مِـنَ اللَّيـالی | فَقَـدْ قَـصَّتْ نَوائبُهـا جَنـاحی
و كيـف يفيـقُ مـنْ عَنَـت الرَّزايـا | مَـريضٌ مـايری وَجْـهَ الـصَّلاح؟

وشەی «صَلاح» لە باڵی ئاخردا ئیهامی هەیە؛ هەم مانای خێر و بەرژەوەندی دەدا، هەم ناوی پەسندراوە.

سەلاحەدین لە فیقهیشدا سەری‌دەرچووە و «*خُلاصە*»ی ئیمام غەززالی لەبەر بووە.

*الأعلام*، ب١، ل١٤٦. *تاريخ ابن خَلكان*، ب١، ل٥٩. *كَشف‌الظُّنون*، ب٢، ل٧٩٧.

## ئیمام سەیفوددینی ئامیدی

سەیفوددین ئەبولحەسەن عەلی، کوڕی موحەممەد، کوڕی سالم، لە پێشەنگانی فیقه و ئوسوول لە مەزهەبی شافیعیدایە کە ساڵی ٥٥٠ یان ٥٥١ ک. م. لە ئامید (دیاربەکر) لەدایک بووە و ساڵی ٦٣١، لە دمشق، لە دنیا دەرچووە.

ئەم مامۆستایە سەرەتا لای ئەبولفەتحی نەسری حەنبەلی خوێندی و شوێنکەوتووی ڕێبازی حەنبەلی بوو. پاشان چووە سەر مەزهەبی شافیعی و ماوەیەک ڕەگەڵ شێخ ئەبولقاسم، کوڕی فەزلانی کەوت و بە شوێن ئەوەدا چووە شام و لای مامۆستایانی هەڵکەوتەی ئەوێ «مَعقول»ی خوێند و زۆرێک لە دەقەکانی لەبەر کرد. ئەمجار چوو بۆ میسر و لەوێ ماوەیەک دەرسی‌گوتەوە. وردە ـ وردە ناوبانگی زانایی و زیرەکی لەڕادەبەدەری لە هەموو لایەک دەنگی‌دایەوە و تاقمێک لە فەقیهانی بەرچاوتەنگ، کەوتنە بەرهەڵستی کردنی و کار گەیشتە ڕادەیەک، ناونیتکەی لە دین لادانیان پێوە نا. سەیفەدین ناچار ئەوێ بەجێ‌هێشت و گەڕاوە شام و لە شاری حەمات دانیشت و شانی لە نووسینی کتێبانی بناغەی دین و فیقه و مەنتیق و حیکمەت و ... شل کرد؛ کە هێندێکیان بریتین لە: «*أبكار الافكار*» لەمەڕ بناغەی دینەوە، «*غايه‌المرام فی علم‌الكلام*»، «*رموز الكنوز*» لە حیکمەتدا، «*دقايق‌الحقايق*»، «*لباب‌الالباب*»، «*مُنتهى السّول* »، لە ئوسوول و «*الاحكام فی اصول‌الحكام*».

ئامیدی لە کێشەدا بێ هاوتا بووە و کەس لەو بوارە دەروستی نەهاتووە.

*طبقاتُ الشّافعيّه*، ب٥، ل١٢٩. *تاريخ ابن خَلكان*،

ب١، ل٣٢٩، ٣٣٠. *الأعلام*، ب٥، ل١٥٣.

## قازی بەهائەدینی شەددادی[1]

ئەبولمەحاسین بەهائەدین یۆسفی مووسلّی لە بەرەماڵەی کوردی بەنیشەدداد و گـەورەپیاوانی دادوەری و زانست، لە دەورانی ئەیبووبیانە کە ساڵی ٥٣٩ ک. م. لە مووسلّ هاتە دنیا و هەر لەو شارە خوێندی و لە فیقهدا شارەزاییەکی تەواوی دەسکەوت. پاشان ڕۆی بۆ بەغدا و ماوەی چوارساڵ لە قوتابخانەی نیزامییـە، زانـستی عەقلی و ویژەیی خوێند. ئینجا گەڕاوە مووسلّ و خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکرد. ماوەیک لەودوا چوو بۆ حەلەب و لەوێوە بۆ لە دمشق و قاهیرەش چوو.

کاتێ کە لە دمشق بوو، سوڵتان سەلاحەدینی ئەییووبی قەڵای کەوکـەبی ئابـڵۆقە دابـوو؛ کـە خەبـەری هاتنی ئیبنوشەددادی پێ‌گەیشت، لەدووی نارد و قازیعەسکەریی و سەرپەرشـتیی بارەگـای قودسـی پـێ ئەسپارد. لەوە بەولاوە، بۆ برێ لە غەزوەکان لەگەڵ خۆی دەبرد و بوو بە یەکێ لە نزیکانی جێ متمانەی.

کاتێ کە سوڵتان سەلاحەدین لە دنیا دەرچوو، قازی بەهائەدین لەوێ بوو و توانی پێش بە سەرهەڵـدانی ئاژاوە لە نێوان کوڕەکانیدا بگرێ. ئەوجار گەڕایەوە میسر کە مەلیک عەزیز، (عوسمان کـوڕی سـەلاحەدین) لە جێی بابی دانێ و لەم کارە گرینگەدا سەرکەوت.

ساڵی ٥٩١ ک. م. مەلیک زاهیر غیاسەدین، میری حەلەب، داوای لێ کرد بچێ بۆ ئەوێ و دادوەری حەلـەب وەئەستۆ بگرێ. بەهائەدین ئەم داخوازەی بەجێ‌هێنا و تا دواکاتی ژیانی (ساڵی ٦٣٢ ک. م.) لەو کارەدا مایەوە.

**کتێبـەکانی**: «*النّـوادر الـسلطانیّه و المحاسـن الیوسـفیّه*» لـە مـەڕ کەسـایەتی سولـّتان سـەلاحەدینەوە، «*دلائل الاحکام*» لـە بـارەی حەدیـسەوە، «*مَلجاءالحُکـام عنـدالتباس الحکـام*» لـە دادوەریـدا، «*فـضل الجهـاد*»، «*الموجزالباهر*» لە فوروعدا و «*کتاب‌العصا*».

قازی بەهائەدین یەکێ لە مامۆستایانی مێژوونووسی بەناوبانگ، قازی ئیبنوخەلیکانە.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل٣٥٤. *الأعلام*، ب٩، ل٣٠٦.

## شەهابەددین «ئەبووحەفس»، عومەری سوورەبەردی

زانای هێژا و عارفی دڵئاگا، کوڕی موحەممـەد، کـوڕی عەبدوڵـلا، کـوڕی موحـەممـەد، خەڵـکی گونـدی

---

١. سەر بە خانەدانی «**بەنیشەدداد**» یان «**شـەددادیان**»، لە بەرەماڵە ناودارەکانی کوردە، کە لە بەشێکی ئازربایجانـدا، لـە ساڵـی ٩٥١ تا ١٠٧٥ ز. پادشاییان کردووە و شارانی نەخجەوان و تفلیس و گەنجەیان بە دەستەوە بووە.

*مُعجَمُ‌الأعلام*، پاشکۆی *المُنجد*، ل ٢٨٦

سوورەبەردی لای زەنجانە کە ساڵی ٥٣٩ ک. م. هاتە دنیا و کە پێ‌گەیشت، ماوەیەک لە بەغدا خزمـەتی مامی (ئەبوونەجیب عەبدولقاهیری سوورەبەردی) کرد و لە پیت و پـیرۆزی زانـست و عیرفـانی ئـەو پـیرە پارسایە، بەهرەی گرت. هەروەها ماوەیەکیش هاودەنگی عارفی ڕووناکـدڵ، شـێخ عەبـدولقادری گـەیلانی کاری‌تێکرد. زیاد لەوەش چووە کۆڕی مریدان و قوتابیانی مامۆستایانی وەک ئەبووزەرعەی موقەددەسی.

شەهابەدین شێخی‌شێخانی بەغدا بوو؛ لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوەی هەیبوو دەیبەخـشی، هیچـی لـە کـەس وەرنەدەگرت و لەوپەڕی هەژاریدا لە دنیا چوو. هەمووساڵێک بۆ زیـارەتی مەکـە و مەدینـە دەرۆیـشت. تـا ڕادەیەک لای خەڵک وەج و ڕێزی هەبوو کە ساڵی ٦٢٨ ک. م. مەردمێکی زۆر و زەبەند بۆ زیـارەتی ماڵـی خوا لە خزمەتیدا بوون.

شێخ شەهاب لە ئاخری عومریدا سەکتە لێیدا و لە هات‌وچوو کـەوت و لـە سـەر تـەخت بـۆ مزگـەوتیان دەبرد. سەرەنجام لە دوارۆژی مانگی محەرەمی ساڵی ٦٣٢ ک. م. دنیای بێ بەقای بەجێ‌هێشت.

لە کتێبی «*بهترین اشعار*»دا، ئەم چوارینەیان بە ناوی ئەوەوە نووسیوە:

بخـشای بـه آنکـه بخـت یـارش نبـود — جُـز خـوردن انـدوه تـو کـارش نبـود
در عـشق تـو حـالتیش باشـد کـه در آن — هـم بـا تـو و هـم بـی‌تـو قـرارش نبـود

شیعری عارفانەی بە زبانی عەرەبیش هەیە. بۆ وێنە قەسیدەیەک کە ئەمە بەیتی سەرەتاکەیە:

تَـصَرَّمَتْ وَحْـشَةُ اللَّيـالی — وَ أَقْبَلَـت دَوْلَـةُ الوصـال

**لە کتێبەکانی**: «*عوارف المعارف*»، «*جذب القلوب الی مواصله المحبوب*»، «*السّیر و الطّیر*»، «*رشف النّصائح*»، «*المُعتَقد*»، «*بغیه البیان فی تفسیر القرآن*» و «*اعلام الهدی من عقیده ارباب التقی*».

*دائرة المعارف*، فرید وَجدی، ب٥. *تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٣٣٠. *الأعلام*، ب٥، ل٢٢٣. *بهترین اشعار* ، ل٢٤٨.

## شەرەفەددین موحەممەدی ئەربیلی

شەرەفەددین موحەممەد، کوڕی ئەبولقاسم عیزەدینی نەسرە کە پێشتر باسیمان کرد. دوای کۆچی دوایـی بابی، کارەکانی ئەوی ـ یەکیان دەرس‌گوتنەوە ـ لە ئەستۆ گرت.

ئەم مامۆستایە زانایەکی وێـژەوان و شـاعیرێکی قـسەزان بـوو. لـە شـیعرەکانیدا باسـی تارانـدنی بـاب و بنەماڵەی لە هەولێر دەکا و لەگەڵ هێرشی خێڵی «کەرج» بەسەر شاری «مەرەند»ی ئازەربایجـان و تـاڵان و ماڵانییان لەو شارەدا بەرامبەری دەکاتـەوە، کـە ئـەو دوو کارەسـاتە لـە یـەک کاتـدا (ساڵـی ٦١٢ ک. م.) ڕوویداوە:

انْ يَكُـنْ أخْرَجُـوا النـساء مـنَ الأو — طـان ظُلْمـاً وَ أسْـرَفُوا فـی التَّعَـدّی

فَلَنــا اُسْــوَةٌ بِمَــنْ جــارَتَ اَلکَــرْ         جُ عَلَــیْهِمْ وَ أَخْرَجُــوا مــنْ مَرَنْــد

زا و مەرگی شەرەفەددین ساڵی ٥٧٢ ک. م. و ٦٣٣ لە هەولێردا ڕوویداوە.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب ١، ل ١٧١.

## شێخولیسلام تاجەدین موحەممەدی ئوشنەهی[1]

عارف و مورشیدی پایەبەرز کە زۆرێک لە گەورەسۆفیانی وەک شێخ سەیفەدینی باخرزی (؟ ـ ٦٥٩ک. م.) کەڵپۆسی مبارەک و ئیجازەی لە دەستی ئەو وەرگرتووە، باوکی شێخ سەدرەدین مەحموودە کە بە جیـاواز باسی ئەویش دەکەین.

بابی تاجەدین، حەدادی ناو بووە.

*لغتنامەی دهخدا*، پیتی ت، ل٣٩٧.

## مەجدەدین عومەری هەکاری

ئەمیر ئەبووحەفس «مەجدەدین» عومەری هەکاری، لە زانایانی شارەزای هەکاری و برای مامۆستا زیائەدین عیسا[2] بووە کە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٥٦٠ ک. م. دا هاتۆتە دنیا و ٢٣ی زیحەجەی ٦٣٦ لە قاهیرە لە دنیا دەرچووە.

*وَفَیاتُ الاعیان*، ب ١، ل٣٩٧.

## ئیبنوئەسیر، وێژەوانی جزیری

ئەبولفەتح نەسروڵلا زیائەدین، کوڕی ئەبیلکەرەم موحەممەدی جزیری، ناسراو بـە «ابـن‌الاثیـر کاتـب»، بـرای ئەبووسەعادەت و ئەبولحەسەن،[3] لە ڕەمەزانی ساڵـی ٥٥٨ ک. م. لـە جزیـر هاتـە دنیـا و لەگـەڵ بـاوک و براکانیدا چوو بۆ مووسڵ و شانی لە خوێندن و فێربوون نا و لە هەر زانستێ کتێبێ یان چەند کتێب و دیوانـە ناسراوەکانی عەرەبی لەبەر کرد. ئەو لە هەموو زانستەکاندا، هەڵـکەوتەی زانایـانی هاوچـەرخی خـۆی بـوو؛ بەتایبەت بۆ نووسین، پیتۆڵی ڕۆژگـار ئەهاتـە ئـەژمار. خـاوەنی مێـژووی «*ابـن‌خَلکـان*» ماوەیـەکی زۆر لـە خزمەتیدا خوێندوویە و لەو گەنجینە گەورەی زانست و ئەدەبە بەهرەی بردووە.

---

١. «**ئوشنەهی**» یان «**ئوشنایی**»، واتا خەڵکی «**ئوشنە**»، کە پێشتر بە شاری «**ئوشنەوییە**» گوتراوە.

*لغتنامەی دهخدا*، پیتی الف، ل٢٦٩٩و ٢٧٠٠.

[شیاوی باسە هەموو ئەو ناوانە هەر «**شنۆ**»کەی خۆمانە! و]

٢. لە لاپەڕەی ٦٢ دا باسی کراوە.

٣. بڕوانە بۆ لاپەڕەکانی ١٢٧ و ٦٨.



زیائەدین کە خوێندنی تەواو کردووە، چۆتە دەرباری سوڵتان سەلاحەدین و سوڵتان خۆشی‌ویستووە. پاشان بووە بە وەزیری مەلیک ئەفزەلی کوڕی وساڵی ٦٠٧ ئەوی بەجێ‌هێشتووە و چۆتە حەلەب بۆ خزمەتی زاهیری غازی، برای ئەفزەل. بەڵام دواجار تاسەی زێد و نیشتمان، ناچاری کردووە بگەڕێتەوە مووسڵ. ماوەیەکیش لە هەولێر و سنجار بووە و دیسان گەڕاوەتەوە مووسڵ و دەفتەر و دیوانی ناسرەدین مەحموودی[1] گەڕاندووە (ساڵی ٦١٨).

مامۆستا زیائەدین هێندێک بەرهەمی نووسراوەشی هەن کە هەرکامیان بۆ نیشاندانی ئەوپەڕی زانایی و تەڕنووسی نووسەر، نیشانەی چاکن؛ کتێبی وەک: «*المثلُ السائر فی ادَب الکاتب و الشاعر*» لە دوو بەرگدا، «*الوشی المرقوم فی حلّ المنظوم*»، «*البُرهان فی علم البیان*»، «*جامع الکبیر فی صناعه المنظوم من الکلام و المنثور*» لە ویژەدا، «*المعانی المُخترعه*» لەمەڕ نوسیارییەوە، «*دیوان تَرَسُّل و مُنشَآت*» لە چەند بەرگدا و سەرجەمێکی هەڵبژێردراو لە شیعری «اَبوتَمام» و «بُحتُری» و «دیک‌الجن» و «مُتَنَبّی» لە بەرگێکی گەورەدا کە لە ئاخرەوە ئەم دوو بەیتەی هێناوە:

تَمَتـعْ بـه علقـاً نَفیـساً فَإنَّـهُ اخْـــ ـــتیارُ بَـصیر بـالأمُور حَکـیم
أطاعَتْـهُ اَنْـواعُ الـبَلاغَـة فاهْتَـدی الـی الـشعْر مـنْ نَهـج اَلَیْـه قَـویم

ئەمەش چەند ڕستە لە نامەیەک کە بۆ میری خۆی نووسیوە، لە حاڵێکدا کە ڕێبواری ڕێگایەکی زۆر سارد و بۆران بووە:

«وَ یُنْهی اَنَّهُ سارَ عن اَلخدمَة، وَ قَدْ ضَرَبَ الدَّجْن فیه مَضاربَهُ، وَ أسبَلَ عَلَیْه ذَوائبهُ، وَ جَعَل کُلَّ قرارة حَفیراً، وَ کُلَّ رَبْوَة غدیراً، وَ خَطَّ کُلَّ ارَض خَطّاً، و غادَرَ کُلَّ جانب شَطا، کَأنَّهُ یُوازی یَدَ مَولانا فی شیمَهٔ کَرَمها و التشاث صَوْب دیمها، وَ المملُوکُ یَستَغْفرُالله منْ هذا التَّمثیل العاری عَنْ فایدَة التَحصیل، وَ فَرْقُ بَیْنَ ما یَمْلا اَلوادیَ بمائه، وَ مَنْ یَمْلأَ النّادی بنَعْمائه، وَ لَیْسَ ما یُنْبتُ زَهرا یُذهبُهُ المَصیفُ، او تمراً یَأکُلُهُ الخَریف، کَمَنْ یُنْبتُ ثَرْوَةً تفوتُ الاعطاف، وَ یَأکُلُ اَلمرْتَبع وَ اَلمُصطَاف...».

ئەم مامۆستا بلیمەتە سەرەنجام ساڵی ٦٣٧ ک. م. لە شاری بەغدا، مەلی ڕۆحی هەڵفڕیوە.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل١٥٨. *تاریخ آداب‌اللغة*، جُرجی زَیدان، ب٣، ل ٥٠ و ٥١. *الأعلام*، ب٨ ل٣٥٤.

## ئیبنولموستەوفی ئەربیلی

ئەبولبەرەکات مبارەک،کوڕی ئەبولفەتح ئەحمەد، کوڕی مبارەک، ناسناو «شَرَف‌الدّین» و ناسراو بە

١. ناصرالدّین محموود، بن ملك قاهر عزّالدّین مسعود، بن ارسلان‌شاه ایّوبی!

«ابن‌المُستَوفی»، پیاوێکی خاکەسار، بەخشندە، هێژا، بەوەج و دەریای وێژەوانی و شیعر و قسەزانی بووە کە ساڵی ٥٦٤ ک. م. لە هەولێر هاتۆتە دنیاوە و ساڵی ٦٣٧، پاش ٧٤ ساڵ ژیانی پڕبایەخ، لە مووسڵ چاوی لێک‌ناوە.

ئیبنولموستەوفی مژیوەرێکی تەواو بووە و هەموو زانستەکانی ئەو سەردەمە، لە زمان و وێژە و نەحو و عەرووز و قافیەوە بگرە تا بەیان و شیعر و ئەخبار و ئەمسالی عەرەبی باش زانیوە و لە حەدیس و ناوی کەسان و هەروەها حیسابان و کاروباری دیوانیدا هاوشانی بۆ هەڵنەکەوتووە. زانایان و هەستیارانی لە خۆ خڕ کردۆتەوە و لە بەرامبەر شیعر یان پەخشانی باشیانەوە، خەڵاتی پێ بەخشیون و بەم بۆنەوە هەر زانا، شاعیر یان نووسەرێک کە گەیشتۆتە هەولێر، پێش هەموو کارێ، لای ئەبولبەرەکات چووە و دیاری خۆی پێشکەش کردووە.

ئیبنولموستەوفی سەرەتا مەقامی کاربەندی (استیفا)ی بووە؛ کە لەو ڕۆژکارەدا هاوقاتی وەزیری هاتۆتەوە. ماوەیەک لەودوا (٦٢٩ ک. م.) بۆتە سەرۆک‌وەزیر. بەڵام سەرەنجام لە کاری دیوانی بێزاوە و دەستی لێ بەرداوە و بۆ ئەوەی مەجالێکی بۆ خوێندنەوە و نووسین هەبێ، چۆتە مووسڵ و هەرلەوێ کۆچی یەکجاری کردووە.

ئەم مامۆستایە لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگ بووە و کەسانێکی زۆریان لێ بۆتە وەزیر و سەرکردە و خاوەن پلە و پایە؛ وەک بابی و مامی (ئەبولحەسەن عەلی، کوڕی مبارەک). هەروەها یەک لە ئامۆزاکانی پیاوێکی زانا بووە و کتێبی فارسی «**نصیحةُالملوک**»ی ئیمام موحەممەدی غەززالی، وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی عەرەبی.

ئەمجار کتێب و نووسراوەی خۆی: مێژووی هەولێر لە چوار بەرگدا، بە ناوی «*نَباهةُالبَلَدالحافل فیمَن وَرَدَهُ من الاماثل*»، «*النّظام*» کە شەرحی شیعری موتەنەبی و ئەبووتەمامە لە ١٠ بەرگدا، «*اِثبات المُحَصل فی نسبَةِ اَبیات المُفَصّل*» لە ٢ بەرگدا، «*سرّالصنیعه*»، «*أبوقُماش*» کە باسی پیتۆڵانی عەرەب و دیوانی شیعرە.

جارێک لە درنگانی شەو لە ڕێگای مزگەوتدا، کابرایەکی نەناس هەڵمەتی بۆ دەبا و سەروچاو و دەست و باسکی بریندار دەکا. بەو بۆنە ئەم چەند شیعرە بۆ مەلیک موعەزەم، میری هەولێر دەنێرێ و تێیدا ئەندامانی بە باندپێچراوی لەشی، بە منداڵی بابۆڵەپێچ کراو دەشبهێنێ:

یـا اَیُّهـا المَلـکُ الَّـذی سَـطَواتُهُ — مِـنْ فعْلهـا یَتَعَجَّـبُ الْمـرِّیخُ
آیـاتُ جُـودکَ مُحْکَـمٌ تَنْزیلُهـا — لا ناسـخُ فیهـا و لا مَنْـسُوخُ
أشْـکُو الَیْـکَ وَ مـا بُلیـتُ بمثْلهـا — شَـنْعاءُ ذکْـرُ حـدیثها تـاریخُ
هـیَ لَیلَـةٌ فیهـا وُلـدْتُ و شـاهدی — فیمـا ادَّعیـتُ الْقُمْـطُ وَ التَّمـریخُ

*الأعلام*، ب٦، ل١٤٩. *تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٤٤٢ و ٤٤٣.

## کەمالەدینی ئەربیلی

کەمالەدین ئەبولفەتحی مووسا، کوڕی شێخ «رضی‌الدّین» یونس، کوڕی موحەممەد، کوڕی «منعە»، ساڵی ٥٥١ لە مووسڵ هاتە دنیا. سەرەتا لای باوکی خوێندی و ساڵی ٥٧١ چووە بەغدا و لە نیزامییە، لای کەمالەدین ئەبولبەرەکات عەبدورڕەحمان،کوڕی موحەممەدی ئەنباری، ئوسوول و ئەدەبیاتی وەرگرت و خزمەتی مامۆستایانی تریش گەیشت و کە بوو بە ئوستادێکی تەواو، گەڕاوە مووسڵ و تا بابی مابوو، زیاتر سەری لە ناو کتێبان و خەریکی خوێندنەوە دەبوو؛ بەڵام دوای ئەو دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکرد و لە ماوەیەکی کەمدا ناوی،وەکوو زانایەکی گەورە، کەوتە ناوان و قوتابیان و تامەزرۆیانی زانست، دەستە ـ دەستە بۆ بەهرە بردن لە کۆڕی دەرسی ئەو مامۆستایە، ڕوویان لە مووسڵ نا.

قازی ئیبنوخەلیکان لە مێژووەکەیدا دەڵێ: «ساڵی ٦١٦ لە مووسڵدا گەیشتمە خزمەتی کەمالەدین و لە هەموو زانستێکدا مامۆستایەکی بێ‌وێنە هاتە بەرچاوم».

هاوچەرخەکانی شادەیان داوە کە شارەزای ٢٤ زانستی وەکوو: بناغەی دین، فیقهـ بنەمای فیقهـ، حیکمەت، مەنتیق، هەسارەناسی، بیرکاری و تەنانەت بژیشکی و مووسیقا و ئەوفاق بووە؛ لە تەفسیر و حەدیس و تەورات و ئینجیلیش سەری دەرچووە.

مەکۆی ئەم مامۆستایە هەمیشە کۆڕی زانایان و تێگەیشتوان بووە و زۆر ڕووی‌داوە کە مامۆستایانی پایەبەرز، بە شێوەی نەشناس لە ڕێگای دوورەوە ڕوویان لێ کردووە و بە عەگاڵ[1] و تەیلەسانەوە[2] لە خزمەتیدا چۆکیان‌داوە و پرسیاری خۆیانیان پرسیوە. عیماد ئەبوعەلی عومەر، کوڕی «عبدالنّور صنهاجی» لەم بارەوە دەڵێ:

کمالُ کمال الدّین للعلم و العُلی — فَهَیْهاتَ ساعٍ فی مَساعیکَ یَطْمَعُ
اذَا جْتَمع النُّظارُ مِنْ کُلِّ مَوْطن — فَغایَةُ کُل اَنْ تَقُولَ وَ یَسْمَعُ
فَلا تَحْسبوهُمْ عَنْ غناء تَطَیْلَسوا — وَ لکنْ حیاءً وَ اعْترافاً تَقَنَّعُوا

**لە کتێبی کەمالەدین، ئەمانە یان نووسیوە:** «*کَشفُ المُشکلات*» لە تەفسیری قورئاندا، کتێبێک لەمەڕ وشەتاکەکانی «*قانون*»ی بووعەلی سیناوە، کتێبێک لە ئوسوولدا، «*عُیون المنطق*»، «*لَغز فی الحکمه و الاسرار السلطانیّه*» لە نوجوومدا، «*رسالَةٌ فی البُرهان عَلی المقدمه الّتی اهملها ارشمیدس فی کتابه فی تسبیع الدائره و کیفیّه اتخاذ ذلک*» و «*شرح الاعمال الهندسیّه*».

کەمالەدین ڕۆژی ١٤ی مانگی شابانی ساڵی ٦٣٩ ک. م. لە زێدی خۆی (شاری مووسڵ)دا کۆچی

---

١. «**عەگاڵ**» یان بە عەرەبی «**عِقال**»: پەتی سەری عەرەبان.

٢. «**طَیلَسان**»: جلێکی وەکوو عابا یان شنێلە، کڵاوێکی پێوە لکاوە و زۆرتر کەشە لەبەری دەکەن.

یەکجاری کردووە.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب۲، ل۱۳۲. *طبقاتُ الشّافعیّه*، ب۵، ل۱۵۸. *الأعلام*، ب۸، ل۲۸۸.

## ئیبنولخەببازی ئەربیلی

شەمسەدین ئەبولعەباس ئەحمەد، کوڕی حوسەین، کوڕی ئەحمەد، کوڕی مەعالی، کوڕی مەنسووری هەولێری، ناسراو بە «ابن خَبّاز» لە زانایانی نەحو و شاعیرانی بێبەش لە چاوە کە ساڵی ٦٣٧ یان ٦٣٩ ک. م. لە هەولێردا کۆچی دوایی کردووە. برێ ناسناوی ئەویان «اَبو عَبدالله» نووسیوە.

**لە کتێبەکانی**: «*شَرح المقدمه الجزولیه*»، «*شرح اللمع لابن جنّی*»، «*التوجیه فی النحو*»، «*النّهایة فی النحو*»، «*الغرّة المخفّیه فی شرح الدرّه الالفّیه لابن مُعطی*» و «*شرح میزان العربّیه لابن انباری*».

*الأعلام*، ب۱، ل۱۱٤. *کَشف الظّنون*، ب۳، ل۱۹۸۹. *هدیةالعارفین*، ب۱، ل۹۵.

## شێخ تاجەدینی ئەرمەوی

موحەممەد، کوڕی حوسەین، ناسراو بە «تاج‌الدّین»، لە پێشەنگانی زانایان و وێژەوانانی چەرخی حەوتەم و کوردانی شاری ورمێیە کە وەک «*لُغتنامە*» دەڵێ: لە کتێبی «*عُیون‌الانباء*»، نووسراوی ئیبنو ئەبی ئوسەیبیعە، بەرگی۲، لاپەڕەی۳۰دا کە باسی کتێبانی فەخرەدین خەتیبی ڕازی دەکا، دەڵێ: «**الرّسالة الکمالیّة فی الحقایق الالهیّه، الّفها بالفارسیّة کمال‌الدّین محمد بن میکاییل و وجدت شیخُنا الامام العالم تاج‌الدّین محمد الارمَوی قد نقلها الی العربیة فی سنة خمس و عشرین و ستّمائة (٦٢٥) بدمشق**».

*لغتنامەی دهخدا*، پیتی ت، ل۵۸ و ۸۵.

## ڕوکنەدینی سنجاری

ڕوکنەدین ئەبولقاسم مەحموود، کوڕی حوسەین، خەڵکی سنجارە کە هەموو عومری خوێندوویە و دەرسی گوتۆتەوە و جاروبارەش کتێبی نووسیوە.

**لە کتێبەکانی**: «*نشر المثل السائر و طَیّ الفلک الدّائر*» یان ناو بردووە.

*هدیةالعارفین*، ب۲، ل٤٠٥.

## شێخ ئەبووسوعوودی بادینی

شێخ ابووسوعوود، کوڕی ئەبی‌شەعائیر، کوڕی شەعبان، لە عارفانی بەناوبانگ و خاوەن کەرامەتی بادینان لە

باکووری کوردستانە کە بۆ دەس‌خستنی زانست و تەریقەت زێدی خۆی بەجێ‌هێشتووە و سەرەنجام لە قاهیرە گیرساوەتەوە و لەوێ خانەقایەکی بۆ ڕاهێنانی ڕێوەندان بنیات‌ناوە و کۆمەڵێکی زۆر وەکوو: داودی مەغریبی، شەرەفەدینی کوردی و خدری کوردی، لە سۆنگەی هاودەنگی ئەوەوە تا پلە بالاکانی عیرفانیان تێپەڕ کردووە و بەشی تەواویان بردووە.

**وێنەیەک لە گوتاری ئەو بەڕێزە:**

«یَنْبَغی للسّالك الصادق فی سُلُوکه اَنْ یَجْعَلَ کتابَهُ قَلْبَهُ؛ وَ مَن کانَ الطَّلَبُ شُغْلَهُ یُوشکُ اَنْ لا یضلَّ عَنْ طَریقِ اللهِ تعالی، وَ مَن کانَ المطلوبُ شُغْلَهُ یُوشکُ اَنْ لا یَقفَ، فالطَّلَبُ شُغْلُ الظاهر، المطلوبُ شُغْلُ الباطِنِ وَ لا یَسْتَقیمُ ظاهرٌ الا بباطنٍ وَ لا یَسلَمُ ظاهرٌ الّا بباطنٍ».

شێخ ئەبووسوعوود ساڵی ٦٤١ ک. م. لە قاهیرە وەفاتی کردووە.

*طبقات شَعرانی*، چاپی میسر، ب١، ل١٦١.

## موحەممەد عەبدوسسەتتاری ئامێدی

«شَمسُ‌الائمّه» موحەممەد، خەڵکی ئامێدی (عمادیّه)، یەک لە مامۆستایانی خاوەن بیروڕا لە ڕێبازی ئیمام ئەبووحەنیفەدایە کە کتێب و نووسراوەی زۆری لێ بەجێ‌ماوە و ساڵی ٦٤٢ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

**چەند نووسراوەی مامۆستا**: شرۆڤەیەک بەسەر کتێبی «*مُختَصر القدوری*» لە فورووعی حەنەفیدا، «*تاسیس القواعد*» و «*عصمه الانبیاء*».

*کَشف‌الظّنون*، ب١، ل٢٤١ و ب٢، ل٤٠٢.

## ئیبنوسەلاحی کوردی شارەزووری

شێخ تەقیەدین ئەبووعەمری عوسمان، کوڕی ئەبولقاسم سەلاحەدین عەبدوڕڕەحمانی شارەزووری، مامۆستایەکی گەورەی خاوەن ئاکاری بەرز و پەسند و خۆ و خدەی دوور لە ناپاکی و ناڕاستی، لە ساڵی ٥٧٧ لە هەولێر لەدایک بووە و ٦٤٣ ک. م. لە دمشق دنیای بەجێ‌هێشتووە.

شێخ تەقی خوێندنی سەرەتا بە لای باببیەوە دەسپێکرد و پاشان کەوتە گەڕان و لە مووسڵ حەدیسی لای ئەبووجەعفەر عوبەیدیللا، کوڕی ئەحمەدی بەغدادی، ناسراو بە «ابن‌السَّمین» و عیمادەدین ئەبووحامید یۆنس وەرگرت و لە بەغدا لای ئیبنوسەکینە و ئیبنوتەبەرزەد، لە نەیشابوور لای مەنسووری فەراوی و موئەییدی تووسی، لە مەرڤ لای ئەبووموزەفەری سەمعانی و لە دمشق لای قازی عەبدوسەمەدی حەرستانی، باقی زانستەکانی خوێند و لە هەموو بارێکەوە بە تەواوی پێگەیشت؛ ئەوجار گەڕایەوە شام و لە



قوتابخانەی ناسرییە ـ کە سوڵتان سەلاحەدین بنیاتی ناوەـ وانەی گوتەوە و ماوەیەکیش دەرسدانەوەی لە مەدرەسەی «ستُّ‌الشّام»ی زومورڕود خاتون، خوشکی سوڵتان، گرتە ئەستۆ.

ئیبنوسەلاح لە دەورانی خۆیدا ئوستادێکی بێ‌وێنە لە تەفسیر و حەدیس و فیقهـ و ئوسوولدا بووە و زۆرێک لە زانایانی ناوداری وەکوو قازی ئیبنوخەلیکان بارهاتووی مەدرەسەی ئەون.

سوبوکی لە «*طَبَقات*»دا ئاوای پەسن دەدا: «کانَ اماماً کبیراً، فقیهاً، محدثاً، زاهدا، وَرعاً مُفیداً استوطنَ دمَشقَ، یُعیدُ زمان السّالفینَ و یَزیدُ بِهجتها بروضة علمٍ جَنی کُلُّ طالبٍ جناها، فما منهم الاَمَنِ اعترفَ مِن بحره و اعترف بدَره...».

ئیبنوسەلاح کتێب و نووسراوەی بایەخداری زۆری داناوە؛ بۆ نموونە: «*اَدَبُ المُفْتی وَ المُستَفتی*»، «*فوائد الرّحلَه*»، «*طَبقات الفُقَها*»، «*مُشکل الوسیط*»، «*صِلَة الناسِک فی صنة المناسک*»، «*معرفۀ انواع الحَدیث*» و «*النُّکت و الفتاوی*».

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٥، ل١٣٧. *تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٣١٢. *الأعلام*، ب٤، ل٣٦٩.

## تاجولعارفین

شەمسەدین حەسەن، کوڕی عەدی، کوڕی مسافر، ناسراو بە «تاجُ‌العارفین»، لە عارفان و زانایانی ناوداری چەرخی حەوتەمی کۆچییە کە لە مووسڵدا ژیاوە و هەر لەوێ، ساڵی ٦٤٤ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الجلوة لاصحاب الخلوة*»، «*هدیة الاصحاب*» و «*مَحَکُ الایمان*».

*هدیۀالعارفین*، ب١، ل٢٨١ . *کشف‌الظّنون*، ب٢، ل٧١٨. *ذیل کشف‌الظّنون*، ب١، ل٣٦٤. *لغتنامەی دهخدا*، پیتی ح، ل٥٨٧.

## ئیبنولحاجیبی نەحوی

جەمالەدین ئەبووعەمری عوسمان، کوڕی عومەر، کوڕی ئەبووبەکر، ناسراو بە«ابنُ‌الحاجب»، لە ئاخری ساڵی ٥٧٠ ک. م. هاتۆتە دنیا و ڕۆژی پێنجشەمبە ٢٦ی شەوالی ٦٤٦ لە ئەسکەندەرییە لە دنیا چووە. بابی لە عەشیرەتی مووسکی مەریوان و دەرکەوان و هاودەنگی ئەمیر عیزەدینی مووسکی سەلاحی ـ لە سەرکردەکانی سپای میسر لە دەورانی پاتشایانی میسرـ بووە.

ئیبنولحاجیب خوێندنی فیقهی ڕێبازی ئیمام مالیک و تەفسیر و قەرائات و نەحو و زبان و وێژەی عەرەبی لە قاهیرەدا دوایی پێ هێنا؛ ئەمجار چوو بۆ دمشق و لە قوتابخانەیەکی تایبەت بە مامۆستایانی مالیکی، کۆڕێکی دەرس‌دانەوەی دامەزراند و لە ماوەیەکی کەمدا ناو و ناوبانگی داکەوت و قوتابیان لە هەموو

لایەکەوە روویان کردە قوتابخانەکەی.

مامۆستا جارێکی تر لە دمشقەوە گەڕاوە قاهیرە و ماوەیەک لەوێ دەرسی گوتەوە و پاشان چوو بۆ ئەسکەندەرییە و تا دوا ساتی ژیانی لەو شارەدا مایەوە.

ئەم مامۆستایە لە زۆربەی زانستی ئەو ڕۆژگارە، بەتایبەت ویژە و سەرف و نەحودا دەستێکی باڵای هەبووە و لە هێندێک کێشەی نەحویدا بۆخۆی خاوەن بیروڕایە و ئیجتیهادی کردووە. هەروەها لە باری وردبینی و هێزی لێکدانەوە و بڕشتی هزر و بیری قووڵ و بەقەوەتەوە کەس تۆزی نەشکاندووە.

قازی ئیبنوخەلیکان لە مێژووەکەی (*وَفَیاتُ العیان*)دا دەڵێ: «ئیبنولحاجیب بۆ شایەتیدان چەن جار هات بۆ لام و ئەمن بە چەند پرسیاری ئەدەبی تاقیم کردەوە و وەرامی هەرەباشم بیستەوە؛ بە شێوەیەک کە هەموو پرسیارێکی بە بەڵگەوە وەرام دەداوە؛ کە نیشانەی زۆر بوونی کرۆکاش و بەربڵاو بوونی زانستی بوو».

ئیبنولحاجیب کتیب و نووسراوەی بایەخداریشی هەبووە؛ بۆ وێنە: «*مُختَصر الفروع یا جوامع الامهات*» لە فیقهی مەزهەبی ئیمام مالیکدا، «*کافیە*» لە نەحو، «*شافیە*» لە سەرفدا؛ کە ئەم دوو کتێبە لەمێژ ساڵەوە دەرسی فەقێیان بووە. «*المَقصد الجلیل فی علم الخیل*» لە عەرووزدا، «*مُنتَهی السّول و الامل فی علمی الاصول و الجَدَل*»، شەرحێکی «*الکتاب*»ی سیبویە، : «*مُعجَم الشّیوخ*»، «*جمال العرب فی الادب*»، «*مُختَصر المنتهی*» لە ئوسوولی فیقهدا و کتێبی «*الامالی*».

*تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٣١٤. *کشف الظّنون*، ب٢، ل٥٣٨. *الأعلام*، ب٤، ل٣٧٤. *هدیة العارفین*، ب١، ل٦٥٤.

## شێخ عەلی کورد

لە عارفان و سۆفیانی چەرخی حەوتەمی کۆچی و هاوچاخی شێخ شەهابەدین عومەری سوورەبەردی[1] بووە کە ماوەیەک لە دمشقدا ژیاوە؛ بەڵام لە دواییدا هاودەنگی و ئاموشۆی خەڵک بێزاری کردووە و ناچار داویەتە بیاوان و دوور لە کۆمەڵگا، گیانی ئەسپاردووە.

مەلا حامیدی بێسارانی، پێڕای شەرحێ کە بۆ کتێبی «*مثنوی مولوی*» نووسیویە، لە چەند شوێنان باسی پارێزگاری شێخ عەلی دەکا. هەروەها مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی لە «*نَفَحاتُ الأُنس*»دا ئاوای ناو لێ دەبا: «ئەو لە شێتە تێگەیشتووەکان بووە و هەموو جۆرە کەرامەت و کاری سەمەرەی لێوە بینراوە؛ خەڵکی دمشق هەموو مرید و باوەڕمەندی بوون...».

*نَفَحاتُ الانس*، تاران، ١٣٣٧، ل٥٨٠.

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٨٠.

## عەلائەدینی کوردی

لە دادوەرانی زانا و ویژەوانی رۆژگاری فەرمانڕەوایی مەلیک ئەشرەفی ئەییووبی و «قاضی‌القضاة»ی شام بـووە و لە نیوەی هەوەڵی چەرخی حەوتەمدا ژیاوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٧١.

## نەجمەدین ئەیووبی خەلاتی

نەجمەدین ئەیووبی موحاسیب، کوڕی عەینوددەولـە، کـوڕی نەسـروڵا، لـە کـوردانی ئـەخلات و زانایـانی بیرکاری و ئەستێرەناسییە کە لە دەربـاری سوڵـتان مـەلیک ساڵـەح (٦٣٩-٦٤٧ ک. م.)، کـوڕی مـەلیک کامیلی ئەییووبیدا ژیاوە و ژمێریار و ئەستێرەناس بووە و لەم بارەوە چەند کتێبیشی هەیـە؛ یـەکیان: «*اصـول احکام النجوم و السرِّ المَکتوم فی اظهارِ ما کانَ مُختَفیاً مِن احکام النُجوم*».

*کـشف‌الظّنـون*، ب١، ل١١٣. *گاهنامـەی تهرانـی*، ١٣١٠ ک. هـ.، ل٩٠. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٢٢٩.

## شێخ وەرامی حیللی

شێخ وەرام (بەهرام)، کوڕی ئەبولفەواریس عیسا، کوڕی ئەبی‌نەجم، مامی ئەمیر حوسامەدین ئەبولفەواریسی حیللی کوردییە کە لە هەڕەتی لاوەتیدا پیاوێکی شەڕوان و چەکداری سپا بووە بەڵام لـەودوا دوورەپـەرێزی هەڵبژاردووە و سەری لە خوێندن و بەندایەتی ناوە.

ئیبنوئەسیر پێڕای ڕووداوانی ساڵی ٦٢٢ ک. م. باس لە شێخ وەرامی حیللی دەکا. هـەروەها زرکلـی لـە «*الأعلام*»دا ساڵی لە دنیا دەرچوونی ـ بەقسەی کتـێبی «*شُعَراءُالحلّه*»ـــ ٦٠٥ ک. م. دنووسـێ؛ کـەچی لـە دەقی کتێبەکەیدا ٦٥٠ ی هێناوە!

**لە کتێبەکانی**: «*نزهةالناظر*» و «*تنبیه‌الخاطر*» لە ئامۆژیاری و هۆزانیدا.

*الأعلام*، ب٩، ل١٢٩. *تاریخ‌الکامل*، ابن‌اثیر، ب١٢، ل٢٠٦.

## کەمالەدینی خەلاتی

ئەبووعەبدوڵلا کەمالەدین موحەممەد، کوڕی عیبادی خەلاتی ـکە «سـەدرەدین»یـشیان پـێ گوتـووەـــ لـە زانایانی چەرخی حەوتەمە کە لە فیقهـ و ئوسوول و حەدیـسدا شـارەزاییەکی تـەواوی هـەبووە و بەرهـەمی نووسراوەی باشیشی لێ بەجێ ماوە؛ وەکوو: «*تلخیص الجامع الکبیر فی الفروع*» و شەرحێک بەسـەر «*صـحیح احادیث مُسلم*»دا.

کەمالەدین ساڵی ٦٥٢ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

*الأعلام*، ب٧، ل٥١. *کشف الظّنون*، ب١، ل٣٣٣، و ب٢، ل٤٣٢. *هدیة العارفین*، ب٢، ل١٢٥.

## ئەبووبەکری شبلی

قازی ئەبووبەکر، کوڕی جونەید، کوڕی ئیبراهیمی شبلی خەلیکانی هەولێری، لە عەشیرەتی کوردی زرزایە کە ساڵی ٥٧٦ ک. م. لە هەولێر هاتۆتە دنیا و ٦٥٣ لە دنیا دەرچووە. قازی لە زانایانی جێ‌بڕوای دەورانی خۆی بووە و لە شاری «اخمیم» دادوەری کردووە.

*طبقاتُ الشّافعیّه*، ب٥، ل٥٧.

## جوبراییل‌شوجاعی ئەربیلی

جوبراییل «ابنُ‌الأوانی»، ناسراو بە «شوجاع»، لە زانایانی کوردی هەولێر و موفتی ئەو شارە و هاودەورەی مێژوونووسی بەناوبانگ، قازی ئیبنوخەلیکان (٦٠٨-٦٨١) بووە و لە نێوانی چەرخی حەوتەمدا ژیاوە.

جامی لە «*نَفَحات‌الانس*»، چاپی تاران، ١٣٣٧ ک. ه. ل٥٢٥دا، باسی عارفێک بە ناوی موحەممەدی «ئاوانی»، ناسراو بە «ئیبنوقائید» دەکا کە لە یارانی شێخ مەحیەدین عەبدولقادری گەیلانی (٤٧٠-٥٦١) بووە و شێخ لە ڕیزی ئەولیای داناوە. دوور نییە جوبراییل شوجاع، کوڕ یان کوڕەزای ئەوبێ.

*لغتنامەی دهخدا*، پیتی ج، ل١٩٧.

## نوورەدینی ئەسعەردی

نوورەدین ئەبووبەکر، موحەممەدی شافیعی، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەبدولعەزیز، کوڕی عەبدوسەمەد، کوڕی ڕۆسەمی ئەسعەردی، زا و مەرگی ٦١٩ و ٦٥٦ ک. م. لە شاعیرانی گەورەی دەرباری مەلیک ناسری ئەییووبی بووە و دیوانێکی داناوە، بە ناوی: «*سُلافه الزرجون فی الخلاعة و المُجوُن*» و وەک لەو ناوە دەردەکەوێ، دیارە شاعیرێکی گاڵتەچی و قسەخۆش و حەنەکبێژ بووە. ئەوا نموونەیەک:

وَلَقَدْ بُلیتُ بشادن ان لُمْتهُ      منْ قُبح ما یأتیه لَیْسَ بنافع
مُتَبَذّل فی خسّة و جَهالَة      وَمَجاعَة کَشُهُود باب الجامع

*الأعلام*، ب٧، ل٢٥٧. *لغتنامەی دهخدا*، پیتی ن، ل٢٣١٨. *کشف الظّنون*، ب٣، ل٩٩٩. *هدیة العارفین*، ب٢، ل١٢٦.

## ئیبنوسەففاری ماردینی

جەلالەدین عەلی، کوڕی یۆسفی ماردینی، پیاوێکی وێژەوان، شاعیر و ئینشابەندی مەلیک مەنسوور، ناسرەدینی ئەرتەقی بووە و ساڵی ٦٥٨ ک. م. ــکاتی هێرشی مەغول بۆ ماردینــ شەهید کراوە. کتێبێکیشی هەیە بە ناوی «*اُنس الملوک*».

*لغتنامەی دهخدا*، پیتی الف، ل٣٢٧.

## جەمالەدینی حەمیدی

شێخولئیسلام جەمالەدین ئەبولحەسەنی عەلی، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی خۆشناوی کوردی حەمیدی، لە پێشەنگانی مەلایان و موفتیانی حەنەفی و مامۆستایانی هەڵکەوتەی چەرخی حەوتەمە کە ساڵی ٦٥٨ ک. م. بە هۆی قەومانی ئاژاوە و بشێوە لە شاری حەلەبدا شەهید بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٨١.

## سەدرەدینی ئوشنوهی

ئیمام سەدرەدین مەحموود، کوڕی شێخ تاجەدین[١] موحەممەد، کوڕی حەدادی ئوشنوهی، لە زانایانی هەڵکەوتەی زانستە ئیسلامییەکان و هەروەها لە وتاربێژانی ناوداری شاری شنۆیە کە هاوچاخی ئەبووبەکری سەعدی کوڕی زەنگی (٦٢٣-٦٥٨) حاکمی شیراز بووە و دوای ئەوەی خوێندنی دوایی هێناوە و ناوی‌دەرکردووە، ماوەیەک چۆتە شیراز و لە ئاخروئۆخری ژیانیدا لەگەڵ شێخ شەهابی سوورەبەردی دیداریان بووە و شێخ شەهاب زۆر جاران باسی زانایی و پارسایی ئەوی کردووە.

سەدرەدین شیعریشی گوتووە و خاوەنی مێژووی «*وَصّاف*»، ئەم چوارینەی لێ هێناوە:

از صحبت تو کنون فراق اولی‌تر     بر درگه تو زَرق و نفاق اولی‌تر
چون پردەی راستی، مخالف کردی     ما را پس از این راه عراق اولی‌تر

وادیارە ئیمام سەدرەدین ئەم چوارینەیەی بۆ ئەبووبەکری سەعد نووسیوە و دوای ئەوە بووە کە دڵی لێ ئێشاوە و شیرازی بەجێ‌هێشتووە. شیاوی باسە هاوکات ئاماژەی بە چەند پەردەی مووسیقاش کردووە.

*لغتنامەی دهخدا*، پیتی الف، ل٢٦٩٩ و ٢٧٠٠.

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٨٢.

## عیززەدین حەسەنی ئەربیلی

عیززەدین حەسەن، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئەحمەد، لە مامۆستایانی شارەزای زانست و فەلسەفەیە کە ساڵی ٥٨٦ لە شاری نوسەیبین هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە، بۆ خوێندن چۆتە دمشق و هەر لەوێ ماوەتەوە و ئیشی دەرس‌گوتنەوە و ڕاهێنانی قوتابیانی لە ئەستۆ بووە و سەرەنجام ساڵی ٦٦٠ ک. م. لەو شارە کۆچی یەکجاری کردووە.

وەک مێژوونووسان دەڵێن، عیززەدین سەر و سەکوتێکی ناحەزی بووە و چاویشی نەیبینیوە؛ کەم لە ماڵ دەرکەوتووە و بۆ لای کەس نەچووە و لە دەوڵەمەندان خۆی لا داوە. بەڵام بەو حاڵەش لەبەر ئەوە زانایەکی گەورە بووە، هەموان ڕێزیان لێ ناوە و قوتابی و مامۆستا لە هەموو لایەکەوە چوونەتە خزمەتی و لە خەرمانی گەورەی زانستی بەهرەیان بردووە. زمان و وێژەی عەرەبیشی چاک زانیوە و شیعری باش گوتووە؛ بەڵام لە شیعریدا جنێوی ناشیرین زۆرە. لە کێشەدا هاوتای نەبووە و کەس نەیتوانیوە بۆڕی بدا.

*الأعلام*، ب٣، ل٢٣٢.

## کەمالی ئەربیلی

ئەبووعەبدوڵڵا ئەحمەد، کوڕی یەحیا ناسراو بە کەمالی ئەربیلی (هەولێری)، زانایەکی پارسا بووە کە ژیانی بە دەرس‌گوتنەوە و بەندایەتی تێپەڕ کردووە و ساڵی ٦٦٥ ک. م. بەرەو دیاری هەرمان چووە. شێخ مەحیەدین، ئیمامی نواوی یەک لە قوتابیانی ئەوە.

*طبقات*، ملا ابوبکر مُصنّف، بغداد، ل٨٥.

## ئەسیرەدینی ئەومانی

دەوڵەتشا لە ژینامەکەیدا دەڵێ: «پیاوێکی زانا و خۆش‌سەروزمان بووە؛ دیوانەکەی ناودێرە و لای خواجە نەسیری تووسی خوێندوویە. بنچینەی لە هەمەدانەوەیە. شیعری عەرەبی زۆرە و گفت و زمانی زانایانەیە...».

هیدایەت لە «*مَجمَع الفُصحا*»، لاپەڕەی ١٠٥دا هێناویە: « ئەومانی لە زانایانی خاوەن ڕێزە؛ ناوی مەولانا عەبدوڵڵا و لە خاکی هەمەدانە. شیعری ڕەوان و جوانە. پەسندەری سولەیمانشای ئەیوایی[١] حاکمی کوردستان بوو. لە خزمەتی خواجەنەسیردا هێژایی دەسکەوت. مردنی ساڵی ٦٥٦ی کۆچی ڕوویدا و

١. سولەیمانشا، کوڕی پەرچەمی ئەیوایی، سەرۆکی تایفەی کوردی «ئەیوە». کە لە بەشی خوونکاران و ماڵەمیراندا بەدرێژی باسی دەکەین.

دەوری پێنجهەزار بەیت شیعری هەیە».

عەللامە دیهخودا لە «لُغَتنامە»دا تێر و تەسەل باس دەکا و دەردەخا کە قەت شاگردی خواجە نەسیر نەبووە و مەرگیشی ساڵی ٦٦٥ ڕوویداوە، نەک ٦٥٦.

وەک دیهخودا دەڵێ: لە ماوەیەکدا کە سلێمانشا لە دەربـاری موستەعـسیم خەلیفـەی عەباسـیدا بـووە، ئەسیرەدین جار لە دووی جار هاتوچۆی بەغدای کردووە و دوور نییە لە سەفەر و هێبەردا دەگەڵی بووبـێ. بەو بۆنەوە کە زۆرێک لە سپا و هاوڕێیانی سلێمانشا لە شەڕ دەگەڵ مەغولدا کوژراون، ڕەحمەتی هیدایـەت، ئەومانیشی لە کوژراوان هێناوەتە ئەژمار.

ئەومانی دەگەڕێتەوە بۆ «ئەومان» کـە نـاوی گونـدێکی کـورد بـووە لـە نێـوان کوردسـتان و هەمەدانـدا. ئەسیرەدینی ئەومانی دوو میری پەسن داوە: یەکەم حوسامەدین خەلیل، کوڕی بـەدر حـاکمی لوڕسـتان، کـوژراو لـە سالـی ٦٤٠دا و دووهـەم شـەهابەدین سلێمانـشای ئـەیوایی، سـەرۆکی تـیرەی ئـەیوایی؛ کـە ئەسیرەدین لە شیعریدا «مَلکُ‌الأیوە»ی پێ دەڵێ: «یا چو دَستِ مَلکُ‌الأیوە صَلاح‌الدّین اَست». ئەسیرەدین پێڕای پەسنی سلێمانشا، باسی ئەوەش دەکا کە چەند لەمێژە لە خزمەتیدایە. دیارە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئـەو کاتە کە ئاموشۆی بەغدای کردووە و سلێمانـشا لـە مـیرانی موستەعـسیمی عەباسـی لـە بەغـدا بـووە. لـە قەسیدەیەکدا دەڵێ:

خـدایگانا شـد سـالها کـە هـست رهـی — چـو آسـتان فـروتن، مُقـیم ایـن درگـاه
سـوی مـشام دل و جـانم از چـە مـی‌نرسـد — نـسیم لطـف تـو اکنـون خـلاف دیگرگـاه

وەک گوتمان، ئەسیر تەنیا پەسنی دوو میری داوە کە کورد و لوڕ بـوون؛ ئەمـەش خـۆی شـایەتێکی‌تـرە لەسەر کورد بوونی.

لە دیوانی ئەسیردا قەسیدەیەک هەیە کە قسە لە شەڕ و خوێنڕژانێکـی تـووش دەکـا. دەبـێ ئامـاژە بـە هێرشی مەغول بۆ بەغدا و کوژرانی سلێمانشا (٦٥٦ ک. م.) بێ:

از این حیات چە حاصل کنون کـە از رە تیـغ — بـە زنـدگی همـە بـا گـور مـی‌برنـد پنـاە
کە جـان بـرد بـە کـران زیـن میـان مـوج بـلا — کە همگنان همە در خـون همـی کننـد شـناە
دریــغ حــشمت ایمــان و حرمــت اســلام — دریــغ شــرع پیمبــر دریــغ دیــن الــە
بـر ایـن عـزا سـزد ار بـر طریـق کاهکـشان — فلــک پــلاس بپوشــد نــشیند انــدر کــاە

ئەسیرەدین لەگەڵ کەمالەدین ئیسماعیل، کوڕی جەمالەدینی عەبـدوڕڕەزاقی ئەسـفەهانیدا دۆسـتایەتی هەبووە و شیعریان بە بالای یەکا گوتووە. لە قەتعەیەکدا ئەسیر دەڵێ:

جهـان جهـان معـانی خـدیو کـشور فـضل — کە فخـر جـای جهـان شـد تـو را ثنـا کـردن
کمال ملت و دین ای کە بر خرد فرض است — بــە سُــنت ســخن خوبــت اقتــدا کــردن

کەمالەدینیش وای جواب داوەتەوە:

اثیـر دیـن را رسـمی اسـت بـر زبـان قلـم پیـــام روح قُـــدُس دمبـــدم اَدا کـــردن
به نـوك کلـك گهـر را جگـر همـی‌سُفتن بـه کـام صیت مُجـازات بـا صبا کـردن

کەمالەدین ئیسماعیل ساڵی ٦٣٥ ک. م. لە کارەساتی ئەسفەهاندا کوژرا. ئەسیرەدین ئاوای شینگێڕی بۆ کردووە:

جهـــان جـــان، کمـــال‌الـــدین ســـمعیل شنیدســـتم کـــه ناگاهـــان فـــرو شـــد
مقابـــل چـــون مـــه و خورشـــید بـــودیم چـــو ناگـــه ایـــن برآمـــد آن فروشـــد

**چەند نموونە لە شیعری ئەسیر:**

برخـــی آن عـــارض چـــون یاســـمین جـــان مـــن و صـــد چـــو مـــن ای نـــازنین
عـشق مـن و حُـسن تـو در عهـد خـویش هـــیچ یکـــی زیـــن دو نـــدارد قـــرین
حُـــسن نبایـــد کـــه بُـــود بـــیش از آن عـــشق نـــشاید کـــه بـــود بـــیش از ایـــن
خـاتم خـوبی اسـت دهانـت کـه هـست حلقـــه‌ی او لعـــل و زمـــرد نگـــین
گـرد دهـان تـو خطـی خـوش نوشـت ســـوز رُخـــت آن دو لـــب شـــکرین
نیـست از آن نقطـه چنـین خـط عجـب زانکـــه خـــط از نقطـــه بخیـــزد یقـــین
کـــی کـــنم از دســـت رهـــا دامنـــت گرچـــه بـــه خـــون بـــر زنـــیم آســـتین
دور مگــــردان ز خــــودم، تــــا نهــــم پـیش تـو چـون زلـف تـو سـر بـر زمـین

**نیزامەدین ناوێکی ترۆ کردووە:**

نظـام‌الـدین! تـو را وصـفی اسـت در بُخـل بگـــویم، گرچـــه از مـــن خـــشمت آیـــد
بـه بُخـل انـدر چـو سـوزن تنـگ‌چـشمی کـــه تـــاری ریـــسمان در چـــشمت آیـــد

**چوارینە:**

چشمم کـه همیـشه جـوی خـون آیـد از او سـیلاب سرشـك لالـه‌گـون آیـد از او
زان تـــرس نگـــریم کـــه خیـــال رخ تـــو بـــا اشـــك مبـــادا کـــه بُـــرون آیـــد از او

**قەتعە:**

غم مخور، شاد بزی، زانکه غم و شادی تـو هر دو چون می‌گذرد، نزد خرد یکسان است
خوار و دشوار جهان چون پی هم می‌گذرد گر تو دشوار نگیری، همه کار آسان اسـت
تـو سـر کـار نگـه‌دار و بُـن کـار مَجـوی که فلك نیز در این واقعه سـرگردان اسـت

**سەرکۆنەی شیعر و شاعیری:**

یارب این قاعده‌ی شعر بـه گیتـی کـه نهـاد که چو جمـع شـعرا، خیـر دو گیتـیش مبـاد

| | |
|---|---|
| ای برادر! به جهان بدتر از این کاری نیست | هان و هان تا نکنی تکیه بر این بی‌بنیاد |
| در فَلک نیز عطارد ز پی شومی شعر | یابد از سوزش دل هر دو مهی صد بیداد |
| گفتنش کندن جان است، نوشتن غم دل | محنت خواندنش آن به که نیاری در یاد |
| این چه صنعت بود آخر بنگویی که از آن | در همه عمر یکی لحظه نباشی دلشاد |
| خود از آن کس چه بکاهد که تو گوییش بخیل | یا بر آن کس چه فزاید که تُواش خوانی راد |
| کاغذی پر کُنی از حشو و فرستی به کسی | پس برنجی که چرا کاغذ زر نفرستاد |
| آن نه خود حُجَت شرعی، نه خط دیوانی است | پس از آن خط به تو چیزیش چرا باید داد |
| وین چه ژاژ است دگرباره که ابیات مدیح | گر بود هفت، فرستی به تقاضا هفتاد |
| پس بدین هم نشوی قانع و از پی تازی | به سوی خانه‌ی ممدوح چو تیری ز گُشاد |
| همچو آیینه نهی در رخ او پیشانی | او ز تو شرم کند همچو عروس از داماد |
| و آن بمشنو که بگویند فلان شخص به شعر | از فُلان شاه به خروار زر و سیم ستاد |
| کاین پی مصلحت خویش همانا گفتند | که نبودند ز بند طمع و حرص آزاد |
| ورنه با جود طبیعی ز پی راحت خلق | من بر آنم که کس از مادر ایام نزاد |
| ورکسی زاد به بخت منش از روی زمین | چرخ ببرید به یک بار مگر نسل و نژاد |
| آنچه مقصود ز شعر است چو در گیتی نیست | شاعران را همه زین کار خدا توبه دهاد |

*لغتنامەی دهخدا*، پیتی الف، ل١٠١٨ و ١٠٢٢.

*تذکرەی دولتشاه*. *مجمع الفصحاء*، ب٢، ل١٠٥.

## شێخ جەمالەدینی لوڕ

لە مەشایخی خاوەن کەرامەتی چەرخی حەوتەمی کۆچییە. وەک مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی لە «*نَفَحات‌الأُنس*»دا دەڵێ: شێخ جەمال لە پێشدا نەخوێندەوار بووە و مەیتەری کردووە؛ بەڵام سەرەنجام بە هۆی پارێزگاری و ڕیازەت کێشانەوە، چاوی دڵی کراوەتەوە و پلە و پایەیەکی بەرزی مەعنەوی دەستکەوتووە.

شێخ جەمالەدین و شێخ عەلی«بزغش»ی شیرازی هاودەورەن و پێکەوە پێوەندییان هەبووە.

*نَفَحات‌الانس*، چاپی تاران، ١٣٣٧، ل٤٧٩.

## سەدرەدینی جزیری

قازی سەدرەدین ئەبوومەنسووری مەوهووب، کوڕی عەمر، کوڕی مەوهووب، کوڕی ئیبراهیمی جزیری، لە

ماموستایانی ئوسولییە کە ساڵی ٥٧٠ ک. م. لە جەزیرەی ئیبنوعومەر هاتۆتە دنیا و پاشان چووە بۆ شام و ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە و دواجار بۆ قاهیرە ڕۆیوە و لە ساڵی ٦٦٥[١] مەرگی مفاجای کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الدُّرُ المنظوم فی حقایق العلوم*» و «*الفَتاوی*».

*طبقاتُ الشّافعیّة*، ب٥، ل١٦٢.

## شێخ شەرەفەدینی کوردی

لە ئەولیای گەورە و چاکانی پایەبەرزی کوردە کە لە ساڵی ٦٦٧ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە و لە حوسەینییەی قاهیرەدا نێژراوە. لە شێخ شەرەفەددین کەراماتی نائاسایی زۆر دەگێڕنەوە و لەگەڵ شێخ خدری کوردیدا پێوەندی نزیکی هەبووە و لە یاران و نزیکانی شێخ ئەبووسەعیدی کوڕی «ابی‌العَشایر» دێتە ئەژمار.

*طبقات شیخ شَعرانی*، چاپی میسر، ب٢، ل٣.

## ئەمیر عیسای هەکاری

نازناو «شەرەفەدین»، پیاوێکی زانا و میرێکی دلێر و پێداگر، لە کوردانی هەکارییە کە لە دەرباری مەلیک زاهیر «بیبرس»، سوڵتانی میسردا دەستی ڕۆیوە و لە فەرماندە پایەبەرزەکانی بووە.

ئەمیرعیسا زبان و ویژەی عەرەبی باش زانیوە و شیعری عەرەبی جوان گوتووە:

أأحبا بَنا ان غبْـتُ عَـنْكُم و کـانَ لـی ... إلـی غَیْـر مَغنـاکُمْ مَـراحٌ و إلمـامُ
فَما عَنْ رضاً کانـت سُـلیمی بَـدیلَـةً ... بلیلـی، وَلکـنْ للـضَّرُورات أحکـامُ

زا و مەرگی عیسا ٥٩٣ ک. م. لە قودس و ٦٦٩ لە دمشق ڕوویداوە.

*الأعلام*، ب٥، ل٢٩٤. *لغتنامەی دهخدا*، پیتی الف، ل٤٦٨.

## ئەمینەدینی ئەربیلی

ئەمینەدین عەلی، کوڕی عوسمان، کوڕی عەلی، کوڕی سلێمانی سۆفی، ساڵی ٦٠٢ ک. م. لە هەولێر هاتۆتە دنیا و ٦٧٠ لە شاری فیووم لە دنیا چووە. پیاوێکی زانا و وێژەوان و لە شاعیرانی هێژایە کە لە سەرەتای لاویدا لە دام و دەزگای مەلیک ناسر سەلاحەدین، میری شامدا ئیشی چەکداری بووە؛ بەڵام دواجار دەستی لێ کێشاوە و گۆشەگیری و بەندەواری هەڵبژاردووە.

ئەمینەدین قەسیدەیەکی عەرەبی هەیە بە ناوی «قصیدةُالفاخرە»، کە هەر بەیتێکی سەنعەتێکی بەدیعیی

---

١. لە «*هدیةالعارفین*»دا زا و مەرگی ٥٩٠ و ٦٧٥ ک. م. نووسراوە.



تێدا خونجاندووە. ئەم دوو بەیتەش هی ئەوە:

هَـدیَـــةُ عبــد مُخْلـص فــی ولائــه لَهـا شـاهدٌ منْهـا عَلـی عَـدَم المـال
وَ لیسَتْ عَلی قَدْری وَ لا قَدْر مـالکی و لکنَّهــا جــاءَتْ عَلــی قَــدَرالحال

*الأعلام*، ب٥، ل١٢٥. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٧١٢.

## شەمسەدین موحەممەدی جزیری

شەمسەدین موحەممەد، کوڕی عەبدوڵڵای جزیری، نووسەرێکی وێژەوان و شەرعزان لە کوردانی جەزیرەی ئیبنوعومەرە کە چۆتە عەدەن و لەبەر فارسیزانی، لە دام و دەزگای مـەلیک موزەفـەری ڕەسـوولی، مـیری ئەوێدا دامەزراوە و بە نووسین و وەرگێڕانەوەوە خەریک بووە و هەروەها نووسینگەی مەلیکی گەڕاندووە.

شەمسەدین مرۆیەکی نەرم ونیان و میهرەبان بـووە و لـە سـەرینەی ئـەو هـەموو کـاری دیوانییـەی، لـە ماڵەخۆی فەقێ و قوتابی ڕاگرتووە و دەرسی پێیان گوتووە. بەڵام دوای ماوەیەک لەبەر شـۆفاری دڵپیـسان، کەوتۆتـە بـەر ڕک و قـینی مـیرەوە و دەسـت بەسـەر هـەموو مـاڵ و سـامانیدا گـیراوە و خۆیـشی دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر، بەند کراوە. سەرەنجام بەریانداوە؛ بەڵان تـا ئـەو کاتـە، ئـازار و ئەشـکەنجەی زینـدان بڕستی لێ بڕیوە و پاش دوو مانگ، سەری یەکجاری ناوەتەوە (نێوان ساڵانی ٦٦٠ تا ٦٧٠ ک. م.).

**لە بەرهەمەکانی**: «*المُختَصَر فی الرّد علی اهل البدع*».

*الأعلام*، ب٧، ل١١١.

## شێخ کەمالەددنی ئەربیلی

شێخ کەمالەدین ئەبولفەزائیل، سالاری هەولێری شافیعی، کوڕی حەسەن، کوڕی عومەر، کوڕی سەعید، لـە گەورەی زانایـان و پێـشەنگی شـەرعزانـانی شـام بـووە کـە ماوەیـەکی زۆر فـەقێتی عەللامـە تەقیـەدین ئیبنوسەلاحی شارەزووری کردووە و خزمەتی مامۆستایانی ناوداری تریش گەیشتووە و بەشـێکی باشـی لـە زانست و ئاکار دەسکەوتووە.

«شیخالسُّنه» شێخ مەحیەدینی ئیمـام نـواوی، لـە شـاگردانی شـێخ کەمالـەدین ئەبولفـەزائیل بـووە و لـە کتێبەکانیدا یادی خێری لێ کردووە.

ئەبولفەزائیل پاش شەست و چەند ساڵ ژیـان، لـە مـانگی جیمـادیئـاخری سالـی ٦٧٠ ک. م. دنیـای بەجێهێشتووە. چەند کتێب و نووسراوەی هەیە؛ یەک لەوانە کورتکراوەی «*روضه الاحکام*»ی ڕوویانیە.

*طبقاتالشّافعیّة*، ب٥، ل٥٦. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٨٠.

## قازی موحەممەدی خەلاتی

ئەبولفەزل مۆحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی حوسەینی خەلاتی، لە فیقهزانانی هەڵکەوتە و شاگردانی شێخ شەهابی سوورەبەردی (شێخی ئیشراق) بووە کە ماوەیەکی زۆر لە دمشق ژیاوە و پاشان ڕووی لە قاهیرە ناوە و لەوێ دادوەری و دەرس گوتنەوەی لە ئەستۆ گرتووە و سەرەنجام ڕەمەزانی ساڵی ٦٧٥ ک. م. لەو شارە دنیای بەجێ هێشتووە.

**لە کتێبەکانی**: «قواعدالشّرع و ضوابطالاصل و الفرع» و «کتابالحدود» کە کورتەیەکە لە مەڕ ئوسوولی فیقهەوە.

*طبقاتالشّافعیّة*، ب٥، ل٣٢. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل١٣٢.

## علی شارەزووری

شەمسەدین ئەبولحەسەن، عەلی شارەزووری، کوڕی مەحموود، کوڕی عەلی، لە مامۆستایان و موفتییانی دمشقە کە لە پارێزکاریدا ناوی دەرکردووە و بریکاری «قاضیالقضاة» ئیبنوخەلیکان بووە و لە مانگی شەوالی ساڵی ٦٧٥ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*طبقاتالشّافعیّة*، ب٥، ل١٢٧.

## شێخ خدری کوردی

شێخ خدر لەگەڵ شێخ شەرەفەددین زۆر مەربووت بوون و دیار نییە ئایا خزمایەتیشیان هەبووە یاخۆ دۆستایەتییان هەر بە بۆنەی ئایین و تەریقەتەوە بووە. هەرچۆنێک بێ ئەمیش لە ئەولیا و عارفانی بەناوبانگی چەرخی حەوتە و کەرامەت و نائاسایی زۆری لێ دەگێڕنەوە.

سوڵتانی ئەیووبی سەرەتا زۆری ئیرادەت بە شێخ خدر بووە. شۆفارانی دڵپیس کە ئێرەییان بەوە بردووە، بۆیان تێچاندووە و مەلیکیان لێ دڕدۆنگ کردووە. ئەویش فەرمانی داوە شێخیان گرتووە و ماوەی چوار ساڵ و نیو لە زیندان ماوەتەوە. سەرەنجام تێدەگا بە هەڵە چووە؛ داوای لێبووردنی لێ دەکا و تێدەکۆشێ بۆی قەرەبوو بکاتەوە.

**لە فەرمایشەکانی شێخە**: «اِذا عَزَمَ اَحَدُکُم عَلی مُخاصَمة اَحَد، فَلا یُهَیِّئْ لَهُ کَلاماً، فَاِنَّ کُلَّ کَلامٍ مُهَیَّی مَفْسُودٌ».

شێخ خدر ساڵی ٦٧٥ ک. م. ڕووی لە جیهانی هەتاهەتایی ناوە و لە خانەقاکەی خۆیدا لە قاهیرە، بەرامبەر بە مزگەوتی مەلیک زاهیر، نێژراوە.

*طبقات کُبری*، شیخ شَعرانی، چاپی میسر، ب٢، ل٢.

## شێخ خدری میرانی

شێخ خدر، کوڕی ئەبیبەکر، کوڕی ئەحمەدی میهرانی (میرانی) عەدەوی، لە زانایانی سۆفی مەشرەفی چەرخی حەوتەم بووە کە ماوەیەک لە قاهیرە ژیاوە و دەرسی گوتۆتەوە و دواتر کۆچی کردووە بۆ مەکە و لەوێ ماوەتەوە، تا ساڵی ٦٧٦ ک. م. وادەی کۆچی یەکجاری گەیشتووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الوظایفُ المغذیه للمَناقبِ المعنویّه*».

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٤٥.

## ئیبنوزەهیری ئەربیلی

مەجدەدین موحەممەد، کوڕی ئەحمەد، کوڕی عومەر، کوڕی ئەحمەد، ناسراو بە «ابنُ‌الظّهیر»، پیاوێکی خەڵکی هەولێرە کە بۆ فێربوون و تێگەیشتن، زێدی خۆی بەجێهێشتووە و زۆربەی شارانی عیراق و شامی داوەتە پاوە و لە هەرکوێ مامۆستایەکی بینیوە لە خزمەتیدا چۆکیداوە و سەرەنجام لە دمشق گیرساوەتەوە و ساڵی ٦٧٧ ک. م. هەر لەوێ سەریناوەتەوە.

مەجدەدین وێژەوان و شاعیر و شەرعزانێکی ئاگا و خاوەن بیر و ڕا بووە کە چەند کتێب و نووسراوەی لێ بەجێماوە. هێندێکیان بریتین لە: «*تذکرةُالاریب و تبصرةُالادیب*»، «*مُختصر امثال الشریف رضی*» و دیوانی شیعر بە زبانی عەرەبی لە دوو بەرگدا.

*الأعلام*، ب٦، ل٢١٨.

## مەجدەدینی ئەربیلی

ئەبوموحەممەد عەبدوڵڵا، کوڕی حوسەین، لە زانایانی فیقهـ و ئوسوولە کە لە تەجوید و قەرائاتیشدا زانیارییەکی باشی هەبووە. لە هەولێر هاتۆتە دنیا و لە دمشق ژیاوە و ساڵی ٦٧٧ ک. م. ئەمری خوای بەجێهێناوە.

مەجدەدین جیا لە پایەی بەرزی زانستی، مرۆیەکی خاکەسار، ئاکارجوان و پارێزکار بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل٥١.

## فەوزەدینی ئەربیلی

ئەبووبەکر فەوزەدین، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئیبراهیمی هەولێری، پیاوێکی وێژەوان و شاعیر بووە کە ساڵی ٦٧٩ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الالفیّه فی الغاز الخفیّه*» کە هونراوەیەکە بریتی لە هەزار ناو.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٢٣٥.

## شێخ سدیقی ئەربیلی

شێخ سدیق، کوڕی بەدر، کوڕی جەناح، پیاوێکی پارێزکار و ئاکارباشی خەڵکی هەولێرە کە ژیانی بە گوێڕایەڵی بۆ قسەی خوا و خزمەت بە خەڵک و فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە تێپەڕ کردووە و دوایین ساڵەکانی تەمەنی، لانشینیماڵی خوا بووە. هەموو خەڵک لە عارف و عەوام و دارا و نەدار و ئەمیر و فەقیر، خۆشیانویستووە و بە دڵی گەڕاون. پادشایانی ئەییووبیش بڕوایان پێ بووە و بۆ ئامۆژگارییەکانی گوێیان ڕاگرتووە.

مەلیک مەسعوود کوڕی مەلیک کامیلی ئەییووبی، کە ساڵی ٦٢٦ ک. م. لە شاری مەککە مردووە، پێش مردنی ڕایسپاردووە تەرمەکەی بدەنە شێخ سدیق و ئەویش وەک کەسێکی ئاسایی کفن و دەفنی بکا. شێخیش هەروای کردووە و لە بەرگی ئیحرامی خۆی ـکە زۆر جاران حەج و عومرەی پێوە کردبووەـ کفنی دەپۆشێ و تەنانەت لە ماڵی حەڵاڵی خۆی خەرجی ناشتنی دابین دەکا.

*تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل٥٢.

## فەخرەدینی خەلاتی[1]

فەخرەدینی کوردی خەلاتی ناسراو بە «مولانا مُحیالدّین» لە زانایانی ناوداری ئەستێرەناسی و ئاسماندۆزییە کە بۆ هاوکاری لەگەڵ خواجە نەسیری تووسیدا، لە کاری بنیاتنانی ئاسماندۆز (رصدخانە)ی مەراغە، لەگەڵ چەند کەسێکی تر لە زانایانی وەک: موئەییەدەدینی عەرووزی دمشقی و نەجمەدینی قەزوینی، ساڵی ٦٥٧ ک. م. چۆتە مەراغە و لە نووسین و تەکووزکردنی زیجی ئێلخانیدا بەشداری کردووە.

*گاهنامەی سید جلالالدّین تهرانی*، ١٣١٠ ک. ھ. ل٨٠. *سالنامەی اَخگر*، ١٣٢٨ ک. ھ. *شَرفنامەی بدلیسی*، ل٤٦٠. *کشفالظّنون*، ب٣، ل٩٦٧.

## ئیمام ئەحمەدی کواشی

ئیمام «موفّقالدّین ابولعَباس» ئەحمەدی کواشی، کوڕی یۆسف، کوڕی حەسەن، لە پێشەنگانی تەفسیر بووە کە ساڵی ٥٩٠ یان ٥٩١ ک. م. لە گوندی کواشەی سەر بە مووسڵ هاتۆتە دنیا. ئیمام ئەحمەد مرۆیەکی یەکجار پارێزکار بووە و بایەخێکی بە ماڵ و سامان و خاوەن دەسەڵاتان نەداوە. لە تەفسیردا کتێب و

---

١. «خلاط» یان «اخلاط» شارێک بووە لە مەڵبەندی بدلیس لە ژووری زریای وان لە باکووری کوردستان.

نووسراوەی زۆر هێژای نووسیوە.

**لە کتێبەکانی**: «*تبصرةُالمتذکر*» و «*کشف الحقایق*»، هەردوو ناسراو بە تەفسیری کواشی، «*روضـةُ الناظر*» و کتێبی «*الوقوف و المطامع فی المبادی و المقاطع*».

کۆچی دوایی ئەم مامۆستایە ساڵی ٦٨٠ ک. م. بووە.

*تاریخ الکامل*، ب١٢، ل١٥٧. *الأعلام*، ب١، ل٢٥٩.
*کشف الظّنون*، ب١، ل٢٤٥، ٣١٤، ٣١٨، ٣٢٨.

## ئیبنوخەلیکان

«قاضی‌القضاة»، شەمسەدین ئەبولعەباسی ئەحمەدی ئەربیلی شافیعی، ناسراو بە «ابن‌خلّکان»، کوڕی شەهابەدین موحەممەد، کوڕی ئیبراهیمی خەلیکانییە[1] کە یازدەی مانگی ڕەبیعولئاخری ساڵی ٦٠٨ ک. م. لە شاری هەولێر هاتۆتە دنیاوە. هەر پێگەیشتووە لای بابی خوێندنی دەسپێکردووە و کە ئەو نەماوە، بۆ مووسڵ چووە و لە کۆڕی دەرسی کەمالەدین ئەبوو یونسدا دانیشتووە. ساڵی ٦٢٦ خۆی گەیاندۆتە حەلەب و لە خزمەتی شێخ بەهائەدین ئەبولمەحاسین یۆسف، کوڕی شەدداد، فیقهی بێ کەم و کووڕی وەرگرتووە و لای ئەبولبەقا یەعیش، کوڕی عەلی نەحوی، چەند دەرسێکی نەحوی خوێندووە. ساڵی ٦٢٣ گەیشتۆتە دمشق و لە عەللامە ئیبنوسەلاحی شارەزووری بەهرەی گرتووە. ئینجا ڕۆیوە بۆ قاهیرە (٦٣٧) و جێگری « قاضی‌القضاة» بەدرەدینی سنجاری پێ سپێردراوە. هێندێک لەودوا، بووە بە دادوەری شام و ماوەی دە ساڵان لەو کارەدا ماوەتەوە. پاشان کەسێکی تریان ناوەتە جێگەی و ئەویش گەڕاوەتەوە بۆ میسر. دوای حەوت ساڵ دیسان داوایان لێ کردۆتەوە بگەڕێتەوە بۆ شام؛ بەڵام ئەمجار کورسی « قاضی‌القضاة» یان پێ ئەسپاردووە.

قازی شەمسەدین، کوڕی خەلیکان لە کەڵەپیاوان و گەورەزانایان و ویژەوانانی ڕۆژگاری خۆی بووە. هەمیشە شاعیری زۆر لە دام و دەزگایدا بوون و شیعریان پێدا هەڵگوتووە و خەڵاتیان بەرکەوتووە. یەک لەوانە ڕەشیدەدینی فاریقییە کە لە بارەی دادوەری‌کردنی لە شامدا و ماوەی وەلانانییەوە، قەسیدەیەکی گوتووە؛ ئەوا دوو بەیتی:

أنْتَ فی الشّام مِثْل یُوسُفَ فی مصْـ ـــرَ وَعنـدی أنّ الکـرام جنـاسُ
وَلکـلّ سَـبع شـدادٌ وَبَعْـدَ السّـ ـــبع عـامٌ فیـه یُغـاثُ النّـاسُ

یەکێکی‌تر گوتوویە:

أذْقْـتَ الـشّامَ سَبعَ سـنینَ جَـدْباً غَـداةَ هجَرْتَـهُ هَجْـراً جَمـیلاً

---

١. بڕوانە بۆ پەراوێزی ژمارەی ٣ ی لاپەڕەی ٧٤.

فَلمّــا زُرْتَــهُ مــنْ ارض مــصْر مَــددتَ عَليـه مـنْ كَفَّيْـكَ نـيلا

بۆخۆشی پێڕای پلە و پایەی بەرزی لە زانست و وێژەوانیدا، شاعیری چاکیش بووە و شیعری تەڕ و ناسکی گوتووە:

یــاربّ انَّ العبــدَ یُخفــی عیْبَــهُ فَاسـتر بحلْمـكَ مـا بَـدا مـن عَیْبـه
وَ لَقــدْ أتــاكَ و مالَــهُ مــنْ شــافع لذُنوبــه، فَاقْبَــلْ شــفاعــةَ شــیْبه

* * *

و ســرْبُ ظبــاء فــی غــدیر تخــالُهُمْ بُــدوراً بــأفْق المــاء تَبْــدُو وَ تَغْــرُب
یَقُــولُ عَــذُولی وَ الغَــرامُ مُــصاحبی أمالَكَ عَـنْ هـذی الـصّبابـة مَـذهَبُ؟
وَ فی دَمكَ المطول خاضُوا كما تری فَقُلْتُ لَهُمْ «دَعْهُـمْ یَخُوضُـوا وَ یَلْعَبُـوا»

قازی ئیبنوخەلیكان ڕۆژی شەمبە ٢٦ی ڕەجەبە مـانگی ساڵــی ٦٨١ ک. م. لـە دمـشق ئـەمری خـوای بەجێهێناوە و لە زیارەتانی «سَفحقاسیون»دا نێژراوە.

**لە کتێبەکانی**: مێژووی بەناوبانگی «*وَفیاتُ الأعیان*» و «*اَنباءُ ابناء الزّمان*» کە باسی ژیان و بەسەرهاتی زۆرێک لـە ناودارانی زانست و عیرفان و شیعر و هەروەها پاتشایان و میرانە و لە ڕوانگەی وردی و ڕاست و درووسـتییەوە، بەتایبەت بۆ ساڵی زا و مەرگی ناو لێ براوان، لە جێبڕواترین کتێبانی تەبەقاتە.

*طبقات الشّافعیّة*، ب٥، ل١٤. *الأعـلام*، ب١، ل٢١٢.
پاشـکۆی *تـاریخ ابـن خَلکـان*، ب٢، نـصر هـورینی.

## سیراجەدینی ئەرمەوی

قازی سیراجەدین «ابوالثنـاء» مەحموود، کوڕی ئەبووبەکر، کـوڕی ئەحمـەد، زانـا و فەیلەسـووفێکی کـوردی ورمێیە کە ساڵی ٥٩٤ ک. م. لە دایک بووە و ٦٨٢ لە قوونیە لە دنیا چووە.[١]

سیراجەدین زۆربەی خوێندنی لـە مووسـڵ بـووە و لـە عەللامـە کەمالـەدین، کـوڕی یـۆنس ئیجـازەی وەرگرتووە.

**لە کتێبەکانی**: «*مَطالع الانوار*» لە حیکمەت و مەنتیقدا، «*بیان الحق*» لە حیکمەت و فەلـسەفەدا، «*اَلمَنـاهج*» لـە مەنتیق و فەلسەفەدا و شەرحێک لە «*وَجیز*»ی ئیمام غەززالی.

*طبقات الشّافعیّة*، ب٩، ل١٥٥. *کشف الظّنون*، ب١، ل١٠٣، ب٢، ل٤٥٣. *هدیة العارفین*، ب٢، ل٤٠٦.

---

١. کتێبی «*الأعام زرکلی*»، ساڵی ١٠٠٣ ک. م. نووسیوە؛ کە لە ڕاست ناچێ.

## حەسەنی شارەزووری

«ابوعبدالله»، کوڕی عەلی، کوڕی عەبدوڵڵا، ساڵی ٦١٩ ک. م. لە جزیر هاتۆتە دنیا و بۆ خوێندن تا بەغدا چووە و ئیجازەی وەرگرتووە و هەر لەوێ نیشتەجێ بووە؛ فتوای داوە و دەرسی گوتووە و سەرەنجام ساڵی ٦٨٢ لە دنیا چووە.

*طبقات‌الشّافعیّة*، ب٥، ل٥٤.

## موجیرەدینی ئەسعەردی

موحەممەد، کوڕی یەعقووب، کوڕی عەلی ئەسعەردی، ناسراو بە «مُجیرُالدّین»، لە چەکدارانی ئازا و لێهاتووی مەلیک مەنسووری ئەییووبی بووە کە لە شیعر و شاعیریش سەری‌دەرچووە.

دوو نموونە لە شیعری:

أطـــــالِعُ كُـــــلَّ ديـــــوان اَراهُ      وَلَـم أزْجُـرْ عَـن التَّـضْمين طَيْـری

اُضَـــمِّنُ كُــلَّ بَيْـــت فيـــه مَعْنـــیً      فَـشعْری نـصْفُهُ مـنْ شـعْرِ غَيْـری

موجیر ساڵی ٦٨٤ ک. م. ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زکی‌بیگ، ب٢، ل١٣٨.

## کەمالەدینی ئازەربایجانی

شاعیرێک لە هاوماڵانی ئیمامی هیرەوی و ئەسیرەدینی ئەومانییە، لە کوردانی ئازەربایجان کە دیوانێکی بووە؛ لەناو چووە. ساڵی لە دنیا چوونی ٦٨٧ ک. م. نووسراوە.

*دانشمندان آذربایجان*، چاپ تهران، ل١٣٨.

## شەمسەدین موحەممەدی شارەزووری

عەللامە شەمسەدین موحەممەد، کوڕی مەحموود، لە زانایان و فەیلەسووفانی ئیسلامی چەرخی حەوتەمی کۆچییە کە کتێب و نووسراوەی زۆری لە بابەتی فەلسەفە و حیکمەت و کەلامەوە هەبووە. بۆ وێنە: کتێبی «*نزهةُ الارواح و روضةُ الافراح*» لە مێژووی حەکیماندا کە بەڕێز زیائەدینی دوڕڕی، مامۆستای مەعقوول، لە عەرەبییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی و بە ناوی «*کَنزالحکمه*» ساڵی ١٣١٦ ک. هـ. لە تاران لەچاپی داوە. کتێبی «*الرّموز و الامثال اللاهوتیّه فی الانوار المجردة الکونیّه*» و شەرحی «*تَلویحات*» لە حیکمەتدا، بە ناوی «*تَنقیحات*».

عەللامە شەمسەدین ساڵی ٦٨٧ ک. م. زیندوو بووە.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل١٣٦. *کشف الظّنون*، ب١، ل٦٢٥، ٩١٣، ١٨٥٣.

## ئیبنوفەخری ئەربیلی

ئەمیر بەهائەدین عەلی، کوڕی فەخرەدین عیسا، کوڕی ئەبولفەتحی هەولێری، ناسراو بە «ابن‌فخر» لە وێژەوانان و نووسەرانی پایەبەرزە کە دوای تەواوکردنی خوێندن و گەیشتن بە لووتکەی زانستی سەردەمی خۆی، سەرەتا بوو بە ئینشابەندی حاکمی هەولێر؛ ئەنجا چووە بەغدا و لە حوکمەتی عەلائەدینی ساحیب‌دیواندا بوو بە ئەندامی یانەی نووسین (دارالانشاء) و تا دواکاتی ژیانی لەو کارەدا مایەوە.

بابی ئیبنوفەخر، والی هەولێر و پیاوێکی زانابووە. لەمەڕ مەزهەبی خۆیەوە قسە و باس زۆرە: هێندێک بە شیعەی ئیمامی دەزانن، تاقمێ دەڵێن سوننەیە و بڕێکیش بە زەیدییان داناوە.

**لە کتێبەکانی**: «*المَقاماتُ‌الاربَع*»، «*رساله الطَّیف*»، «*کَشف الغمه فی مَناقب الائمه*» و دیوانی شیعری عەرەبی.

**لە شیعرەکانی**:

اَیـا هـاجری مـنْ غیـر جُـرْم جَنَیْتُـهُ　　وَ مَـن دأبُـهُ ظُلْمـی وَ هجـری، فَدَیْتُـهُ
أجرْنـی رَعـاکَ الله مـنْ نـار جَفْـوَة　　وَ حَـرَّ غـرام بالبعـاد اصـطَلَیْتُه
وَ کُنْ مُسْعفی فیما الاقی منَ الهَوی　　فَهَجْرُکَ یا کُلَّ المُنی ما نویَتُهُ

لە دنیا چوونی ئیبنوفەخر ساڵی ٦٩٢ ک. م. بووە.

*آثار الشیعةُ الامامّیة*، ترجمەی علی جواهر کلام، چاپ مجلس، ب٤، ل١٦٦. *الأعلام*، ب٥، ل١٣٥. *کشف الظّنون*، ب٢، ل٨٩.

## حوسامەدینی خۆیی

حوسامەدین حەسەن، کوڕی عەبدولموئمین، نازناو «حُسام» و ناسراو بە «مُظَفّری»، لە کوردانی کۆچەری ماردین و شاعیرانی چەرخی حەوتەمە.

**کتێبەکانی**: «*نَصیب‌الفتیان*»، لە بەرامبەر «*نصاب صبیان*»ەوە؛ وشەدانێکی هۆنراوەیە بریتی لە ٤٠٠ چوارینە. «*قواعدُالرّسائل*»، لە ئینشانووسیدا، کە ساڵی ٦٨٤ ک. م. دایناوە. کتێبی‌تر «*نزهةُالکُتّاب*» کە دەستەواژەیە.

ئەم بەیتە هی ئەوە:

بس حسرت حسرت‌الملوک[1] است مرا　　باریک و ضعیف تن چو دوک است مرا

*مقدمەی لغتنامەی دهخدا*، ل٣٠٠. *لغتنامەی دهخدا*،

---

١. ناوی گوڵێک و چێشتێکی لە تیرەی یاپراخە.

پیتی ح، ل٥٣٧. یەکـــ دوو ســەرچاوەی تـر.

## عوبەیدی ئەسعەردی

تەقیەدین ئەبولقاسم عوبەید، کوڕی موحـەممـەد، کـوڕی عەباسـی ئەسـعەردی، لـە زانایـانی هەڵـکەوتە و مامۆستایانێ بووە کە حەدیس و ناوی ناودارانی یەکجار باش لەبەر کردووە و هەموو بڕوایان پـێ هێنـاوە. زا و مەرگی ساڵی ٦٢٢ لە ئەسعەرد و ٦٩٢ ک. م. لە قاهیرە ڕوویداوە.

**لە کتێبەکانی**: «السِّرُ المصون فیما یقالُ عندَ فتحِ الحصُون».

*الأعلام*، ب٤، ل٣٤٢. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٦٤٥. *لغتنامەی دهخدا*، پـیتی ت، ل٢٣١٨. *کـشفُ الظّنـون*، ب٣، ل٩٨٩. *ایـضاحُ المکنـون*، ب٢، ل١١.

## مەجدەدین موحەممەدی ئەربیلی

ئەبوعەبدوڵڵا مەجدەدین، موحەممەدی هەولێری، کوڕی ئەحمەد، شاعیرێکی چەرخی حەوتەمە کە ساڵـی ٦٠٧ لە هەولێر هاتە دنیا و بۆ خوێندن کەوتـە گـەڕان و خزمـەتی زۆر زانـا و مامۆسـتای وەک: ئەبووبـەکر، کوڕی خازین و سەخاوی و کاشغەری لە دمشق گەیشت. پاشان ماوەیەک لە بەغدا و هێندێک لـە دمـشق دەرسی گوتەوە و ساڵی ٦٩٧ لە دنیا دەرچوو.

# چەرخی هەشتەم

## شێخ تاجەدینی سنجاوی

شێخ تاجەدین ئیبراهیم، کوڕی ڕۆشن‌ئەمیر، کوڕی بابیل، کوڕی شێخ پنداری کوردی سنجاوی، ناسراو بە «شیخ زاهد»، لە پێشەوایانی تەریقەت و مراد و مورشیدی شێخ سەفیەدینی هەردەوێلییە[1]. تاجەدین بۆخۆی مریدی سەید جەمالەدینی گەیلانی بووە. سەید جەمال لە زنجیرەی تەریقەتدا دەگاتەوە بە عارفی پایەبەرز و گەورەی خێڵ، جونەیدی بەغدادی.

شێخ زاهید لە ئابادی «سوورەمردە»ی لای «شیروان» نەخۆش دەکەوێ و شێخ سەفی دەگەڵ خۆی دەیبا بۆ گەیلان و چاردە ڕۆژ لەودوا، لەوێ کۆچی دوایی دەکا.

شێخ زاهید ٣٥ ساڵ لە شێخ سەفیەدین گەورەتر بووە و هەکیان لە تەمەنی ٨٥ساڵیدا مردوون؛ کە دەزانین شێخ سەفی ساڵی ٧٣٥ ک. م. لە دنیا چووە، دەبێ شێخ زاهید سەرەتای چەرخی هەشتەمی کۆچی (ساڵی ٧٠٠)، کۆچی یەکجاری کردبێ.

*لُغتنامەی دهخدا*، پیتی ت، ل٥٨. بە گێڕانەوە لە *تاریخ ادبّیات*، ئیدوارد براون، وەرگێڕانی ڕەشید یاسەمی، ل٣٣.

## زەینەبی ئەسعەردییە

کچی سلێمان، کوڕی ئەحمەد، خەڵکی ئەسعەرد و ناسراو بە «زینب اَسعَردیّە»، خاتوونێکی زانا و حەدیس‌زان بووە کە دەوری ٨٠ ساڵ ژیاوە و ساڵی ٧٠٥ ک. م. لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە.

*الأعلام*، ب٧، ل١٠٧.

---

١. کتێبی «*کارنامەی بُزُرگان*»، بلاڤۆکی مەزرینگەی پەخشان و ڕادیۆ، لاپەڕەی ٢٥٣، نووسیویەوە: شێخ سەفیەدینی هەردەویلی ماوەی ٢٢ ساڵ هاوڕێی شێخ زاهید تاجەدین ئیبراهیم بووە.



## شەمسەدین موحەممەدی گۆرانی

قازی شەمسەدین موحەممەدی گۆرانی، کوڕی بارام، ساڵی ٦٢٨ لە حەلەب هاتۆتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکردووە و سەرەنجام لە میسردا ئیجازەی وەرگرتووە. بابی کوردێکی بارامناو بووە کە بۆکار و کاسبی، ڕێی غوربەتی گرتۆتە پێش و لە حەلەب گیرساوەتەوە. شەمسەدین دوای تەواوکردنی خوێندن، گەڕاوەتەوە حەلەب و لەو شارە دەرسی گوتووە و وتاری داوە و کار و باری شەرعی خەڵکی، بۆیان جێبەجێ کردووە. دواجار بووە بە دادوەر و سەرەنجام ساڵی ٧٠٥ ک. م. هەر لەوێ سەری‌ناوەتەوە.

بنەماڵەی زانایان و وێژەوانانی گۆرانی شاری حەلەب، زاروزێچی ئەم مامۆستایەن.

*طبقات‌الشّافعیّة*، ب٣، ل٦٢.

## شەمسەدین موحەممەدی جزیری

ئەبووعەبدوڵلا، شەمسەدین موحەممەد، کوڕی یۆسف، کوڕی عەبدوڵلای جزیری، ساڵی ٦٣٧ لە دایک بووە و ٧١١ ک. م. کۆچی دوایی کردووە. باوکی لە جزیر گوهێر (صرّاف) بووە؛ بۆ میسر چووە و شەمسەدین لە قاهیرە خوێندنی دەسپیکردووە و وردەـ وردە شارەزای فیقهـ و ئوسوول و مەنتیق و نەحو و بەیان بووە و تەنانەت لە بژیشکیشدا زانستێکی باشی دەس‌کەوتووە.

**لە کتێبەکانی**: شەرحی «مِنهاج»ی قازی بەیزاوی لە ئوسوولی فیقهدا، شەرحی «الفیّە»ی ئیبنومالیک لە نەحودا و شەرحی «أسئلە»ی قازی سەراجەدین.

*الأعلام*، ب٨ ل٢٥. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل١٤٢.

## زەینەدینی ئامیدی

عەلی، کوڕی ئەحمەد، کوڕی یۆسف، کوڕی خدر، لە کوردانی ئامید (دیاربەکر)ە کە دواجار بۆ بەغدا چووە و ساڵی ٧١٤ ک. م.[1] لەو شارە کۆچی دوایی کردووە. ئەو لە گەورە مامۆستایانی حەنبەلی دێتە ئەژمار کە لە فیقهدا شارەزاییەکی تەواوی هەبووە و لە باری ڕاستی و دروستی و پاکی و ئاکارچاکییەوە هەڵکەوتە ناوی‌دەرکردووە. ئەگەرچی نەیبینیوە، بەوحاڵەش لای هەمووان ڕێز و سامێکی تایبەتی هەبووە.

زەینەدین لە زیرەکی و هۆش و هێزی زەینیشدا پیتۆڵی ڕۆژگاری خۆی بووە. بێژگە زمانی کوردی، عەرەبی و فارسی و ترکی و مەغولی و ڕۆمی زانیوە و خەونیشی باش لێکداوەتەوە. ئەگەرچی بە منداڵی کوێر بووە، بەڵام بە ڕەنجی شانی خۆی ژیاوە و مامەڵەی کتێبی کردووە و بەم بۆنەوە کتێبخانەیەکی

١. «لغتنامەی دهخدا»، ٧١٠ ک. م. نووسیوە.

گەورەی پێکهێناوە. بۆ ئەوە کتێبەکانی بناسێتەوە و نرخی هەرکامیان بزانێ، هەر کتێبێکی تازەی سەندووە، پارچە کاغەزێکی بە شێوەی تایبەتبەخۆی، دەق کردووە و بە سەریدا لکاندووە؛ ئەگەر دواجار دەستی بەسەریا کێشاوە، ناو و نرخی کتێبەکەی زانیوە. کە وابوو زەینەدین یەکەم کەسە کە پیتی زۆپی بۆ کوێران داهێناوە؛ شتێک وەکوو ئەوەی کە ئەورۆ خەتی برەیلی[1] پێ دەڵێن.

زینەدین هێندێک کتێبیشی داناوە؛ یەک لەوانە: «*جَواهِر التَّبصیر فی علم التَّعبیر*»ە.

*الأعلام*، ب٥، ل٦٣. *لغتنامەی دهخُدا*، پیتی ز، ل٧٦.

## ئوممەموحەممەدی هەکاری

خاتوونێکی زانا لە کوردانی هەکاری، کچی یۆسف، کە لە حەدیس‌زانانی ڕۆژگاری خۆی بووە و زۆرێک لە زمانی ئەوەوە حەدیسیان گێڕاوەتەوە و ساڵی ٧١٤ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل٢٣٣.

## نەجمەدین حەسەنی هەزبانی

نەجمەدین حەسەن، کوڕی هاروون، شەرعزانێکی سەربەست و لە یارانی شێخ مەحیەدینی نواوی بووە کە دەوری ساڵی ٧٢٠ ک. م. پشتی یەکجاری لە دنیا کردووە.

*طبقات‌الشّافعیّة*، ب٦، ل٨٦.

## ئەحمەدی خەتاتی سوورەبەردی

ئەحمەدی سوورەبەردی، ناسراو بە«شیخ‌زادە»، یەک لەو شەش خۆشنووسە بەناوبانگانەیە کە ڕاستەوخۆ لە یاقووتی موستەعسیمی مەشقیان وەرگرتووە و بە مامۆستایانی شەشانە بەناوبانگن و ڕادەی جوان‌نووسی (اقلام ستّۀ)یان زۆر بردە بان و لە مامۆستاکەیان چوونە پێشترەوە. خەتی جوانی ئەحمەدی سوورەبەردی و باقی هاوکارانی لە مووزەی «ایران باستان»ی ئێران و چەند مووزەی تر لە دنیادا ماوەتەوە.

*کارنامەی بزرگان ایران*، تهران ١٣٤٠ ک. ه، ل٣٤.

---

١. لوی بریل «*Louis Braille*»ی فەرانسی (١٨٠٩ تا ١٨٥٢ ز.)، شەشسەد ساڵ دوای زینەدین ئەو خەتەی داناوە. ئەویش لە سێ‌ساڵانەوە کوێر بووە.

*هامش الأعلام*، ب٥، ل٦٣. بە گێڕانەوە لە گۆڤاری *المُستَقبَل*.

## موحەممەدی سنجاری

موحەممەد، کوڕی عەبدوڕڕەحمان، کوڕی موحەممەد، خەڵکی سنجار، لە مامۆستایانی ڕێبازی حەنەفییە کە دواجار چۆتە ماردین و بە دەرس‌گوتنەوە و فتوادانەوە ڕایبواردووە و هەر لەوێ، ساڵی ٧٢١ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**یەک لە کتێبەکانی**: «عُمدةُالطالب لِمَعْرفةُ المَذاهِب»ە، کە باس لە جیاوازی بیر و بۆچوونی زانایانی مەزهەبەکان دەکا.

هێندێک باب و کاڵیان لە کۆچەرانی سەمەرقەندی زانیوە.

*الأعلام*، ب٧، ل٦٥.

## سووزی غەیبی

خواجە شاوەیسی غەیبی[١]، نازناو «سووزی»، لە کوردانی شارباژێڕی لای سلێمانییە کە لە چەرخی هەشتەمدا ژیاوە و پیاوێکی دڵ و دەروون پاک و خاوەن خۆ و خدەی خواپەسند بووە و لە شیعر و شاعیریش سەری‌دەرچووە. پاش خۆی، منداڵانی ڕوویان لە ڕۆژهەڵات کردووە و سەرەنجام لە سنە نیشتەجێ بوون و ئەو بنەماڵە ئێستا «دەبیر شاوەیسی»یان ناوە.

ڕەونەقی سەنەندەجی لە ژین‌نامەی «*حَدیقەی امانُ‌اللهی*»دا، لە بارەی خواجە شاوەیسەوە دەڵێ:

«وجه تسمیه‌ی او به غیبی این که در اوایل حال، خود را مشغول تزکیه‌ی باطن و ریاضات ساخته و به سیر و سلوکِ مقامات اعلی پرداخته، تا در اندک مدتی ترقّیات عظیم در آن مقام به جهت او روی‌داده و صاحب حال و جَذب احوال شده و از جمله‌ی اولیاءالله محسوب است. خوارق عادات از او بسیار به ظهور پیوسته است؛ اشتهار اسم او به غیبی به این علّت است. غرض مردی نیک‌ذاتِ پسندیده صفات بوده، در زمان خود او، از زمره‌ی ارباب کمال و اصحاب افضال شمرده می‌شده و در بستن اشعار، طبع شکفته‌ای داشته ... ».

**بەکورتی واتا**: هۆی ناونانی بە غەیبی ئەوەیە کە لە سەرەتاوە، سەری کردبووە عیرفان و سەخڵەتی‌کێشان و دەروون پاڵاوتن و دەس لە دنیا بەردان و تەک بەلای خواوە دان و لە ماوەیەکی کەمدا زۆر سەرکەوت و بوو بە خاوەنی کەشف و کەرامات. بەکورتی پیاوێکی دڵپاک و ئاکار چاک بووە و لە ڕیزی پیاوانی خوا و

---

١. بەرە و بنچینەی خواجە شاوەیس، ئەوڕۆکە بە ناوی تایفەی «شاوەیسی» و «ئیبرایم‌بەگی» دەناسرێن. خواجە شاوەیس باپیری ئیبرایم بەگە کە لە ئاخر و ئۆخری چەرخی هەشتەمدا ژیاوە و وەزیری کلۆڵ بەگی ئەردەڵان، کوڕی ئەمیر حەسەنی ئەردەڵان بووە و باپیرەگەورەی ئیسمایل بەگی وەزیرە، کە ساڵی ١٠٣٩ ک. م. بۆتە وەزیر. ئەمیش دەبێتە باوکی خەسرەوبەگی مونشی، کە لە پیاوماقووڵانی دەزگای ئەردەڵان بووە و ساڵی ١١٤٢ شەهیدکراوە و دەبێتە بابی عەبدوڵڵابەگی مونشی «ڕاجی» کە باسی دەکەین.

جوامێران هاتۆتە ئەژمار و هەروەها لە هۆنینەوەی شیعریشدا دەستێکی باڵای هەبووە...

ئەوا دوو نموونە لە شیعری غەیبی:

فــردوس نــسیمی ز گلــستان تــو باشــد
دوزخ شَـرَری از تَـف هجـران تـو باشـد
روحـی کـه درون تُتُـق غیـب نهـان بـود
امـروز عیـان از لـب خنـدان تـو باشـد
چشم بد از آن گلشن رُخ دور، کەخورشید
همچـون گُـل پژمـرده بـه بستان تـو باشد
کو مُعْتَزلـی تـا کـه از ایـن حُجّت روشـن
خجلـت زدەی طلعـت تابـان تـو باشـد
هر یکۀ شده اعضای مـن از نالـه چـو نـالی
رحم آر بـدین خسته کـه نـالان تو باشـد
در عید وصـالت ز خـدا خواسته «سـوزی»
قربـان تـو، قربـان تـو، قربـان تـو باشـد

* * *

ساقی بهـار مـیرسـد اکنـون تـو در خـوری
کــز صُــحبت ریــایی زاهــد شــدم بَــری
افــــسرده گــــشتەام ز دم ســــردطینتان
تــابی بــزن بــه جــانم از آن لعــل آذری
رحمـــی نمـــای بـــر دل پیـــران نـــامراد
کَــز گُلــبن مُــراد جوانیــت برخــوری
ای خلــوت حــریم تــو را، مــاه پــردەدار
وی بنــد گیِّ حُــسن تــو را، مهــر مُــشتری
یـک پرتـو از فـروغ رخـت دسـت موسـوی
یـک نُـسخه از فـسون لَبَـت سـحر سـامری
از فــرق تــا قــدم همــه اَعــضای قُدسـیت
چابکترنــد هریکــی از یــک بــه دلبــری
نــازم بـه بـیْنظیـری ذاتـت کـه جُـز خـدا
بــا هــر کــه مــی کُنَمْــت برابـر، فزونتـری
از حیــرت جمــال تــو دارنــد قدســیان
در یکـدگر نظـاره کـه یـارب چـه مظهـری
آن خـال مـشکفام بـه بـالای چـشم مـست
کـابروت هـم نمـوده بـر او سـایه گـستری،
باشـد خطیـب عـشق و بـه محـراب داسـتان
تُــرک ســیاەمــست وَرا کــرده منبــری
«ســوزی» بهــای دوســت ز دنیــا و دیــن
ایـن اسـت و ایـن طریقـه و سـرّ قلنـدری

*حدیقەی ئامان‌اللهی*، ل٣٧٣.

## شێخ جوبرەئیلی کوردی

شێخ جوبرەئیل، کوڕی عومەر، کوڕی یۆسفی کوردی، ناسراو بە «اَبوالامانه»یە کە ساڵـی ٦٥٣ ک. م. هاتۆتـە دنیا و ٧٢٣ لە دنیا دەرچووە و لە عارفانی بەناوبانگی ڕۆژگاری خۆی بووە.

گۆڤاری «*یادگار*» لە باسی شەمسەدین موحەممەد، کـوڕی ئەحمـەدی کیـشیدا (مـردن ٦٩٤)، دەڵـێ: «شەمسەدین لە ڕێگای سەفەری بۆ حیجاز، کاتێ گەیشتە بەغدا، ماوەیەک هاتەسەر ئەوەی هاودەنگی شێخ جوبرەئیلی کوردی بکا و بە فەرمانی ئەو، دەستیدایە گۆشەنشینی و ڕیازەت».

عەللامەی دیهخوداش لە «*لغتنامه*»دا بە گێڕانەوە لە پەراوێزی «*شَدُّالازار*»ی عەللامەی قەزوێنی، لاپەڕەی ١١١ و ٢٤٠، دەڵێ: « یافیعی لە ڕووداوانی ساڵی ٦٧٦دا ـکە ساڵی کۆچی دوایی ئیمام یەحیا نواوییە ــ لە باسی ئەوانەی کە لێی ڕەوایەت دەکەن، یەکیان شێخ جوبراییلی کوردی ناو دەبا و دەقی ڕستەکەی ئەمەیە: «روی عَنهُ اَی عن النّووی جماعه مِن ائمه الفُقَها و الحُفّاظ، مِنهُم الامام عَلاءَالدّین العَطّار و منهُم الشیخُ النسکُ المُبارکُ جبرئیل الکُردی و علیه سَمعتُ الاربَعین».

بەکورتی شێخ جوبرەئیل لە پێشەنگانی ڕاویان و لە کەسانێکە دەرسی ئیمام نواوی گوێ لێبووە و لێی گێڕاوەتەوە و هەروەها یافیعیش (لەدایکبووی ٦٩٨) بۆ شێخ جوبرەئیل وا بووە.

*مجلّەی یادگار*، ژمارەی ٢، ساڵی٢، چاپی ١٣٢٤ ک. ه، ل٦٥. *لغتنامەی دهخُدا*، پیتی ج، ل١٩٤.

## بەدرەدین حەسەنی ئەربیلی

بەدرەدین حەسەن، کوڕی ئەحمەدی هەولێری، زانایەک بووە شارەزا لە زمان و وێژە و مێژوو و بژیشکیدا؛ وڵاتانی زۆر گەڕاوە و سەرەنجام لە شاری دمشق دامەزراوە.

**لە کتێبەکانی**: «*مَدارسُ دَمشق و جوامِعُها و رُبُطها و حَماماتُها*» و «*رَوضة الجلیس و نزهة الانیس*».

زا و مەرگی بدرەدین ساڵانی ٦٦٣ و ٧٢٦ ک. م. ڕووی‌داوە.

*الأعلام*، ب٢، ل١٩٥.

## شێخ عیمادەدینی هەکاری

عیمادەدین عەبدولعەزیز، کەسناو «اَبوالعِزّ» و ناسراو بە «ابنُ‌الخطیب»، کوڕی ئەحمەد، کوڕی عوسمان، لە زانایانی ناودار و نووسەرانی پایەبەرزە کە چەند کتێبێکی لێ ماوەتەوە و هەروەها شیعریشی هۆنیوەتەوە و ساڵی ٧٢٧ ک. م. لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٥٨١.

## ئەبولفیدای ئەیووبی

مەلیک موئەیید ئیسماعیل، نازناو «عیمادەدین»، کوڕی ئەفزەل، کوڕی مزەفەر مەحموود، کوڕی مزەفەر تەقیەدین عومەر، کوڕی نووروددەولە، کوڕی نەجمەدینی ئەیووبی، مێژوونووس و زانای بەناوبانگ، کە زۆرتر بە ناوی «اَبولفدا» ناسراوە، ساڵی ٦٧٢ ک. م. لە دمشق هاتۆتە دنیا و دوای تەواو کردنی دەرس و دەور و شارەزابوون لە فیقهـ و وێژە و مێژوو و جوگرافی و تەنانەت بژیشکیدا، بووە بە هاوکاری مامی و لە چەند



شەڕیدا لەگەڵ خاچپەرستان، بەشداری کردووە و ماوەی ١٢ ساڵیش هاوڕێی مەلیک ناسر، لە میرانی میسر بووە. ئەمجار لە هەژدەی جەمادیئەوەڵی ساڵی ٧١٠ دا حوکمەتی حەماتی پێ دراوە و ٧٢٠دا نازناوی «الملك‌المؤیّد»ی پێ بەخشراوە و سەرەنجام محەڕەمە مانگی ساڵی ٧٣٢ ک. م. مردووە و بەرگی کفنیان دەبەری کردووە.

**لە کتێبە گرینگەکانی**: «*المُختَصر فی تاریخ البَشر*» لە ٤ بەرگدا، کە بە ناوی «*تاریخ ابوالفدا*» بەناوبانگە و بە هێندێک لە زمانە ئورووپییەکانیش وەرگەڕاوەتەوە و لە کتێبە بەرزەکانی مێژووە. «*تقویم البُلدان*»، لە جوگرافیدایە و دەقی عەرەبییەکەی زۆر جاران لە چاپ دراوەتەوە و بە زۆر زمانی ئورووپاییش وەرگێڕدراوە. «*الحاوی*» لە فیقهدا. کتێبی«*الموازین*».«*الطریقُ‌الرّشاد الی تعریف الممالك و البلاد*» لە جوگرافیدا. «*جامع‌المسانید*» لە حەدیسدا و «*الکُنّاش*» لە سەرف و نەحودا؛ کە ساڵی ٧٢٧ ک. م. نووسراوە.

ابولفدا جاروبارەش شیعری گوتووە و ئەم دوو بەیتە هی ئەوەن:

أحْسنْ بـه طرْفاً أفـوتُ بـه القَضا　　انْ رُمتُـهُ فـی مَطْلَـب اَوْ مَهـرَب

مثْـل الغَـزالَـة مـا بَـدَتْ مـنْ مَشْرق　　الا بَـدَتْ أنوارُهـا فـی المغـرب

*طبقات‌الشّافعیّة*، سُبُکی، ب٦، ل٨٤. *تاریخ آداب‌اللغـةُ العربیـة*، جُرجی زَیدان، ب٣، ل١٨٧. *لغتنامەی دهخُدا*، پیتی الف، ل٧١٢.

## عەبدوڕڕەحیمی بدلیسی

مەولانا عەبدوڕڕەحیم زانایەکی گەورەی کوردە کە لە چەرخی هەشتەمدا ژیاوە و عومری بە خوێندنەوە و نووسین و دەرسدانەوە تێپەڕ کردووە و لێیەوە چەند شەرح و پەراوێز و نووسراوە بەجێماوە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٤٧.

## عوسمان عەبدولمەلیکی کوردی

عوسمان، کوڕی عەبدولمەلیکی کوردی شافیعی، لە زانا بەناوبانگەکانی چەرخی هەشتەمە کە لە میسردا ژیاوە و ساڵی ٧٣٨ ک. م. ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە.

**لە کتێبەکانی**، ئەوی «*کشف الظّنون*» ناوی بردوون: «*شرح بدیع‌النّظام الجامع بین کتاب البزودی و الاحکام*» نووسراوی ابن‌السّاعاتی، «*شرح الحاوی الصّغیر فی الفروع*»، «*شرح مُختَصر المُنتهی*»نووسراوەی ابن‌الحاجب و «*شرح شامل*» لە فورووعی مەزهەبی شافیعیدا.

*کشف الظّنون*، ب١، ل١٩٢ و ٤١٦، ب٢، ل٤٦ و ٥٤٠.

## پیرمیکایلی[1] جاف

پیرمیکایلی جاف ناسراو بە «شەش ئەنگوست»، لە ئەولیا و پیاوچاکانی چەرخی هەشتەمە کە لە گوندی دەودانی پەنا سیروان، لە ناوچەی جوانڕۆدا ژیاوە و هەر لەوێ، ساڵی ٧٣٨ ک. م. ئەمری خوای بەجێهێناوە. لەودواتر زاروزێچی، ئەوێیان بەجێهێشتووە و لە ناوچەی قەرەداغی نێزیک لە سلێمانی گیرساونەوە.

سەرباشقەی عارفان، مەولانا خالدی «ذی‌الجناحین» لە پشتی پیرمیکایلە کە وەک دەڵێن ئەویش لە تۆرەمەی حەزرەتی عوسمان(د)، خەلیفەی سێهەمە.

*یادی مەردان*، مەلاکەریم، ل٧.

## موحەممەدی جزیری

موحەممەد،کوڕی ئیبراهیم، کوڕی ئەبیبەکر، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی عەبدولعەزیز، لە دایکبووی ٦٥٨ و لە دنیاچووی ٧٣٩ ک. م. زانایەکی مێژووزانە لە جزیر (جزیر و بۆتان)، خاوەن کتێبی هەرەباش؛ وەکوو: «*حَوادث‌الزّمان و اَنبائه*»، «*وَفَیات الاکابر و الاعیان و اَبنائه*» لە ٣ بەرگدا.

موحەممەدی جزیری پیاوێکی خۆش‌سەروزمان، ئەمین، درووستکار و ڕاستبێژ بووە و لە بواری زبانی و وێژەوانیشدا سەری‌دەرچووە و جار-جاریش شیعری گوتووە.

*الأعلام*، ب٦، ل١٨٩. *هدیة‌العارفین*، ب٢، ل٥٠.

## مەجدەدینی ماردینی

مەجدەدین ئەبولحەسەن عیسا، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی موحەممەد، لە کوردانی ماردینە کە ژیانی بە دەرس‌گوتنەوە و فتوا و خزمەت لە ڕێی پەرە دان بە ئایینی ئیسلام داوەتە سەر و ساڵی ٧٤٦ ک. م. لە دنیا چووە.

مەجدەدین هێندێک بەرهەمی نووسراوەشی لێ بەجێ ماوە؛ بۆ وێنە: «*مُختَصر مَعالم السُّنَن للبَیهَقی*».

*هدیة‌العارفین*، ب١، ل٨٠٩.

## فەخرەدینی چارپردی[2]

ئەبولمەکاریم فەخرەدین ئەحمەد، کوڕی یۆسفی چارپردی، لە مامۆستایانی سەرف و نەحو و وێژە و

---

١. بناوانی پیرمیکایل ئێستا «عەشیرەی میکایلی»یان پێ ئێژن؛ کە لقێک لە هۆزی جافن و تا ئەم دواییانە کۆچەر بوون. زستانان زۆرتر ناوچەی قەرەداغ و هاوینان لە پاڵداوێنی شاهۆ ڕەشماڵیان هەڵداوە.

٢. «**چارپرد**» ناوچەیەکی ئارانە لە باکووری ئازربایجان کە کوردستان بووە.

شەرعزانانی شافیعییە کەساڵی ٧٤٦ لە تەوریز کۆچی یەکجاری کردووە.

چارپردی لە خزمەتی قازی ناسرەدین بەیزاویدا خوێندوویە و لە عیرفانیش بەشێکی پێ گەیوە و لەگەڵ قازی عیزەدین ئەیجیدا کێشە و بەربەرەکانێ دوور و درێژیان هەبووە.

هێندێک نووسراوەی بایەخداری لێ بەجێ ماوە؛ بە تایبەت کتێبی «*المُغنی*» لە نەحودا، چەند شەرح لە: «*شافیه*»ی ئیبنولحاجب و «*کَشّاف*»ی زەمەخشەری و «*حاوی صغیر*» و «*منهاج*»ی قازی بەیزاوی بە ناوی «*السّراج الوهّاج*».

*تاریخ آداب اللغةُ العربیة*، جُرجی زَیدان، ب٣، ل١٤٧. *لغتنامەی دهخُدا*، پیتی ج، ل٣٩. *طبقات الشّافعیّة*، سُبُکی، ب٦، ل٨٨.

## شەمسەدینی سنجاری

شەمسەدین موحەممەد، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی ساعدی ئەنساری، کەسناو «أبوالوجود» و ناسراو بە «إبن الأکفانی»، بژیشکێکی سنجارییە کە بۆ خوێندن زۆر وڵاتان گەڕاوە و لە هەر شوێنێک شتێک فێر بووە تا سەرەنجام لە قاهیرەدا گیرساوە و دەرس‌دان و دەرمانی نەخۆشانی دەسپێکردووە و هەر لەوێ سالی ٧٤٩ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

ئیبنولئەکفانی بژیشکێکی توێژەر و جێی‌متمانەی خەڵک بووە و زۆر کتێبی بایەخداری نووسیوە کە بریتین لە: «*ارشاد القاصد الی اَسْنَی المَقاصد*» لە زۆرێکی زانستەکاندا، «*کشف الرَّین فی امراض العین*» کە نامیلکەیەکە لەمەڕ جەوهەری کانی و ئالی و جۆر و ڕەگەزی جۆراجۆرەوە، «*غُنْیَةُ اللبیب فیما یَستَعمَلُ عند غیبة الطبیب*»، «*نغب الطائر من البحر الزّاخر فی التفسیر*»، «*نهایة القصد فی صناعة الفصد*»، «*روضة الالباء فی اَخبار الاطباء*»، «*اللُباب فی الحساب*» و «*الدّر النظیم فی احوال العلوم و التعلیم*».

ئەم بژیشکە هەڵکەوتە لە حیکمەت و ڕیازیشدا مامۆستایەکی بێ‌وێنە بووە.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل١٥٥. *الأعلام*، ب٦، ل١٨٩.

## شێخ عەبدوڵڵای سنجاری

لە زانایانی چەرخی هەشتەمە کە ئیبنوبەتووتە، گەشتیار و مێژووزانی بەناوبانگ کاتی چوونی بۆ سنجار (٧٢٠ ک. م.) چاوی پێ‌کەوتووە و زۆری پێدا هەڵگوتووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل٣٩.

## قەوامەدینی کاکی

قەوامەدین موحەممەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئەحمەدی کـاکی، لـە کـوردانی سـنجار و شـەرعزانـانی حەنەفییە کە چۆتە قاهیرە و ساڵی ٧٤٩ ک. م. لەو شارە ماڵاوایی لە دنیا کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*سِراجُ الدرية فی شرح الهداية*» لە فیقهدا، «*جامع الاسرار فی شَرح المنار*» و «*عيـون المـذاهب*» کە کورتەیەک لە گوتەکانی چوار ئیمامە.

*الأعلام*، ب٧، ل٢٦٥.

## ئیبنوعیسای هەکاری

لە زانایانی بەناوبانگی چەرخی هەشتەمی کۆچییە کە بەتایبەت لە فیقهـ و حەدیسدا مامۆستایەکی شارەزا بووە و ساڵی ٧٥٠ ک. م. لە دنیا چووە.

**لە کتێبەکانی**: «*رجال البخاری و مسلم*»، کە بە ترتیبی پیتی ئەبجەد ڕیز کراوە.

*تاریخ آداب اللغةُ العربية*، جُرجی زَیدان، ب٣، ل٢٤٠. ب٤، ل ١٠٧.

## ئیبنوخەتیبی هەولێری

ئەبولمەعالی، داوەریدادوەران، بەدرەدین موحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی ئەحمەدی هـەولێری مووسـڵی، ناسراو بە «ابن‌الخطيب»، مامۆستایەکی وردبین و زانا لە مووسیقا و شارەزا لە فیقهـ و نەحودا بووە. جارێک لـە لایەن حاکمی مووسڵەوە باڵوێزیی میسری پێ سپێراوە و ئەم لەم کارەدا لێهاتوویی خۆی نیشان داوە.

ئیبنوخەتیب نووسەر و شاعیریش بووە و کتێبی زۆریشی نووسیوە؛ کە هێندێکیان بریتین لە: شەرحێکی «*کافيه*» لە نەحو و «*شافيه*» لە سەرفدا، زنجیرە پەراوێزێک بۆ: «*الحاوی*» لە فورووعدا، «*تَسهيل*»ی ئیبنومالیـک و نامیلکەیەک لەمەڕ ناساندنی زانستەکانەوە. بەرهەمی تری سەرجەمێکە لە مەقام و ستران، کە ساڵـی ٧٢٩ ک. م. هۆنیویەتەوە و ناوی ناوە: «*جواهر النظام فی معرفة الانعام*».

زا و مەرگی ئیبنوخەتیب ساڵانی ٦٨٦ و ٧٥٥ ک. م. ڕوویداوە.

*الأعلام*، ب٧، ل١٧٦. *هدية‌العارفين*، ب٢، ل١٣٥.

## فاتمەی هەکاری

فاتمە خاتوون، کچی ئیبراهیم، کوڕی داود، کوڕی نەسر، لە ژنە زاناکانی چەرخی هەشـتەمە کـە لـە بـواری فیقهـــ و حەدیـــسدا تـــاقمێکی زۆری بەهرەمەنـــد کـــردووە و ســـەرەنجام ساڵـــی ٧٥٧ ک. م. دنیـــای بەجێهێشتووە. لەدایکبوونیان ساڵی ٦٨٣ ک. م. نووسیوە.

*هدیة‌العارفین*.

## عەلائەدین عەلی خەلاتی حەنەفی

عەلائەدین عەلی، کوڕی موحەممەد، کوڕی حەسەن، مامۆستایەکی خەڵکی خەلات بووە کە کتێب و نووسراوەی زۆری بەجێهێشتووە و ساڵی ٧٥٨ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*کتاب‌الحدود*» لە ئوسوولی فیقهدا، «*کتاب‌السّیره*» و شەرحێکی کتێبی «*هدایە*» لە فورووعدا.

*کشف الظّنون*، ب٢، ل٢٧٣ و ٦١٤ و ٦٥٠. *هدیة‌العارفین*، ب١، ل٧٢٣.

## مەولانا تاجەدینی کوردی

لە زانایان و مامۆستایانی بەناوبانگی چەرخی هەشتە کە دواقۆناغی خوێندنی لە خزمەتی عەللامەی ئەمەوی بووە و دوای ئەوە لە شاری بروسە ـ لە ڕۆژاوای ئاناتولی تورکیە ـ دەرسی گوتۆتەوە و دووەم سوڵتانی عوسمانی (ئورخان ٧٢٧- ٧٦١ ک. م.) زۆری ڕێز لێناوە و سەرناوی «خێرەدین پاشا»ی پێداوە و وەزیری ڕاوێژکاری بووە.

دەق و پەراوێزی *شرفنامەی بدلیسی*، چاپی میسر، ل٣٠.

## شەهابەدینی هەکاری

شەهابەدین ئەبووسەعیدی هەکاری، کوڕی ئەحمەد، کوڕی ئەحمەد، کوڕی ئەحمەد، کوڕی حوسەین، کوڕی مووسا، مامۆستایەکی حەدیس و تەفسیرە کە لە میسردا ژیاوە و ساڵی ٧٦٣ ک. م. لە دنیا نەماوە. ئەم زانایە تەفسیرێکی چەند بەرگی هەبووە و کتێبێکیشی لە حەدیسدا بە ناوی «*رجال السُّنَن الأربعه*» هەیە.

*الأعلام*، ب١، ل٨٧.

## ئەسەدەدین سولەیمانی هەزبانی

ئەسەدەدین سلێمان، کوڕی داود، کوڕی عیمادەدین، کوڕی میری گەورە عیزەدینی هەزبانی مووسکی، بابی لە میرانی تایبەتی مەلیک ئەشرەف، کوڕی مەلیک عادڵی ئەییووبی و باپیری (ئەمیر عیزەدین)، پوورزای سوڵتان سەلاحەدینی ئەییووبی بووە.

ئەسەدەدین بۆخۆشی میرێکی گەڕناسی زانا و ویژەوان و شاعیر هاتۆتە ئەژمار؛ بەڵام بەجارێک دەستی لە دنیا و دەسەڵات بەرداوە و ڕووی لە پاکی و پارێزگاری ناوە و حلکی جاوی دەبەرکردووە و لەگەڵ زانایان و



پارسایان دانیشتووە.

نموونەیەک لە شیعری:

مَـا الحُـبُّ الّـا لَـوْعَـةٌ وَ غَـرامُ فَحَـذار أن يُثنيـكَ عَنْـهُ مَـلامُ
العـشْقُ لِلْعُـشاق نـارٌ حَرُّهـا بَـرْدٌ علـی اَكْبـادهمْ وَ سَـلامُ
تَلْتَـذّ فيـه جُفُـونُهُمْ بـسُهادها وَ جُـسُومُهُمْ اذْ شَـفَّها الاسـقامُ
وَ لَهُـمْ مَـذاهبُ فـی الغَـرام وَ ملَّـةٌ اَنـا فـی شَـريعَتها الغَـداةَ إمـامُ
وَ لَهُـمْ وَ للأحبـاب فـی لَحَظـاتهم خَـوْفَ اَلوُشـاةِ رَسـائلُ وَ كَـلامُ
لَطُفَـتْ اشـارَتُهُمْ وَ رَقَّـتْ فـی الهـوی مَعنـیً فَحـارَتْ دونَهَـا الافهـام
فَإلَيـكَ عَـنْ عَـذلی فَـإنَّ مَـسامعی مـا لِلْمَـلام بطَرْقهـا الْمـامُ
أنـا مَـنْ يَـری حُـبَّ الحسان حَياتَـهُ فـإلی مَ فـی حُـبِّ اَلحـسان اُلامُ

ئەسەدەدین ساڵی ٧٦٧ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

*لغتنامەی دهخُدا*، پیتی الف، ل٢٢٦٣.

## شێخ یۆسفی گۆرانی

شێخ یۆسف، کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی عومەر، کوڕی عەلی، کوڕی خدری گۆرانی، ناسراو بە «عَجَمی»، یەک لە عارفان و سۆفیانی گەورە بووە کە شێخی شەعرانی لە «*طبقات*»دا وای لە بارەوە نووسیوە: «هوَ اوّلُ مَن أحْيـی طَريقَة الشيخ جنيد رضیالله عَنهُ بِمصر بَعْدَ اندِراسها وَ كانَ ذا طَريقَة عَجيبَة فی الانقطاعِ وَ التسليكِ وَ لَهُ تلامذة كَثيرة و عِدَّةٌ زوَيا...».

شێخ یۆسف بۆتە مریدی شێخ نەجمەدین مەحموودی ئەسفەهانی و شێخ بەدرەدین حەسەنی شمشێری و ئەم دوو مورشیدە پایەبەرزە، کەڵپۆسی دەروێشییان پێ بەخشیوە و ئیجازەی ئیرشادیان پێ داوە.

شێخ یۆسف دواجار بۆ میسر ڕۆیوە و لەوێ چەند خانەقا و تەکیەی پێکهێناوە و خەڵکی ڕێنوێنی کردووە و سەرەنجام ساڵی ٧٦٨ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە و لە «قرافة صُغری»دا نێژراوە.

نامیلکەیەک لە شێخ یۆسف بەجێماوە بە ناوی «*رَيحانة القُلوب فی التوصُل الی المحبوب*» کە باس لە مەرجی تۆبە و دۆخی دەروێشی دەکا.

*طَبَقات کُبری*، چاپی میسر، ب٢، ل٦٦. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٩٣٩.

## جەمالەدینی گۆرانی

جەمالەدین ئەبولمەحاسین یۆسف، کوڕی عەبدولکەریمی گۆرانی شافیعی، زانایەکی ناوچەی شارەزوورە کە

چۆتە میسر و چەنای چەن ساڵ لەوێ دەرسی‌داوە و ساڵی ٧٦٨ ک. م. ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە.

**لە کتێبەکانی**: «*بدیع‌الانتفاث فی شرح القوافی الثّلاث*» و «*حِزب التّوحید*».

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٥٧.

## خاتوو ئەسمای هەکاری

ئەسما خاتوون، کچی ئەحمەد، کوڕی ئەحمەد، کوڕی حوسەینی هەکاری، لە ژنانی حەدیس‌زان بووە کە ساڵی ٧١٥ هاتۆتە دنیا و ٧٧٠ ک. م کۆچی دوایی کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل٢٣٢.

## خاتوو جوەیرییەی هەکاری

خاتوو جوەیرییە، کچی ئەحمەد و خوشکی خاتوو ئەسمایە کە ژنێ بووە زانا و ئاگا لە حەدیس و لەگەڵ زانایانی ئەم بوارەدا، کۆڕی وت‌وویژی هەبووە و پاش نەود ساڵ ژیان، ساڵی ٧٨٣ ک. م. ماڵاوایی یەکجاری لە دنیا کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل٢٣٣.

## موحەممەدی شوانکارە

موحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی موحەممەد، لە تایفەی کوردی شوانکارەی فارسە کە دەوری ساڵانی ٦٩٧ ک. م. لە دایک بووە و لە نووسەرانی قەڵەم ڕەوان و جوانی چەرخی هەشتەمە کە لە باری شیعر و شاعیریشدا ناوێکی هەبووە و پەسنی خواجە غیاسەدین، کوڕی ڕەشیدەدین فەزلوڵلای داوە و هەموو عومری خەریک نووسین و شیعر دانان بووە.

شوانکارە ساڵی ٧٣٣ ک. م. شانی لە نووسینی کتێبێک لە بارەی مێژووی گشتییەوە شل کردووە و ساڵی ٧٣٥ دوایی پێ هێناوە و داویە بە خواجە غیاسەدین کە نیشانی ئەبووسەعید، دوامین پاشای مەغولی بدا. بەڵام لەپڕ ئەبووسەعید دەمرێ و لە بشێوە و تالانی گەڕەکی ڕوبعی‌ڕەشیدی تەورێزدا، کتێب لەناو دەچێ. شوانکارە دیسان کتێبەکەی دەنووسێتەوە و ئەمجار «مَجمَع‌الانساب»ی ناو دەنێ کە کتێبێکە لەوپەڕی ڕێک‌وپێکی و جوانیدا، بریتی لە مێژووی جیهان لە سەرەتاوە تا پاشایەتی ئەبووسەعید.

*تاریخچەی ادبیّات ایران*، سعید نفیسی، پاشکۆی *سالنامەی پارس*، ١٣١٧ ک. ه.

## بەدرەدینی هەکاری

قازی ئەبووعەبدوڵلا موحەممەد، کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی ئەحمەد، لە زانایانی خەڵکی هەکارییە کە دوای

تەواو کردنی دەرس و دەور، ماوەیەک لە حەمس، هێندێ لە قودس و چەلێکیش لە دمشق دادوەری کردووە و سەرەنجام ساڵی ٧٨٦ ک. م. لە دنیا چووە.

**لە کتێبەکانی**: کورتکراوەی کتێبی شەش بەرگی «*دَرء تعارض العقل و النقل*»ی ئیبنو تەیمییە، لە ٢ بەرگدا و هەروەها کورتەی «*میدان الفرسان*»ی موحەممەد، کوڕی خەلەفی غەری لە چەند بەرگدا.

*الأعلام*، ب٧، ل١١٤. *هدیة العارفین*، ب٢، ل١٧٢.

## ڕەشیدەدین ئیسماعیلی کوردی

ڕەشیدەدین ئیسماعیل، کوڕی مەحموود، کوڕی موحەممەدی شافیعی کوردی، لە چەرخی هەشتەمدا ژیاوە و ژیانی بە نووسین و دەرس گوتنەوە و فتوادان گوزەراووە.

**لە کتێبەکانی**: «*فوائد المسائل الضروریّه فی الفرائض*» و «*سراج العابدین فی شرح الاربعین*»، کە ساڵی ٧٧٥ ک. م. نووسیویە.[1]

*هدیة العارفین*، ب١، ل٢١٥. *ذیل کشفُ الظُّنون*، ب ٢، ل ٧. *کشفُ الظُّنون*، ب ٢، ل ١٨٤.

## شێخ ئەحمەدی کاشتەری

عارفێکی پارسا، خەڵکی گوندی کاشتەر لە ناوچەی بێڵوارە کە لە چەرخی هەشتەمدا[2] ژیاوە و زێدی خۆی بەجێ‌هێشتووە و بەرەو وڵاتی عوسمانی چووە و لە شاری «بروسا»دا نیشتەجێ بووە.

شێخ ئەحمەد عارفێکی نزا وەرگیراو بووە و کەشف و کەرامەتی زۆریان لێ بینیوە و تا بڕانەوەی چەرخی هەشتەم ژیاوە.

*الشّقایق النُعمانیّة*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٢٣.چەند جونگی دەسنووس.

## میر موحەممەدی مەردۆخ

مەولانا میرموحەممەدی مەردۆخ، باپیرەگەورەی یەکێ لە بنەماڵەگەورەکانی کوردستانە، بە ناوی «مەردۆخ» یان «مەردۆخی» کە کەسانی هەڵکەوتەی زۆر، لە زانست و عیرافانیان لێ هەڵکەوتووە.

بەپێ ئەوەی لە شەجەرەنامەی ئەم تایفەدا نووسراوە، مەردۆخ ناوی گوندێک بووە لە ناوچەی جەبەل لە

١. لە «*هدیة العارفین*»دا ٧٧٨ نووسراوە.

٢. لە دەورانی پاتشایی سوڵتان مراد خانی عوسمانی (٧٦١-٧٩١) بووە و ئەم سوڵتانە زۆری خۆش‌ویستووە.

دەرووزی شامدا کە سەید یۆسف، بابی میرموحەممەد خەڵکی ئەوێ بووە و ساڵــی ٧٣٧ ک. م. لەگــەڵ ژن و منداڵ و کەس و کاریدا، ئەوێیان بەجێهێشتووە و ڕوویان لە کوردستان ناوە و لە دەشتێکی لای هەورامان ـکە لەودوا ناوی بووە بە دەشتی شامیانـ بنە وباریان داگرتووە.

بابامەردۆخە عارفێک بــووە زانــا کــە لــە ســەیر و ســولووک و کەشــف و کەرامــەتی، حەکایــەتی زۆریــان گێڕاوەتەوە. ئەم پیاوە گەورە زۆربەی ژیانی بە دوورەپــەرێزی و گۆشــەنــشینی و سەڵــتی تێپــەڕ کــردووە و ساڵانی ئاخری عومری بیری لە هاوسەرگرتن کردۆتەوە و کچی شــێخ شــەهابەدینی دزاوەری خواســتووە و لەم ژنە، لە دواساڵی ژیانیدا، بۆتە خاوەن کوڕێک و ناوی ناوە موحەممەد گوشایش؛ کە پیاوێکی ناوداری لــێ دەرهاتووە و باسی ئەویش دەکەین.

میر موحەممەدی مەردۆخ ١١٠ساڵی عومر کردووە و زا و مەرگی ٦٨٠ و ٧٩٠ ک. م. ڕوویداوە.

*نَسَب‌نامەی خاندان مردوخی.*

## موحەممەد ئەفەندی شارەزووری

موحەممەد ئەفەندی، کوڕی عەبدولقادر، مامۆستایەکی زانا بووە کە سەرەتا لە مووسڵدا ژیاوە و دەرسیداوە و پاشان بۆ شام چووە (٧٣٨ ک. م.) و دوایی (٧٩٨) لە دمشق ماوەتەوە و دەرسی گوتۆتەوە.

موحەممەد ئەفەندی شارەزای وێژەی عەرەب بووە و جاروبارە شیعریشی گوتووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل١٢٦.

## موحەممەدی بەرقەلعی

مەولانا موحەممەدی بەرقەلعی، زانایەکی خەڵــکی بــدلیس و هاوچــەرخی ئــەمیر شــەرەفخــانی یەکــەم، حاکمی ئەوێ بووە و کتێبێکی بە ناوی ئەوەوە کردووە و بەرهەمی تریشی لە نــەحو و مەنتیقــدا دانــاوە و تــا بڕانەوەی چەرخی هەشتەم ژیاوە.

*شَرفنامەی بدلیسی*، چاپی میسر، ل٤٤٧.

## تاجەدینی سنجاری

قازی ئەبوعەبدوڵڵا تاجەدینی سنجاری حەنەفی، کوڕی عەلی، ساڵی ٧٢٢ ک. م. لە سنجار هاتۆتــە دنیــا و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکردووە و بۆ درێژەپێدانی، ڕووی لە مووسڵ و هەولێر ناوە و بە هەموو توانــەوە بــۆ فێر بوون تێکۆشیوە تا بە مرادی گەیشتووە. ئەمجار ماوەیک لە هەولێر و چەند شوێنی تری کوردســتان بــە کاری دادوەریوە خەریک بووە و پاشان چۆتە میسر و لەوێوە گەڕاوەتەوە دمشق و سەرەنجام ساڵی ٧٩٩ ک.

م. لەو شارە لە دنیا دەرچووە.

قازی تاجەدین چەند کتێب و نووسراوەشی لێوە بەجێماوە؛ یەکیان هۆنراوەیەکە لە فەرائیز و کەلـەپووردا. شاعیرێکی دەمپاراویش بووە و ئەم بەیتە هی ئەوە :

لِکُـلِّ أمـری منَـا مـنَ الـدَّهْر شـاغلٌ وَ مـا شُـغُلی مـا عـشْتُ الاَّ المَـسائلُ

# چەرخی نۆهەم

## جەلالەدین عومەری کوردی

جەلالەدین عومەر،کوڕی خدری کوردی شافیعی، مامۆستایەکی پارێزکار و بەئاکار و دڵاوا و جێ بڕوا بووە کە دەرسی کوتووە و فتوایان لێ وەرگرتووە و ساڵی ٨٠٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.
**کتێبی** «*الكَنزُ المطلوب فی الدّوائر و الضُّرُوب*» هی ئەوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٧٩١.

## یۆسفی کوردی

کوڕی حوسەین، لە کوردانی خێڵی «زێدکی»[1] لای مووسڵە، کە بۆ خوێندن تا بەغدا و حەلەب و دمشق چووە و دوای وەرگرتنی ئیجازە، تا دواساڵی ژیانی (٨٠٤ ک. م.) هەر لەو شارە ماوەتەوە.
یۆسف هاودەورانی زانای بەناوبانگ «ئیبنوتەیمیە»یە و لەگەڵیدا زۆرێک وتوویژ و کێشەی هەبووە. کتێبێک بە ناوی «*اَلمَسح عَلَى الجَوْرَبین*»، بە هێنانی حەدیس و بەڵگەکانییەوە، لە نووسراوەکانیەتی.
*الأعلام*، ب٩، ل٣٠٢. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٥٨.

## عیسای جەزەری

زانایەکە لە زاروزێچی عەللامە ئیبنوجەزەری کە زمان و وێژەی عەرەبی باش زانیوە و ژیانی بە خوێندن و فێر کردن ڕابواردووە و ساڵی ٨٠٥ ک. م. جیهانی بەجێهێشتووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل٩٦.

---

١. زۆرێک لە کتێبان بە هەڵە «یەزیدی»یان نووسیوە.

## حافیزی عیراقی ڕازنانی میهرانی

زەینەدین ئەبولفەزل عەبدوڕڕەحیم، کوڕی حوسەین، کوڕی عەبدوڕڕەحمان، کوڕی ئەبووبەکر، کوڕی ئیبراهیمی ڕازانی میهرانی ، ناسراو بە «ئیمام حافیزی عیراقی» لە حافیزانی قورئان و پێشەنگانی تەفسیر و حەدیس بووە کە ساڵی ٧٢٥ ک. م. لە ڕازانی لای هەولێر هاتۆتە دنیا و هەر بە منداڵی لەگەڵ بابی چۆتە میسر و لای مامۆستایانی گەورەی ئەوێ، ماوەیەکی زۆری خوێندووە و پاشان ڕووی لە شام و فەلەستین و حیجاز ناوە و لە خزمەتی زانایانی ئەو وڵاتانەش بەهرەی بردووە و ئەوجار گەڕاوەتەوە میسر و تا دواساڵی ژیانی (٨٠٦ ک. م.) لە قاهیرە کتێبی داناوە و دەرسی‌داوە.

**لە کتێبەکانی**: «*فتح‌المُغیث بشرح الفیة الحدیث*»، «*فتح‌الاساتید*»، «*الفیة العراقی فی اصول الحدیث*»، «*المُغنی عن حَمل الاسفار فی الاسفار*»، «*محجة القرب فی محبّة العَرب*»، «*التّحریر فی اصول الفقه*»، پەراوێزێک لە کتێبی «*تاریخ العبر فی خَبَر مَن عَبَر*» و «*مُهمّات المُهمّات فی الفروع*».

*الأعلام*، ب٤، ل١١٩. *دائرەالمعارف*، فرید وَجدی، ب٧، ل٢٨٧. *لغتنامەی دهخُدا*، پیتی ح، ل١٣٠.

## عەللامە عەبدوڕڕەحیمی بارزانی

لە کوردانی ناوچەی بارزان و مامۆستایەکی گەورەی شەرع و حەدیس لە ڕۆژگاری خۆیدا بووە کە لە سەرەتای چەرخی نۆدا ژیاوە و ئیبنوحەجەری عەسقەلانی ئیجازەی لە لای ئەو وەرگرتووە.

*سالنامەی اَخگر*.

## شەهابەدین ئەحمەدی گۆرانی

شەهابەدین ئەحمەد، کوڕی یۆسف، کوڕی عەبدوڵڵای گۆرانی، پیاوێکی زانا و دیندار بووە کە ساڵی ٨١٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: هۆنراوەیەکە بە ناوی «*نظمُ منهاج الوصول الی علم الاصول، تالیف قاضی بیضاوی*».

*هدیةالعارفین*، ب١، ل١١٩.

## مەلا پەرێشانی دینەوەری

مەلا ئەبولقاسم ناسراو بە مەلا پەرێشان، خەڵکی دینەوەری لای کرماشان، پیاوێکی زانا هاتۆتە ئەژمار کە بێجگە زبانی کوردی، عەرەبی و فارسی و ترکیشی زانیوە. لە ساڵی زا و مەرگی خەبەرێکی وامان نییە؛ تەنیا

وەک لە مانای یەک ـ دوو بەیت[١] لە شیعرەکانیدا دەردەکەوێ، لە زەمانی شێخ ڕەجەبی بورسی، نووسەری «*مَشارق‌الانوار*[٢]»دا ژیاوە و لەگەڵ شێخی ناوبراودا، دۆستایەتییەکی پەنجا ساڵەیان بووە. جا کە دەزانین شێخ ڕەجەب ساڵی ٨١٠ ک. م. زیندوو بووە، دەبێ مەلا پەریشانیش لە چەرخی هەشتەمدا بووبێ و تا سەرەتاکانی چەرخی نۆیەم ژیابێ.

لە شیعری مەلا پەریشان شتێکی وا نەماوەتەوە؛ تەنیا پرژ و بڵاو، لە شیعرە ئایینییەکانی ـ کە «پەریشان‌نامە»ی ناوە و بە زمانی کوردییە ـ چەند وەندێک هەیە، کە هێندێک وشە و دەستەواژەی فارسی و عەرەبی و تەنانەت ترکیشی تێ خزاوە. ئەوا دوو نموونە لەو شیعرانە:

مــن ژ بــسم‌الله، مــن ژ بــسم‌الله ئبتــدا مەکــەم، مــن ژ بــسم‌الله
پــەریــشان نامــە زکــر مەکــەم لله نە ئەڕای هەرکـەس، بـل فَنـا فـی‌الله
لا رطــبٌ، لا یــابسٌ الّــا فــی کتــاب کتـاب دەرج هەمـە وَ فَـصل الخطـاب
زاهــر هــەر شــیء لــە کَـتْم عَـدَم الله اربــاب حــدوث ژ قــەدەم
ئاب و باد و خاک و ئاتـەش زاهـیرەن عونسور بێ‌ئەمکان مەعناش باهیرەن
زەمــانی ئــەیام جاهلیــەت بی نـەبی هـات ژ بەعـد نـازل بـی نُبـی

وەک لەم شیعرەیدا دەردەکەوێ، وا دیار مەلا شوێنگری ڕێبازی «حورووفییە»[٣] بووە.

---

١. شێخ ڕەجەب برسی وە ئەو گشت قورسی ئەو لە وەحدەت حەرفێ ژ من پرسی
پـەنجـا سـاڵ تـەریق خزمـەتم گوزاشـت جوز وە یەک ڕشـتە جەربەزە نیاشت

٢. ڕەحمەتی عەللامەی دیهخودا سەبارەت بە ڕەجەبی بورسی لە «*لغتنامە*»دا دەفەرموێ: «لەو کەسانەیە کە یەک نازناویان نەبووە؛ جارێک بە «ئەلبورسی»، جارێکی‌تر بە «حافیز البورسی» و برێ جاریش بە ناوی «شێخ ڕەجەب» ناو لە خۆی دەبا و نووسەری «*روضات‌الجنّات*» ئەوی لە ڕیزی زانایان و نووسەران داناوە و لە نووسراوەکانی «*مشارق‌الانوار*»، «*لُباب حقایق الایمان*» و «*مَشارق‌الامان*» ـ کە ساڵی ٨٠١ ک. م. دانراوە ـ ناوی لێ دەبا.

*لغتنامەی دهخُدا*، پیتی ر، ل ٢٩١.

٣. **حُروفیّە** ناوی کۆمەڵێکە شوێنکەوتووی فەزلوڵای ئەستەرئابادی کە لە چەرخی هەشتەمدا ژیاوە و بیر و بۆچوونی لە ژێر کارتێکردوویی مەزهەبی شیعەدا بووە. ئایینی فەزلوڵا لەسەر بنەمای ڕەسەنایەتی «پیت» دامەزراوە و بە شێوەیەکی سەرسووڕێنەر بە پیت کایەی کردووە و قورئانی بە کەیفی خۆی لێکداوەتەوە و دەرکەوتنی ئیمامی نادیاری لێ دەرهێناوە. فەزلوڵا ساڵی ٧٤٠ ک. م. لە دایک بووە و کە پێگەیشتووە، تاقیلەدووری کردووە و لە ساڵی ٧٨٨ بڕوای خۆی بە ئاشکرا ڕاگەیاندووە و لە ٧٩٦ دا ـ کاتێ خەریکی نووسینی کتێبی «*جاودان‌نامە*» بووە ـ بە فەرمانی ئەمیران شا، کوڕی سێهەمی تەیمووری گوورکانی، کوژراوە.

*جغرافیای تاریخی و تاریخ کُرستان*، ساکی، ل ٦٩. ⊃

*تذکره‌ی شُعرای کرمانشاه*، ل ١٢١و ١٢٢.

## موحەممەد شەمسەدینی موقەددەسی

موحەممەد شەمسەدین، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی عەبدوڵلا، ناسراو بە «مُقَدّسی»، کاتێ کە بابی بە ڕاسپێراوی لە قودس بووە، هاتۆتە دنیا و هەر لەو شارە خوێندنی دەسپێکردووە و دوای فێربوونی کتێبە سەرەتاییەکان، بۆتە فەقێ و بە بۆنەی زیرەکی یەکجار و تێکۆشانی زۆرەوە، لە ماوەیەکی کەمدا فیقهی ئیسلامی و شیعر و وێژەی عەرەبی، بەتەواوی وەرگرتووە. پاشان هاونشینی پیاوچاکانی هەڵبژاردووە و بۆ پاکردنەوەی دڵ و دەروونی، ئەوپەڕی تەقەلای داوە تا گەیشتۆتە ڕادەیەک کە بۆی بەئاوات بووە.

ئەم دوو بەیتە عەرەبییە هی ئەوە:

لَمْ یَزَلَ الطّامعُ فی ذلَّة　　قَدْ شُبِّهَتْ عنْدی بذُلّ الکلاب

وَلَیْسَ یَمْتازُ عَلَیْهِمْ سوی　　بوجْهه الکالح ثُمَّ الثّیاب

زا و مەرگی موحەممەدی موقەددەسی ساڵی ٧٤٧ لە قودس و ٨١١ ک. م. لە مەککە ڕوویداوە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل١٣٨.

## شێخ زەکەریا کەمالەدینی کاکۆزەکەریایی

شێخ زەکەریا کەمالەدین، کوڕی شێخ عەبدوڕڕەحمانی «اَهدل»[١]، سەرباشقەی مەشایخی کاکۆزەکەریا و لە ناودارانی سۆفیانی کوردستانە کە لە ساڵی ٧٢٦ ک. م. هاتۆتە دنیا. یازدەساڵان بووە بابی شەهید کراوە و هەر

---

➲ لە کتێبی «*سَرسُپردگان*»، نووسراوی سەید موحەممەد عەلی خواجەدین، چاپی ١٣٤٩ ک. ه. ل ١٥٨و ١٥٩دا، ناوی بنیاتنەری ئایینی حوروفییە، شا فەزلوڵای نەعیمی تەورێزی، لە دایک بووی ساڵی ٧٣٠ ک. م. نووسەری «*جاودان‌نامه*» هاتووە.

١. سەید عەبدوسەمەدی مورادی تووداری، لە کتێبی «*نورالانوار*»دا، زنجیرەباوانی شێخانی کاکۆزەکەریای ئاوا هێناوە: «زەکەریا کەمالەین، کوڕی شێخ عەبدوڕڕەحمان «اَهدل»، کوڕی شێخ حەسەن زاهید، کوڕی شێخ سلێمانی «مُنزَوی»، کوڕی شێخ خالید، کوڕی شێخ حەسەنی لوبەید، کوڕی شێخ تەقیەدین ئەبولحەسەنی شازلی، کە دەچێتەوە سەر ئیمام حەسەنی موجتەبا (د).»

شێخ خالید یەکەم کەسی ئەو بنەماڵە بووە کە هاتۆتە کوردستان و لە مەریوان نیشەجێ بووە و یەک لە مریدانی گوندی «هەزارکۆرە»ی وەقفی کردووە و ناوی ئەو دێیەش بۆتە «خالیدییە» کە پاشان بووە بە «کاکۆزەکەریا». شێخ خالید پیاوێکی مبارەک و نزا وەرگیراو بووە. شێخ سلێمانی کوڕیشی هەروەها؛ لەبەر گۆشەنشینی، ناوی «مُنزَوی»یان لێ ناوە. شێخ عەبدوڕڕحمانی «اَهدل»یش پیاوێکی گەورە بووە کە خوانەناسێک شەهیدی کردووە.

لەو تەمەنەوە بۆ خوێندن ڕووی لە وڵاتی غەریب ناوە و سەرەنجام گەیشتۆتە میسر و لـەوێ خوێنـدنی تـەواو کردووە. لە گەڕانەوەدا، بۆ حیجاز چووە و حەجی بەجێ‌هێناوە. پاشان بە گەڕان، گەیشتۆتە بوخارا و تەریقـەی تەیفوورییە ـکە هەر نەقشبەندییەی لای ڕۆژاوایەـ وەرگرتووە و بە شوێن ئەوەدا چۆتە بەغدا و تەریقەتی قادری ناسیوە و ماوەیەکیش خەریکی سەیر و سلووک بووە و سەرنجام هەر لەوێ ژنی خواستووە. ئـەمجار بـەنیازی زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان، کەوتۆتە گەڕان بە ئێراندا تا گەیوەتە کرمان. لەوشارە چـاوی بـە شـا نیعمـەتوڵای وەلی کەوتووە و ئەو هەلەی بە دەسکەوتێکی گەورە زانیوە و ماوەیەکی لێ ماوەتەوە. لەو نێوانەدا ژنەکەی ـکە لەگەڵی بووەـ کوڕێکی دەبێ و شا نیعمەتوڵا، بە ناوی خۆیەوە ناوێ دەنێ نیعمەتوڵا و نزای بەچاکەی بۆ دەکا. ئەو کوڕە کە گەورە دەبێ، خەڵکەکە بە خۆشی ئەو هاوناوییەوە، شێخ نیعمەتوڵای وەلییان پێ گوتووە.

شێخ زەکەریا کوڕی زۆر بوون: ١. بابا عەلی، کە لە گوندی کاکۆزەکەریادا نێـژراوە ٢. شـێخ نیعمـەتوڵای وەلی ٣. شێخ حەسەنی سوورکەوڵ ٤. پیریۆنس ٥. شێخ عەلی ناسـراو بـە بابـەشـێخی بێـساران، کـە لـە بێسارانی سەر بە ژاوەرۆدا نێژراوە و چەند کوڕی‌تر کە هەموو شێخیەتییان کردووە.

*نورالانوار* و چەند جونگی دەسنووس.

## عەلائەدین عەلی جزیری

عەلائەدین عەلی، ناسناو ئەبولحەسەن، کوڕی ئیبراهیم، لە مامۆستایان و زانایانی ناوداری جزیر و بۆتانـە کـە ساڵی ٨١٣ ک. م. لە دایک بووە و ٧٤٨ لە دنیا دەرچووە.

*هدیةالعارفین*.

## ئەبولفەتح موحەممەدی جزیری

ئەبولفەتح موحەممەد، کوڕی موحەممەد شەمسەدین، دووهەم کەس لە پیاوە زاناکانی بنەماڵەی جزیرییە[1] کە لە ١٢ی ڕەبیعولئەوەڵی ساڵی ٧٧٧ ک. م. لە دمشق هانۆتە دنیا و هەشـتسـاڵان قورئـانی لەبـەرکردووە و کەوتۆتە فێربوونی قەرائات و چەند دەقی تایبەتی لەم بارەوە. دوای ئەوە چۆتە میسر و لـە موقریـانی ئـەوێش بەهرەی گرتووە. پاشان خوێندنی فیقهـ و باقی زانـستە ئیـسلامییەکانی دەسـپێکردووە. بـە شـوێن ئـەوەدا گەڕاوەتەوە شام و لە دمشق بۆتە مامۆستای قوتابخانەکەی بابی؛ کە پێش چوونی بۆ ئەستەمبووڵ گەڕاندوویە. بەڵام هێندەی پێ نەچووە، تاعوون داکەوتووە؛ تووشیاری بووە و بەو نەخۆشییەوە، ساڵی ٨١٤ ک. م. لـە دنیـا چووە. لەم کاتەدا بابی لە شیراز بووە.

---

١. یەکەم «عەللامە ئیبنولجەزەری»، بابی ئەبولفەتحە کە چەند لاپەڕە دواتردا باسی دەکەین.



*الشّقایق النّعمانیّة*، ب١، ل٤٢. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*.

## زەینەدین عەبدورڕەحمانی خەتیب

زەینەدین عەبدورڕەحمان، کوڕی یۆسف[1]، کوڕی حوسەین، ناسراو بە خەتیب، لە مامۆستایانی تەفسیر و حەدیس و ناسینی ناوداران و هەروەها لە مۆچیاریدەران و وتاربێژانی بەناوبانگە کە ساڵی ٨١٩ ک. م. لە حەلەب لە تەمەنی حەفتا ساڵاندا کۆچی دوایی کردووە.

زەینەدین یەکجار پارێزکار بووە و خوێندنی ڕۆژانەی قورئانی ـلە سەفەر و هێبەرداـ نەفەوتاندووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل٧.

## نیزامەدین عەبدولمەلیکی دەربەندی

نیزامەدین عەبدولمەلیکی دەربەندی شافیعی، ساڵی ٧٤٩ ک. م. هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە بۆ خوێندن و فێربوون چۆتە غوربەت و ماوەیەک لە شارانی عیراق و شام و چەلێک لە مەدینەی مبارەک، خزمەتی مامۆستایانی زانا گەیشتووە و بەشی خۆی لێیان بەهرە بردووە؛ تا بۆتە مەلایەکی تەواو. ئەوجار لە مەککەی پیرۆز لانشین بووە و هەر لەوێ ساڵی ٨٢٤ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

نیزامەدین، زیاد لە باری زانستی، لە بواری عیرفانیشدا زۆر سەرکەوتوو بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، اَمین زکی بیگ، ب٢، ل٥٢ و ٥٣.

## ئەحمەد ئەبووزەرعە

وەلیەدین ئەبووزەرعە ئەحمەد، کوڕی عەبدورڕەحیم حافیزی عیراقی[2]، مەشهور بە «ابنُ العراقی»، لە پێشەنگانی فیقهـ و گەورەزانایانی ڕۆژگاری خۆی بووە کە خوێندنی لە قاهیرە و دمشقدا تەواو کردووە و لە قاهیرە ماوەیەک دەرسیداوە و ساڵی٨٢٤ ک. م. پاش جەلالی بەلقینی بووە بە قازی؛ بەڵام ساڵێک زیاتر دەوامی نەهێناوە و دەستی لێ بەرداوە و بە ئەرخەیانییەکی زیاترەوە، شوێنی خوێندنەوە و نووسینەکەی گرتۆتەوە.

**لە کتێبەکانی**: «*الدّلیلُ القویم علی صحة التّقدیم*»، «*تحفة التحصیل فی ذکر رُوات المراسیل*»، شەرحێک لە «*تقریبُ الاساتید*» نووسراوی باوکی، شەرحێک لە کتێبی «*النّکت فی علم الجدل*» نووسراوەی شێخ ئەبوو ئیسحاقی شیرازی، «*الاجْوبة المَرضیة عن الاسئلة المکّیّة فی الفَتاوی*»، «*الاربعین فی الجهاد*»، «شرح

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١٢٣.

٢. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١٢٤.

*البهجةالوردیّة»*، «*التّحریر لما فی منهاج الاصول*»، شەرحی کتێبی «*حاوی صغیر*» و پەراوێز بۆ «*کَشّاف*» و ژیننامەیەک لە چەند بەرگدا، لە ساڵی لەدایکبوونیەوە تا ساڵی ٧٩٣ ک. م.

زا و مەرگی ئەم زاناگەورەیە، ساڵانی ٧٦٢ و ٦٢٦ ک. م. لە قاهیرەدا ڕووی‌داوە.

*الأعلام*، ب١، ل١٤٤. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٤٦٤. *هدیةالعارفین*، ب١، ل١٢٣.

## شێخ نیعمەتوڵای کاکۆزەکەریایی (یەکەم)

شێخ نیعمەتوڵا، کوڕی شێخ کەمالەدین زەکەریا[1]، لە مەشایخی کاکۆزەکەریایی و ناسراو بە «وەلی»[2]، پیاوێکی عارف، زانا، پارێزکار، دەروێش‌مەرام و لای خەڵک زۆر بەڕێز و حورمەت بووە. زبان و وێژەی عەرەبی و فارسی چاک زانیوە و شیعری جوان گوتووە و نازناوی «سەید»ی هەڵبژاردووە. هۆنراوەی بەناوبانگی «*کفایةالاسلام*» ناسراو بە «*فرض و سُنَّت*»، بەرهەمی قەڵەمی ئەوە کە بە فارسییەکی ڕەوان، باس لە ئیمان و ئیسلام و شەرع و فەرع، بەرامبەر بە مەزهەبی ئیمام شافیعی (د) دەکا. ئاوا چەند بەیتی سەرەتای:

حَمد بی‌حدّ خدای یکتا را — آن که جان داد و عقل و دین ما را
ذات پاکش ز عیب و عار بری است — خالق آدمیّ و جنّ و پری است
هر چه ظاهر شد از ارادت او — نیست مقصود جز عبادت او
حق‌پرستی تو را سَر دین است — به یقین راه مُستقیم این است
پیرو پاک دین احمد شو — تابع ملّت محمد (ص) شو
احمد مُرْسَل است فخر بشر — گرد نَعلین اوست، کُحل بصَر
آدم از قُرْب احمد است کبیر — عالم از نور احمد است مُنیر
صد هزاران درود بی‌پایان — باد بر مصطفی و بر یاران
این کتاب کفایةُالاسلام — هر کسی یاد کرد، یافت نظام

ئەمەش چەند بەیتی کۆتایی ئەو هۆنراوە:

شد تمام این کفایةُالاسلام — باد بر مصطفی درود و سلام
نظم این مختصر مُحَرَّم بود — سال هشتصد، یکی از آن کم بود
طالبان را مَلُول می‌دیدم — زان به خیرُ الکلام، کوشیدم
اندر این مختصر زیاده بر این — نتوان کرد طفل را تلقین

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١٢٦.

٢. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١٢٦.

مُبتــدی را از ایــن گریــزی نیــست | و اندر این دوره حق‌پـذیری نیست
خلــق در قیــد جهــل محبوســند | همـــه در بنـــد نـــام و ناموســـند
بیـــشتر در فـــساد مـــی‌کوشـــند | حـق بـه تلبـیس و مکـر مـی‌پوشـند
آن‌کـسان اهــل حرمــت و اَدبنــد | کــه کمــال صَــلاح مــی‌طلبنــد
بـــاز یابنـــد از طریـــق نَجـــاح | انــدر ایــن مختــصر کمــال فــلاح
همـــه را یـــا مُفــتّحَ الابـــواب | بنمـا راه خیـر و صـدق و صـواب
یارب از فضل خـویش رحمـت کـن | جـای «سـیّد»، مقـام جَنَّـت کـن
«نعْمَـــــــــةُالله» را ببخــــــشایی | کـــه ســـمیع و بـــصیر و دانـــایی
«نعْمَـــــةُالله» راســـت در دو ســـرا | حَـلّ هـر مُـشکلی بـه فـضل خـدا
وآنکــه خوانــد، دعــا طمــع دارم | ز آنکـــه مـــن بنـــده‌ی گُنهکـــارم

سەید عەبدوسەمەدی تووداری لە «*نورالانوار*»دا ئەو هۆنراوە بـە هـی شـێخ عەبـدوڕڕەحمان ڕوکنـەدینی کاکۆزەکەریایی دەزانێ؛ کە لەبەر دوو نیشانە، نابێ وابێ: ١. بەیتی ٢ و ٣ لە ئاخرەوە، «نعمـتالله» دەڵێ، نەک «عبدالرّحمن». ٢. هەر لە بەیتی دووەمی کۆتاییدا، بۆ ساڵی هۆنینەوەی ئێژێ: ساڵی ٨٠٠ یەکی کـەم، واتـا: ٧٩٩. وەک لە باسی سەید عەبدوڕڕەحماندا دەبینین، ئەو ساڵی ٨٩٨ ک. م. لە دنیا چووە. یانی ئەگەر ئـەو شیعرانە هی ئەو بن، دەبێ بەشوێنیدا ٩٩ ساڵ ژیابێ کە ئەوەش ناگونجێ. بڕێکیش هەر «نعمَتالله»کـەیان دیوە، داویانەتە پاڵ شانیعمەتوڵای ماهانی کرمانیوە (٧٣١-٨٣٤) و «شێخ» و «شا»یان لێ تێکچووە!

*نورالانوار* و باوان‌نامەی دەسنووسی بنەماڵەکانی کوردستان.

## مەحیەدینی خەلاتی

مەحیەدین موحەممەد، کوڕی موحەممەدی خەلاتی، لە زانایانی پایەبەرزی خەلات بـووە کـە ساڵــی ٨٣١ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل١٨٧.

## ئیبنولجەزەری

عەللامە شەمسەدین موحـەممـەد ئەبولخـەیر، ناسـراو بـە «ابـنُ‌الجَـزَری»، کـوڕی موحـەممـەد، کـوڕی موحەممەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی یۆسـف، لـە زانایـانی گـەورەی کـورد لـە چـەرخی نۆیەمدایە کە ساڵی ٧٥١ ک. م. هاتە دنیا و لە دمشق خوێنـدنی دەسـپێکرد و پاشـان چـووە قـاهیرە و خزمەتی مامۆستایانی هەڵکەوتەی ئەوێش وەکـوو: «دمیـاطی» و «ابـن الـدمامینی» و «اسـنوی» گەیـشت و

بەتەواوی پێگەیشت. ئەوجار ساڵی ٧٩٨ ڕۆیە ئاستانە (پاتەختی عوسمانی) و سوڵتان یولدرم زۆری حاواندەوە و ماوەیەک لەوێ تەجوید و قەرائات و حەدیسی دەرس گوتەوە تا لە ساڵی ٨٠٥دا ئەمیر تەیمووری گوورکانی هێرشی کردە سەر وڵاتی عوسمانی و ناوبانگی شەمسەدین موحەممەدی گەیشتە گوێ و چاوی پێ کەوت و زانی کە چەند پلەی زانستی لەسەرە و بیەوێ و نەیەوێ، لەگەڵ خۆی بردی بۆ سەمەرقەند و لەوێ هەموو جۆرە پێداویستییەکی ژیان و دەرس‌دانی بۆ پێک‌هێنا.

ساڵی ٨٠٧ ک. م. کە تەیموور مرد، ئیبنولجەزەری لە سەمەرقەندەوە بازیدا خوراسان و چووە هەرات و پاش ماوەیەک گەیشتە ئەسفەهان و جا شیراز و لە هەرکام لەو شارانەدا، تاقمێکی زۆر لە قوتابییان و زانستخوازان لێی بەهرەمەند بوون. حاکمی شیراز چەند جاران داوای لێ کرد دادوەری ئەو شارە بگرێتە ئەستۆ؛ بەڵام نەیکرد و چوو بۆ بەسرە و لەوێوە ساڵی ٨٢٣ گەیشتە مەدینە و ماوەیەک مایەوە. ساڵی ٨٢٧ ڕۆیەوە بۆ دمشق و لەوێوە گەیشتە قاهیرە و سوڵتانی میسر زۆری ڕێز لێ‌نا. پاش ماوەیەک دیسان سەفەرێکی حیجازی کرد و گەڕاوە قاهیرە؛ بەڵام ئەمجار زۆری پێ نەچوو، ڕووی کردە ئێران و لە شیراز گیرسایەوە تا لە ڕۆژی پێنجەمی ڕەبیعولئەوەڵی ساڵی ٨٣٣ ک. م. دوامین کۆچی خۆی کرد و ئەو دنیایەی بە یەکجاری بەجێ‌هێشت.

عەللامەی جەزەری کتێب و نووسراوەی زۆری هەبووە؛ هێندێک لە کتێبەکانی بریتین لە: «*النشر فی القرآت العشر*» لە دوو بەرگدا، «*التّمهید فی علم التّجوید*»، «*المُقَدّمة فیما عَلی قارِئهُ اَن یَعْلَمَهُ*»، «*البدایة من علوم الرّوایة و الهدایة*» لە حەدیسدا، «*طَبَقات القُراء*» لە دوو بەرگدا، «*غایاتُ النّهایات فی اَسماء رجال القرآت*»، «*التعریف بالمولد الشّریف*»، «*عقد اللّآلی من الاحادیث المُسَلسَله الغوالی*»، «*الجوهرة فی النحو*»، «*ذات الشّافی فی سیرة النّبی و الخُلَفاء*» هۆنراوەیەکە بە زبانی عەرەبی بریتی لە پانسەد بەیت لە بەحری ڕەجەزدا کە ساڵی ٧٩٨ هۆنیویەتەوە و ئیبنولحاجی کوردی لە ساڵی ١١٨٧ ک. م. شەرحێکی بە ناوی «*رفع الخفا*»ی بۆ نووسیوە.

مامۆستا هەروەها بە فارسی و عەرەبیش شیعری گوتووە؛ کە بەداخەوە شیعرە فارسییەکانی هیچی لێ نەماوەتەوە. ئەم دوو بەیتە لە قەسیدەیەکی عەرەبییە بۆ پەسنی پێغەمبەر ئیسلام (د) دایناوە:

لطَیْبَةَ بِتُّ طُولَ اللَّیلِ أسْری ... لَعَلَّ بها یَکُونُ فَکاکُ أسْری
الهی سَوَّدَ الوَجْهَ الخَطایا ... وَ بَیَّضَت السُّنُون سَوادَ شَعْری

خدربەگی کوڕی جەلال، لە مامۆستایانی هاودەورەی، ئەم دوو بەیتەی بۆ نووسیوە:

لَوْ کانَ فی بابِه للنَظْم مَفخَرةٌ ... أَلَّفْتُ فی مَدْحِه ألفاً مِنَ الکُتُب
لکنَّهُ البَحرُ فی کُلّ الفُنُون فَما ... اهْداء دُرّ الی بحرٍ مِنَ الادَب؟

ئیبنولجەزەریش وای وەڵام داوەتەوە:

فی دُرِّ نَظْمِکَ بَحرُ الفَضْل ذُوَلجَب ... وَ دُرُّ نَظْمِکَ عقدٌ فی حُلی‌الادب

اَلـــدُرُّ فـــی البحـــر مَعْهُـــودٌ تَکَوُّنُـــهُ      وَ البَحـرُ فـی الـدُّرِّ یُبْـدی غـایَــةَ العَجَـب

ئیبنولجەزەری پێنج کوڕ و سێ کچی هەبووە؛ هەموویان خـاوەن زانسـت و پارێزکـار و ناسـراوی کـۆڕی مامۆستایان: ١. ئەبولفەتح موحەممـەدی جـەزەری (٧٧٧-٨١٤) ٢. ئەبولخـەیر موحـەممـەد (٧٨٩-؟) ٣. ئەحمەدی موحەممەد (٧٨٠-؟) ٤. ئەبولفەزلی ئیـسحاق ٥. ابوافـدا ئیـسماعیل ٦. فاتمـەی جـەزەری ٧. عایشەی جەزەری ٨. سەلما جەزەری؛ کە لەمەڕ هەرسێ کچەکەیەوە بەجیا باس دەکەین.

*الأعلام*، ب٧، ل٢٨٤. *الشَقایق النّعمانیّة فی عُلَماء الدوله العُثمانیّه*.

پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ل٣٩. *کشفُ الظُّنون*، ب٢، ل٦٦٩.

## یەعقووبی قەرامانی

یەعقووب، کوڕی ئیدریس، لە قەرامانی باکووری کوردستان هاتۆتە دنیا و کە بـایبالّـیداوە، بـۆ خوێنـدن و فێربوون، زۆربەی شارانی عیراق و شام گەڕاوە و دوای ئەوەی خوێندنی دوایی پـێهێنـاوە، ڕووی لـە زێـد و نیشتمانەکەی خۆی ناوە.

یەعقووب زانایەکی هەڵکەوتە بووە و لەگـەڵ دەرس‌گوتنـەوەدا، خوێندنـەوە و نووسـینی نەفەوتانـدووە و ساڵی ٨٣٣ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*اِشراق الانوار*».

*تاریخ آداب اللغة العربیّة*، جُرجی زیدان، ب٣، ل٢١٨.

## خاتوو سەلمای جەزەری

کچی ئیبنولجەزەری شەمسەدین موحەممەد و لە بێژەرانی حدیسە و بۆ بیرتێژی و زیرەکی هاوتای نـەبووە و لە سێیەکی هەوەڵی چەرخی نۆیەمدا کۆچی دوایی کردووە.

*الشَقایق النّعمانیّة فی عُلَماء الدوله العُثمانیّه*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ل٤٢.

## شەمسەدینی حەلەبی

موحەممەد، کوڕی «ناهض»،[1] کوڕی موحەممەد، کوڕی حوسەین، ناسراو بە شەمسەدین، لە زانایانی وێـژە و

١. ژین‌نامەنووسان باسی موحەممەد، کوڕی «ناهض»ێکی تریان کردووە کە نازناوی «بـەدرەدین» بـووە. زرکلـی لـە «*الأعلام*»دا، بە گێڕانەوە لە کتێبی «*الدّورُ الکامله*»وە دەڵێ: «محمد بن ناهض، بن سالم، بن نصرالله، بدرالدّین، ابـنُ الـضّریر مات بحلب، سنه ٧٣١». ئاخۆ شەمسەدین لە پشتی بەدرەدین بێ؟ نازانە، هیچ پێوەندێکیان نییە.

مێژووە کە شیعری چاکی گوتووە و کتێب و نووسراوەشی هەبووە. ئەم دوو بەیتە هی ئەوە:

کَـمْ دَوْلَـةٍ بفُنُـونِ الظُّلْـمِ قَـدْ فَنِيَـتْ    وَراحَ آثـارُهُمْ مِـنْ بَعْـدهِم وَ مُحُـوا

وَ قـالُ سُـبْحانَهُ: «حتّـی اذا فَرِحُـوا»[1]    وَ جـاءَ مِـنْ بَعـدهِمْ مَـنْ يَفْرَحُـونَ بِهـا

**لە کتێبەکانی**: «*سيرة المويّد*»، «*بُستانُ الناظرِ وَ أُنسُ الخاطرِ*».

شەمسەدین لە قاهیرەدا ژیاوە و زا و مەرگی ساڵی ٧٥٧ لە حەلەب و ٨٤١ ک. م. لە قاهیرە بووە.

## ئیبنولکوردی

ئەبووعەبدوڵڵای شەمس، کوڕی موحەممەد، کوڕی حەسەن، کوڕی ئەحمەد، ناسراو بە «ابنُ‌الكُردی»، ساڵی ٧٨١ ک. م. لە شارەزوور هاتۆتە دنیا و بە ماڵەوە چوونەتە فەلەستین و لەوێ خوێندنی دەسپێکردووە. پاش مردنی بابی، لەگەڵ دایکیدا ڕۆیون بۆ حیجاز و لە مەککە دانیشتوون و لەوێ شانی لە خوێندنی کتێبانی بژیشکی و گیاناسی شل کردووە و پاش ماوەیەک تێیدا شارەزاییەکی باشی دەسکەوتووە؛ بەتایبەت لە برینکاری و شکستەبەندیدا گەیشتۆتە ئەوپەڕی لێهاتوویی و وا ناوی‌دەرکردووە، لە هەموو لایەکەوە نەخۆش و بریندار و دەردەدار خۆیان پێ گەیاندووە و ئەو دەرمانی کردوون.

ئیبنولکوردی مانگی شابانی ساڵی ٨٤٣ ک. م. دەستی لە دنیا بەرداوە و لە زیارەتانێکی مەککە بە ناوی «مُصلّی»دا نێژراوە.

*مَشاهيرالكُرد*، ب٢، ل١٥٢.

## شێخ زەکەریا خالیدی

شێخ زەکەریا، ناسراو بە «مُهاجر»، لە عارفان و زانایانی ناوەندی چەرخی نۆیەم و مریدانی شێخ نیعمەتوڵای وەلی کاکۆزەکەریایی(؟- ٨٢٧ ک. م.) دێتە ئەژمار و بەو بۆنەوە موهاجیریان پێ گوتووە کە زێدی خۆی بەجێ‌هێشتووە و چۆتە گوندی «بست» لە ناوچەی «ساراڵ» و ژیانی بە ئامۆژیاری و ڕێنوێنی خەڵکەوە داوەتەسەر و هەر لەوێ کۆچی یەکجاری کردووە.

شێخانی «خوڕخوڕە» و «بست»، لە پشتی شێخ زەکەریان.

*نورالانوار. تاريخ مردوخ.*

---

١. ئاماژە بە ئایەتی ٤٤ لە سوورەتی ئەنعامە کە دەفەرموێ: «فَلَمّانَسوا ماذُكّروا بِهِ فَتَحنا عَلَيهم اَبوابَ كُلِّ شَيئٍ حَتّی اِذا فَرِحوا بِما اُتوا اخَذناهُم بَغْتَةً فَاِذا هُم مُبْلِسوُنَ».

## ئەبووبەکر ئەحمەدی جەزەری

ئەبووبەکر ئەحمەد، کوڕی موحەممەد شەمسەدین، سێهەمین کەس لە بنەماڵەی بەناوبانگی جەزەرییە کە ساڵی ٧٨٠ ک. م. لە دمشق لە دایکبووە و هەر لەوێ خوێندنی تەواو کردووە و پاشان بۆتە دادوەری شاری «بورسا» و پاش بیست ساڵان بەجێیهێشتووە و چووە بۆ میسر و تاکۆتایی ژیان (٨٤٩ ک. م.) لەو وڵاتە دەرسی گوتۆتەوە.
**لە نووسراوەکانی**: یەکیان شەرحێکە لە دەسپێکەکەی بابی (ئیبنولجەزەری)، لە تەجویددا.
*الشَقایق النّعمانیّة*، ب٢، ل٤٣. *هدیةالعارفین*، ب١، ل١٢٣.

## ئەبولخەیر موحەممەدی جەزەری

ئەبولخەیر موحەممەد، کوڕی موحەممەد شمس‌الدّین (ابنُ‌الجَزَری) و برای ئەبووبەکر ئەحمەد، چوارەم ناوداری بنەماڵەی جەزەرییە کە ساڵی ٧٨٩ ک. م. هاتۆتە دنیا و لە شام خوێندوویە تا لەگەڵ باوکی چۆتە میسر و لەوێش لە مامۆستایانی قەرائات بەهرەی بردووە و دوای گەڕانەوەیان بۆ دمشق، لای بابی «*صحیح بُخاری*» و چەند کتێبی لە فیقهی خوێندووە.

ساڵی ٨٠١ کە باوکی چووە بۆ ئاستانە (پاتەختی عوسمانی)، دوای ماوەیەک ئەمیش چووە و لەوێش درێژەی بە خوێندن داوە و کە باوکی دەڕواتە سەمەرقەند (ساڵی ٨٠٧)، پێی دەگا و ئەمجار پێکەوە دەبن تا دەگەنە شیراز (دەوری ساڵی ٨٠٩ ک. م.).

ئەبولخەیر لە دەورانی پاشایی سوڵتان موحەممەد، کوڕی مراد خاندا دیسان گەڕاوەتەوە ئاستانە و تا دواکاتی ژیانی (ناوەڕاستی چەرخی نۆیەم)، بەڕێوەبردنی نووسینگە و ئینشابەندی دیوانی لە ئەستۆ بووە.
*الشَقایق النّعمانیّة*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل٤٣.

## ئایشەی جەزەری

خاتوو ئایشەی جەزەری، کچی شەمسەدین موحەممەدی ئیبنولجەزەری، خانمێکی زانا لە بنەماڵەی جەزەرییە کە لە حەدیس و فیقهدا زانستێکی ئەوتۆی هەبووە و لە پشتی پەردەوە قوتابیانی دەرس‌داوە و تا ناوەڕاستی چەرخی نۆیەمی کۆچی ژیاوە.

*خیرات‌حِسان*، ب٢، ل١٦٨.

## فاتمەی جەزەری

خوشکی خاتوو ئایشێیە کە تەوای قورئانی لەبەر بووە و لە حەدیس‌زانان هاتۆتە ئەژمار و ئەمیش فەقێ و قوتابی ـلە کچ و کوڕـ دەرس‌پێ‌گوتووە و لە نیوەی دووهەمی چەرخی نۆدا دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*خیراتُ حِسان*، ب۳، ل۱۸.

## یۆسفی کوردی

یۆسف، کوڕی یەعقووب، کوڕی شەرەفی کوردی لە زانایانی کـوردە کـە چۆتـە حەلـەب و لـەوێ دەرس و فتوای داوە و جیا لە باری زانستی، پیاوێکی پاک وپارێزکار بووە.

زا و مەرگی ئەو مامۆستایە سالانی ۸۰۰ و ۸۵۱ ک. م. ڕوویداوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب۱، ل۲۲۷.

## شێخ بورهانی کوردی

شێخ بورهانەدین ئیبراهیم، کوڕی مووسا، لە زانایانی ناوداری چەرخی نۆیە کە سالی ۸۵۳ لە دنیا دەرچووە و کتێبی «*دُرَّە القاری المُجید فی أحکام القرائة و التجوید*» قەلەمی ئەوە.

*کشفُ الظُّنون*، ب۱، ل٤۵۸ و ۷٤۹.

## ناسرەدین ئەبولفەزلی هەزبانی

ناسرەدین ئەبولفەزل موحەممەد، کوڕی مووسا، کوڕی عوسمانی مووسـلی، لـە خێـلی کـوردی هـەزبانی، پیاوێکی زانا بووە و کتێبێکی لێ بەجێ ماوە، بە ناوی: «*فُتوحُ الوهّاب و دلائل الطّـلاب الـِی مَنـازلِ الاحباب*». سالی ۸۵۸ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

*هدیةالعارفین*، ب۲، ل۲۰۰.

## فازیلی کاکۆزەکەریایی

شێخ موحەممەد سادق، ناسراو بە «فاضل»، کوڕی شێخ نیعمەتولای وەلی کاکۆزەکەریایی، کەسـێکی زانـا و تێگەیشتوو بووە کە لە زۆربەی زانستەکاندا سەری دەرچووە. کتێبی «*قامووس الانساب*»، کە لەمـەڕ بـاوک و باوانی بنەمالە سەیدەکانی کوردەوارییەوە، بەرهەمی ئەوە. کوڕێکیشی بە ناوی شـێخ عەبدولـلا، ناسـراو بـە «صامت» هەیە کە زۆر عارف و پارسا بووە.

*نورالانوار. تاریخ مردوخ*.

## شەمسەدینی حەسکەفی

شەمسەدین «ابواللُّطـف» موحـەمـەد، کـوڕی عـەلی، کـوڕی مەنـسووری حەسـکەفی، لـە مامۆسـتایانی

هەڵکەوتەی شافیعییە کە لە «حسن کیفا» هاتۆتە دنیا و لە دیاربەکر خوێندنی دەسپێکردووە و پاشان لە شام و حیجاز و میسر درێژەی پێداوە و تێکۆشیوە لە هەموو بارێکەوە زانیارییەکی هەبێ و تەنانەت شیعریشی گوتووە و ماوەیەکیش لەگەڵ مووسیقا خەریک بووە و بەم بۆنەوە بەشێکی باشی لە زانست و ئاگایی کۆ کردۆتەوە و سەرەنجام ساڵی ٨٥٩ ک. م. ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە.

**لە کتێبەکانی**: «*شَجَره*» لە سەرف و نەحودا، «*تحقیق الکلام*»، «*موقف المأموم والامام*»، *رَفع الحجاب فی ذَبائحِ اهلِ الکتاب*».

*الأعلام*، ب٧، ل١٨٠.

## عەبدولوەهابی نیوانی

عەبدولوەهاب، کوڕی یۆسفی نیوانی کوردی، لە زانایان و مامۆستایانی شافیعی بووە کە دەوری ساڵی ٨٦٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە و کتێبێکی لێ بەجێماوە؛ بە ناوی: «*رفعُ الشَّکِ و المَین فی تجرید الفنّین*».

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٦٣٩.

## عەبدوڵڵا ئیبنوبەیرەم

عبدوڵڵا، کوڕی موحەممەد، کوڕی خەلیل، کوڕی «بکتوت»، ناسراو بە «ابن بَیْرَم» (کوڕی بەهرام) و بابی شەمسی کوردی[1]، لە مامۆستایانی فیقهە و بەتایبەت لە فەرائیز و کەلەپووردا زانیارییەکی قووڵی هەبووە و بۆ زیاتر زانین و بەهرە گەیاندن، بە زۆرێک وڵاتی ئیسلامیدا گەڕاوە.

زا و مەرگی عەبدوڵڵا ساڵانی ٧٨٧ و ٨٦٦ ک. م. نووسراوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٥٠.

## شێخ عومەری بەبانی بانیاسی

شێخ عومەر، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی ئەبیبەکری بەبانی (بابانی) بانیاسی، پارسایەکی پایەبەرز بووە کە لە شارەزوورەوە بۆ خوێندن چۆتە وڵاتە عەرەبەکان و پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، بۆتە سۆفی و لە قاهیرە گیرساوەتەوە.

وەک شێخی شەعرانی لە کتێبی «*طَبَقات*»دا دەڵێ، شێخ عومەر بۆ هەموو نوێژێکی فەرزی، غوسڵێکی کردووە و گوێی نەداوە هاوینە یان زستان و لەم کارەدا یەکجار شێلگیر بووە. هەرچۆنێک بێ ئەم عارفە

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١٤٥.

گەورە لە پارێزگاری و نەوس‌کوشتندا ناوی‌دەرکردووە و جێ ڕێز و متمانەی خەڵک بووە؛ میران و دەوڵەمەندان زۆریان حەول‌داوە شتێک لێیان قبووڵ بکا، بەڵام ئەو لە ڕەنجی شانی خۆی نەبووبێ، قەرەی هیچ شتێک نەکەوتووە و ئەویشی لێ مابێتەوە، بە هەژار و فەقیری بەخشیوە و سەرەنجام لە ساڵی ٨٦٨ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*طَبَقات کُبری*، چاپی میسر، ب٣، ل٨٤.

## مەلا ئەحمەدی باتی

شاعیر و وێژەوانێکی دیندار و زانا بووە کە دەوری ساڵانی ٨٢٠ تا ٩٠٠ ک. م.[1] ژیاوە و لە زێدی خۆیدا (باتەی سەر بە هەکاری) نێژراوە.

مەلا ئەحمەد دیوانێکی بە کوردی و عەرەبی هەبووە کە لەناو چووە؛ بەڵام هۆنراوەیەکی بە کوردی کرمانجی، لەمەڕ هاتنە دنیای پێغەمبەری ئیسلام (د) داناوە کە وەک دەڵێن ساڵی ١٣٢٤ ک. م. لە قاهیرە چاپ‌کراوە.

*خلاصة الکُرد و الکُردستان*، وەرگێڕانی محمد علی عَونی، چاپی قاهیرە، ١٩٣٦ز، ل٣٥٥.

## شێخ ئەبووتاهیری بدلیسی

لە مەشایخی گەورەی چەرخی نۆیەم بووە کە مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی لە کتێبی «*نَفَحاتُ الأُنس*»دا وەکوو وەلییەکی پایەبەرز ناوی لێ بردووە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٥١.

## خاتوو ئەمەتوڵڵای هەکاری

کچی ئەبولعەلا، کوڕی شەهابەدینی کوردی، لە ژنانی زانا و پارسای چەرخی نۆهەم بووە کە زۆرتر قوتابی کچ و ژنی وەرگرتووە و دەوری ٦٠ ساڵ عومری‌کردووە. کەسێکی وەک نووسەری کتێبی «*الضوء اللّامع*»، لە خزمەتیدا دەرسی خوێندووە.

*مَشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٢٣٢.

## موحەممەدی ماردینی

موحەممەد، کوڕی فەخرەدین عوسمان، کوڕی عەلی ماردینی شافیعی، لە زانایانی کوردی ماردینییە کە

---

[1] لە کتێبی «*مێژووی ئەدەبی کورد*»دا ماوەی ژیانی، نێوان ساڵانی ١٤١٧-١٤٩٥ز. نووسراوە.

سەری لەناو خوێندنەوە و تۆژینەوە و دەرس‌گوتنــەوەدا بــووە و ساڵــی ٨٧١ ک. م. بــۆ حیجــاز چــووە و لــە گەڕانەوەدا، کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*البَحر المَواج فی شرح المنهاج للّنواوی*» و پەراوێزی «*جامع صحیح بُخاری*».

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٢٠٥.

## نوورەدین حەمزەی قەرامانی

زانایەکی ناوچەی قەرامانی کوردستان بووە کە ساڵی ٨٧١ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێزێکی پوخت و پاراوە لە تەفسیری «*بیضاوی*» و چەند کتێبی‌تر.

*کشفُ الظُّنون*، ب١، ل١٦٥.

## مەولانا گوشایش

مەولانا موحەممەد، ناسراو بە «گوشایش»، کوڕی میرموحەممەدی مەردۆخ (بابامەردۆخە)یە کە ساڵــی ٧٩٠ ک. م. هاتۆتە دنیا و دوای پێگەیشتن، خوێندنی لە هەورامان دەسپێکردووە و پاشان ڕووی لە مەولاناوا نــاوە و بە قەولێک، بۆتە فەقێ عەللامەی دەوران شێخ حەسەنی مەولاناوایی و سەرەنجام ئیجازەی لێ وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە هەورامان و بۆ زیاتر تێگەیشتنی خەڵکەکە لە شەرعی ئیسلام، تا دوامــین کــاتی ژیــانی (٨٧٣ ک. م.) بە هەموو گیانی تێکۆشیوە.

وای دەگێڕنەوە گوایە مەولانا گوشایش چاوی کز و چکۆلە بووە و کاتــێ کــە چۆتــە نێــو خەڵــکی ناوچــە دوورەدەستەکانەوە و هاتووە ئایینی ئیسلامیان پێ بناسێنێ، خەڵکی دەوری ڕیش‌ســپیان دەگــرن و لێیــان دەپرسن: «قورونی قەدیما یام مارفەتوو پیرشالیاری؟». واتا: قورئان پێشترە یان مارفەتوو پیرشالیار؟ ئەوانیش جوابیان داوەتەوە: «مارفەتوو پیرشالیاری قەدیما؛ قورروونی هێزی کە گوشایشە کۆری ئاوەردەنــەش». یــانی: مارفەتوو پیرشالیار پێشترە؛ قورئان دوێنێکە پیرشالیارە کوێرە هێنای. بەڵام وێدەچێ ئەم قسە ڕاست نــەبێ؛ چونکوو لە چەرخی نۆیەمدا هەورامان موسوڵمان بوون و هەموان بــڕوایان بــە گــەورەیی و پــیرۆزی قورئــان هەبووە؛ چۆن دەگونجێ لەگەڵ کتێبێکی مرۆیەک دایناوە، بەرامبەری بکەنەوە؟

مەولانا گوشایش دوو کوڕی بووە: مەلا عەباس، باپیرەگەورەی والییان و دادوەرانی مەردۆخی هەورامان و شێخ عەبدولغەفار کە هەموو مەردۆخیانی‌تر لە پشتی ئەون.[١]

---

١. وەک مەردۆخیانی دگاشێخان و تەختە و کاشتەر و سیویە و گلیان و سنە و دژن و هەزارکانیان و باقراوا و قەرەداغ و سلێمانی و چەند لقی‌تر کە تا سووریا و ترکیا و تەنانەت لوبنانیش چوون.

*تاریخ مردوخ. ڕەگەزنامەی بنەماڵەی مەردۆخ.*

## خاتوو فاتمەی گۆرانی

کچی بەدرموحەممەد، کوڕی جەمالی گۆرانی و لە پشتی خدری گۆرانییە کە ساڵی ٧٩٤ ک. م. هاتە دنیا و لە بەغدا و دمشق و لای مامۆستایانی ئەو کاتە، زۆربەی زانستە ئیسلامییەکانی خوێند و پاشان دەرس‌گوتنەوەی قوتابیان و خوێندکارانی ـ لە کچ و کوڕـ گرتە ئەستۆ و سەرەنجام ساڵی ٨٧٣ لە دنیا دەرچوو.

*مَشاهیرالکُرد.*

## عەلائەدین عەلی گۆرانی

عەلائەدینی عەلی، کوڕی شێخ خدر، کوڕی عەبدولمەلیک، کوڕی عوسمان، زانایەکی ناوچەی شارەزوورە کە ساڵی ٨١١ ک. م. لەدایک‌بووە و پاش تەواوکردنی خوێندن، تا دوا کاتی ژیان دەرسی‌گوتۆتەوە. ساڵی لە دنیا چوونی نەنووسراوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٨٥ و ٨٦.

## شێخ جەمالەدین یۆسفی حەسکەفی

شێخ جەمالەدین یۆسف لە کوردانی حسن‌کیفایە کە دوای کۆتایی هێنان بە خوێندن، کەوتۆتە سەیر و سلووک و بۆتە مریدی شێخ جەمالەدینی مەتبوولی(؟ـ ٨٨٠ ک. م.).

شێخ جەمال لە تەجویدد و قەارئاتدا مامۆستای ڕۆژگاری خۆی بووە و حەوت قەرائەتەکەی بە شارەزایی تەواوەوە دەرس‌گوتۆتەوە.

*طَبَقات شَعرانی*، ب٢، ل٨٤.

## شاحوسەینوەلی سوورەبەردی

شاحوسەینی وەلی سوورەبەردی مەشهوور بە «سَرپُلی»[١]، لە بنەماڵەی سوورەبەردییان و خاتوو فاتمەی دایکی، خوشکەزای شێخ سەفیەدینی هەردەوێڵی بووە کە لە ڕەجەبە مانگی ساڵی ٧٦٧ ک. م. هاتۆتە دنیا و پاش خوێندنی سەرەتایی، بەشوێن زانست و زانیاریدا، ساڵانێکی زۆر بە شارانی عیراق و شام و حیجازدا

---

١. شاحوسەین زۆر جاران لە سەر پردێکی لای تەکیەکەیەوە دانیشتووە و بەو بۆنەوە وایان پێ گوتووە.

گەڕاوە و ئەوجار چۆتە سەمەرقەند و بۆتە مریدی شێخ حەسەنی سەمەرقەندی، کە خاوەن خانەقا بووە و سەری لە سەیر و سلووک ناوە. کە شێخ حەسەن کۆچی دوایی کردووە، بەرامبەر بە وەسیەتی خۆی، ماوەیەک خانەقای گەڕاندووە؛ بەڵام سەرەنجام چووە بۆ مەککە و دوای بەجێهێنانی حەج، گەڕاوەتەوە تەورێز و لەوێ تەکیەیەکی داناوە و پاش ژیانێکی بە درێژی ١١٥ ساڵان، ساڵی ٨٨٢ ک. م. دەستی لە دنیا بەرداوە و هەر لە تەکیەکەی خۆی لە تەورێز، نێژراوە.

وەک نووسیویانە، ئەمیرتەیمور، شاحوسەینی زۆر خۆشویستووە و زۆری ڕێزلێناوە و تەنانەت خوشکی خۆی (جەهان خاتوون)ی لێ مارە کردووە. یەک لە مەشایخی ئەو ڕۆژگارەش بە ناوی قاسمی ئەنوار (٧٥٧ـ٨٣٧)، ئاوای پێدا هەڵدەڵێ: «مَن آن شاەحُسَین کە اُو سَرپُلی اَست، دیدەام؛ کوُ وَلی است...». واتا: ئەمن ئەو شاحوسەینە سەرپولییەم بە چاوی خۆم دیوە؛ کە وەلییە.

*دانشمندان آذربایجان*، ل١٨٧. *کارنامەی بزرگان ایران*، ل٣٠٢.

## زەینەدین عەبدوڕڕەحمانی شارەزووری

زەینەدین عەبدوڕڕەحمان، کوڕی حوسەین، کوڕی ئیبراهیمی شارەزووری، ساڵی ٨٠٨ لە دایک بووە و لەدووی زانست، ساڵی ٨٣٥ ک. م. بەرەو قاهیرە چووە و خزمەتی مامۆستایانی ناوداری ئەوێ گەیشتووە و پاشان ئەسکەندەرییە و دەمیاتیشی بینیوە و دوای تەواو کردنی دەرس و دەور، ڕووی لە حیجاز ناوە و سەرەنجام گەڕاوەتەوە میسر و تا کۆتایی ژیان (٨٨٣)، بە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە و وتاردانی ڕابواردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٤.

## جەمال کوردی شارەزووری

جەمالەدین عەبدوڵلا، کوڕی عیسا، کوڕی عەبدوڵلا، ناسراو بە «جەمال کوردی»، زانایەکی خەڵکی شارەزوورە کە لە قاهیرەدا ژیاوە و لە مامۆستایانی بەناوبانگی تەفسیر و قەرائات و تجوید بووە و لە تەمەنی ٤٥ ساڵاندا (ساڵی ٨٨٣ ک. م.) کۆچی دوایی کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٤.

## سافی جەزەری

شاعیرێکی باکووری کوردستانە کە بۆتە وەزیری سوڵتان بایەزیدی دووهەم (٨٨٧ ــ ٩١٩ ک. م.). ئەو پێشتر لە چەکدارانی ئەبولفەتح خانی کوڕی سوڵتان موحەممەد خانی دووهەم بووە و وردە ــ وردە بۆتە وزیری دارایی و سەرەنجام تا پلەی سەرەک‌وەزیری گەیشتووە.

وەک نووسەری قامووسی «*الأعلام*» و خاوەنی «*کَشف الظّنون*» دەڵێن، شیعری چاکیشی گوتووە.
*لغتنامەی دهخُدا*، پیتی ص، ل٧٧.

## جەمالەدین یۆسفی کوردی

جەمالەدین یۆسف، کوڕی یەعقووب، لە زانایانی کوردە کە زێدی خۆی بەجێهێشتووە و لە شاری قودس دانیشتووە و ساڵانێکی زۆر لەوێ دەرسی گوتووە و سەرەنجام ساڵی ٨٨٨ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.
*کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٢٩٨.

## عومەری کوردیی شافیعی

عومەر، کوڕی خەلیلی کوردی، بابی لە کۆچەرانی کوردە کە چۆتە قاهیرە و عومەر لەوێ هاتۆتە دنیاوە و خوێندوویە و پاش وەرگرتنی ئیجازە، لە قوتابخانەیەکی ئەو شارە، بۆ دەرس گوتنەوە، بانگ کراوە و تا کۆتایی ژیان (٨٨٨ ک. م.) بەو کارەی درێژەی داوە.

*مَشاهیر الکُرد*، ب٢، ل٩٣.

## تاج کوردی

موحەممەد، کوڕی عومەر، کوڕی موحەممەد، مەشهوور بە «تاج کوردی»، لە زانایانی هەڵکەوتەی چەرخی نۆی کۆچییە کە لە قودس خوێندنی تەواو کردووە و لە خزمەتی بەدرەددین حەسەنی قودسی ئیجازەی وەرگرتووە. ئەوجار گەڕاوەتەوە مووسڵ و دەرس گوتنەوە و بارهێنانی فەقێیانی دەسپێکردووە و لە کۆتاییدا ساڵی ٨٨٨ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

*مَشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٤٠.

## مەولانا ئەحمەدی گۆرانی

مەولانا شەهابەدین ئەبولعەباسی ئەحمەد، کوڕی ئیسماعیل، کوڕی عوسمانی شارەزووری گۆرانی، ساڵی ٨١٣ ک. م. لەدایکبووە و هەر لە ناوچەی شارەزوور خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە و پاشان بۆ میسر چووە و لای مامۆستایانی گەورەی ئەوێ ماوەیەکی زۆر خوێندوویە تا تەواو پێگەیشتووە و دوای وەرگرتنی ئیجازە لە کۆڕی مامۆستایانی وەک عەللامە حافیز، کوڕی حەجەری عەسقەلانی، گەڕاوەتەوە زێدی خۆی. دوای هێندێک چۆتە «برۆسا» لە تورکیای عوسمانی و لە قوتابخانەیەکی ئەوێ دەرس گوتنەوەی دەسپێکردووە و لە ماوەیەکی کەمدا ناوی دەرکردووە و باسی تێگەیشتوویی و زانایی، تەنانەت بەرگوێی

سوڵتان مرادخانی عوسمانی (٨٢٤–٨٥٥ ک. م.) کەوتووە و زۆری نەخیاندووە کردوویەتە مامۆستای تایبەتیی وەلیعەهد (موحەممەدی فاتیح). کاتێ کە موحەممەد بۆتە سوڵتان (٨٥٥– ٨٨٦)، بەنیاز بووە بیکاتە وەزیر؛ بەڵام مەولانا نەیویستووە و تەنیا دەرس گوتنەوە و دادوەری کردووە و ماوەیەکیش سەرپەرشتی مەوقووفاتی سەڵتەنەتی لە ئەستۆ گرتووە.

جارێک سوڵتان موحەممەدی فاتیح، فتوایەکی لێ داوا دەکا کە بەرامبەر بە شەرع نەبووە. مەولانا زۆر تووڕە دەبێ و سەبرێ بابی عالی بەجێدێڵێ و دەچێتە میسر. سوڵتان قایتبای، خاوەن دەسەڵاتی میسر، زۆری بەخێر دێنێ و ڕێزی لێ دەگرێ. پاش ماوەیەک سوڵتانی عوسمانی نامەیەکی لێ دەنووسێ و داوای لێبووردنی لێ دەکا و لێی دەخوازێ بگەڕێتەوە. مەلا ئەحمەد کە هەموو دۆست پێوەندی لەوێ بووە، داخوازی سوڵتان بەجێدێنێ و دەگەڕێتەوە برۆسا و لە لایەن سوڵتانەوە مەقامی شێخولیسلامیشی پێ دەدرێ.

مەولانا ئەحمەد لە تەفسیر و حەدیس و ئەخبار و فیقهدا، تاکانەی ڕۆژگاری خۆی بووە و بۆ پاکی و پارێزکاریش، ناو و ناوبانگی هەموو وڵاتی داگرتووە. بەبێ مەرایی و لەڕووداماوی، لەگەڵ سوڵتان و باقی دەسەڵاتداران ئاخافتووە و هەمووی هەر بەناوی خۆی بانگ کردووە؛ لە کەسیان کۆی نەکردۆتەوە و جاروبارەش لە کاتی ئامۆژگارییاندا فرمێسکی بەچاویاندا هێناوە. مرۆیەکی خاکەسار و بێ دەعیە و دەمار؛ بەڵام مەند و سەنگین و بەسام و هەیبەت بووە و کەس لە بەرامبەر مۆچیاری و قسەیەوە خۆی نەگرتووە.

**لە کتێبەکانی**: «*غایةُ الامانی فی تفسیر السَّبع المثانی*»، «*الکوثرُالجاری عَلی ریاضِ البُخاری*»، «*فَرائدُ الدُرر فی شَرحِ لَوامعِ الغُرر*»، «*الدُّرَرُاللّوامعِ، شَرحُ جمعِ الجوامع*»، «*الشّافیه*» لە عەرووزدا و شەرحێکی «*کافیه*»ی ئیبنولحاجیب لە نەحودا.

ئەم مامۆستا بلیمەتە، ساڵی ٨٩٣ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە .

*الشّقایقِ النُعمانیّة*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٨٨. *الأعلام*، ب١، ل٩٤. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٣١٤ و ٣٩٨. *تاریخ سُلیمانیه*، ل٢٣٣. *هدیةالعارفین*، ب١، ل١٣٥.

## جەمالەدین عەبدوڵڵای گۆرانی

جەمالەدین عەبدوڵڵای شافیعی، کوڕی موحەممەد، کوڕی خدر، کوڕی ئیبراهیمی گۆرانی، ساڵی ٨١٨ ک. م. لە جزیر هاتۆتە دنیا و پاش خوێندنی سەرەتایی، بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەی، چۆتە برۆسا و ماوەیەک لە خزمەت غیاسەدین حەمید بووە دوای ئەوە بەرە و قاهیرە چووە و لەوێ ئیجازەی وەرگرتووە.

جەمالەدینی گۆرانی لە کەلام و ئوسوولدا مامۆستایەکی هەڵکەوتە بووە و زۆر ساڵان ئەم زانستانەی دەرس گوتووە و سەرەنجام لە مانگی شابانی ساڵی ٨٩٤ ک. م. لە قاهیرە، کۆچی یەکجاری کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٥٠.



## ئەحمەدی عەباسی

ئەحمەدی کوڕی یۆسف، کوڕی حوسەین، کوڕی یۆسفی حەسکەفی عەباسی، شەرعزان و داوەریدادوەرانی خەڵکی حسن‌کیفا بووە کە دوازدەساڵان لە تەوریز خوێندوویە و پاشان چۆتە جزیر و لە مزگەوتی عومەر دەرسی گوتووە و دوای ماوەیەک بۆتە قازی حسن‌کیفا و تا دوا ساڵی ژیان (٨٩٤ ک. م.) بەو کارەوە خەریک بووە.

**لە کتێبەکانی**: «*تُحفة الفوائد بِشرح العقائد*»، «*کشف الدُّرَر فی شرح المُحرَر*» لە چوار بەرگدا و شەرحی «*طوالع الانوار*»ی قازی بەیزاوی لە کەلامدا.

*الأعلام*، ب١، ل٢٦٠. *لغتنامەی دهخُدا*، پیتی ح، ل٧٠٤.

## خەیرەدینی بدلیسی

لە زانایان و مامۆستایانی بەناوبانگی شاری بدلیس بووە کە لە بڕانەوەی چەرخی نۆیەمدا کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: شەرحێکە لە کتێبی «*ایساغوجی*»، اثیرالدّین عُمر ابْهَری (؟-٧٠٠ ک. م.).

*کشفُ الظُّنون*، ب١، ل١٧٤.

## شێخ عەبدولقادیری حەلەبی

کوڕی شێخ یۆسفی کوردی، لە مامۆستایانی فیقهی شاری حەلەب بووە کە لای شێخ عوسمانی کوردی، شەرعزانی بەناوبانگی شاری حەلەب، فیقهی خوێندووە و ساڵی ٨٩٦ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٣٠.

## عەلی شەرابییە

ناسراو بە «عەلا»، کوڕی موحەممەد شەمسەدین، لە ناوچەی شەرابییەی سەر بە قوسەیری شامە کە ساڵی ٨٩٦ ک. م. لە شاری حەلەب، سەری بە کاری دەرس‌گوتن و فتوادانەوە گەرم بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٨١.

## شێخ زەینەدین عەبدوڕڕەحمانی ئامێدی

شێخ زەینەدین عەبدوڕڕەحمان، کوڕی موحەممەد، لە زانایان و مامۆستایانی شافیعییە کە دوای خوێندن، ماوەیەک لە حەلەب دادوەر بووە و هێندێک لە قاهیرە دەرسی گوتووە و پاشان چۆتە ئاناتولی و سەرەنجام

گەڕاوەتەوە حەلەب و ساڵی ٨٩٧ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٠.

## شێخ عەبدوڕڕەحمانی کاکۆزەکەریایی

ناسراو بە «رُکن‌الدّین»، کوڕی شێخ ئەحمەدی سامیت، کوڕی شێخ موحەممەد سادیق فازیل، لە بنەماڵەی کاکۆزەکەریایی و عارفانی زانای چەرخی نۆیە کە کتێب و نووسراوەشی هەبووە و ساڵی ٨٩٨ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

شێخ ڕەحمان بە منداڵی لەگەڵ بابی بۆ حیجاز دەڕوا و لە کاتی بەجێ‌هێنانی حەجدا، شێخ ئەحمەد لە دنیا دەڕوا و ئەم هەر لەوێ دەمێنێتەوە و دەخوێنێ و پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، دەگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی (گوندی کاکۆزەکەریا).

*نورُالأنوار. تاریخ مردوخ.*

## شێخ عوسمانی جەزەری

کوڕی سلێمان، لە پشتی عەللامە خەلیلی جەزەری و خەڵکی دێهاتێکی دەوری ورمێ بووە کە بۆ خوێندن، تا شام و حیجاز چووە و دوای وەرگرتنی ئیجازە، هاتۆتە زێدی خۆی و تا ساڵی ٨٩٨ ک. م. فەقێ وەرگرتووە و دەرسی گوتووە و ئەوساڵە کۆچی دوایی کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٥٩.

## ئیبنوسەدەقە

زەینەدین عەبدوڕڕەحیم، ناسراو بە «ابن‌صَدَقه»، کوڕی فەتحەدینی سەدەقە، کوڕی ئەیووبی کوردی شافیعی، بابی بۆ میسر چووە و زەینەدین ساڵی ٨٤٤ ک. م. لەوێ هاتۆتە دنیا و لە قاهیرە خوێندوویە و لە هەموو زانستە ئیسلامییەکاندا شارەزاییەکی باشی پەیدا کردووە و بەتایبەت لە بواری حەدیسدا مامۆستای بێ‌قسەی ڕۆژگاری خۆی بووە. چەن جاران سەفەری مەککە و مەدینە چووە و هەموو جارێ خوازیارانی حەدیس و ڕەوایەتی بەهرەمەند کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٢٣.

## جەمالەدینی کودوانی

کوڕی یۆسف، کوڕی باباعومەر، کوڕی ڕۆسەم، لە هۆزی کوردی کودوان و مامۆستایانی ناودارە کە لە مەدینە

ژیاوه و له ساڵی ٨٩٩ دا، بەشی بە دنیاوه بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٢٢٤.

## خاتوو سیتتەی گۆرانی

خوشکی خاتوو فاتمه و کچی بەدر موحەممەدی گۆرانییە کە لە زانست و وێژەدا باش سەری دەرچووە و لـە ڕاویانی حەدیس بووە و ئاخری چەرحی نۆ، ژیانی کۆتایی هاتووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٣٩.

## شەمسی کوردی

موحەممەد، کوڕی عەبدوڵلا، کوڕی موحەممەد، کـوڕی خـەلیل، کـوڕی بـەکتووت، ناسـراو بـە شەمـسی کوردی، یازدەی شـابانی ساڵـی ٨٤٢ ک. م. لـە دەوروبـەری هـەولێر لـەدایکبـووە و ساڵـی ٨٩٦، دوای سەفەری حیجاز و بەجێهێنانی حەج، بۆ قاهیرە چووە و هەر لەوێ نیشتەجێ بووە.

ئەم مامۆستایە گەرچی حەنبەلی بووە، بەڵام فیقهی مەزهەبەکانی تریـشی بـاش زانیـوە و لـە موفتییـانی پایەبەرزی ڕۆژگاری خۆی هاتۆتە ئەژمار.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٣٩.

## عیمادەدینی جەزەری

عیمادەدین عەبدولغەنی، کوڕی مووسا، کوڕی ئەحمەد، لە زانایانی هەڵکەوتەی جزیروبۆتانە کە لـە زمـان و وێژەدا ئوستاد و لە فیقهـ و ئوسوولدا خاوەن ئیجتیهاد بووە.

عیمادەدین دوا قۆناغی خوێندنی لە خزمەت زانای بـەناوبانگ «عَلَـمالـدّین بلقینـی شـافعی»دا بـە ئـەنجام گەیاندووە و پاشان لە قاهیرە دەرسیداوە و ساڵی ٨٩٥ ک. م. سەفەرێکی حەج چووە.

لەدایکبوونی ئەم مامۆستایە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٨٢٥؛ بەڵام ساڵی لە دنیاچوونی نەنووسـراوە و دەبـێ لە کۆتایی چەرخی نۆیەمدا بووبێ.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٢٨.

## هومایی

کوردی باشووری کوردستانە؛ بەڵام زاگەی ڕۆشن نییە. پیاوێکی زانـا و شـاعیرێکی کـەمقـسەی هاوچـەرخی نەوایی، لە شاعیرانی چەرخی نۆهەمە. جارێک سەفەرێکی خوراسانی کردووە. ئەم بەیتـە سـەرەتای غـەزەلێکی

ئەوە:

جانــا مــنم زدســت فــراق تــو مُــردەای      خــون در تــنم نمانــد چــو نــار فــشُردەای

*لغتنامەی دەهخدا*، پیتی هـ ل٢٦٨. بە گێڕانەوە

لە کتێبی *مجالس النفاس*، امیرعلی شیرنوایی.

# چەرخی دەیەم

## مەولانا حوسامەدین عەلی بدلیسی

کوڕی عەبدوڵڵای حەنەفی سۆفی، لە زانایانی بەئاکار و عارفانی تەواوعەیاری بدلیسە کە زنجیرەی تەریقەتی لە شێخ عەمماری یاسری بدلیسی وەرگرتووە و پیاوی ڕیازەتکێشان و نەفسکوشتن بووە. تەفسیرێکی بابی دڵی عارفان نووسیوە بە ناوی: «*جامعُ التنزیل و التّاویل*» لە پێنج بەرگدا و شەرحێک لە زاراوەی سۆفییان بە ناوی «*الکَنزُ الخَفی فی بَیان مقامات الصّوفی*».

کۆچی یەکجاری مەولانا حوسامەدین، ساڵی ۹۰۰ ک. م. ڕوویداوە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٤٨. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٣٣٣. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٨٣٨.

## بەدرەدین موحەممەدی ماردینی

ئەبووعەبدوڵڵا بەدرەدین موحەممەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئەحمەد، ناسراو بە «سبْط ماردینی»، زانایەکی ئەستێرەناس و بیرکار بووە و لە باسی هەیئەت و گەڕۆکان سەریدەرچووە. بابی لە کوردانی ماردینە کە بۆ کار و کاسبی، بە ژن و منداڵەوە ڕۆیوە بۆ دمشق و بەدر ساڵی ٨٢٦ ک. م. لەوێ لەدایکبووە.

بەدرەدین لە زیرەکی و بڕشتی زەین و بیری بەقەوەتدا گاڵەی پێکردووە و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ خوێندن و فێربوون، هەدای نەداوە و لە هەرکوێ ناوی مامۆستایەکی زانای بیستبێ، خۆی پێ گەیاندووە و بەهرەی لێ بردووە. کتێبی زۆری لە هەندسە و ریازی و نوجووم و باقی لقەکانی بیرکاریدا نووسیوە و دەسنووسەکانی ئێستاش لە کتێبخانەی خەدیوی میسردا هەیە. دوو کتێبی بە ناوی: «*تُحفَةالالباب فی علم الحساب*» و «*الجواهر فی تجدید الخطوط و الدوائر*»، ساڵی ۱۲۹۹ ک. م. لە میسردا چاپ کراوە.

**باقی نووسراوەکانی**: «*جَداولُ رَسمِ المُنْحرفات عَلی الجدار*»، پەراوێز بەسەر «**لامیە**»ی ئیبنولهائیم لە جەبر و موقابیلەدا، شەرحی«*رَحَبّیە*» لە فەرائیزدا و «*حاوِی المختصرات فی العَمَل بِرُبعِ المُقَنطرات*».



بەدرەدین لە زانستگای ئەزهەری قاهیرەدا مامۆستای فەرمی بووە و ساڵی ٩٠٧ ک. م. لەو شارەدا کۆچی یەکجاری کردووە.

*الأعلام*، ب٧، ل٢٨٢. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٣٦١.

## مەحموودی شیروانی

مەحموود، کوڕی پیرکورد، کوڕی ئەمیر شیروانی حەنەفی سۆفی، پیاوێکی زانا و شاعیرێکی سۆفی مەشرەب بووە کە هەڵبەستێکی مۆچیاری‌نامەی بە زبانی فارسی، بە ناوی «*کیمیاءُالقُلوب*» هۆنیوەتەوە کە یەکەمی ڕەبیعولئەوەڵی ساڵی ٨٩٢ ک. م. کۆتایی پێ هێناوە و بۆخۆی لە سەرەتای چەرخی دەیەم، لە شارێکی تورکیادا کۆچی دوایی کردووە.

*کشفُ الظُّنون*، ب ٢، ل ٣٦٤. *تاریخچەی ادبیات*، سَعید نَفیسی. ضمیمەی سالنامەی پارس، ١٣١٧ ک. ه. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٤١١.

## شێخ مەحیەدین موحەممەدی ئیسکلیبی[1]

مەحیەدین موحەممەد ئەفەندی ئامێدی ئیسکلیبی حەنەفی، کوڕی موستەفا ئەفەندی، لە عارفان و زانایانی ئامێدە کە لە سۆفیگەریشدا پلە و پایەیەکی بەرزی هەبووە. خوێندنی لە خزمەت عەلائەدین عەلی، کوڕی موحەممەدی «قوشجی»دا تەواو کردووە و تەریقەتی لە عارفی مەزن شێخ ئیبراهیمی قوسەیری وەرگرتووە.

سوڵتان بایەزیدخانی عوسمانی یەکجار خۆشی‌ویستووە و هۆگری بووە و لە قوستەنتەنییە (ئەستەمبووڵی ئێستا)دا، خانەقا و مزگەوتێکی بۆ کردۆتەوە و بەم بۆنەوە بە «شیخ‌السُّلطان» ناوی دەرکردووە.

*الشَقایق النّعمانیّة فی عُلَماء الدولە العُثمانیّە*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل٣٨٢ و ٣٨٥.

## سەید عەلی شەهید

لە کوردانی ئامێدییە کە دوای کۆتایی هاتنی دەرس‌ودەور، بۆ وەرگرتنی تەریقەت، گەیشتۆتە سەمەرقەند و خۆی سپاردۆتە خواجە عوبەیدیللای ئەحرار و چۆتە نێو تەریقەی نەقشبەندی و چەند ساڵان لە خزمەتی ئەو پیرە پارێزکارەدا بووە و هاوڕێ لەگەڵ سەیر و سولووک، ڕاهێنانی کوڕێکی مورشیدەکەی وەئەستۆ گرتووە.

---

١. **ئیسکلیب**: ناوەندی ناوچەیەکی کوردە لە ڕۆژهەڵاتی باکووری ئاناتولدا. بابی شێخ مەحیەدین لە ئامێدەوە چۆتە ئەوێ و مەحیەدین لەوێ هاتۆتە دنیا.

پاش لە دنیا چوونی خواجە عوبەیدیللا، لەسەر داخوازی کۆمەڵێک لە دۆستان و مریدانی شێخ، چووە بۆ قەزوێن و ساڵانێکی زۆر لەو شارەدا خەریکی ئیرشاد بووە و سەرەنجام ساڵی ٩٢٥ ک. م. تاقمێک لات و شەلاتی ئۆزبەک شەهیدیان کردووە.

*الانوارُالقُدسیّە*، چاپی میسر، ل١٧٣.

## ئیبنوسیووفی حەسکەفی

بەدرەدین حەسەن، کوڕی عەلی، کوڕی یۆسف، ناسراو بە «ابنُ السّیوفی»، لە زانایانی کوردی خەڵکی حسن کیفایە کە دوای خوێندن، لە حەلەب نیشتەجێ بووە و ساڵی ٩٢٥ ک. م. هەر لەوێ کۆچی یەکجاری کردووە.

*ایضاحُ المَکنون*، ب٢، ل٢٥٨.

## شەمسەدین موحەممەدی بازلی

ئەبووعەبدوڵڵا شەمسەدین موحەممەد، کوڕی داود، کوڕی موحەممەدی بازلی ئامێدی، لە ساڵی ٨٤٥ ک. م. لە جزیر هاتە دنیا و خوێندنی لەوێ دەسپێکرد و لە ئامێد و هەولێر و مووسڵدا درێژەی پێ دا و پاشان بەشوێن مامۆستایانی حەدیس‌زاندا، زۆربەی ناوەندە زانستییەکان گەڕا تا سەرەنجام بە مرازی خۆی گەیشت. ئەوجار لە شاری حەمات گیرساوە و نووسین و بارهێنانی قوتابیان، بەتایبەت لە وانەی حەدیسی وەئەستۆ گرت و هەر لەوێ لە ساڵی ٩٢٥ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێنا.

**لە کتێبەکانی**: «*غایةُ المرام فی رجال البُخاری*»، «*تقدمة العاجل لذخیرة الاجل*»، «*التُحفَة المرضیة فی المسائل الشّامیّة*»، «*تُحفة ذَوی الارب*»، پەراوێز لە سەر شەرحی «*جمع الجوامع محلّی*» و «*البدیع فی مدح اشفیع*».

*الأعلام*، ب٦، ل٣٥٥. *کشفُ الظُّنون*، ب٢، ل١٤٨.

## عەلائەدین تەبیبی ئەربیلی

کوڕی وەلیەدین، زانایەکی خەڵکی هەولێرە کە شارەزای زۆربەی زانستە عەقڵی و نەقلییەکان و پسپۆڕی بژیشکی و دەرماناسی بووە کە لە شاری حەڵەبدا ژیاوە و هاوڕێ لەگەڵ دەرس گوتن، دەوا و دەرمانی نەخۆشانیشی کردووە و ساڵی ٩٢٦ ک. م. دنیای بێ‌بنیای بەجێ‌هێشتووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٧١.

## موحەممەدی حەسکەفی

کوڕی ئەبی‌لوتف موحەممەد، کوڕی عەلی، خەڵکی حسن کیفایە کە هێشتا لە دایک نەبووە باوکی مردووە و

دایکی هەموو ئەرکی بارهێنانی وەئەستۆ گرتووە و کە پێ‌گەیشتووە بۆ خوێندنی ناردووە و پاش فێر بوونی وانە سەرەتاییەکان، لە قوتابخانەیەکی شارەکەیدا دەرس و دەوری درێژەپێداوە و زۆرێک تێیدا سەرکەوتووە و پاشان بۆ قودس و قاهیرە چووە و ماوەیەکیش لەو شارانەدا خوێندوویە تا لە هەموو بارێکەوە پێگەیشتووە. ئەمجار لە قودس نیشتەجێ بووە و تا دواسالی ژیانی (٩٢٨ ک. م.)، لەوێ دەرسی گوتۆتەوە.

**لە کتێبەکانی**: *«الموضحُ المُبین لأقسام التّنوین»* لە نەحودا، *«عِقدُ اللالی لِبَدرِ الامالی»* و هۆنراوەی *«سائل السّائل الی معرفة الاوائل»* کە بەم بەیتەوە دەس‌پێدەکا:

قالَ مُحَمَّدٌ فَتی ابنُ الشّمس ابنُ ابی اللطف الفقیر القُدسی

*الأعلام*، ب٧، ل٢٨٤.

## کەمالەدین حەکیمی بدلیسی

مەولانا کەمالەدین حەکیم ئیدریسی بدلیسی، کوڕی حوسامەدین عەلی، لە مێژووزانانی بەناوبانگ و میرانی زانا و تێگەیشتووی دەرباری عوسمانییە؛ کە سەرەتا ئینشابەندی دەرباری سوڵتان یەعقووبی ئاق‌قوینلوو (؟-٨٩٥) بووە. ساڵی ٨٩٠ لە لایەن سوڵتان یەعقووبەوە نامەیەک بۆ دەرباری عوسمانی دەنووسێ؛ سوڵتان بایەزیدی عوسمانی کە چاوی بە خەت و ئینشای دەکەوێ، دڵی دەگرێ و بە نهێنییەوە بانگی دەکاتە لای خۆێ. کە پاتشایی ئاق‌قوینلوو هەڵدەپێچێ (٩٠٨ ک. م.)، کەمالەدین دەچێتە خزمەتی سوڵتان و بەرهەڤ بوونی خۆی بۆ خزمەت لە دەرباریدا ڕادەگەیەنێ. سوڵتانیش زۆری بەخێر دێنێ و پلە و پایەیەکی هێژای ئەوی پێ دەسپێرێ.

کەمالەدین لە دەورانی پاتشایەتی سوڵتان سەلیم‌خانی یەکەمیشدا (٩١٩ -٩٢٦)، ڕێز و حورمەتی تایبەتی بووە و سوڵتان زۆر خۆشی‌ویستووە و لە شەڕ و لەشکرکێشیدا، کوردانی سپای عوسمانی بەو سپاردووە.

مەولانا ئیدریس بە زبانی عەرەبی و فارسی و ترکی شیعری گوتووە و بە عەرەبی و فارسی کتێبی نووسیوە؛ کە هێندێکیان بریتین لە: شەرحێک لەسەر کتێبی بەناوبانگی *«فُصوص الحکَم»*، نووسراوەی شێخ مەحیەدینی عەرەبی، ڕاژەی کتێبی *«گُلشَن راز»*، نامیلکەیەک بە ناوی *«الاباء عَنْ مَواقعِ الوَباء»*، وەرگێڕانی چل حەدیس بە شیعری فارسی، بە ناوی *«اربَعین بدلیسی»*، کە ساڵی ٨٨٦ ک. م. تەواوی کردووە، *«الحَقُّ المُبین فی شَرحِ عین الیَقین»* لە کەلامدا، بە زبانی فارسی، *«مِرآت الجمال»* لە ویژەی فارسیدا، سەرجەمی نامەکانی، مێژوویەکی فارسی بەناوی *«هَشت بِهِشت»*، بریتی لە ژین‌نامەی هەشت سوڵتانی ئەوەڵی عوسمانی تا دەگاتە ڕووداوانی ساڵی ٩٠٨ ک. م. و کتێبی *«سَلیم‌نامە»* کە باسی پاتشایی سوڵتان سەلیم‌خانی یەکەمە.

لە شەڕی میسر و گرتنیدا، کەمالەدین خزمەتی زۆری کردووە و پاش سەرکەوتنیش لەمەڕ چۆناوچۆنی شەڕەکەوە، بە فارسی و عەرەبی شیعری گوتووە؛ کە یەکیان قەسیدەیەکی فارسییە، ڕووی قسەی لە سوڵتان سەلیم و تێیدا گلە و گازندەیەکیش لە بار و دۆخی خۆی دەکا. ئەوا چەند بەیتی:

کساد نقد من از جهل تا به کی رایج    چو صاف و ناسَرَه‌ی فضل را تویی معیار
ز مصر جامع فضلم نشد جوی حاصل    ولی گُهر به کف آورده جاهلان خروار
بر آسمان علوم آن که هست معراجش    چگونه رفعت ادریس را کند انکار

کۆچی دوایی مەولانا کەمالەدین ئیدریس ساڵی ٩٣٠ ک. م. لە ئەستەمبووڵدا ڕووی‌داوە و لە پەنای زیارەتی سەحابەی شەهید ئەبووئەییووبی ئەنساریدا نێژراوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل١٩٦١. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٢١٧ و ٢١٨، ب٢، ل١٩٢ و ٦٥٦. *الشَقایق النّعمانیّة فی عُلَماء الدوله العُثمانیّه*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل ٣٥٣. *لغتنامه‌ی دهخُدا*، پیتی الف، ل١٥٦٢.

## مەولا مەحیەدینی کوردی

مەولا مەحیەدینی کوردی عەجەمی، زانایەکی کوردستانە کە بۆ خوێندن و بەشوێن زانستدا، زۆر شاران گەڕاوە و سەرەنجام ماوەیەک لە تورکیای ئێستا، خزمەتی عەللامە شەهابەدین ئەحمەدی شارەزووری (؟–٨٩٣ ک. م.) گەیشتووە و پاش وەرگرتنی ئیجازە، هێندێک دەرسی گوتۆتەوە و ماوەیەکیش لە شاری ئەدرنە دادوەری کردووە و لە سی‌ساڵەی یەکەمی چەرخی دەیەمدا لە دنیا دەرچووە.

مەولا مەحیەدین پیاوێکی دیندار و پارێزکار و بۆ بەجێ‌هێنانی فەرمانی شەرع و سەلماندنی ڕاستەقینە، یەکجار شێلگیر و هەروەها خۆش‌خەت و دەم پاراو و قسەجوان و قەڵەم ڕازاوە بووە کە چەند نووسراوەی لێ بەجێ‌ماوە؛ وەک: کۆمەڵێک بابەتی فیقهی و نامیلکەیەک لەمەڕ شەهید و شەهادەتەوە.

*الشَقایق النّعمانیّة فی عُلَماء الدوله العُثمانیّه*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب١، ل ٣٤٢ و یەک ـ دوو سەرچاوەی‌تر.

## ئیلاهی بەگ

زانایەکی وێژەوان و شاعیر، لە گەورە پیاوانی عەشایر بووە کە سەری لەبەر سەربادان لە فەرمانی سوڵتان سەلیم خانی عوسمانی، بەبا داوە و شەهید کراوە.

*لغتنامه‌ی دهخُدا*، پیتی الف، ل١١٧، بە گێڕانەوە لە *قاموس اعلام تُرکی*، ب٢.

## شێخ سونعوڵڵای کۆزەکنانی

مەولانا شێخ سونعولا، خەڵکی گوندی کۆزەکنانی لای تەوریزە کە لە چەند شارێکی ئازربایجان و کوردستاندا فەقێتی کردووە و ماوەیەکیش بۆخۆی خەریک خوێندن و تۆژینەوە بووە؛ ئەوجار بۆ وەرگرتنی تەریقەت، ڕووی لە خوراسان ناوە و بە هاوقۆڵی مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی (٨١٧–٨٩٨) چۆتە خزمەتی عارفی بەناوبانگ خواجە عوبەیدیللای ئەحراری نەقشبەندی (٨٠٦–٨٩٥) و سەری پێ سپاردووە و ماوەیەکی زۆر لە خانەقاکەیدا کەوتۆتە سەیر و سلووک و پاش وەرگرتنی ئیجازەی مورشید و کەڵپۆسی دەروێشی، گەڕاوەتەو زێدی خۆی و لەوە بەدوا، خەڵکێکی زۆ ڕوویان لەوێ کردووە و بەهرەیان لێ بردووە.

کاتێ کە قزڵباشانی سەفەوی، بۆ پەرەدان بە مەزهەبی شیعە، کەوتنە جەستەی خەڵکی سوننەی کوردستان و ئازربایجان و هەراسیان لێیان هەڵگرت، شێخ سونعولا و تاقمێک لە مریدان و خزم و کەس و کاری، باریان کرد و چوونە ناو خێلاتی کوردی وڵاتی عوسمانی؛ بەڵام پاش هێندێک، هاوڕێیانی تاقەتیان نەما و ناعیلاجیان کرد بگەڕێتەوە. لەم کاتەدا شۆفارانی قزڵباش، خەبەر دەبەن بۆ شائیسمایل (٩٠٧ــ ٩٣٠ ک. م.) کە وا شێخێکی هەڵاتوو، گەڕاوەتەوە. شا فەرمان دەدا بیبەنە لای و قزڵباشان خوایخوایی دەیگرن و دەیبەنە خزمەتی شا. شێخ نەک هەر کڕنۆش ناکا، لە جوابی هەڕەشە و گوڕەشەی شایانەدا بە بوێرییەکی تەواو و زمانێکی پاراوەوە هەموو کاری پێچەوانەی فەرمانی خوا و بێئاکاری دام و دەزگای شایی دێنێتەوە بیری و قسەی پێ ناهێڵێ و دەمی دەکاتە تەڵەی تەقیو و وا بەسەر ڕۆحیدا زاڵ دەبێ، فەرمانی کوشتنی بۆ نادرێ و تەنیا دەسپێرێ چاوی لێ دانەخەن و بەر بە کۆڕبەستن و وتاردان و ئامۆژگاری کردنی بگرن.

لەو کاتەوە مەولانا گردەنشین دەبێ و سەرەنجام دەوری ساڵی ٩٣٠ ک. م. ڕۆحی بەرزی جەستەی خەستەی بەجێدێڵێ و لە مەینەتی دنیا ڕزگاری دێ.

*العقد المنظوم فی ذکر أفاضل الروم.*

پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل ٢٥٢.

## حاجی خەلیفە

جەمالەدین ئیسحاقی قەرامانی حەنەفی، مەشهوور بە «حاجی خلیفە»، کوڕی موحەممەدی سۆفی، لە کوردانی قەرامانە کە ساڵی ٩٣٣ ک. م. لە دنیا چووە و پیاوێکی زانا و سۆفیمەشرەب بووە و چەند کتێب و نووسراوەی لێ بەجێماوە؛ وەک: پەراوێزی تەفیسری «*بیضاوی*»، «*التوابع*» لە سەرفدا و «*الرّسالة فی اطوار السُّلوک*».

*کشفُ الظُّنون*، ب ١، ل ١٦٤. *هدیةالعارفین*، ب ١، ل ٢٠٢.

## شێخ عەبدولغەفاری مەردۆخی

عەللامە شێخ عەبدولغەفاری یەکەمی مەردۆخی، ئەردەڵانی،[١] کوڕی مەولانا گوشایش، کوڕی ئەمیر موحەممەدی مەردۆخ، نازناو «*شیخ اَجَل*»، عارفێکی دڵئاگا و زانایەکی خاوەن قوتابخانە و خانەقا بووە کە پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، سەری بە شێخ شەمسەدینی شووشی سپاردووە و دوای وەرگرتنی ئیجازە، گەڕاوەتەوە هەورامان و لە شوێنێکدا ـکە پاشان ناوی بووە بە دگاشێخان، یانی گوندی شێخگەلــ تەکیە و خانەقایەکی کردۆتەوە و خەڵکی ئیرشاد کردووە.

زا و مەرگی شێخ عەبدولغەفار ٨٤٧ و ٩٣٤ ک. م. ڕوویداوە و لە دگاشێخان نێژراوە.

*تاریخ خاندان مردوخ*.

## وەجهی سنجاری

شاعیرێکی فارسیبێژی خەڵکی سنجاری کوردستانە کە لە چەرخی دەیەمدا ژیاوە. ئەم بەیتە هی ئەوە:

مَرا چنان کە منم جُملە خلق دانستند تو را چنان کە تویی هیچ کس نمی‌داند

*لغتنامەی دهخُدا*، پیتی و، ل١١٦، بە گێڕانەوە لە *مجمع الخواص*، ل٢٤١.

## مووسای لالایی[٢]

مووسا، کوڕی حوسەین، کوڕی مسافر، کوڕی حەسەن، کوڕی مەحموود، لە تایفەی کوردی «لالا»یە کە بۆ خوێندن، زۆربەی شارانی عیراق و شام چووە و پاشان لە حەلەب بۆتە مامۆستا و دەرسی گوتۆتەوە؛ بەڵام پاش ماوەیەک دەستی لە دەرس و مەدرەسە بەرداوە و بەشوێن مورشیدێکی دڵوشیاردا زۆر وڵاتان گەڕاوە و سەرەنجام مرادی خۆی دۆزیوەوەتەوە و بۆتە سۆفی و ئەمجار گەڕاوەتەوە حەلەب دەرسگوتنەوەی دەسپێکردۆتەوە.

مەولا مووسا پیاوێکی دیندار، دڵاوا، میهرەبان، خاکەسار و میواندۆست بووە و لە تەفسیر و حەدیس و فیقهدا باش سەریدەرچووە و لە کتێب و زاراوەی سۆفیانی ئەهلی عیرفانیشی زانیوە و ساڵی ٩٣٩ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

---

١. بەشی ناوەڕاستی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بەو بۆنەوە کە ماوەیەکی دوور و درێژ میرنشینی ئەردەڵان بووە، ناوچەی ئەردەڵانیان پێ گوتووە. شێخ عەبدولغەفاریش لەبەر نیشتەجێ بوون لەوێدا، جاروبارە بە «ئەردەڵانی» ناویان لێ بردووە.

٢. ئەمین زەکیبەگ لە مێژووەکەیدا، یەکێکیتر لە زانایانی کورد، بەناوی موسا، کوڕی حەسەنی لالانی شافیعی ناو دەبا کە ساڵی ٩٣٠ ک. م. بە تاعوون تێداچووە؛ بەڵام وێدەچێ هەر دووموسا یەک بن.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب۲، ل ۲۱۰.

## شێخی مەککی

سەید موحەممەد مزەفەری بەرزەنجی، ناسراو بە «شیخ مَکّی»، لە سەیدەکانی بەرزنجەی کوردستان و زانایانی سەردەرچووی چەرخی دەیەمی کۆچییە کە دواساڵەکانی ژیانی لە مەککەدا لانشین بووە و هەرلەوێش کۆچی دوایی کردووە.

**ئەم کتێبەی لێوە بە جێماوە**: «*الجانب الغربی فی حل مُشکلات ابن العربی*».

*تاریخ سُلَیمانیّە*، ل ۲۸۰.

## موحەممەدی فوزوولی

بەگوێرەی ئەوەی لە کتێبی «*دانشمندان آذربایجان*»دا نووسراوە، موحەممەد، کوڕی سلێمانی فوزوولی، لە شاعیرانی چەرخی دەیەمی کۆچی بووە کە هێندێک لە ژیننامەنووسان وەکوو خەڵکی بەغدایان ناساندووە و هێندێکیش لە خێڵی بەیاتترکی ئازربایجانیان زانیوە؛ بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوەی مامۆستا کریمسکی کە لە کتێبی «*تاریخ ادبّیات ترک*»دا نووسراوە، لە کوردەکانی ئازربایجانە کە بە سێ زمانی عەرەبی فارسی و ترکی شیعری گوتووە و دیوانیشی چاپ بووە.

**لە کتێبەکانی**: یەکیان «*حَدیقه السُّعَداء*»، وەرگەڕاوەی «*روضه الشّهدا*»ی کاشیفییە بە زبانی تورکی.

*دانشمندان آذربایجان*، ل ۳۰۰.

## ئیبنوکەدخودا گەرمیانی

زانایەکی ناوچەی شارەزوور بووە کە بۆ خوێندن زۆر شاران چووە و لە کۆڕی دەرسی زۆر لە مامۆستایاندا دانیشتووە و سەرەنجام لە خزمەتی عەللامە جەلالەدینی دەوانی، ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و پاشان چۆتە شاری کووتاهییە لە تورکیای ئێستادا و لەوێ دەرسی‌داوە و دادوەری کردووە.

ساڵی ۹٤۰ ک. م. دوای سەفەرێکی حیجاز و بەجێهێنانی حەج، لە «کووتاهییە»دا ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

*الشَقایق النّعمانیّة*، ب۱، ل ۵۲۳. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*.

## ئیبنوقەسساب

زەینەدین ئەبووهورەیرە عەبدوڕڕەحمان، ناسراو بە «ابن‌قصّاب»، زانایەکی کوردە کە بە کۆچ و بارەوە بۆ

حەلەب چووە و ساڵی ٩٤٢ لەو شارە کۆچی یەکجاری کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب٢، ل١٦.

## ئیلیاسی کەبیر

مەولانا ئیلیاسی کەبیر، خەڵکی ناوچەی قەڵاگۆرانی لای سەردەشتە کە هۆزی کوردی گۆرکی لێیە. ئیلیاس دوای خوێندنێکی سەرەتایی، ئەچێ بۆ میسر و لە خزمەتی عەللامە حافیز، کوڕی حەجەری عەسقەلانیدا ماوەیەک بەهرە دەبا و هێندێکی‌تر لە زانستەکانیش لای مامۆستایانی‌تر دەخوێنێ و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی و باقی ژیانی بۆ دەرس‌گوتنەوە و ڕاهێنانی قوتابیان تەرخان دەکا و لە نیوەی هەوەڵی چەرخی دەیەمدا لە دنیا دەڕوا.

*تاریخ سُلَیمانیّه*، ل٢٤٣.

## شێخ عەبدوڵڵای هەکاری

لە زانایان و مامۆستایانی چەرخی دەیەمی کۆچییە کە هێندێک کتێب و نووسراوەی لێ بەجێ‌ماوە؛ بۆ وێنە: پەراوێزی «*تفسیر بیضاوی*» لە سوورەی هوودەوە تا نەبەء، حاشیە بۆ شەرحی «*استعاره*»ی مەولا عیسامەدین ئیبراهیم، کوڕی موحەممەدی ئەسفەراینی.

*کشفُ الظّنون*، ب١، ل١٦٥، ب٢، ل١٧٩.

## شێخ عەبدۆی قوسەیری

شێخ عەبدۆ (عەبدە)ی قوسەیری خەڵوەتی، خەڵکی گوندێکی کوردی بەناوی «خینوو» لە ناوچەی قوسەیری شامە کە لە ساڵی ٩٤٤ ک. م. وەفاتی کردووە.

شێخ عەبدۆ سەرباشقەی تەریقەتی خەڵوەتییە، کە هێندێک کەشف و کەرامەتیان لێ گێڕاوەتەوە و مریدێکی زۆری هەبووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب٢، ل٥٣.

## ئەمیرشاهیی چەلەبی

ئەمیرشاهی، کوڕی قاسمی چەلەبی تەورێزی، پیاوێکی زانا و گەورە عەشایرێکی کوردی ئازربایجانی بووە کە لە دەورانی پاتشایی سوڵتان سەلیم‌خانی یەکەمی عوسمانیدا بۆ ئەستەمبووڵ چووە و لە لایەن سوڵتانەوە پلە و پایەیەکی باشی دەسکەوتووە و سەرەنجام ساڵی ٩٤٥ ک. م. مردووە.

کتێب و نووسراوەشی هەبووە؛ یەکیان مێژوویەکە بەناوی: «*سُلیمان‌نامه*».

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٤١٥.

## فیدائی لاجانی

ناسراو بە شێخزادە، کوڕی شەمسەدین موحەممەد، خەڵکی لاجانی موکوریانە. شەمسەدین موحەممەد سەرۆکی عەشیرەتێکی کورد بووە کە کاتی خۆی، بە خێڵ و خاوخێزانەوە کۆچدراوەتە شیراز و شێخزادە لەوێ لەدایکبووە و پێگەیشتووە و خوێندوویە و لەبەر زیرەکی و وردبینی، لە دەرباری شائیسمایلی سەفەوی (٩٠٧ـ٩٣٠) جێ خۆی کردۆتەوە و جارێک لە لایەن شاوە بۆ لای سوڵتان موحەممەدی شەیبانی، میری خوارەزم ناردراوە؛ زۆر بە باشی ڕاسپێرییەکەی بەجێ‌هێناوە و سەرکەوتووانە گەڕاوەتەوە و بەو بۆنەوە تەواو عەزیز بووە. بەڵام دواتر دڵئێشانێک قەوماوە و تۆراوە و کونجێکی هەڵبژاردووە و باقی ژیانی پشتی لە دنیا کردووە و ملی لە خوێندنەوە و عیبادەت ناوە.

شێخزادە شاعیرێکی چاک بووە و نازناوی «فیدائی» هەڵبژاردووە. ئەم چوارینە هی ئەوە:

زان دار بقا فتاده در دام عذاب آدم پی گندمی و ما بهر شراب
مُرغان بهشتیم، عَجَب نیست اگر او از پی دانه رفت و ما در پی آب

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب٢، ل١٠٥.

## شەهابەدین ئەحمەدی قوسەیری

شەهابەدین ئەحمەدی قوسەیری خەڵوەتی شافیعی، کوڕی نوورەدین عەبدوڕڕەحمان، مامۆستایەکی زانا بووە کە پاش عومرێک دەرس‌گوتنەوە و بارهێنانی قوتابیان، ساڵی ٩٤٧ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە و کتێبێک بەناوی «*الوصيّه السَّنّيه*»ی لێ بەجێ‌ماوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل١٤٢.

## جەمالی عیراقی

جەمالەدین ئەمیربەگ، لە کوردانی کوردستانی باشوور و سەر بە بنەماڵەیەک لە شێخان و ئەهلی تەریقەتە و بۆخۆی مرۆیەکی زانا و عارفێکی بەرکەتی بووە کە شیعریشی جوان داناوە و لە ناوەڕاستی چەرخی دەیەمدا ژیاوە. ئەم دوو بەیتە شیعری ئەوە:

اگر گویم نهال قامتت دلجوست می‌رنجی و گر گویم تو را بالای چشم ابروست می‌رنجی

شکایت چون کنم از آن دو چشم فتنه جوی تـو　　　که گر گویم سر زلف تو عنبربوست می‌رنجی

*تحفه‌ی سامی*، ل٥٧.

## خەیاڵی کۆنەپۆشی

شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ حەیدەر، لە سەیدەکانی کۆنەپۆشـی، شـاعیرێکی ئاکـار بـەرز و دڵوشـیار و دیندار بووە کە لە گوندی سەلەسی، لەولای ڕۆژهەڵاتی مەریوانەوە ژیاوە.

لە پەراوێزی بەشی یەکەمی دیوانی مامۆستا قانیع، بە ناوی «*گوڵاڵەی مەریوان*»دا، لەمەڕ خەیاڵـییەوە، وای نووسیوە: « خەیاڵی شاعیرێکی کۆنی مەریوانییە لە دەوروبەری سەدەی دەهەمی هیجریدا ژیاوە. ئەوەی کە لەم زاتە بەنرخە بەجێ‌مابێ، قورئانێک و دیوانێکی شیعری خۆیە بە خەتی خۆی؛ بەڵام هەردووکیان دڕاون و پەڕپووت بوون. دیوانەکەی دڵۆپەی باران شۆردوویەتەوە و ئیستفادەی کەمتر لـێ ئـەکرێ. بـە شـیعرەکانیا [کە بە کوردی سۆرانین] وا دەرئەکـەوێ کـە پیـاوێکی قەلەندەرمەشـرەب و وەتـەن‌دۆسـت بـووە؛ لـە زۆر میسراعیا کە ئەخوێنرێتەوە، شکاتی لە زوڵمی زەمانە کردووە و وا دەرئەکەوێ کـە دووسـێ دەفعـەیـەک کەوتووتە بەر تاڵان و بڕۆی قزڵباش و ئەردەڵان...».

*گوڵاڵەی مەریوان*، بەندی یەکەم، چاپی دووهەم، ١٩٧٠ز. ل٦٩و٧٠ و ٧١.

## سەیدی هەورامی یەکەم

لە ڕۆژنامەی ژین، ژمارەی ١٣٨١، ساڵی ١٩٥٨ز. وتارێک بە ناوی «*شـیعر و شـاعیرەکانمان*» چـاپ کـراوە و لەمەڕ سەیدییەوە وای نووسیوە: «سەیدی لە بڕانەوەی چەرخی ١٥ی زایینیدا ژیاوە و ٤٥٨ ساڵ لەوەو پـێش مردووە و لە گوندی ڕەزاوی هەوراماندا نێـژراوە. ئـەو بێجگـە شـیعر و شـاعیری، لـە بژیـشکی و گیاناسـیدا شارەزایەکی تەواو بووە و نەخۆشانی دەرمان کردووە...».

مامۆستا موحەممەد ئەمینی کاردۆخی لە پێشەکی «دیـوانی سـەیدی»دا ـکـە خـۆی کـۆی کردۆتـەوە و لەچاپی‌داوەـ دەڵێ: «داخەکەم ژین، ناوی نووسەری وتارەکە و ئەو سەرچاوە ئـەو شـتانەی لـێ وەرگرتـووە، نەنووسیوە. بە لای منەوە هەڵەی زۆرە؛ لە ساڵی ژیانیا بەتایبەتی، کە بەتەواوی ڕوون بووەتـەوە سـەیدی لـە زەمانی شێخ عوسمانی تەوێڵەدا بووە و تا ساڵی ١٢٦٥ی کۆچی ژیاوە؛ خانووەکەشی لـە شـاری هـەورامانی تەخت، لە کوردستانی ئێرانا ئێستاش ماوە...».

بەڵام وەک زۆرێک لە مێژووی ئەدەب‌ناسان دەڵێن، دوو شاعیری هـەورامی بـە نازنـاوی «سـەیدی»مـان هەبووە؛ کە هەکیان بە هەورامی شیعریان گوتووە. بەڵگەی ڕوونی ئەم گوتەیەش ئەو شیعرانەیە کە دەدرێتە پاڵ ناوی سەیدییەوە، هێندێکیان بە شێوە زاراوەی کۆن و هێندێکیش نوێ. ئـەم دوو شـێوە تـا ڕادەیـەک

لێک دوورن که دژواره هی یەک شاعیر بن. کەوابوو لەم کتێبەدا دوو سەیدی ناو لێ دەبەین: یەکیان لە چەرخی دەیەمدا ژیاوە و بە زاراوەی هەورامی کۆن شیعری گوتووە و ئەوی دیکەیان لە بڕانەوەی چەرخی سێزدەدا بووە و شیعرەکانی بە زمانی هەورامی ئێستایە.

سەیدی یەکەم، ناوی سەید موحەممەد سادق، کوڕی سەید عەلی، لە نیوەی یەکەمی چەرخی دەدا ژیاوە و پیاوێکی زانا و شارەزا لە کاری بژیشکی و گیاناسیدا بووە و نەخۆشی بە دەوا و مەعجوونی گیایی، دەرمان کردووە. شیعرە کوردییەکانی بە زاراوەی هەورامی کۆنن و بە فارسیش شیعری گوتووە و شیعری بە کوردی و فارسی و هەروەها کوردی و عەرەبیشی لێ بەجێماوە.

**چەند نموونە لە شیعری سەیدی**:

ئەز ئورۆمۆن مەکانم بێ و وڵاتم
سەر و پیری خوای گیرەن خەڵاتم

بەرۆ دەرویش لوۆ سەیرۆ وەڵاتۆ
نەنیشتوو هیچ وەڵاتێونە، نە ساتم

لوۆ ژێوار مەبوو شێتو نیشاتێ
نیشاتێ شێوناش عەیش و نیشاتم

نیشاتۆ کاکە بارۆمی خەجەڵنۆ
خەمیش بەرگم پەژارەش بوو خەڵاتم

چەنۆ ئاخ و خەمو مەن پەی نیشاتێ
سیوا و ئاخۆ نیۆ هیچ دەستەڵاتم

نیشات ئەر میر و مەللای پەرسە دادم
شکاتوو تۆن، شکاتوو تۆن، شکاتم

نەژیڤانۆ مەژیڤۆ بێ تە ساتێ
حەیاتە منی، حەیاتە منی، حەیاتم

نیا پەی تە، قەرەار و ژیو تاڵا
بەرێنی شەکرم و قەندم، نەباتم

تە خۆ نەبوە وەفات هەرگیز چەنی مەن
بینایيم! بێ وەفاییت بەر وەفاتم

ئەز ئەر دیڤانەتە ئەر شێت و سەرسام
پەکەم تۆنی، تە قستەن موشکڵاتم

تەمەم بەستێنە نێ ئاچاڵ و زنجێ
کە دەی چا کەوسەرە ئاو و حەیاتم

لوڤۆنۆڤە، سەر و توفوو جەحێڵی
دەرەک پیر نوشرەن وەخت و سەعاتم

تە بەرزا دەی زەکات و نازەنینیت
ئەزیش دەرویش و تە، سا دە زەکاتم

* * *

نازەنین! مەن پەی تە ژینم تاڵەنە
وَز فراقت زار مینالم چو نی

چند گویی خواهم آمد پیش تو؟
سامەڕۆ، هەی بێوەفا کەی مێنەمەی

شد سفید از راه تو چشم اُمید
ئینتزار نۆ بەینە لام، ئانا نەمەی

ئەر سەراسەر زیڵ و مەن گێلێش چەنێ
غَیْرَ حُبِّک فی فُؤادی لَیْسَ شَیْ

یار «صیدی» گر ببینی ناصحا
ماچی حەق شۆ ئاشقۆ، ئینساف مەدەی

لاو و پیر، مەلا و میر ئەر ئاشقۆ
ما علَیْهِم لَوْمَةٌ الاَ علی

کـــالبم ئـــاویر و دووریـــت ســـۆچنا / کـــس نـــزد آب آتـــشم را وای و وی
ناڕپـــستانی ز هجـــرش گـــشتەام / ناتەڤـــۆن و زەرد و زایـــف پێـــسە بـــەی

ئەمەش غەزەلێکی زۆر جوانی فارسی سەیدی:

برگ گُل بهشت لب مىپرست تُست / مستى كه هوشيار نشُد چشم مَست تُست
مرگ از محبت تو خلاصم نمى كند / در زير خاك نيز دلم پايبست تُست
خواهى عمارتش كُن و خواهى خراب كن / امروز در قلمرو دل، دست دست تُست
اى شاخ گُل! منال كه امروز روزگار / بر مطلبى كه دست ندارد، شكست تُست
هركس خدنگ ناز كمال تو ديده است / داند كه زخم سينهى «صيدى» ز شست تُست

پێشەکی دیوانی سەیدی، چاپی سلێمانی، ١٩٧١ز. یەک ـ دوو بەیازی دەسنووس.

## بورهانەدینی موقەددەسی

بورهانەدین ئیبراهیم، کوڕی والی، کوڕی نەسری موقەددەسی کوردی، ناسراو بە «ابنُ‌الوالی»، لە شەرعزانـانی حەنەفی و موفتی و مامۆستای شاری غەززە بووە کە ساڵی ٩٦٠ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الدُّرَّة البُرهانيّة فى نَظم المقدمة الآجروميّة*» لە نەحودا و «*تُحفة العُبيد فى الخيل و الرّماية و الصيد*».

*هديةالعارفين*، ب١، ل٢٧.

## عەبدوڵڵای بوزەینی

عەبدوڵڵای بوزەینی کوردیی شافیعی، پیاوێکی زانا بووە لە خێڵی بوزەین، کە ماوەیەک لە ئەسفەهاندا ژیـاوە و پاشان ڕووی لە شام ناوە و ساڵانێکی زۆر لەوێ دەرسـی‌داوە و سـەرەنجام ساڵـی ٩٢٦ ک. م. لـە دنیـادا نەماوە.

*مَشاهيرالكُرد*، امين زَكى‌بيگ، ب٢، ل٥١.

## عەبدوڕڕەحیمی کەوواء

کوڕی عەبدولکەریم، مەشهوور بە «کَوّاء»، خەڵکی ئامید (دیاربەکر) و لە سـۆفییانی خەڵـوەتی، نیـشتەجێی شاری حەڵەب بووە کە زۆرتر وتاری داوە و خەڵکی ئامۆژگاری کردووە و پاش سەدسـالان، ساڵـی ٩٦٣ ک. م. لە دنیا چووە.

*مَشاهيرالكُرد*، امين زَكى‌بيگ، ب٢، ل٢٣.

## حوسەینی مالیکی دیاربەکری

کوڕی موحەممەد، کوڕی حەسەن، لە زانایانی ناوداری فیقهـ و سیره و مێژووە کە زێدی خۆی بەجێهێشتووە و بۆ مەککە چووە و لەوێ زۆرتر خەریکی نووسین و دەرس‌دان و دادوەری بووە و ساڵی ٩٦٦ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الخَمیس فی احوال انفَس نَفیس*» لە بارەی ئەنبیای پێشین و ئاکار و ڕەوشتی پێغەمبەری ئیسلامەوە (د)، «*تاریخ خُلفا*» تا بڕانەوەی دەوڵەتی چراکیسە لە میسردا (٢بەرگ) و نامیلکەیەک لە بارەی ئەندازە و ڕووبەری کەعبە و مەسجیدولحەرامەوە.

*تاریخ آداب اللغة العَرَبیّة*، جُرجی زَیدان، ب٣، ل٣٠٨.
*الأعلام*، ب٢، ل ٢٨٠. *هدیة العارفین*، ب١، ل٣١٩.

## عەبدولخەللاقی خێزانی

مەولانا عەبدولخەللاقی خێزانی لە زانایان و پیاوچاکانی گەورەی شاری بدلیس بووە کە لە چەرخی دەیەمدا ژیاوە و زنجیرەی تەریقەتی دەگاتەوە بە عارفی ڕەببانی شێخ ڕوکنەدینی عەلائوددەولەی سمنانی (د).

مەولانا شاعیرێکی باش بووە و زمان و وێژەی عەرەب و فارسی چاک زانیوە. ئەم چەند بەیتە تەڵبژێری قەسیدەیەکە بە باڵای شاری بدلیس و سروشتیدا گوتووە:

وه چه بدلیس، که شرمنده و خجلت‌زده‌اند — آب خضر و نفس عیسی از آن آب و هوا
چه مقامی است که از نزهت و پاکیزگیش — شده از روی زمین باغ ارم ناپیدا
چه دیاری است که از طیب وی آهو چو شنید — خواست صحرای خُتن را کند آن‌لحظه رها
چه زمینی است که از صفوت خاك خوش او — از گلستان جنان آمده عمری است صبا،
تا غباری بَرَد از ساحت پاکش سوی خلد — که کند غالیه‌انگیزی جعد حُورا
لیك هرچند که سرگشته در آن کوی دوید — به غُباری نشدش دسترس از عین صفا

*شرفنامەی بدلیسی*، چاپی میسر، ل٤٥٢.

## مەلا عەبدوڵڵای قازی

مەلا عەبدوڵڵای قازی، کوڕی مەلا عەبدولعەزیز، کوڕی مەلا حوسەین، لە پشتی مەلا یەعقووبی قازی، سەرباشقەی قازیانی هەورامان و مەولانا گوشایشی کوڕی بابامەردۆخەیە کە لە چەرخی دەیەمدا ژیاوە و پیشەی باوانی (دادوەری) بووە و دەرسیشی گوتووە. کتێبێکی لە بارەی مێژووی هەورامانەوە نووسیوە کە

خوالێخۆشبوو ئایەتوڵڵای مەردۆخ، لە مێژووەکەیدا بەهرەی لێ بردووە.[١]

*تاریخ مَردوخ*.

## عەبدوڵڵا ئەفەندی عەبدی

لە گەورە زانایانی کوردستان لە دەوڵەتی عوسمانیدایە کە چەند نووسراوەیەکیشی هەیە. دوایین پیشەی عەبدی، دادوەری شاری نابلوس بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب٢، ل٤٥.

## مەیلی

مەولا موحەممەد ئەفەندی، نازناو «مَیلی»، جێگری بەجێگەی موفتی ئەبوسسوعوودی ئامێدی ئەسکلیبی، لە زانایانی چەرخی دەیەمە کە ساڵی ٩٣١ ک. م. هاتۆتە دنیا و لای بابی خوێندنی دەسپێکردووە و لە خزمەتی مامۆستا شەمسەدینی «فَنّاری»دا دوایی پێ هێناوە و بۆتە مامۆستای قوتابخانەیەکی شاری ئەدرنە و پاش ماوەیەک بۆ دادوەری چۆتە حەلەب و هەر لەوێ لە تەمەنی چل‌ساڵاندا کۆچی دوایی کردووە.

مەیلی زانایەکی زیرەک، وردبین، دوورنوارِ و بەئاکار بووە و لە زمان و وێژە و مێژوو و سیرەدا باش سەریدەرچووە؛ خەتی نەسخی جوان نووسیوە و شارەزای ڕابردەی خۆشنووسی و بەسەرهاتی خۆشنووسان بووە و پارەیەکی زۆری بۆ سەندنی خەتی جوان خەرج کردووە و کۆمەڵێکی بایەخداری خۆشنووسی کۆ کردۆتەوە؛ زمانی فارسی چاک زانیوە و بە فارسی شیعری جوانی هۆنیوەتەوە.

**دوو غەزەلی فارسی مەیلی**:

به آیین وفا بستی میان را، یا خیال است این — چنین نازک‌خیالی، کی توان بستن، محال است این
ز بالای تو حیران نیشکر، سرو گلستان هم — عجب شیرین شمایل قامت بااعتدال است این
نهان شد آفتاب و ماه نو خوشتر نمی‌آید — ز رویت آن خجل وز ابروت در انفعال است این
مکن عیبم اگر می‌نالم از بار غم هجران — غم هجران مگو، صدگونه اندوه و ملال است این
ز حال «میلی» دلداده‌ی مجنون نپرسیدی — نیامد هیچ از او یادت، نمی‌دانم چه حال است این

* * *

تو را، ای دوست! آرام دل و جان می‌توان گفتن — به جان‌بخشی لَبَت را آب حَیوان می‌توان گفتن
قَدَت مانند سرو ناز، چون قامت برافرازی — چو بخرامی، تو را سرو خرامان می‌توان گفتن

١. شوێنی ئەو کتێبە ئێستا گومە؛ بەڵام ئایەتوڵڵا دەڵێ ڕوونووسێکی لێ هەبووە کە پاشان لەناو چووە.

بریزی بی گُنه هر لحظه خون صد مسلمان را | تو را ای تُرک بدخو، نامسلمان می‌توان گفتن
به کویت گُلرخان جمعند بهر دیدن رویت | سر کوی تو را رشک گلستان می‌توان گفتن
مه من با تو دارد «میلی» بی‌خانمان حرفی | ولی حرفی که پنهان از رقیبان می‌توان گفتن

*العقد المنظوم فی ذکر افاضل الرّوم*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل ١٤٨- ١٥٠.

## مەولا جەعفەری ئامێدی

برای شێخ مەحیەدینی ئامێدییە کە لە شاری ئەسکلیبی تورکیا لەدایکبووە و دوای سانەوە لە خوێندن، ماوەیەک لە قوتابخانەی سوڵتان بایەزید خانی شاری ئەدرنەدا دامەزراوە و دەرسیداوە و هێندێک لە دمشق قازی بووە و لە ئاناتۆل قازیعەسکەری کردووە و سەرەنجام ساڵی ٩٧٨ ک. م. لە دنیا چووە.

مەولا جەعفەر مرۆیەکی پارێزکار، دڵپاک و یەکجار دیندار بووە و کاتی پشوودانی بە خوێندنەوە و عیبادەت ڕابواردووە.

*العقد المنظوم فی ذکر افاضل الرّوم*.
پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل ٢١٠ و ٢١١.

## شێخ ئەبووسەعیدی کورد

مەولانا شێخ ئەبووسەعید، کوڕی شێخ سونعوڵا، لە کوردانی گوندی کۆزەکنانە لە ئازربایجان و ساڵی ٩٢٠ ک. م. هاتۆتە دنیا؛ وەک شاعیرێک ئێژێ:

هشت ذیقعده سال نهصد و بیست | متولد به ساعت خَیر است
بوسعیدی که داد ما را حق | ثانی بُوسعید بُوالخیر است

**واتا**: هەشتی زیقعدەی ساڵی نۆسەت و بیست، لە ساتێکی پیرۆزدا هاتەدنیاوە؛ بووسەعیدێ کە خودا پێیداوین، لفی ئەبووسەعیدی ئەبولخەیرە.[1]

بابی تا هەبووە خوێندنەوە و نووسین و وانە سەرەتاییەکانی سەرف و نەحوی پێ فێر کردووە و کە ئەو چووە، بۆخۆی کەوتۆتە گەڕان بە ئازربایجان و کوردستاندا و لە خزمەتی مامۆستایانی شارەزا بەهرەی بردووە، تا لە باری زانستییەوە گەیشتۆتە پایەیەکی بەرز و زانایانی ئەوزەمانە هەموو پەسندیان کردووە. ئەوجار بۆ

١. فەزلولا، کوڕی ئەحمەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی ئیبراهیمی میهەنی (٣٥٧- ٤٤٠ ک. م.)، لە گەورەترین عارفان و شاعیرانی فارس‌زبانە.

بەجێ‌هێنانی حەج، ڕووی لە حیجاز کردووە. قزڵباشانی سەفەوی ـکە لەبەر ڕوت و ڕاست بوون و نەترسانی، لە دڵەوە ڕکیان لێ بووەـ پێشی پێ دەگرن و سەفەری لێ قەدەغە دەکەن. بەڵام ئەبووسەعید ئەوینی زیارەتی ماڵی خوا و ڕامووسانی بارەگای پێغەمبەری مەزن (د) وای بێ‌تاقەت کردووە، گوێ نەداوە و شەوەناوێک هاوڕێ مامی، پەنامەکی وەڕێ کەوتوون؛ بەشکوو بتوانن بێ وەی دەرباز بن. بەیانی ئەو شەوە قزڵباش پێیان دەزانن و شوێنیان هەڵدەکەن و لە گوندێکی سنووردا تووشیان دەبن و بە کەلەپچەکراوی وەریان‌دەگەڕێننەوە.

بە فەرمانی شاتەهماسب (٩٣٠ ـ ٩٨٤) پارەیەکی زۆریان بە ناوی تاوانی سەرپێچی لە فەرمان، بۆ بڕیار دەدەن و چونکوو هیچیان دەسیان نەچووە و ماڵ و سامانێکی وایان نەبووە پوولێکی وەهای لێ شین ببێ، هەچێکیان هەبووە هەڕاجی دەکەن و بە ئەمری شا، خۆشیان لە سیاچاڵ دەخەن و بە هەموو شێوەیەک ئەشکنجەیان دەدەن. بۆ وێنە: پلیان لێ بڕیون و بەر سەگیان خستوون.

کاتێ کە سوڵتان سلێمان‌خانی قانوونی (٩٢٧ ـ ٩٧٤)، لەشکری بەرەو ئازربایجان کێشاوە، شێخ ئەبووسەعید و مامی لە زینان دەرباز دەبن و خۆ دەخەنە خاکی عوسمانی. لە شاری ئامید، مامی شێخ، لەبەر پیری و ئازاری زیندان، زیاتر بڕ ناکا و ساڵی ٩٥٥ ک. م. لە ژیان ڕزگاری دەبێ. شێخیش لەوێوە دەچێتە شام و پاش ماوەیەک دەگاتە قوستەنتەنییە (ئەستەمبووڵ).

ڕۆسەم‌پاشای سەرەک وەزیر، کە لە بەسەرهاتی شێخ ئاگادار بووە، زۆری ڕێز لێ دەگرێ و بە فەرمانی سوڵتان قوتابخانەیەک و چەند قوتابی بۆ دادەنێ و مانگانەیەکی بۆ بڕیار دەدا (ساڵی ٩٦١).

سەرەنجام ساڵی ٩٧٦ سەفەری حیجاز دەکا و بە ئاواتی لەمێژینەی دەگا و ساڵی ٩٨٠ ک. م. گیانی پاکی بەرەو بارەگای خاوەنی گیانان دەڕوا.

شێخ ئەبووسەعید پیاوێکی زانا لە هەموو زانستە ئیسلامییەکان و یەکجار شارەزا لە فیقهـ و ئوسوولدا بووە و لەوپەڕی پاکی و پارساییدا ژیاوە. دەستێکی ئاواڵە و دڵێکی دلۆڤان و زمانێکی ڕاست و سەرێکی نەترسی هەبووە و ژیانی بە سەڵتی ڕابواردووە و قەت خۆی سەرقاڵی ماڵ و خێزان نەکردووە. گڵکۆی لە پەنای بارەگای یەک لە ناودارانی زانست و عیرفانی ئەستەمبووڵ، شێخ وەفایە. شاعیرێک لەم بارەوە گوتوویە:

| | |
|---|---|
| چون شیخ ابوسعید مرحوم | زین دار فنا به آبرو شد |
| از بس که وفا نمود با خلق | میدان «وفا» از آن او شد |

*العقد المنظوم فی ذکر افاضل الرّوم*. پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکان*، ب٢، ل ٢٥٢. یەکێ ـ دوان سەرچاوەی تر.

## شێخ وەلی زێباری

کوڕی عوسمان، لە کوردانی زێباری سەر بە ئامید و شێخانی زانای چەرخی دەیە کە لە دیاربەکر دەرسی داوە و

چەند بەرهەمێکی لێ بەجێ ماوە؛ لەو ناوە، کتێبی: «*انیسُ العارفین*» لە سۆفییەتیدایە کە ساڵی ٩٦٧ ک. م. دایناوە.
*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٠١.

## ئەبووسوعوود موفتی ئامێدی

شێخولیسلام ئەبووسوعوود موحەممەد ئەفەندی موفتی، جێگری شێخ موحەممەد مەحیەدینی ئامێدی ئەسکلیبی، لە زانایان و مامۆستایانی هەڵکەوتەی کورد لە وڵاتی عوسمانیدا بووە کە خوێندنی لای بابیەوە دەسپێکردووە و بە شێلگیری و تێکۆشانی زۆرەوە، لە زوربەی زانستەکانی ئەو سەردەمەدا شارەزایی پەیدا کردووە و ساڵی ٩٤٤ ک. م. هاوکات لەگەڵ دەرس گوتنەوە، کاری قازیعەسکەریشی وەئەستۆ گرتووە و لە ساڵی ٩٥٢ دا بووە بە شێخولیسلام و موفتی وڵاتی عوسمانی و تا دوا ساتی ژیانی لەو جێگە و پێگەیەدا ماوەتەوە.

کۆچی دوایی ئەبووسوعوود ساڵی ٩٨٢[1] ک. م. ڕوویداوە و لە پەنا مەرقەدی ئەبووئەییووبی ئەنساری سەحابیدا نێژراوە.

موفتی ئەبووسوعوود بۆ بەرزەخۆیی و چاوتێری و پاراستنی کەسایەتی خۆی، بەناوبانگ بووە و بە ئاکاری پەسند و خۆ و خدەی ڕندەوە کۆشیویە بایەخی بەرگی مامۆستایی هەرچێک زیاتر بکاتەوە. کتێب و نووسراوەشی زۆر بووە و لە هەموو بایەخدارتر تەفسیرێکی قورئانی پیرۆزە بە ناوی «*ارشاد العقل السَّلیم الی مَزایا الکتاب الکریم*» کە لە پەراوێزی تەفسیری کەبیری ئیمام فەخری ڕازیدا، لە میسر، چاپ کراوە.

**باقی کتێبەکانی**: «*حسم الخلاف فی المسح علی الخفاف*»، «*ثواقبُ الانظار فی اوائل مَنار الانوار*»، «*غَمَزات المليح تعليقة علی التلويح للتفتازانی*»، «*التلويح فی شرح التّنقيح*» لە ئوسوولدا، «*بضاعة القاضی فی الصُّکوک*»، «*مَعاقد الطَّراز فی وقف النُّقود و جَوازه*»، «*موقف العقول فی وقف المنقول*» و «*الفتاوی*».

ابووسوعوود لە زمان و وێژەی عەرەبدا شارەزاییەکی تەواوی هەبووە و شیعریشی گوتووە و قەسیدەی دوور و درێژ و زۆر بەقەوەتی لێوە بەجێماوە. بۆ وێنە قەسیدەیەکی میمییە بریتی لە ٩٤ بەیت کە تێیدا بەرهەڵستی قەسیدە میمییەکەی ئەبووعەلای مەعەڕڕی کردووە. ئەوا چەند بەیتی سەرەتای ئەو قەسیدە:

أبَعْد سُلَيْمی مَطْلبٌ و مرام؟ و غَيْرُ هَواها لَوْعَةٌ وَ غَرامُ
و فَوْقَ حماها مَلْجَأ و مثابَةٌ و دُون ذُراها مَوْقفٌ وَ مَقامُ
وَ هَيْهاتَ اَنْ يُثنی الی غَيْر بابها عنانُ المطايا اَوْ يُشَدَّ حزامُ
هیَ الغايَةُ القُصْوی وَ انْ فاتَ نَيْلُها فكُلُّ مُنَی الدُّنيا عَلَیَّ حَرامُ

---

١. ئەم ڕستە بەرامبەر بە حیسابی ئەبجەد، ساڵی مردنیەتی: «قَد أنتَقَل المولی ابوالسُّعود= ٩٨٢».

پێڕای نامەیەکی بە شیعر، بۆ دۆستێکی ـ کە بو ڕاسپێرییەک ناردراوە ـ ئاوای نووسیوە:

یـــا بائنـــاً وَ مَحَلُّـــهُ بفُـــؤادی کَیْـــفَ البعـــادُ وَ أیْنَمـــا تَمْتـــازُ
زُمَّـت رکابـکَ للرَّحیـل بـدَوْلَـةِ الله جـــارک حَیثمـــا تَجْتـــازُ
وَجْـدی وَ أشـواقی الیـک حَقیقَـةٌ وَ الـشَّوقُ مِنْـه حَقیقَـةٌ وَ مَجـازُ

*العقـد المنظـوم فـی ذکـر افاضـل الـرّوم*.
پەراوێزی *تاریخ ابن خَلکـان*، ب٢، ل ٢٨٢–٣٠٥.

## قازی مەحیەدینی گۆرانی

لە زانایان و وێژەوانانی گەورەی شارەزوور بووە کە ساڵی ٩٨٢ ک. م. لـە شـاری حەلەبـدا، پـاش عومرێـک دەرس گوتنەوە و وتاربێژی و ئامۆژگاری، لە دنیا چووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی بیگ، ب٢، ل١٨٧.

## موحەممەد ئەفەندی دەفتەری

ئەبولفەزل موحەممەد، کوڕی مەولانا حەکیمی ئیدریسی بدلیسی[١]، لە زانایـان و مامۆسـتایانی هەڵـکەوتەی چەرخی دەیەمە کە ماوەیەکی زۆر ئینشابەندی تایبەتی دەفتەر و دیوانی سوڵتان سـەلیمخـانی عوسمـانی بووە.

ساڵی کۆچی دوایی ئەبولفەزلی دەفتەری لە کتێبی «*کەشف الظنون*»دا، جارێـک ٩٨٧ و جـارێکی تـر ٩٨٢ ک. م. نووسراوە.

**لە کتێبەکـانی**: «*جریـدةالاثـار و خریـدةالاخبـار*»، «*تعریـفُ التَّلبیس و تبعیـدُ الابلیس*»، «*مـداحِ الاعتقـاد*» لـە سۆفیگەری و سەیر و سولووکدا، وەرگەڕانی تەفسیری «*مواهب کاشفی*» بە زبانی ترکـی، «*تـاریخ ابوالفـضل*»، پەراوێزێکی فارسی بۆ کتێبی «*هَشت بهشت*» نووسراوی بابی و *دیوانی* شیعر.

*کـــشفُ الظُّنـــون*، ب١، ل٢١٦ و ٢١٨، ب٢، ل٥٣٤ و ٦٥٦.
*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٢٥٣. *شرفنامەی بدلیسی*، ل ٤٥٠ و ٤٥١.

## ئیبنوبەرزان

مەحموودی کوڕی ئەحمەدی ئسکلیبی، ناسراو بە «ابن‌بَرزان»، بابی لە کوردانی بارزانی بووە کە بۆ ئسکلیبی

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١٥٠.

تورکیا چووە و مەحموود لەوێ لەدایکبووە و کە پێگەیشتووە، خوێنـدنی دەسـپێکردووە و زۆری کۆشـاوە و سەرەنجام مامۆستای مەزن، موفتی ابووسوعوود، ئیجازەی پێ داوە.

ئیبنوبەرزان لە زمان و وێژەی عەرەبدا ناوبانگی دەرکردووە و سەرەنجام مانگی شەوالی ساڵی ٩٨٣ ک. م. لە ئەستەمبووڵ لە دنیا چووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب٢، ل١٧٩.

## وەلی مەردۆخی

شێخ شەمسەدین، کوڕی شێخ عەبدولغەفاری مەردۆخی ئەردەڵانی، عارفێکی دڵوشیار و زانایـەکی بـەئاکار بووە کە لەبەر پارێزکاری و ڕیازەتی زۆر بە «وەلی» ناوی دەرچووە.

شێخ شەمسەدین مامۆستایەکی کەموێنە بـووە و لـە بیرکـاری و ئەستێرەناسـی و حیکمەتـدا بـە پلـەی پسپۆڕی گەیشتووە و لە هەموو لایەکەوە، قوتابیـان و خوازیـارانی ئـەم زانـستانە، خۆیـان پـێ گەیانـدووە و بەهرەیان لێ دەسکەوتووە.

زا و مەرگێ ئەم مامۆستایە، ساڵانی ٩١٢ و ٩٨٥ ک. م. لە هەورامان ڕوویداوە.

*تاریخ مردوخ*.

## شەهابەدینی حەسکەفی

مەلا شەهابەدین ئەحمەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی یۆسفی حەسـکەفی شـافیعی، زانایـەکی وێژەوان و شاعیرێکی هۆزانە کە ساڵی ٩٣٧ ک. م. لە حسن‌کیـف هاتۆتـە دنیـا و دوای دەرس و دەور، لـە قوتابخانەی مەلاتییەی شاری حەلەب دامەزراوە و دەرسی‌داوە.

**لە کتێبەکانی**: «*مُنتهی اَمَلِ الادیب*»، «*الرَّوضـة الوردیّـة فـی الرِّحلـة الرُّمیّـة*»، «*مختَـصر شـقایق النُعمـانیّـة*»، «*عقودُالجمان فی وصف نبذة من الغلمان*»، «*مُختَصَر تاریخ الذهبی*»، «*شرح الشّواهد للسّیوطی*» و «*شرح الغزّی فی الصّرف*».

مەلا شەهابەدین لە ساڵی ٩٩٠ کۆچیدا، نزیـک بـە شـاری حەلـەب، جووتیارێـک لێـی‌داوە و شـەهیدی کردووە.[١]

*هدیۃالعارفین*، ب١، ل١٥١. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل١٠٣١ و ١١٣٩ و ١٣٧١.

---

١. زرکلی لە «*الأعلام*»، ب١، ل٢٤٤، ساڵی ١٠٠٣ نووسیوە.

## شێخ ڕەزا کاکۆزەکەریایی

شێخ ڕەزا موعینەدین، کوڕی مووسا، کوڕی مەحموود شوجاعەدین،کوڕی یۆسف، کـوڕی عەبـدوڕڕەحمان، یەکێکی‌تر لە مەشایخی بەناوبانگی کاکۆزەکەریاییە کە پاش دوایی هاتنی خوێنـدن لـە کوردسـتان، چۆتـە مەککە و ماوەیەک لە خزمەتی عەللامە شێخ ئیبنوحەجەری هەیتەمیدا بووە و بەهرەی لێ بردووە.

شێخ ڕەزا موعینەدین بێجگە باری زانستی، لە بواری تەریقەت و عیرفانیشەوە شێلگیر بووە و بۆ ڕێنـوێنی خەڵـک زۆری کۆشـیوە. کتێبێکـی بـە نـاوی «*مَسلَکُ السّالِك*» لـەمـەڕ داب و دەسـتووری ڕێبازەکـانی سـۆفییانەوە، بـە فارسـی نووسـیوە و تێیـدا باسـی ڕێ و ڕەوشـی نەقـشبەندی و قـادری و خەڵـوەتی و سوورەبەردی و چەشتی، بە دوور و درێژی کردووە.

ئەم عارفە زانایە لە ئاخر و ئۆخری چەرخی دەی کۆچیدا کۆچی یەکجاری کردووە.

*نورالانوار. تاریخ مردوخ.*

## شاحوسەینی بدلیسی

مەولانا شاحوسەینی بدلیسی، عارف و زانایەکی شاری بدلیـسە کـە وەک *شـەرەفنامە* دەڵـێ، لـەو شـارەدا مزگەوت و خانەقایەکی بووە و بە مۆچیاری و ڕێنوێنی خەڵکەوە پـەرژاوە و پـاش ١٢٠ سـاڵان، لـە کۆتـایی چەرخی دەدا، چرای عومری داییساوە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٢٥٢.

## شوکری بدلیسی

شوکری‌بەگی بدلیسی، زانایەکی ویژەوان و شاعیرێکی گفت‌جوان و مێژووناسێکی هۆزان بووە کە ماوەیـەک خزمەتی ئەمیر شەرەف‌خانی بدلیسی کردووە و دواجار بۆ دەرباری سوڵتان سەلیم‌خانی عوسمانی چـووە و لە ڕیزی هاودەنگان و میرانی سوڵتاندا جێی‌گرتووە.

شوکری‌بەگ ڕووداوانی دەورانی سوڵتان سەلیمی دووەمی (٩٧٤– ٩٨٢ ک. م.) بە شـیعر هۆنیوەتـەوە و ناوی«*فتوحات سَلیمیَّه*»ی لێ ناوە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٥١. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٢١٩ و ب٢، ل١٧٤. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٤١٩.



# چەرخی یازدەهەم

## یۆسفی سدیقی

زانای پارێزکار، یۆسفی سدیقی شاهۆیی، کوڕی قازی مەحموود، کوڕی کەمالەدینی گۆرانی، لە عەشیرەتێک بە ناوی ڕویسی سەر بە هەورامانە.

یۆسفی سدیقی لە زانست و زمان و هەروەها پارسایی و عیرفاندا، پلە و پایەیەکی بەرزی هەبووە و لەساڵی ١٠٠٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێز لەسەر «*خیالی شرح عقاید*»، پەراوێز بۆ «*شرح خطایی*»، دیسان زێوار لەسەر «*تفسیر بیضاوی*» و نامیلکەیەک لە مەنتیقدا.

*خلاصةالأثر فی اعیان القرن الحادی عشر*، ب٤، ل٥٠٨. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٦٥.

## مەولا موحەممەدی وانی

مەولا موحەممەد، کوڕی موستەفا وانی، ناسراو بە «وانقولی»، لە زانایان و مامۆستایانی بەناوبانگی چەرخی دەیە کە دانیشتووی شاری «برۆسە»ی تورکیای ئێستا بووە و زۆرتر کتێبی نووسیوە و دەرسی گوتووە و لە سەرەتای چەرخی یازدەی کۆچیدا (١٠٠٠ یان ١٠٠١) کۆچی یەکجاری کردووە.

مەولا موحەممەد گەلێک نووسراوەی بایەخداری لێ بەجێماوە؛ بۆ وێنە: «*نَقدُ الدُّر*» لە فیقهی حەنەفیدا، پەراوێز لەسەر «*فرائض سجاوندی*» و ...

*الأعلام*، ب٧، ل٣٢٠. *کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٣٩٨. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٢٩٠.

## یۆسفی ئەسەم

یۆسفی «اصم»ی شافیعی، کوڕی موحەممەدی سارایی[1] سۆرانی، مامۆستایەکی شارەزا لە هەموو زانستە ئیسلامییەکاندا و موجازی شێخ عەبدولکەریمی شارەزووری بووە؛ کە زۆربەی کاتی بە خوێندنی کتێبان و دەرس‌گوتنەوە ڕابواردووە و ئەگەر خوێندنەوەی نوسراوەیەکی دەسپێکردووە، وای تێدا نوقم بووە، کەسێ بانگی لێ کردبێ، نەیبیستووە؛ بەو بۆنەوە «اصم»، واتا کەڕیان پێ گوتووە.

**لە کتێبەکانی**: تەفسیرێک بە ناوی: «*مَنقولُ التّفاسیر*»، کتێبێک لە فیقهدا بە ناوی «*المسائل و الدلائل*»، زنجیرە پەراوێزێک بەسەر «*فرائض*»، «*شرح منهج*»، «شرح *شَمسّیه*»ی قوتب و «*شرح قول*»ی ئەحمەد و ...

یۆسف لە ساڵی ١٠٠٢ دا کۆچی دوایی کردووە.

*خُلاصة‌الأثر*، ب٤، ل٥٠٩. *هدیة‌العارفین*، ب٢، ل٥٦٥. *ایضاح‌المکنوُن*، ب٢، ل٥٥٤. *لُغتنامەی دهخُدا*، پیتی س، ل٢٨٣٣.

## شێخ عەبدوڵای ئەبدال

پیاوێکی بەرزەمژی، خەڵکی هەورامان بووە کە پاش دوایی هاتنی خوێندن و چەند ساڵێک قوتابی گرتن و دەرس‌گوتنەوە، بەجارێک بەزم و ڕەزمی قوتابخانە و دەرس‌ودەوری وەلا ناوە و بەشوێن مورشیدێکی تەریقەتدا زۆر شوێنان گەڕاوە و سەرەنجام لە بەغدا مرادی خۆی دۆزیوەتەوە و چۆتە نێو کۆڕی مریدانیەوە و ماوەیەکی زۆر سەری کردۆتە سەیر و سولووک و ڕیازەت‌کێشان و لە بەرێکەوە و وردە ــ وردە، بەرچاوی کراوەتەوە و تا ڕادەیەک لە پلەی عیرفان سەرکەووتووە کە عارفانی هاوچەرخی، لە ڕیزی ئەولیایان داناوە.

شێخ عەبدوڵلا ساڵی ١٠٠٣ ک. م. لە دمشق ژیانی سەردنیای وەلاناوە و لە زیارەتانی فەرادیسدا نێژراوە.

*خُلاصة‌الأثر*، ب٣، ل٨٥.

## مەولانا خدری بەبە

مەولانا خدری بەبەی خێرانی، زانایەک لە عەشرەتی بابان بووە کە لە شاری بدلیس دانیشتووە و لە مەدرەسەی ئەشرەفییەی ئەوێدا دەرسی گوتووە؛ بۆ تەفسیر و حەدیس و فیقهی شافیعی، مامۆستای بێ‌قسەی دەورانی خۆی بووە و ساڵی ١٠٠٥ ک. م. مردووە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٥٥.

---

١. بەجێی «**سارایی**» لە بڕێ کتێباندا، بە هەڵە، «صغراتی» و «صغرایی»یان نووسیوە.

## مەولانا مووسا بدلیسی

نەوەی مەلا حوسەین، لە زانایان و مامۆستایانی ناوداری شاری بدلیس بووە کە لە سەرەتای چەرخی یازدەدا لەوێ دەرسی گووتووە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٥٢.

## موحەممەدی زەرقی

مەولانا موحەممەدی زەرقی، لە موفتییان و مامۆستایان و هەروەها مەشایخی ناوداری بدلیس بووە کە هاوکات ئامۆژەی ئادابی تەریقەت و بانگەشەی ئەحکامی شەریعەتی کردووە و ساڵی ١٠٠٥ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٥٦.

## مەلا عەبدوڵڵای عولوانی

عەللامە مەلا عەبدوڵڵای عولوانی، زانایەکی باکووری کوردستانە کە بەشوێن زانست و تەریقەتدا زۆرێک لە وڵاتە ئیسلامییەکان گەڕاوە و پاش چەند ساڵان دووری لە نیشتمان، ئیجازەی مەلایەتی لە شام، لای عەللامە بەدری غەززی و بەرایی تەریقەتی لە شێخ ئەبولوەفا عولوانی حەمەوی وەرگرتووە و ئەمجار گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و تا دوا کاتی ژیان (١٠٠٦ ک. م.) خەریکی دەرسدانی زانست و ڕێشاندانی عیرفان بووە.

*خُلاصةالأثر*، ب٣، ل٨٥.

## شەمسەدین موحەممەدی حەسکەفی

شەمسەدین موحەممەد، کوڕی شەهابەدین ئەحمەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی یۆسفی حەسکەفی، مەشهوور بە «ابن المُلا» پیاوێکی زانا بووە و هێندێک نووسراوەی لێ بەجێماوە؛ یەکیان «*نهایةالادب*»ی ناوە.

زا و مەرگی ئیبنومەلا ساڵانی ٩٦٧ و ١٠١٠ ک. م. ڕوویداوە.

*الأعلام*، ب٦، ل٢٣٦. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٢٦٤.

## ئەمیر شەرەفخانی بدلیسی

ئەمیر شەرەفخانی بدلیسی، کوڕی شەمسەدینخان، لە میرانی بەناوبانگی کوردە کە ساڵی ٩٤٩ هاتۆتە

دنیاوە و ١٠١١ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

لە بەرگی تایبەت بە خوونکاران وماڵەمیراندا، بە تێروتەسەلی باسی میری و خوونکاری شەرەفخان و باب و باوان و بنچینەی خانەدانی دەکەین کە ئەگەڕێتەوە بۆ ساسانیان. لێرەدا زۆرتر لە باری زانستی ئەو کەسایەتییە ورد دەبینەوە.

شەرەفخان لە دەرباری شا تەهماسبی سەفەوی و لە نێوان شازادە و بەچکەمیراندا گەورە بووە و خوێندوویە و لە زمان و وێژەی فارس و عەرەبدا بەشێکی باشی دەسکەوتووە و زۆریش لە شا نێزیک بووە و حوکمی نەخجەوان و چەند شوێنیتری کردووە. کە بابی لەبەر پیری و وەڕەزی، دەستی لە میری کێشاوە، بە فەرمانی شا، حوکمەتی میراتی خۆی پێ‌گەیشتووە و بۆتە میری بدلیس لە ڕۆژاوای زێباری وان و دەوروبەری، کە کنج و مووش و خەلات و سعرد و خێزانیشی گرتۆتەوە و وەک خۆی لە شەرەفنامەدا دەڵێ، زیاتر لە ٦٠٠ ساڵ ناوەندی دەسەڵاتداری باب و باوانی بووە.

بە مەرگی شا تەهماسب، سەرەتا شا ئیسمایلی دووهەم پلەی میرمیرانی هەموو کوردستانی پێ داوە و بۆتە بەریوانی شا و باقی میرانی کورد؛ بەڵام پاش ماوەیەک لەبەر شۆفاری دڵپیسان، شای لێ دڕدونگ بووە و ناوچەیەکی پچووکی پێ سپاردووە و دەستی لە هەموو لایەک کۆتا کردووە. سوڵتان مرادخانی عوسمانی کە ئەمەی زانیوە، بەرەو لای خۆی بانگی کردووە و ساڵی ٩٨٦ ک. م. فەرمانی بدلیسی بۆ نووسیوە.

شەرەفخان میرێکی دیندار، دادپەروەر، خیرومەند، تێگەیشتوو، زانا و وێژەوان و شاعیر بووە کە ساڵی ١٠٠٥ وازی لە ئەمیری و خوونکاری هێناوە و کوڕە گەورەکەی (ئەبولمەعالی) لە جێ خۆی داناوە و لەوە بە دواوە، زۆرتر یان لەگەڵ زانایانی ڕابواردووە یان خەریکی خوێندنەوە و نووسین بووە و چەند کتێب و نووسراوەشی داناوە کە گرنگ‌ترینیان مێژووی ناوازەی شەرەفنامەیە کە ١٠٠٥ دەستی‌پێکردووە و ١٠٠٧ ک. م. دوایی‌پێ هێناوە و تێیدا تا بۆی دەستی داوە، ناو و مێژووی ماڵەمیرانی کوردی تۆمار کردووە.

شەرەفنامە بە زمانی فارسی نووسراوە و تا ئێستا چەند جاران چاپ کراوەتەوە و بە چەند زبانی دیش وەکوو کوردی و عەرەبی و ڕووسی و ئینگلیسی وەرگێڕدراوە. شەرەفنامەی بەکوردی، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار، یەک لە شاکارەکانی پەخشانی کوردییە.

*شرفنامەی بدلیسی*، چاپی میسر، ل٥٧٣–٥٨٦. یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی

عەللامەی مەزن و عارفی پایەبەرز، مەلا ئەبووبەکر، موحەممەد حەسەنی موسەننیفی چۆڕی پیرخدرانی شاهۆیی، کوڕی سەید هیدایەتوڵلا، کوڕی مەولانا یۆسفجان، کوڕی سەید حوسەین، لە پشتی پیرخدری شاهۆیی، شەرعزانێکی وێژەوان و نووسەرێکی زمانزان و شاعیرێکی هەستیار بووە کە پەخشانی فارسی



یەکجار ڕێک و ڕەوان و جوان نووسیوە و دوو کتێبی «*ریاضُ‌الخُلود*» و «*سراجُ‌الطریق*»ی، دوو نموونەی باش لە پەخشانی سەرکەوتووی ئەو ڕۆژگارەن.

مەلا ئەبووبەکر لە پێشەکی «*سراج‌الطریق*»دا خۆی ئاوا ناساندووە: « چنین گوید بندەی فقیر، مُحتاج به مواهب مَلِکِ کبیر... أبویوسُف سیّد حَسن، بن هدایت‌الله پیرخضرانی...» هەر بەمەدا دەردەکەوێ کە دوو نازناوی هەبووە: «ئەبووبەکر» و «ئەبوویۆسف» کە بە یەکەمیان زیاتر ناسراوە.

لکانی ناوی مەلا ئەبووبەکر بە «پیرخدر» و «شاهۆ»وە بەو بۆنەوەیە کە بە چەند پشت دەگاتەوە بە سەید موحەممەد زاهید، پیرخدری شاهۆ؛ کە پێشتر باسیمان کرد.

وەک کتێبی «*هدیةالعارفین*» دەڵێ، مەلا ئەبووبەکر ساڵی ٩٠٩ ک. م. لە دایکبووە؛ بەڵام بۆ ساڵی لە دنیا دەرچوونی کێشە زۆرە. «*هدیةالعارفین*» و یەک ـ دوو سەرچاوەی تر، ساڵی ٩٩٩یان نووسیوە؛ بەڵام «*الأعلام*» و هێندێکی تر ١٠١٤یان گوتووە.

لە ساڵی ١٣٤٥ ک. هـ. لە کتێبخانەی ماڵەئەعیانێکی سنەدا بەیازێکم چاوپێ‌کەوت کە لە لاپەڕەیەکیدا، بە خەتێکی جوان نووسیبووی: ئەم دوو بەیتە مەرحوومی مەلا ئەبووبەکری چۆڕی لە سەرەمەرگیدا گوتوویە:

چنان بر روی جانم پرگشادند بە جانان مژدەی وصلم بدادند
مَلَک تشریف حاضر کرد آن دم رقَم زد در مَماتم «خیر مقدم»

ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، دەستەواژەی «خیرمقدم» بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ٩٩٤، بۆ ساڵی مەرگی. هەرچۆنێک بێت، مامۆستا لە نێوان ساڵانی ٩٩٤، ٩٩٩ یان ١٠١٤دا، لە گوندی چۆڕی لای مەریوان ـکە نیشەجێی ئەوێ بووە و ئێستەش هەر ماڵی ئەوبنەماڵەیە ـ کۆچی یەکجاری کردووە.

مەلا ئەبووبەکر کتێب و نووسراوەی زۆری هەیە کە هێندێکیان بریتین لە: «*الوضوح*» لە چوار بەرگدا، شەرحێکی عەرەبی کتێبی «*مُحرر*»ی ئیمام ڕافیعی لە فیقهدا، «*طبقات الشافعیّه*»، ژین‌نامەی تاقمێک لە مامۆستایانە کە ساڵی ١٣٥٦ ک. م. لە بەغدا چاپ کراوە، «*سراج‌الطریق*» بە فارسییەکی هاسان و ڕەوان، بریەتی لە پەنجا باب، لە مەڕ عیرفان و ئەخلاقەوە، کە ساڵی ٩٤٨ نووسیویە، «*ریاض‌الخُلود*» ئەویش بە فارسی لە هەشت باب و هەربابێکی پێنج بەش، کە ساڵی ٩٨٩ ک. م. نووسراوە.

لەم دوو کتێبە فارسییەدا، مەلا ئەبووبەکر جاروبارە و لە جێی خۆیدا، لە خۆی و برایەکی کە ناوی نەهێناوە، شیعر دێنێتەوە. هەروەها لە کۆتایی «*ریاض‌الخُلود*»دا ئەم شیعرەی داناوە:

در آن دم کاین معانی روی بنمود ز هجرت نهصد و هشتاد و نُه بود
زمان پُر فتَن، عهد پُر آشوب نه دانش مطلب و نی علم مرغوب
تو گویی هردم از چرخ مقوَّس غم و اندوه باریدی به هر کس

خـــصوصاً بنـــده را در کوهـــساری دهـــی بـــود از ولایـــت برکنـــاری
گهـــی از ظالمـــان اهـــل اســـلام به غارت می‌شدی هر صبح و هر شام
گهـــی از جـــور مـــأمور قزلبـــاش نهان می‌گشتم انـدر شعب هـر تـاش
در ایـــن آشـــفتگی و تیـــره‌حـــالی مُحیطـــی دیـــدم از تـــألیف خـــالی

**ئه‌مه‌ش حیکایه‌تێکی ئه‌و کتێبه**:

«آورده‌اند که در عصر سلطان سنجر، درویشی از بهر سؤال به درِ سرای توانگری رفت. سـرایی دیـد مُـشیَّد و دروازه‌های بلند و دیوارهایی مُزَخْرَف. درویش به خود اندیشید که صاحب این همه اسباب، ما را چیـزی بـسیار خواهد داد. آواز داد که صاحب خیر از خیر محروم نباشد؛ سائل بر در است و فاقّه بر او غالب، صـاحب‌خانـه را کنیزکی بود شیرین نام. گفت: ای شـیرین! شـکر را بگـو کـه مرجـان را بگویـد، تـا مبـارك را خبـر کنـد کـه خوش‌قدم را آواز کند که به صوفی بگوید که در خانه نان حاضر نیست. درویش که ایـن تـشریف و تعظـیم از صاحب‌خانه شنید، از برای نیمه‌نانی، گفت: یارب! اسرافیل را بگو تا میکاییل را بگوید تا جبرییـل را آگـاه کنـد که به عزراییل فرمان رساند که جان این ممسك بدبخت را قبض کند.

صاحب‌خانه چون این بشنید لرزه در اندامش افتاد، نیمه‌نانی بیرون آورد و به دست درویش داد. درویش نـان را به گوشه‌ای فرو نهاد و با عصایی که داشت به خراب‌کردن در مشغول شد. صاحب‌خانه دید که درویـش درِ سرا را ویران می‌کند، گفت: ای درویش! مگر دیوانه شده‌ای؟ چرا درِ سرا را ویران می‌کنـی؟ درویـش گفـت: دیوانه نیستم، یا نان به اندازه‌ی در ده و یا در به اندازه‌ی نان کُنم، این هردو را نامتناسب دیدم...».

**واتا**: ده‌گێڕنه‌وه له ده‌ورانی سوڵتان سنجه‌ردا، ده‌روێشێک بـۆ سـواڵ چـووه ده‌رکـی ماڵـی ده‌وڵـه‌مه‌ندێک. ماڵێکی بینی پته‌و؛ به ده‌رک و ده‌روازه‌ی به‌رز و دیوار و په‌ساری ڕازاوه‌وه. له‌به‌ر خۆیه‌وه گوتی: خـاوه‌نی مـاڵ و سامانی وا، ده‌بێ زۆرێکم شت بداتێ. ده‌نگی هه‌ڵدا: خێرۆمه‌ند له خێـر بـێ‌بـه‌ش نـه‌بێ؛ سواڵـکه‌رێک لـه بـه‌ر ده‌رکه‌یه؛ ده‌ستته‌نگی بڕستی لێ بڕیوه. خاوه‌نماڵ خزمه‌تکارێکی هه‌بوو، شیرینی ناو بوو. گوتی: ده شـیرین! بێژه به شه‌کر، بێژێته مه‌رجان، با هه‌واڵ بداته مباره‌ک، خۆشقه‌دم ڕاسپێرێ، به‌و مامسۆفییه ڕاگه‌یێنێ: له ماڵه‌وه نان نییه! ده‌روێش که ئه‌م هه‌موو به‌زم و ڕه‌زمه‌ی بیست، گوتی ده‌سا یاڕه‌بی! بێژه به ئیسرافیل، بێژێته میکاییل، با هه‌واڵ بداته جبراییل، فه‌رمان به ئیزراییل ڕاگه‌یه‌نێ، گیانی ئه‌و چرووکه داماوه بستێنێ.

خاوه‌نماڵ که ئه‌مه‌ی بیست، له ترسان له‌رزی لێ نیشت. له‌ته نانێکی هانی و دایه ده‌ستی ده‌روێـشه‌وه. ده‌روێش نانه‌که‌ی له پاڵێک دانا و به گۆچانه‌کـه‌ی که‌وتـه ڕمانـدنی ده‌رکـه‌وه. ماڵـخوێ دیـتی ده‌روێـش خه‌ریکه ده‌روازه‌که‌ی خراپ ده‌کا. تێخوڕی: ئه‌رێ ده‌روێش! ئه‌وه شێت بـووی؟ بـۆ وا ده‌کـه‌ی؟ گـوتی نـا شێت نیم. یا نانه‌که‌ت بێنه ڕاده‌ی ئه‌و ده‌رک و ده‌روازه، یان ده‌رکه‌که‌ت دێنمه قه‌دی نانه‌کـه‌ت! ئـه‌و دووه لێک ناکاڵێنه‌وه...

لە هۆنراوەکانی مامۆستا، تەرجیعبەندێکە لە پەسنی پێغەمبەردا (د) کە پیتی سەرەتا و دوایی هەر بەندێکی، پیتێکی ئەلفو بێتکەیە. ئەوا دوو بەندی بۆ نموونە:

آفتاب رخ تو نور هُدی        طلعتت شرح نَصٍّ کَرَّمْنا
اوفتاده به خاك درگاهت        جبهەی ساکنان ارض و سما
آدم ار دم ز مهر تو نزدی        کی زدی دم ز عَلَّمَ الاسما
آیت شرح صورتت یاسین        کاشف سرِّ سیرتت طاها
ابروان تو قاب‌قوسین‌اند        رمزی از قُرب تُسْت اَوْ اَدْنی
یا نَبی رد مکن بضاعت ما        سعی فرمای در شفاعت ما

* * *

خُلد را زینت و بقا زان رُخ        عرش را زیور و صفا زان رُخ
خطّەی خاك را سُکون زان قَد        چرخ گردان نه سر نه پا زان رخ
خوبرویان مُلك معنی را        آبرو زان زنخ، بها زان رخ
خواند واللّیل پیک حق زان زُلف        گفت والشّمس و الضُّحی زان رخ
خیمەی شرع را ستون زان قَد        خانەی ورع را جُلا زان رُخ
یا نبی رد مَکُن بضاعت ما        سعی فرمای در شفاعت ما

لە بەندی ئاخردا، پێش بەیت‌گەردان، ئاوا ناوی خۆی دەبا و دەڵێ:

یارب از فضل و جود احسانت        بَر «حَسَن» جُرم و معصیت بخشای

مەلا ئەبووبەکر دوای دەرس‌گوتنەوە، زۆرتر لە سووچی حوجەرەیەکدا خەریک خوێندنەوە و عیبادەت بووە و جار ـ جاریش لەسەر زەوی‌وزارەکەیدا کشت‌وکاڵی کردووە.

*مجلّەی یادگار*، ژ ٦و٧، ساڵی پێنجەم، چاپی ١٣٢٧. *الأعلام*، ب٢، ل ٤٦. *ایضاح‌المکنون*، ب٢، ل٤٤٣ و ٦٠٠. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل ٢٦٠. *خُلاصةالأثر*، ب١، ل ١١٠. *لُغتنامەی دهخُدا*، پیتی ئەلف.

## جەزبی نارنجی[1]

جەزبی نارنجی، کوڕی شاقولی‌خان، لە خانانی کوردستانە کە لە بوێری و جوامێریدا ناوی‌دەرکردووە و

---

١. لە «*تحفەی سامی*»دا باسی «نارنجیی شارەزووری» دەکا و دەڵێ: نارنجی سوڵتان، کوڕی یاری سوڵتان، لە چەرخی دەیەمدا ژیاوە و ناوی جەزبی نابا؛ بەڵام لە «*فرهنگ سُخَنوران*»دا، بەجیا باسی هەردووکیان هەیە.

ماوەیەکی بە سەیران و گەڕان ڕابواردووە و لە دەورانی جەلالەدین ئەکبەرشادا (٩٦٣-١٠١٤ک. م.) لە هیندوستان بووە.

جەزبی لە زبان و وێژەوانیدا سەری‌دەرچووە و شیعریشی جوان گوتووە. ئەم بەیتە هی ئەوە:

من آن نیم که به قاصد دهم نشانەی خویش      کە سازدش زپی مُدّعا بهانەی خویش

ئەم تاکە بەیتەش لە «*تذکرەی آتشکدەی آذر*»دا بە ناوی ئەوەوە نووسراوە:

بود از دست او دل از نگاه غیر چون مُرغی      کە طفل مکتب از ترس معلّم سردهد زورش

*لُغتنامەی دهخُدا*، پیتی ج، ل٢٨٢. *قاموس الأعلام*، چاپی ئەستەمبووڵ.

## شێخ موحەممەدی کوردی

لە هاوڕێیان و هەوالانی شێخ شەهابەدینی غەزنەوی بووە و لای ئەوەوە خوێندنی تەواو کردووە و تێدا سەرکەوتووە. پاشان خزمەتی شێخ شەهابەدینی عیساوی و شێخ شەمسەدینی مەیدانی ـکە لە مەشایخی خاوەن خانەقا و بەکەرامەتی ئەو سەردەمە بوون ـ گەیشتووە و لە پیت و بەرەکەتی هاودەنگییان بەهرەی بردووە.

شێخ موحەممەد عارفێکی خاکەسار و بێ دەمار و دڵاوا بووە؛ زۆربەی ڕۆژانی ساڵ ڕۆژووی گرتووە و بەم بۆنەوە «صائم‌الدّهر»یان پێ گوتووە. قەت ژنی نەخواستووە و ماوەی چل ساڵان لە دمشقدا بە عیبادەت و ڕیازەت و خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە، ژیانی داوەتەسەر و سەرەنجام ڕۆژی سێ‌شەمبە حەوتی جیمادی‌ئەوەڵی ساڵی ١٠١٤ ک. م. کۆچی دوایی کردووە و لە قوبکەی «مرج‌الدّحداح»ی زیارەتانی فەرادیسی دمشقدا نێژراوە.

*خُلاصةالأثر*، ب٤، ل٢٨٧.

## شوهرەتی ئامیدی

حەیدەری چەلەبی دیاربەکری، نازناو «شوهرەتی»، پیاوێکی شاعیر و وێژەوان بووە و لە نەخۆشخانەی ڕەوانی شامییەدا دەفتەرداری کردووە. دیوانی شیعرێکی لێ بەجێ‌ماوە و ساڵی ١٠١٤ ک. م. دەستی لە دنیا بڕاوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٤١.

## مەولانا شەمسەدین موحەممەدی شیرانشی

لە مامۆستایان و زانایانی ناودارە کە لە تەفسیر و هەیئەت و مەنتیق و کەلامدا ئوستادی بێ‌قسەی سەرەتای

چەرخی یازدە بووە و لە قوتابخانەی «**اخلاصيّه**»[١]ی شاری بدلیسدا ماوەیەکی زۆر دەرسی گوتووە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێز لەسەر جزمی نەبەئی تەفسیری «*بیضاوی*»، پەراوێز بۆ «*شرح سیّد شریف*» لە وەزعدا، حاشیە لەسەر «*عصام‌الدّین استعاره*» و ...

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٥٦. *کشف‌الظنون*، ب١، ل١٩٣ و ٨٩٨.

## ئەبولعەبباسی قەرامانی

کوڕی یۆسف، کوڕی ئەحمەد، لە زانایانی ھەڵکەوتەی چەرخی یازدەیە. بابی لە قەرامانی باکووری کوردستانەوە بۆ دمشق کۆچی کردووە و ئەبولعەبباس ساڵی ٩٣٩ ک. م. لەوێ لەدایک بووە و بەو بۆنەوە «دمشقی»یان پێ گوتووە.

باوکی لە دمشق چاودێر و ژمارياری نەخۆشخانەی نووری و مزگەوتی ئەمەوی بووە و سەرەنجام یەکێکی نەناسراو کوشتوویە.

**لە کتێبەکانی**: «*أخبارُ الدّوَل و آثار الاوَّل*» کە مێژووی ھەموانی ئیسلامییە و ساڵی ١٢٨٢ ک. م. لە بەغدا چاپ بووە و «*الرَّوض النَسیم و الدُّرُالیتیم فی مناقب السُّلطان ابراهیم*».

وەفاتی قەرامانی ساڵی ١٠١٩ ک. م. ڕوویداوە.

*آداب اللغة العربیّة*، جُرجی زیدان ، ج٣، ل٣٠٥.

## بێسارانی

ئەویندارى ئازراو و شاعیری شلەژاو، مەلا موستەفای بێسارانی، لە ھەستیارانی بەناوبانگی کوردە کە غەزەڵە جوان و سترانە دڵبزوێنەکانی، بەیتی سەرزاری ھونەرناسان و ئاودەنگی دڵی تەنگی عاشقانە.

ساڵی زا و مەرگی وی، تەواو لێمان ڕوون نییە؛ ھەروەک بۆ ناوی بابیشی قسەکان یەک ناگرنەوە.

مامۆستا عەلائەدینی سەجادی لە کتێبی «*مێژووی ئەدەبی کوردی*»دا، ناوی بابی مەلا ئەحمەد و ساڵی ھاتنەدنیای ١٠٥٢ و لە دنیا دەرچوونی ١١١٣ ک. م. نووسیوە.

لە کتێبی «*پیرشالیار*»دا، ناوی خۆی مەلا ئەحمەد، ناوی بابی مەلا مەحموود و زا و مەرگی ساڵی ١٦٥٠ و ١٧٠٦ ز. نووسراوە.

وێژەوان و زانای بەڕێز، سەید تاھیری سەیدزادەی ھاشمی، بە گەڕان و تێکۆشانێکی زۆر، بەشێکی بەرچاو لە شیعرەکانی ـکە پرژ و بڵاو ببوون ـ کۆ کردۆتەوە و پێشەکییەکی کورت، بەڵام بەکاکڵی بۆ نووسیوە؛ کە

١. ھەموو خەرجی ئەو قوتابخانەیە و مامۆستا و فەقێیەکانی، ئەمیر شەرەفخان دابینی کردووە.

ئەوا پاژێکی:

« تاکە کەسێ کە لە کتێبێکدا لەم شاعیرە عارفە هێژایە ناوی بردووە، مامۆستای شەهید، مەلا موحەممەدی قازی جوانڕۆییە لە بنەماڵەی قازیانی ئەوێ کە بەگشتی خۆیان بە زاروزێچی مەلا موستەفا دەزانن.

مەلا موحەممەد ـ کە تا دەوری ساڵانی ١٢٩٠ ک. م. دادوەری جوانڕۆ بووە ـ مەلا موستەفا بە پشتی پێنجەمی خۆی دادەنێ و بابی ئەویشی مەلا قوتبەدین، کوڕی مەلا شەمسەدین نووسیوە. بەپێی ئەمە وێدەچێ مەلا موستەفا تا ساڵەکانی ١٠٩٠ ژیابێ.»

نووسراوەی مامۆستا سەید تاهیری هاشمی، سێ خاڵمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە:

١. ناوی باب و کاڵی بێسارانی لە لایەن کەسێکەوە کە خۆی لەو پشتە بووە.

٢. دەورانی ژیانی بێسارانی (چەرخی یازدەی ک. م.).

٣. هەڵە بوونی ئەو گوتەیە کە بێسارانی منداڵی نەبووە و هەر ژنی نەخواستووە.

کە وابوو، مەلا موستەفا بێسارانی، کوڕی مەلا قوتبەدین، کوڕی مەلا شەمسەدین، لە گوندی بێساران، سەر بە ناوچەی ژاوەرۆی کوردستان، لە یازدە فرسەقی ڕۆژاوای باشووری شاری سنەوە هاتۆتە دنیا و هەر لەوێ خوێندنی دەسپێکردووە و لە دێهاتی تری هەورامان و ژاوەرۆ، وەک «نۆدشە» و «پایگەلان»دا درێژەی بە خوێندنەکەی داوە و سەرەنجام لە شاری سنە کۆتایی پێ هێناوە و پاشان گەڕاوەتەوە بێساران و تا دواکاتی ژیان، لەوێ ماوەتەوە و بە دەرس گوتنەوە و کشتوکاڵەوە ژیانی داوەتەسەر.

هێندێک دەڵێن عەللامە و عارفی بەناوبانگ، حاجی مەلا قاسمی پایگەلانی، مامۆستای بێسارانی بووە؛ کە شتی وا ناگونجێ و وەک دەبینین، مەلا قاسم لە چەرخی سێزدەدا ژیاوە.

بێسارانی کاتی فەقێتی و لە هەڕەتی جەوانیدا، وەک بۆخۆت دەزانی، لە نەکاوێک لەنجەولاری ڕێبوارێکی نازدار، ئاوری لە هەناوی بەرداوە و دڵی لە پێناو گۆشەچاوێکی ئامێنەناوێکدا داناوە. کچێکی پایگەلانی، کچی شیرموحەممەد ناوێک کە ماڵیان لە پەنای ئەو قوتابخانە بووە کە بێسارانی لێی خوێندووە. بەڵام هەرچیک بووە وەکوو برووسکەیەک هاتووە و چووە؛ کوا دەرفەتی دیدارێک کە دڵی پێ دامرکێ و گیانی پێ بحەسێتەوە؟

بەرەبەیانێک کە عاشقی شەیدا هەموو شەو بەیادی دڵدار چاوی لێک نەناوە، بۆ نوێژی بەیانی هەستاوە و بە سکاڵاوە ڕووی لە قیبلە کردووە، بەشکوو خاوەنی بەزەیی دەروێکی لێ بکاتەوە؛ لە ناکاو دەنگی دڵبزوێنی دڵداری دێتە بەرگوێ. بە هەڵەداوان دەگاتە سەربان کە بۆ ساتێکیش بووە دڵی ئەویندار بە دیداری بسرەوێ؛ بەڵام لە بەختی چەوتی، دارتوویەکی چڕوپڕ دەبینێ کە وا لق و پۆی دەرکردووە و هەموو لای داگرتووە، گوڵە زەوییەکیش لە حەوشەی ماڵی ئامین نابیندرێ. بێسارانی بە کزێکەوە ئەم چەند بەیتە دێتە

سەر زاری و لەبەر خۆیەوە ئێژێ:

| | |
|---|---|
| چـــــڵێ نەپـــــەنا، چـــــڵێ نەپـــــەنا | چـــڵێ چـــون ڕەقیـــب مـــەدران نەپـــەنا |
| هـــۆر ئامـــان مـــەدران نـــە ڕووی تەمـــەنا | مـــــەر بـــــاد قـــــودرەت بـــــدەرۆش فـــــەنا |
| وەبـــاد قـــودرەت لـــەتارـــــ لـــەتار بـــۆ | نمـــــازۆ بـــــاڵای قیبلـــــەم دیـــــار بـــــۆ |
| بـــسۆچۆ بـــا هـــەر بـــازەدەی ســـەحەر | ڕیـــــشەش جـــــەزەمین بـــــەربارۆ وەبـــــەر |
| تـــا بـــاڵای قیبلـــەم چـــون شـــەم خانـــان | بوینـــــۆ وەچـــــەم نـــــە بـــــەرزەبانان |

کە چەند جاری دەڵێتەوە، ناکاو بایەکی بەقەوەت هەڵدەکا و چڵ و پەلی دارەکە دەنێتەیەک. لەوە بەدواوە هەرجارێک کە ئارەزووی دیدار تەکی لێ هەڵچنیوە و خۆی پێ نەگیراوە، سەرێکی سەربانی داوە و بە هەڵکەوتێک چاوی بە گراوییەکی کەوتووە و زاخاوێکی لە سەر دڵ داشۆردووە.

بێسارانی پاش ماوەیەک ناعیلاج پایگێلانی بەجێهێشتووە و چیدی چاوی بە ئامین نەکەوتووە؛ بەڵام گڕی ئاوری ئەوین هەروا لە ناخیدا بڵێسەی داوە و پێوە سووتاوە و تەنیا سوکناییدەری، ئەو شیعرە بەسۆزانە بووە کە وەک غەزەل و بەستە دایناوە.

پاش ماوەیەکی درێژخایەن، سەرەنجام لە هەستیدا هەست بە گۆڕانێک دەکا و بەجارێک لەو ئەوینە پاکە مەجازییەوە، بە ئەوینی حەقیقی دەگا و لەوە بەولاوە هۆنراوەکانی ڕەنگ و بۆنی عیرفانی دەگرنە خۆ:

| | |
|---|---|
| ئێمـــەیـــچ پەروانـــەی شـــەم شناســـانیم | پـــەڕ و بـــاڵ ســـوفتەی دیـــن خاســـانیم |
| میللـــەت پـــاکدیـــن، پێغەمبـــەرانیم | نـــەک جـــە تایفـــەی کـــەم نـــەزەرانیم |
| بنمانـــــە جـــــەمین، نـــــوور پاکتـــــەن | ئـــەر تـــۆ پاکـــەنی، جـــە کـــێ باکتـــەن؟ |

لەم شیعرە و زۆری تری وەکی ئەمە، بۆمان دەردەکەوێ کە بێسارانی عارفێکی دڵگەرم بووە و بۆ گەشانەوەی ڕۆح و بووژانەوەی دەروونی، ڕێبازی ڕاستی و دروستی و داوێنپاکی هەڵبژاردووە.

مەلا موستەفا بە بۆنەی خۆشەویستی زاگەیەوە، نازناوی «بێسارانی» هەڵبژاردووە و شیعرەکانی بەگشتی، بە زمانی وێژەی ئەوسەردەمەی کوردان، واتا هەورامی (گۆرانی) بووە. شیعری بە تێکوڵ دووخشتەکی (مەسنەوی) و بە کاکڵ غەزەل و غەرامین. ئەوا چەند نموونە:

| | |
|---|---|
| چـراخم نەجـەرگ، چـراخم نـە جـەرگ | هێجران دووریت چنگ پێکان نە جـەرگ |
| ســـــەرتاپا ســـیا قوڵاخیمـــــەن بـــــەرگ | هـــەر ڕۆ مـــەوازۆ ســـەد ئـــاوات وە مـــەرگ |
| دیـدەم بـێ نـوورەن جـە تـاو ئەسـرین | هۆن جێش مەتکیۆ چون سفتەی بـرین |
| جەوساوە دیـدەم دوور کەفتـەن جـە تـۆ | لـــــێڵاویش لێـــــڵەن لێڵاوتـــــەر مـــــەبۆ |
| ڕوشـــنی بیـــسات وەنـــەم بیـــەن تـــار | زنـــــدەگیم تاڵـــــەن وێنـــــەی ژار مـــــار |
| کەسێ کە بەی تەور حاڵ جەستەش بـۆ | پێسە جوویای وەسڵ ئاوات وەستەش بـۆ |

خاسش هەر ئێدەن مەرگش مێمان بۆ مەگەر ئەو بە مەرگ دەردش دەرمان بۆ

* * *

قیبلەم یە حەیفەن وێنەی تۆ شایی بگێرۆ نەدڵ خەشم گەدایی
ئەگەر گوناهێ وەنەم کەری بار یە سەر، یە شمشێر، یە تەناف، یە دار
وەگەرنە حەیفەن بە واتەی بەدگۆ نە پەردە مانۆ ڕاز مـن و تـۆ

* * *

چـراخم حاڵەن، چـراخم حاڵەن خـودا مەزانۆ، حاڵم بەدحاڵەن
هیجران کوشتەی تۆم، یە خەیلێ ساڵەن بە ئاهەر دووریت، تەن کۆی زوخاڵەن
جە دووری باڵات، باڵام خەم وەردەن ئەنـدامم دایم گێرۆدەی دەردەن
تـۆ وێت مەزانی، مـن داغدار تـۆم غەیر جە مەیل تۆ هیچ نییەن ڕوجۆم
ئەڵماس موژەت جە دڵ جا کەردەن بە سەد حەکیمان دەواش نەبەردەن
زام دووریەن جە دڵ کەردەن کار مەواچان مەردەن، کەس نەکەردەن چار
شیم وەلای حەکیم بدەرۆ دەوام پەی دەرد برین هیجران سەرئەنجام
حەکیم وات دەردت، دەرد کارییەن دەوا پەی دەردت، نادیارییەن
ساکە مـن حەکیم نەدەرۆ دەوام مەر ئەجەل بەیۆ باوەرۆ شەفام

*مێژووی ئەدەبی کوردی*، چاپی بەغدا، ١٩٥٢ ز. ل ١٨٠.
گۆڤاری *گەلاوێژ*، ساڵی ١٩٤٤ ز، ژ ٤ و ٥. *پیرشالیار*، ل٣٧. *دیوانی دەسنووسی بێسارانی*، گردەوەکویی و پێشەکی سەید تاهیری هاشمی.

## حاتەمبەگی کوردستانی

کوڕی ئەحمەدبەگ، شاعیرێکی وردبین، گفتجوان، بەزمگێڕ و ڕووخۆش بووە کە لە سەرەتاکانی چەرخی یازدەدا ژیاوە و ئینشابەندی کەلبعەلیخانی ئەردەلان بووە و سەریشی لە بژیشکی دەرچووە. ماوەیەک بەرەو هەمەدان چووە و لەوێ عەتاری کردووە و پاشان گەڕاوەتەوە سنە و لەو شارەدا دنیای بەجێهێشتووە.

**ئەم بەیتانە هی ئەون:**

ز فیض پاکدامانی ز بس با حُسن یکرنگم نقاب از چهرەی معشوق خیزد گر پرد رنگم

* * *

ز بس بیگانەام زین آشنایان غریبم در وطن چون شاخ پیوند

* * *

زهر است زهـر، الحَذَر از گفتگـوی خلـق خوابیده همچو مـار، نفـس در گلـوی خلـق

*تذکرەی نصرآبادی*، به تصحیح وحید دستگردی،
چاپی تاران، ١٣١٧ ک. هـ. ، ل٣٢٤.

## مەولا موحەممەدی قەرامانی

زانایەک لە کوردانی باکوورە کە ساڵی ١٠٢١ ک. م. لە دنیا چووە. لـە نووسـراوەکانی شـەرحێکی کتـێبی «*غُرَرُالاحکام*» لە فرووعی حەنەفییەی مەلا خوسرەوە.

*کشف‌الظنون*، ب٢، ل١٥٣.

## موحەممەدی حەلەبی گۆرانی

لە شاعیرانی ئاخر و ئۆخری چەرخی دە و سەرەتای چەرخی یازدەیە کە لە حەلـەب ژیـاوە و هـەر لـەوێش ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە. لە شیعرەکانیەتی:

بــدرٌ أدار علــی النُّجــوم بــراحَـــةِ شمــساً فنــارت فــی کُـؤُس رحیقــه
شــمْسٌ اذا طَلعَــتْ کَــأنَّ و میـضها بـــرْقٌ تـــلاْلأ عنْـــد لمـــع بریقـــه
یَــسْقی و إنْ عَــزَّتْ علیــه و رام انْ یَـــشْفَی لـــداء مُحبّـــه و حریقـــه
فیـــدیرها مــــنْ مُقلتیْـــه و تـــارةً مــنْ وَجنَتَیْــه و تــارَةً مــنْ ریقــه

* * *

ملیــکٌ جمــال أنْبــت العــزَّ خُــدُّهُ نباتــاً لــهُ کــلُّ المحاســن تُنْــسبُ
فَکَــرَّرتُ لــثْم الخــدِّ منْــهُ لطیبــه و کــلُّ مکــان یُنْبــتُ العــزَّ أطْیــبُ

موحەممەدی حەلەبی، بابی قازی سەلاحەدینە کە باسی ئەویش دەکەین.

*خُلاصةالاثر*.

## عومەری قادری

عومەر، کوڕی عەبدولوەهاب، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی مەحموود، کوڕی عەلی قـادری شـافیعی، لـە فیقهـــ و حەدیس‌زانانی گەورەیە کە سەرەتا لای باوکییەوە خوێندنی دەسپێکرد و چاردەسـاڵان گەیـشتە خزمـەتی شێخ مەحموودی حەلەبی ناسراو بە «ابن‌بیلونی» و چەند کتێبی لە سـەرف و نـەحو و تەجویـد، لا خوێنـد و ئەمجار لە کۆڕی دەرسی مەلا ئیبراهیم، کوڕی موحەممەدی کوردی بەبانی حەلـەبی، زۆری بـەهرە بـرد و هەروەها لای مامۆستایانی هەڵکەوتەی تـریش خوێنـدی تـا تـەواو پێگەیـشت. لـەو کاتـەدا بـەرێوەبردنی

«دارُالإفتا»ی شاری حەلەبی پێ سپێردرا.

عومەری قادری هەموو دوای نیوەڕۆیەکی هەینی، پاش نوێژی عەسران، لە مزگەوتی جومعەی شاری حەلەبدا کۆڕی وتاردان و ئامۆژگاری بەڕێوەبردووە و تا هەبووە بە شێوەی بانگێشتن بۆ چاکە و بەرگری لە خراپە و دەرس گوتنەوە و ڕێنوێنی خەڵک، خزمەتی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*شرح الشّفا فی حدیث مُصطَفی*» لە چوار بەرگدا. پەراوێز بۆ «*تفسیر ابی سُعود*»، شەرحی «*عقاید*»، شەرح لە «*رساله قُشیری*» و سەرجەمی «*رسائل و فتاوی*».

عومەری قادری زەوقی شیعریشی بووە و جار ـ جار شیعری گوتووە. ئەم دوو بەیتە هی ئەوە:

لـم أكْتَحـلْ فـی صـباح یَـوْم  أریـــق فیـــه دمُ الحُـــسین
الا لأنّـــی لفـــرْط حُزْنـــی  سَـــوَّدْتُ فیـــه بیـــاض عینـــی

کە لەم دوو بەیتەی وەرگرتووە:

و قائـــل لـــمْ كحلْـــت عینـــاً  یـــوم اســـتَباحُو ادم الحُـــسیْن
فقلـــتُ كُفُّـــوا، أحـــقُّ شـــئ  یلْـــبس فیـــه الـــسَّوادَ عَیْنـــی

ئەم مامۆستایە بەرهەمەکانی مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی یەکجار لا بەرز بووە و بە تایبەت کتێبی «*الفوائد الضیائیّه*»ی لە نەحودا، هەر لە خۆی جیا نەکردۆتەوە و لەمەڕ نووسەرەکەیەوە وای گوتووە:

لله دَرُّ إمـــام طالمـــا ســـطعتْ  أنـوار إفـضاله مـنْ علْمـه الـسامی
ألفاظـه أسـكرتْ أسْـماعنا طَربـاً  كَأنَّها الخمرُ تُـسْقی مـنْ صـفاالجام

زا و مەرگی عومەری قادری ساڵانی ٩٥٠ و ١٠٢٤ ک. م. ڕوویداوە و شێخ ساڵحی گۆرانی ـ لە مامۆستایانی هاوچەرخی ـ بۆ فەوتی وای گوتووە:

إمـــام العُلـــوم وزیْـــن العـــلا  ســراج الهـــدى عُمـــر ذوالوفـــا
تَـــولّی فَـــأرَّخْ «ســـراجٌ بهاالْـــ  عُلُـــومُ هَـــدی، فَرَقـــا، فـــانْطَفی»

*خُلاصة الأثر*، ب٢.

## عەبدولحەیی کوردی

مامۆستایەکی کوردە کە دوای تەواوکردنی دەرس و دەور، لە شاری دمشق دانیشتووە و لە قوتابخانەیەک بەناوی «موعینییە»دا دەرسی گوتووە و ساڵی ١٠٢٥ ک. م. جیهانی بەجێهێشتووە.

عەبدولحەی ماوەیەکیش لە قاهیرە ڕایبواردووە و لەگەڵ زانایان و مامۆستایانی ئەوێدا کێشە و وتووێژی زانستی هەبووە.

*خُلاصة الأثر*، ب٢، ل٣٤٤.



## مەولانا عەبدوڵڵای بدلیسی

مەشهوور بە «ڕەشک»، واتا ڕەشتاڵە، لە سەرەتاکانی چەرخی یازدەی کۆچیدا ژیاوە و لە مەدرەسەی «ئیدریسییە»ی بدلیس، دەرسی‌داوە و لە زانایانی هەڵکەوتەی سەردەمی خۆی بووە.

*شرفنامەی بدلیسی*، ل٤٥٦.

## شێخ عەبدولغەفاری«دووەمی»مەردۆخی

کوڕی شێخ شەمسەدین وەلی مەردۆخی، لە زانایانی هەڵکەوتەی کوردستانە کە لە بژیشکی و ئەستێرەناسی و بیرکاریشدا سەری‌دەرچووە و خوازیارانی زانست و تێگەیشتن، لە هەموو لایەکەوە ڕوویان لە قوتابخانەکەی کردووە و بەهرەیان لێ بردووە.

زا و مەرگی شێخ سالانی ٩٦٩ و ١٠٢٦ ک. م. ڕووی‌داوە.

*تاریخچەی خاندان مَردوخ.*

## ئیبراهیمی حەسکەفی

ئیبراهیم، کوڕی ئەحمەد شەهابەدین، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی یۆسفی حەسکەفی شافیعی، مەشهوور بە «ابنُ‌الملا» لە شاعیران و ویژەوانانی بەناوبانگە کە لە زانستە ئیسلامییەکانیشدا مامۆستایەکی هەڵکەوتە بووە و ساڵی ١٠٣٠ ک. م.[1] لە شاری حەلەب کۆچی یەکجاری کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*انعاش الرّوح بمأثر نصوح*»، «*الالباب*» کە شەرحی «*تحفةُالاحباب*» لە تەسریفدایە، «*غايةُ سُول الحريص من ايضاح شرح التّلخيص*»، «*كشف النّقاب عن غُنيـةُ الاعـراب*»، «*حلْبـة المناضـله فـى المطارحـه و المُراسله*» و دەیان کتێبی‌تر.

*الأعلام*، ب١، ل٣٠. *لُغتنامەی دهخُدا*، پیتی ح، ل٧٠٥.

*كشفُ الظُّنون*، ب٣، ل١٦٧٦. *هديةالعارفين*، ب١، ل٣٠.

## حوسەینی جزیری (جەزەری)

کوڕی ئەحمەد، کوڕی حوسەین، لە کوردانی جزیر و بۆتان و سەر بە بنەماڵەیەکی خاوەن ناو و نان بووە؛ وەک خۆی لەم چەند بەیتەدا ئاماژەی پێ کردووە:

---

١. لە «*الأعلام*»دا، ١٠٣٢ نووسراوە.

انَّ الجزیــــرَة لاعـــدا جودیّهـا[1] الغیـث الهتـون
خُلقُـوا بهـا آبـای، آ سادالـشّری و هـی العـرین
و لهـم بهـا البیـتُ اَلمُؤَثَّـل فـی قواعـده المکـین
وَ لَنـا بهـمْ نَـسبٌ علـی الـ ـدُّنیا لـهُ شـرفٌ و دیـن
وَ بر ُکنـه المَجْـدُ المَتیـ ـن وَ طُلّـه الـسّامی المُبـین

حوسەینی جزیری دوای مەرگی باوکی، جزیری بەجێ‌هێشت و بۆ حەلەب ڕۆی و لە خزمەتی ئیبراهیم، کوڕی ئەحمەد و قازی ناسرەدین موحەممەد، زبان و ویژەی خوێند؛ شیعرێکی زۆری عەرەبی لەبەر کرد و زۆر کتێبی ویژە و وشەی خوێندەوە و بەهۆی زیرەکی و لێهاتوویییەوە، لە ماوەیەکی کەمدا، بوو بە یەک لە شاعران و ویژەوانانی ئەو سەردەمە. ئەمجار ڕۆی بو دمشق و لەوێوە بەغدا و چەند شارێکی تورکیای ئێستا و لە خزمەتی موحەممەد، کوڕی قاسمی قاسمی، چەند پاژێک لە کتێبی «*هدایةالفقه*»ی خوێند و سەرەنجام گەڕاوە بۆ حەلەب لەو شارە نیشتەجێ بوو.

**چەند شیعری حوسەینی جزیری**:

یـا لیلـةً جمعتْنـا و الـسُّرورُ معـاً لا روَّعَتْهـا دواعـی الأُفْـق بـالفلق
لواسْـتطَعْنا و قَـدْ شـابتْ مفارقنـا صبْغاً لَها منْ سواد القلْب و الحدق
بکیْتهـا و شـباب العَـیْش فـی دعـةٍ منّـا و غافـل طـرف الـدَّهْر لَـمْ یَفُـق
علْمـاً بـانَّ اللَّیـالی غیـر بـاقیـةٍ و کـلُّ مجْتمـع یُرْمـی بمفْتـرق

حوسەینی جەزەری لە ئاخر و ئۆخری ژیانیدا بۆ شاری حەمات چووە و گەیشتنە بەرەوەی، لەگەڵ مەرگی کوڕی ئەمیری ئەوێ (ڕووحی، کوڕی عەلی، کوڕی ئەهوەج)دا هاوکات بووە. لەم بارەوە دەڵێ:

لا تعْجَبـوا أنْ سـال دمعـی دمـاً و اشْـتعلتْ نـارُ تبـاریحی
فَلَـسْتُ مـنْ یبکـی علـی غیْـره و إنَّمـا أبْکـی علـی روحـی

بەهەڵکەوت، پاش ئەم دوو بەیتە، بۆخۆشی زۆری نەخایاندووە ئەجەلی هاتووە و وەک دەڵێن، دوای سێ ڕۆژ دنیای بەجێ‌هێشتووە.

حوسەینی جزیری ساڵی ٩٩٧ لە دایک بووە و بۆ مەرگی، هێندێک ١٠٣٣ و هێندێکی‌تر ١٠٣٤ یان نووسیوە.

---

١. «**گووتی**» یان «**جوُدی**»، زنجیرە کێوێکە لە ناوچەی بۆتان، لە ڕۆژهەڵاتی باکووری جەزیرەی ئیبنوعومەر کە بەرامبەر بە ئایەتی قورئانی پیرۆز، گەمیەکەی نووح لەوێ لەنگری گرتووە: «ئەوجا گوترا: زەمین ئاوت هەڵقوڕێنە! بەرزایی بەس بیارێنە! ئاو ڕۆچوو بە ناخی ئاخا و کار سەری‌گرت؛ لەسەر **جوودی** لەنگەری گرت؛ وترا: تارن، ئەوانەی ناحەقیکارن.» **هوود** ـ ٤٤

*الأعلام*، ب٢، ل ٢٥٠. *خُلاصةالأثر*، ب٢، ل ٨١.

## زەینەدینی کوردی بەلاتی[١]

مامۆستایەک بووە کە پەسند و پشتیوانی هەموو زانایـانی کـوردی هاوچـەرخی، لـە زانـستە فیقهییەکانـدا وەرگرتووە و قوتابییانیش ئاخر قۆناغی خوێندنیان لە کۆڕی ئـەودا تـەواو کـردووە و ئیجازەیـان وەرگرتـووە. عەللامە و مامۆسـتای بـەناوبانگ حەیـدەری یەکـەمی هـەورامانی حـەریری (؟-١٠٣٦ ک. م.) یـەک لـە شاگردانی ئەو بووە.

زەینەدین دەوری سەد ساڵ ژیاوە و تا کاتی مەرگ، هێز و پێزی وتاردان و دەرس‌گوتنەوەی نەفەوتاوە.

چەند ئیجازەنامە و فتوای دەسنووس.

## مەلا ئەحمەدی موجەلی

نووسەری کتێبی «*خلاصةُالاثر فی أعیان القَرْن الحادی العَشَر*»، پێڕای پەسندانی و باسی پلەی بەرزی زانستی، لەقەبی «مُجلی» بۆ نووسیوە؛ کە ناوی قەبیلەیەکی کوردە.

مەلا ئەحمەد سەرەتای چەرخی یازدەهەم، کۆچی دوایی کردووە و زانای بـەناوبانگ مەلاعەبدولکـەریمی چۆڕی مەریوانی، لە شاگردە هەڵکەوتووەکانیە.[٢]

*خُلاصةالأثر*، ب٢، ل ٤٧٤.

## غوباری ئامیدی

قاسم‌ئەفەندی، ناسراو بە غوباری، خەڵکی دیاربەکر و لە ناودارانی زانایان و مامۆستایانی ئـەو شـارە بـووە کـە پاش سەرکەوتن لە ئاخر پلەکانی زانستە ئیسلامییەکان، ماوەیـەک دادوەری مەککـەی مبـارەک و پاشـان ئەستەنبووڵ بووە.

غوباری پیاوێکی ڕووگەش، خۆش‌دەم‌وزمان، قسەزان و خۆش خەت بووە و شێوە خەتێکی بـەدی‌هێنـاوە کە بە ناوی خۆیەوە (غوباری) ناسراوە.

ساڵی کۆچی یەکجاری غوباری، ١٠٣٤ ک. م. نووسراوە.

---

١. «**بەلات**» ناوچەیەک لە کوردستانی باشوورە.

٢. مەلائەحمەدی موجەلی ئیجازەی لە دەستی حەبیبوڵڵا میرزاجانی شیرازی وەرگرتـووە و ئـەویش لـە جەمالـەدین مەحموودی شیرازی و جەمالەدینیش موجازی، عەللامە جەلالەدین موحەممەدی دەووانی بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب٢، ل١٢٧.

## حەیدەری یەکەمی ماوەرانی، حریری

عەللامە حەیدەری ئەوەڵ[1]، کوڕی موحەممەد، سەرگەورەی بنەماڵەی بەناوبانگی «حەیدەری ماوەرانی»یـە[2] کە سەرەتا لە قەڵای حەسەناوا ـکە ئەودەم ناوەندی ئەردەڵان بووەـ دەرسی گوتووە و پاشان لەسەر داخوازی ئەمیر سلێمان‌بەگی کوڕی قولی‌بەگی سۆران، ساڵی ٩٤٤ ک. م. بۆ ناوەندی ئەو میرنشینە (حریر) چـووە و لەوێ بۆتە شێخولیسلام و بە دەرس‌گوتنەوە و فتوادان، درێـژەی بـە خزمـەتی دیـنی خـۆی داوە و دەوری ساڵی ١٠٣٦ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

---

١. پشتی عەللامە حەیدەری ئەوەڵ ئەچێتەوە سەر سـەفەوییان. لـە کتـێبی «*یـادی مـەردان*»دا ئـەم ڕەگەزنامـە ئـاوا نووسراوە: «حەیدەری ئەوەڵ، کوڕی موحەممەد، کوڕی حەیدەر، کوڕی بورهانەدین ئیبراهیم، کوڕی عەلائەدین، کـوڕی سەدرەدین، کوڕی سەفیەدین ئەبولفەتح ئیسحاقی ئەردەبیلی». باپیرەگەورەی ئەم بنەماڵە فیروزشای کوردی سنجاری شافیعی بووە کە پێشتر باسمان کردووە.

٢. زاروزێچی حەیدەری ماوەرانی تا ئەم دواییانە لە حەریر و چەند شوێنی‌تری کوردستانی باشوور و بەغـدا و دمـشق و حەلەبدا، پێشەنگانی پەرەدانی زانست و زانیاری بوون. زانایانی حەیدەری بەتایبەت لە بیرکاریدا، بلیمەتییان نوانـدووە و زۆر کتێبی بایەخداریان لە مەڕ ئەستێرەناسی و ڕیازی و حیکمەتەوە نووسیوە. خوازیارانی زانست، بۆ بـەهرە گـرتن لـەو دەریای زانیارییە، لە هەموو لایەکەوە ڕوویان لە حەریر و ماوەران ناوە.

یەک لە زانایانی ئەم خانەدانە، لە شەرحی «*تحریر أقلیدُس*» و یەکێکی‌تریان لەبارەی مووسیقاوە، دوو کتـێبی گـەورەیان نووسیوە.

لقێکی حەیدەرییان، بە ناوی کەوکەبییە، ئێستاش لـە حەلـەب دەژیـن و مامۆسـتایانی گـەورەیان تێـدا هەڵـکەوتووە.

عیسامەدینی مووسڵی لە کتێبی «*الرّوض أنضر فی عُلَماء العصر*» لە ژێر سەردێڕی «السّاده الحیدریّـه»دا دەڵـێ: «أمّـا هَـذا البَیت فَهوَ سَماءُ فضلٍ منَ الذّکاء عِمادُهُ و خیامُ علمٍ قَد رَقَت عَلی سَطح المجَرَّه اَوتادُهُ و کرسـیٌ کَمـال نُـصبَ عَلـی عَـرشِ البراعه و الفصاحه و سَنَدُ مَعال وضعَ عَلی نقشِ الاعجاز و الرَّجاحه، فَمنهُ أنتَشَرَت أصـنافُ الادَب و الفَـضائل و عَنـهُ أُخـذَتْ أنواعُ الفَرائد منَ المَسائل، کُلٌّ منهُم عَلّامَة زَمانه و فَهّامَه و وَقته و أوانه ...».

لە ناودارانی بنەماڵەی حەیدەری، بە تەرتیب: حەیدەری یەکەم، ئەحمەدی حەیدەری، حەیدەری دووهەم، ئیبراهیمـی حەیدەری، سەبغەتوڵڵا ئەفەندی حەیـدەری، مـەولانا موحـەممـەد ئەسـعەد سـەدرەدینی حەیـدەری، عوبەیدوڵـڵای حەیدەری موفتی بەغدا، عەبدوڵڵای حەیدەری، مەلا عیـسا حەیـدەری، سەبغەتوڵـڵا ئەفەنـدی دووەمـی حەیـدەری، عەبدولحەکیم ئەفەندی حەیدەری، عەبدولقادر ئەفەندی قازی بەسرە، ئیبراهیم فەسیحەدین ئەفەندی، عەبدوسسەلام حەیدەری موفتی، عیسا حەیدەری دووهەم، عەبدوڕڕەززاق حەیدەری، فەزلوڵڵا حەیدەری و ئیسماعیل حەیدەری؛ کـە هەموو خاوەن پلە و پایەیەی بەرزی زانستی بوون.

حەیدەری ئەوەڵ موجازی عەللامە زەینەدینی بەلاتییە؛ کە هەموو زنجیرە ئیجازەنامەکانی زانستی لە کوردەواریدا، ئەچێتەوە سەر ئەو. یەکێکی‌تر لە مامۆستایانی، زانای پایەبەرز شێخ عومەری باڵەکی بووە.

**لە نووسراوەکانی**: پەراوێز لەسەر کتێبی «*اثبات واجب*»ی جەلالەدینی دەووانی و حاشیە بۆ «*عَقاید عَضُدیّە*» و ...

شیاوی باسە باپیرانی حەیدەری ئەوەڵ، سەرەتا بۆ باکووری کوردستان چوون و حەیدەر خوێندنی لەوێ دەسپێکردووە.

*البیتوشی*، شیخ محمد خال سلیمانیەای، بغداد ١٣٣٧ ک. م. *بغیةالواجد فی مکتوبات مولانا خالد*، محمد اسعد صاحب‌زادە خالدی، دمشق ١٣٤٤ ک. م. *یادی مەردان*، مەلا کەریم.

## ئەبووبەکری ئامێدی

ئەبووبەکری کوردی ئامێدی هەر لە منداڵییەوە بۆ فێر بوون و زانین، وڵاتی خۆی بەجێ‌هێشتووە و بۆ دمشق چووە و لە خزمەتی شێخ ئەحمەدی کوردی ئامێدی و مامۆستایانی تردا خوێندوویە و لە ئوسووڵ و فیقهدا تەواوی کردووە. ئەوجار لە مزگەوتی ئەمەوی بۆتە مامۆستا و دەرسی‌گوتۆتەوە.

ئەبووبەکر مرۆیەکی خاکەسار و بێ دەمار، ڕووگەش و میهرەبان و چاوتێر و شوکرانەبژێر بووە کە لە شەوی یازدەی موحەڕڕەمی ساڵی ١٠٣٦ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە و لە زیارەتانی فەرادیسی دمشقدا نێژراوە.

*خُلاصةُالأثر*، ب١، ل١١٠.

## عەبدولموحسینی گۆرانی

کوڕی سلێمانی گۆرانی، لە زانایان و مامۆستایانی بەناوبانگی شافیعی چەرخی یازدەی کۆچی و هاوچاخی حاجی خەلیفە خاوەنی کتێبی «*کشف‌الظّنون*» بووە؛ کە لە مدینەی پیرۆزدا ژیاوە و دەوری ساڵی ١٠٤٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

ئەم مامۆستایە تەفسیرێکی بۆ قورئان، بەناوی «*جامعُ‌الاسرار*»، تا ئاخری سوورەی ئەعراف نووسیوە.

*کشفُ الظُّنون*، ب١، ل٣٥٨. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٦٢٢.

## نەفعی

عومەربەگی نەفعی لە کوردانی «باش‌قەڵا»ی لای ئەرزڕوومی باکووری کوردستانە کە چۆتە ئەستەمبووڵ و لەوێ سەرەتا کاروباری حوکمەتی ـ وەک بەرپرسی مەرزینگەی کان و پیشەسازی ـ پێ سپێراوە.



نەفعی شاعیرێکی سەرپەتی و توانا بووە کە زۆرتر بە ترکی شیعری گوتووە و هەموو هەر فڕبێژی کردووە و تانە و تەشەری لە دەسەڵاتداران داوە. چەند جاران لە لایەن دەوڵەتەوە تەمێ کراوە و تەنانەت لە زینـدان خراوە و سەرەنجام بە بۆنەی ئەتکی بارامپاشای وەزیری عوسمانییەوە، پاش گرتن و سزادان، لە شابانی ساڵی ١٠٤٤ ک. م. لە سێدارە دراوە.

نەفعی دیوانێکی بووە لە شیعری ترکی و کوردی و فارسی کە بەداخەوە بێجگە چەند بەیتێکی ترکی، شتێکی تر دەستی نووسەری ئەم کتێبەی نەگرت.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب٢، ل٢١٦.

## شێخ مستەفای تەختی

جاجی شێخ موستەفا تەختی مەردۆخی، کوڕی شێخ شەمسەدینی وەلی، کوڕی شێخ عەبدولغەفاری ئەوەڵ، لە ناودارانی بنەماڵەی مەردۆخی، لە عیرفان و زانستدایە کە ساڵی ٩٥١ ک. م. لە دایک بووە و دوای خوێندنێکی سەرەتایی لە زێدی خۆی، ڕووی لە وڵاتە عەرەبەکان ناوە و ماوەیەک لە عیراق و هێندێک لە شام بووە و پاشان بۆ حیجاز چووە و لە مەککەی پیرۆزدا، دەوری ساڵێک لە خزمەتی عەللامەی تویژەر، شەهابەدینی ئەحمەد، کوڕی حەجەری هەیتەمی (؟-١٠٤٧ ک. م.) خوێندوویە و دوای وەرگرتنی ئیجازە، گەڕاوەتەوە کوردستان و پاش چەند ساڵان دەرس‌گوتنەوە و خزمەت بە خەڵک، ساڵی ١٠٤٧ ک. م. لە گوندی تەختەی لای شاری سنە، ئەمری خوا بەجێ‌هێناوە.

*تاریخچەی خاندان مَردوخ.*

## مەلا عەبدولەتیفی قازی

کوڕی مەلا حوسەینی گەورە، لە والییان و دادوەرانی کوردستان و باپیرەگەورەی شێخولئیسلامەکانی سنەیە کە مرۆڤێکی زانا، وێژەوان و پارێزکار بووە و ساڵانێکی زۆر دادوەری کوردستانی ئەردەڵانی لە ئەستۆ گرتووە. ئەم بەیتە سەجعی مۆرەکەی بووە:

کی بود شاهد پی اثبات دین چون خط عبداللطیف بن حُسین

کۆچی دوایی ئەم زانایە لە نیوەی دووەمی چەرخی یازدەی کۆچیدا ڕوویداوە.

*تاریخ مَردوخ.*

## شێخ ئەحمەدی حەریری عوسالی

بابی شێخ ئەحمەد لە کوردانی حەریر بووە کە بۆ گوندێکی شام بە ناوی «عوسال» چووە و ئەحمەد لەوێ

لەدایکبووە و پاش پێگەیشتن و خوێندنی دەرسە سەرەتاییەکان، بۆ دمشق چووە و لەوێ هاوڕی لەگەڵ خوێندن و فێر بوون، پاکژکردنەوەی دڵ و دەروونیشی دەسپێکردووە. دوای ماوەیەک چۆتە حەلەب و خزمەتی یەکێ لە عارفە ناودارەکانی ئەوێ بە ناوی شێخ ئەحمەدی دەرغەوانی گەیشتوە و لە ودمی هەناسەی ئەو زاتە، داوای یارمەتی کردووە. ئەوجار بە عیشقی دیتنی شاوەلی، سەرباشقەی تەریقەتی خەڵوەتیان، بۆ «عینتاب» چووە و چۆتە ڕیزی مریدانیەوە و پاش دەسکەوتنی شارەزاییەکی تەواو لە سەیر وسولووک و سۆفییەتیدا، ئیجازەی ئیرشادی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە دمشق. خەڵکی تینووی ڕاستی و پاکی، لە هەموو لایەکەوە ڕوویان لێ هاوردووە و سەریان پێ سپاردووە.

شێخی عوسالی شەوی هەینی ١٨ی زیحەجەی ساڵی ١٠٤٨ ک. م. لە دنیا چووە.

*خُلاصةالأثر*، ب١، ل٢٤٨.

## مەلا قاسمی کوردی

زانایەکی باکووری کوردستانە کە لە سەرەتای پاشایەتی سوڵتان مرادی چوارەم (١٠٣٢-١٠٤٩ ک. م.)دا، کۆچی کردۆتە وڵاتی عوسمانی و پاش ساڵێک و دوان بۆتە قازی ئەدرنە و سەرەنجام ساڵی ١٠٤٨ ک. م. لە ئەستەمبووڵ کۆچی یەکجاری کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زَکی‌بیگ، ب٢، ل١١٢.

## مەلا ئەبووبەکری سۆرانی

مەلا ئەبووبەکری وانی حەنەفی کوڕی مەلا موحەممەد، کوڕی سلێمانی سۆرانی، لەدایکبووی وان و نیشتەجێی قوستەنتەنییە ( ئەستەمبووڵی ئێستا)، لە مامۆستایانی هەڵکەوتە بووە کە لە ساڵە دواییەکانی تەمەنیدا بۆ قاهیرە چووە و لەوێش دەرسی گوتووە و بەهرەی گەیاندووە و ساڵی ١٠٤٨ ک. م. سەر لە بانی کتێبیان، لە حوجرەیەکی ئەزهەردا، لە دنیا چووە.

**لە بەرهەمەکانی**: شەرحێکی قەسیدەی بوردە بە ناوی: «*الدُّرة المُضیّة فی شرح الکواکب الدُّریّة*».

*کشفُ الظُّنون*، ب٢، ل٩٩ و ٢٢٨. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٢٣٩.

## شێخ حەسەنی ئامێدی

لە زانایانی کۆچەری کوردە کە دەوری ساڵی ١٠٣١ ک. م. لە دمشق نیشتەجێ بووە و هەر لەوێ ژنی خواستووە و دەرسی‌داوە و زۆرێک لە قوتابیانی بارهێناوە.

شێخ حەسەن زۆرتر دەرسی تەفسیر و حەدیس و فیقهی گوتۆتەوە و بەشێک لە شەو و ڕۆژی خەریکی

عیبادەت بووە و زۆرێک کتێبی نووسیوەتەوە و لـە پیریـدا کتێبخانەکـەی وەقفـی خوێنـدکاران و قوتابیـان کردووە و ساڵی ١٠٤٨ ک. م. لە دنیا چووە و لە زیارەتانی فەرادیسی دمشقدا نێژراوە.

*خُلاصةالأثر*، ب٢، ل٧٨.

## قازی سەلاحەدینی گۆرانی

قازی سەلاحەدین، کوڕی موحەممەدی گۆرانی حەلەبی، شاعیرێکی توانا و وێژەوانێکی هێژایە کە لە حەلەب ژیاوە و بەرپرسی دەفتەری داوەری دادوەرانی ئەوشارە بووە و ساڵی ١٠٤٩ ک. م. لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا لە دنیا چووە.

قازی سەلاحەدین نووسەرێکی باشیش بووە و شاعیران و نووسەرانی هاوکـاتی، خۆیـان لەبـەر نـەگرتووە. یەک لە ژینامە نووسان وای پێدا هەڵگوتووە: « شاعِر إن ذكر المجيدون فهوالواحـدُ الكامـل و نـاثرٌ إن وصـفَ المتون إاى الاداب فهو القاضى الفاضل[1]... ».

**لە کتێبەکانی**: «*الجوارى الغَوادى*»، «*الجواهر المضيئه*» لـە شـەرحی «*هَمزّيـه*»ی بووسـیریدا، «*رواج الـضائغ و سلاسل القرار*»[2].

**ئەمەش پارچە شیعرێکی سەلاحی گۆرانی**:

أيـن فـصْلُ الرَّبيـع، أيـن الـشَّباب  يئـستْ مـنْ رجوعـه الأحبـابُ
غارتْـــهُ مواقـــعٌ أعْدمَتْـــهُ  فـــشرابُ الرَّبيـــع رغْمـــاً ســـرابُ
خَـرَس اَلعَنْـدليبُ فيـه وَ أضْـحى  صـاحبالنُّطـق فـى رُبـاه الغُـرابُ
لَـوْ عَلمْنـا أنَّ الزَّمـان خَـؤونٌ  فيـه تنْـأى مـنَ اللّقـا أصـحاب،
لـشَفينا مـن اللّقـاء قُلوبـاً  لَـمْ يَرعْهـا مـنَ الزَّمـان انْقـلابُ
لكـن المـرء لا يـزالُ غَفُـولاً  بـيْنَ هـذا و بـيْن ذاك حجـابُ

*خُلاصـةالأثـر*، ب٢، ل٢٥٢-٢٥٦. *الأعـلام*، ب٣، ل٢٩٨.

*فهرس مَخطوطات دارالكتب الظّاهريّه*، ل٨٩ و ٩٠ و ٢٤٣.

## قازی قاسمی مودەڕڕیس

کوڕی موحەممەد، لە زانایانی باکووری کوردستانە کە زۆرتر خەریکی دەرس‌گوتنەوە و تۆژینەوە و نووسـین

١. قازی فازیل لە وێژەوانان و شاعیرانی بەناوبانگ و کەڵەپیاوانی دەرباری سوڵتان سەلاحەدین بووە.
٢. لە کتێبی «*ایضاح المَكنون*»دا ساڵی نووسرانی ئەم کتێبە ١١٦٠ ک. م. گوتراوە؛ کە لە ڕاست ناچێ.

بووه و لەگەڵ ئەوەشدا، دەستی لە کـەس دانەکێـشاوە و لـە ڕەنجـی شـانی خـۆی ژیـاوە. کتێبێکـی لـێ بەجێماوە بە ناوی: «*نسائم السّنافی کیفیّه مدینه بوسنا*».

ئەم مامۆستایە ساڵی ١٠٥٠ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٨٣٣.

## مەلا عەبدولکەریمی چۆڕی

کوڕی مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی مەریوانی، سەرەتا لە خزمەت بابی زانایدا خوێنـدی و ماوەیـەک لە دەرسی مامۆستای پایەبەرز مەلا ئەحمەدی کوردی موجەلی بـەهرەی بـرد و پاشـان کەوتـە گـەڕان بـۆ خوێندن؛ تا ئیجازەی وەرگرت. ئەمجار گەڕاوە زێدی خۆی و دەرسـی گوتـەوە و سـەرەنجام ساڵـی ١٠٥٠ ک. م. دنیای بەجێهێشت.

**لە کتێبەکانی**: تەفسیرێکی قورئانی پیرۆز تـا سـوورەی نـەحل، لـە سـێ بەرگـدا، «*الواضح*»، «*المتوسط*»، «*الاوضح*» و «*أنذار الاخوان*» لە مۆچیاریدا.

تاقمێکی زۆر لە کۆڕی دەرسی مەلا عەبدولکەریمی چۆڕیدا بەشدار بوون و پێگەیشتوون؛ بـۆ وێنـە: مـەلا ئیبراهیم، کوڕی حەسەنی گۆرانی کوردی.

*خُلاصةالأثر*، ب٢، ل٤٧٤. *ایضاح‌المکنون*، ب١، ل٣٠٨. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٦١٢.

## شێخ ئیبراهیمی هەورامانی

زانایـەکی هـەورامانی کوردسـتانە کـە لـە نیـشتمانی خـۆی پـەڕەوازە بـووە و لانـشینی دوو شـاری پـیرۆزی مەککـە و مەدینـەی هەڵـبژاردووە و بـە نـۆرە، لـەو شـارانە دەرسـی گوتـووە ئامۆژیـاری داوە و زانـای بـەناوبانگ ئەبووسـالم عەبدوڵـلا، کـوڕی موحـەممـەد، کـوڕی ئەبووبـەکری عەییاشـی مـەغریبی (؟- ١٠٩٨) شاگردی موجازی ئەو بووە.

شێخ ئیبراهیم لە ساڵی ١٠٥٠ ک. م. بەشی بە دنیاوە بووە.

*خُلاصةالأثر*، ب١.

## شێخ عەبدوڕڕەحمان، موفتی ئامێدی

کوڕی موحەممەد، کوڕی موحەممەد، کوڕی عیمادەدین، لە زانایانی بەناوبانگی چەرخی یازدەیە کە بـە منداڵـی بابی مردووە؛ بەڵام لەبەر زیرەکی و لێهاتوویی، کە خوێندنی دەسپێکردووە و وانە سەرەتاییەکانی دوایی هێناوە، لە

ماوەیەکی کەمدا گەیشتۆتە ڕادەیەک کە لە کۆڕی دەرسی مامۆستایانی گەورەی ئەو سەردەمە، وەکوو: عەللامـە حەسەنی بوورینی و شێخ موحەممەد موحیببەدین و ... جێی بۆتەوە و ئیجازەیان پێ داوە.

شێخ عەبدوڕڕەحمان ساڵی ١٠٤١ ک. م. بۆ بەجێهێنانی حەج، ڕووی لە حیجاز ناوە و لەوێ تەریقەتیشی ناسیوە و لە گەڕانەوەدا بۆ شام، کاری دەرس‌گوتنەوە و بارهێنانی قوتابیانی گرتۆتە ئەستۆ. زۆری پێ نەچووە کراوەتە موفتی ئەوێ و ناوی وەکوو زانایەکی پارێزکار، لە هەموو لایەک دەنگی‌داوەتەوە؛ تا ئەو ڕادە کە مامۆستایانی مەککە، گیر و گرفتی شەرعی خۆیان لەو پرسیوە و داوای فتوایان لێ کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الهدایة*» لەمەڕ عیباداتەوە، «*المُستطاع من الزّاد*»، پەراوێز بەسەر تەفسیری کەششافدا و سەرجەمی نامیلکەکانی. دیوانی شیعریشی هەبووە و شیعری لەوپەڕی جوانی و قەوەتدان؛ بۆ وێنە:

أُکفکفُ دَمعَ العین خوفاً و أکْتُمُ من الناس، و المخْفیُّ فی القلْب أعْظمُ
وَ هَبْنی کَتَمْتُ الدَّمع عَنْهُمْ تَجَلُّداً علی حَرّ نار فی الحشا تتضرَّمُ
أیخْفی نحُولُ الجسْم منْ عَیْن ناظر؟ وَ هَلْ ذلَّة النَّفس العزیز تُکَتَّمُ؟

ئەم دوو بەیتەش مامۆستایەکی هاوچەرخی بۆی نووسیوە:

أدامَ الله اَیّام العماد و أبْقی النّفع منهُ للْعباد
و لا برحَتْ نُحاةُ العلم تَبْغی فضائلهُ و تَرْجعُ بالمُراد

زا و مەرگی شێخ عەبدوڕڕەحمان ١٤ی ڕەبیعولئاخری ساڵی ٩٧٨ و شەوی یەکشەممە، ١٧ی جیمادیئەوەڵی ساڵی ١٠٥١[1] ک. م. ڕوویداوە و لە زیارەتانی «بابُ الصّغیر»ی دمشقدا نێژراوە.

*فهرس مخطوطات دارالکُتُب الظاهریّە*، چاپی دمشق، ساڵی ١٣٨٤ ک. م. ل١٠٤. *مشاهیرالکُرد*، ل١٤ و ١٥، بە گێڕانەوە لە *خُلاصةالأثر*.

## باباڕەسوولی بەرزەنجی[2]

سەید باباڕەسوولی کەبیری بەرزنجی شارەزووری، کوڕی عەبدوسەید، سەرباشقەی سەیدەکانی بەرزنجەیە

---

١. دوکتور عیززەت حەسەن لە کتێبی «*فهرس مخطوطات دارالکُتُب الظاهریّە*»دا، ساڵی ١٠٣٥ی نووسیوە.

٢. «**بەرزەنجە**» ناوی بنەماڵەیەکی بەناوبانگە کە بەتایبەت لە ناوچەی شارەزووردا ڕیشە و ڕەتەوەیەکی مەزن و کۆنیان هەیە. لە باوان‌نامەی ئەم بنەماڵەدا نووسراوە: سەرباشقەیان عارفی ناودار سەید باباعەلی هەمەدانییە کە لە چەرخی هەشتەمدا ژیاوە و ساڵی ٧٨٦ یان ٨٠٥ ک. م. لە دنیا چووە. دوو کوڕی بە ناوی سەید مووسا و سەید عیسا بووە کە کۆچیان کردووە و لە شارەزوور سەقامیان گرتووە. سەید مووسا وەجاخی کوێر بووە؛ بەڵام سەید عیسا منداڵی زۆر بوون و هەموو سەیدەکانی بەرزنجی زار و زێچی ئەون؛ کە زۆر کەسانی هێژایان لێ هەڵکەوتووە و لەم کتێبەدا هێندێکیان دەناسێنینەوە.

کە عارفێکی پایەبەرز بووە و لە باری زانستیشەوە، لای مەلا ئەبووبەکری موسەنیفی چۆڕی و مەلا مووسا تەوەکولی خوێندنی تەواو کردووە و پاشان لە ناوچەی شارەزوور دەرسی تەریقەتی داوە و هەموو خەڵک سەریان پێ سپاردووە و سەرەنجام ساڵی ١٠٥٦ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

*السّادات البرزنجیّه.*

## ئەبووسوعوودی حەلەبی

برای قازی سەلاحەدین و کوڕی موحەممەدی حەلەبی گۆرانی و لە ناودارانی شیعر و وێژەی چەرخی یازدەیە کە لە شاری حەلەبدا ژیاوە و ماڵی بنکەی وێژەوانان و شاعیران و شیعردۆستان بووە و خوازیاران و قوتابیانی لەگەڵ جوانی و وردەکاری شیعردا ئاشنا کردووە و ساڵی ١٠٥٦ ک. م. لە دنیا چووە.

**شیعرێکی ئەبووسوعود**:

أجَلْ انَّهـا الآرامُ شیمَتُها الغَدْرُ فلا هَجْرُها ذَنْبٌ و لا وصْلُها عُذْرُ
ففُزْ سالماً منْ ورطة الحُبِّ و اتَّعظْ بحالی، فَإنَّ الحُبُّ أیْسرهُ عُسْرُ
وَ قَدْ هاجنی فی الایک صدْحُ مُغَرِّد به حَلَّت الاشجانُ وأرتحَلَ الصَّبْرُ
یُذَكِّرُنی تلْكَ اللَّیالی الَّتی انْقضَتْ فقَدْ كان عیْشُ فی ذُراك هُو العُمرُ
سُقیت لَیالی الوصْل! مُزْنَ غَمامة بلَذَّة عیشٌ لَمْ یَشُبْ حُلْوَهُ مُرُّ
فكَمْ قَدْ نَعْمنا فیك معْ كُلِّ اَغْید رَقیق الحواشی، دونَ مَبْسمه الزَّهْرُ
لَقَد خَطَّ یاقُوتُ الجمال بَخَدِّه جداول منْ مسك صحیفتُها الدُّرُ
و روض به جَرَّ الغَمامُ ذُیُولَهُ فَخَرَّ لَهُ وجْداً علی رأسه النَّهرُ
وَ قَدْ أرقَصَ الاغْصان تَغْرید وُرقه وَ أضحْكَ ثغْر الزَّهْر لَما بكَی القَطْر
وَ ضاع به نَشْر الخُزامی فَعطِّرَتْ نَسیمُ الصبا منْهُ و یا حَبَّذا العطْرُ

*خُلاصةالأثر*، ب١، ل١٢٣ و ١٢٤.

## مەلا قاسمی گۆرانی

کوڕی عەبدولمەننانی گۆرانی، خەڵکی شارەزوور، لە مامۆستایانی فیقهـ و ئوسوول بووە کە بە بۆنەیەکەوە زێدی خۆی بەجێ‌هێشتووە و بەرەو شام چووە و پاش کورتە ماوەیەک لە لایەن سەنان‌پاشای وەزیری عوسمانییەوە، کاری سەرپەرشتی و پێڕاگەیشتنی مەوقووفاتی دمشقی پێ سپێردراوە و تا ئاخری ژیانی، لەوپەڕی دەسپاکیدا، ئەو کارەی بەڕێوە بردووە و ساڵی ١٠٥٧ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە و لە زیارەتانی «باب‌الصغیر»ی دمشقدا نێژراوە.

*خُلاصة‌الأثر*، ب٣، ل٢٩٢.

## مەولا حەسەنی زێباری[1]

کوڕی موحەممەد، مرۆیەکی ئاگا و پارێزکار و مامۆستایەکی زانا و هێرەکاری خەڵکی زێبار بووە کە لە ناوەڕاستەکانی چەرخی یازدەدا ژیاوە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێزێکە لە سەر «*شرح فرائد الفوائد لتحقیق معانی الاستعارات و اقسامها*»، نووسراوەی عوسامەدینی ئەسفەراینی (؟- ٩٤٣) کە بەناوی موحەممەد شەمسەدینی کوڕیەوە کردووە. ڕوونووسێک لەم کتێبەم دەس‌کەوت کە موحەممەد ئەمین، کوڕی مەلا حوسەینی ڕوودباری هەورامانی ناوێک ساڵی ١٢٢٠، لە گوندی ملەکەوو نووسیویەتەوە.

*کشف‌الظنون*، ب٢، ل١٧٩. یاداشتەکانی نووسەر.

## مەلای جزیری[2]

شێخ ئەحمەد، مەشهوور بە «مەلای جزیری»، کوڕی شێخ موحەممەد، لە عەشیرەتی کوردی بوختی و لە بنەماڵەی زانست و پارێزکاری، لە شاری جزیر هاتۆتە دنیاوە. بابی پیاوێکی زانا بووە و سەرەتا بۆخۆی دەرسی پێ گوتووە. ئەحمەد ئەمجار بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەی، ناوچەکانی تری باشووری کوردەواری، وەک: هەکاری و دیاربەکر و ئامێدی گەڕاوە و پاش دوایی هاتنی دەرس و دەور، لای مامۆستایەکی بەناوبانگی ئەو سەردەمە، واتا مەلا تاهای دیاربەکری، ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە جزیر و دەرسی گوتۆتەوە. پاش ماوەیەک چۆتە حسن‌کێفا و لەوێ کاری خۆی درێژەپێداوە و بەرنوێژی و ئامۆژگاریشی کردووە؛ بەڵام لەپڕێک دەستی لە هەموو کارێک بەرداوە و چۆتە نێو کۆڕی سۆفییان و هەموو کاتی بە عیبادەت و ڕیازەت و بەجێ‌هێنانی داب و دەستووری تەریقەت ڕابواردووە.

مەلای جزیری شاعیرێکی پایەبەرزە کە بە کرمانجی باکوور شیعری گوتووە و زۆربەی شیعرەکانی ئەویندارانە و عارفانەیە. وەک دەڵێن، بە لاوی دڵی لە لای سەلما ناوێ لە بنەماڵەیەکی بوودە، داناوە و ئەم ڕووداوە کارێکی زۆری لەسەر هەست و زەوقی شاعیری کردووە.

لەمەڕ کات و سەردەمی ژیانی مەلاوە، قسەی مێژوونووسانی کورد و ڕۆژهەڵاتناسانێ کە لەم بارەوە

---

١. «**زێبار**» ناوچەیەکی کوردەوارییە لە پەنای ڕووباری زابی گەورەوە، نزیک لە ئامێدی.

٢. «**جزیر**» یان «**جزیروبۆتان**» شارێکی کوردستانی باکوورە لە پاڵداوێنی کێوی «**جوودی**»دا؛ کە ـ وەک گوتمان ـ بەرامبەر بە دەقی قورئانی پیرۆز، گەمیەکەی نۆح (د) لەوێ لەنگری گرتووە.

لێ کۆڵیونەتەوە، یەک ناگرێ. خوالێخۆشبوو جەلادەت عالی بەدرخان (بلەچ شـێرکۆ) لـە کتـێبی «*القضیّة الکُردیّة*»دا ساڵی کۆچی دوایی مەلای جزیری، ١١٦٠ ز. نووسیوە. مێژووزانی بەناوبانگ، ڕەحمـەتی ئـەمین زەکـی‌بـەگ لـە دوو کتـێبی «*کـوردانی بـەناوبانگ*» و «*کـورد و کوردسـتان*»دا دەورانی ژیـانی مـەلای، ناوەڕاستەکانی چەرخی شەشەمی کۆچی و ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی ئاوگوسـت ژابـا لـە کتـێبی «*مباحثی از اکراد*»دا، نێوان یالانی ٥٤٠ و ٥٥٦ ک. م. دەڵێ. شەرقناسی ئاڵمانی فۆن هارتمەن ـکە دیوانەکەی مەلای لە ساڵی ١٩٠٤ ز. لە شاری برلیندا چاپ کردووە و پێشەکییەکی ئاڵمانیشی بۆ نووسیوەـ خۆی لەم باسە نادا و هەر قسەی ژابای دووپات کردۆتەوە.

مامۆستا عەلائەدین سـەجادی لـە کتـێبی «*مێـژووی ئـەدەبی کـوردی*»دا، پـاش گەڕاندنـەوەی هـەموو قسەوباسان، پشت بە دەسنووسێکی دیوانەکەی مەلای جزیری دەبەستێ کـە عەبـدولقادری کـوڕی عـەلی ئامێدی، ساڵی ١٣٣٨ ک. م. نووسیویەتەوە و تێیـدا ساڵـی لـەدایکبـوونی مـەلای ١٤٠٧ز. (٨١١ ک. م.) زانیوە و مەرگیشی پاش ٧٥ ساڵ لە شاری جزیر نووسیوە و دەڵێ: «...شێخ موحەممەدی بـاوکی مـەلا لـە بنەماڵەیەکی شیخی بەرماڵی بووە. بەپێ ڕەوشتی ئەو دەورەوە، حەزی بە خوێندەواریش کردووە. لـەپێـشا خۆی دەرزی ئەحمەدی کوڕی دائەدا؛ لە پاشا بۆقوتابخانە؛ لەوێوە بۆ فەقییەتی.

شێخ ئەحمەد بۆ خوێندن هەموو ناوچەی جزیرە و هەکاری و دیاربەکر و عیمادییە گەڕاوە. لـە خوێندنـدا زۆر زیرەک و پێشکەوتوو بووە؛ لە فارسیدا دەستێکی باشی بووە؛ لە عیلمە عەرەبییەکانا، بەتایبـەتی بـەدیع و بەیان و ئوسوول، سەرامەدی دەوری خۆی بووە... لە ئاخرا لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا لـە گونـدی سـترباس لـە دیاربەکر، لە لای مەلاتاها ناو ئیجازەی عیلمی وەرئـەگرێت و چەنـد ساڵـێک لـە گونـدی سـربا ـهـەر لـە دیاربەکرـ ئەبێ بە مەلا... تا لە دیاربەکر بووە تەدریسێکی زۆری کـردووە و گـەلێ ئیجـازەی داوە؛ لـە پاشـا حاڵەتی عەشقی، سەری پێ کێشاوە بەلای تەسەووفەوە و لە کەڵـکی تەدریـسی ئـەخا؛ حاڵـەتی دێوانـەیی ئەگرێت و ڕوو ئەکاتەوە بۆ جزیرە و لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا ئەمرێت و ئەنێژرێت. گۆڕەکەی ئێستەش مـەزاری دڵسۆزانە...».

مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلا موحەممەدی بۆتانی ژڤـنگی، دانیـشتووی سـووریا، شـەرحێکی عـەرەبی بـۆ دیوانەکەی مەلای جزیری، بەناوی «*العقدالجوهری فی شرح دیوان الجزری*» نووسیوە و ساڵـی ١٣٧٧ ک. م. لە شاری قامیشلی چاپی کردووە. ئەو دەڵێ مەلا لە دواییەکانی ٩٠٠ی کۆچی هاتۆتـە دنیـا و تـا بڕانـەوەی ساڵی ١٠٠٠ و شایەدیش ١٠٠٥ ژیاوە.

بەڵام هیچکام لەم بۆچوونانە، لەبەر ئەوەی پشتیان بە بەڵگەیەکی بێ‌قسە نەبەسـتووە، لـە ڕاسـت نـاچن. تاکە شتێک کە دەتوانێ لەم بارەوە هێندێک بەچاومان ڕوون بکاتەوە، هاوکـات بـوونی لەگـەڵ شـاعیرێکی تری کورد، بەناوی «فەقێ تایران»ە. ئەمیش وەک مەلای جزیری، عـارف و شـاعیر بـووە و پێکـەوە شـیعر و

نووسراوەیان گۆڕیوەتەوە. فەقێ تایران لە بەیتێکی خۆیدا دەڵێ: «هەزار و چل و یـەک چوونـە». واتـا ١٠٤١ ساڵ لە کۆچ چووە. کە وابوو بێشک مەلای جزیریش لە چەرخی یـازدەدا ژیـاوە. ئـەم گوتـە ڕای دوکتـور کەمال فواد و دوکتور مەکینـزی پشتیوانی دەکا کە کاتی مەرگی مەلایان ١٥٧٠ و ١٦٤٠ ز. نووسیوە.

مەلای جزیری عارفێکی وەحدەت وجوودی بووە لە سەر تەریقەتی نەقشبەندی. زمانی عەرەبی و فارسی و ترکی باش زانیوە و بێجگە کوردی، شـیعری عەرەبیـشی زۆرە. لـە شـیعریدا نازنـاوی «مـەلا» و «مـەلێ» و جاروبارەش «نیشانی» هەڵبژاردووە. دیوانەکـەی پێـشتر لـە ڕووس و ئاڵـمان و سـووریا چـاپ بـووە و لـەم دواییانەش (١٣٦١ ک. ه.( بە پێـشەکی و شـەرحێکی ڕازاوەی زانـای هێـژای کـورد، مامۆسـتا هـەژارەوە، سرووشی تاران لەچاپی داوەتەوە.

**چەند وێنەیەک لە شیعری ئەم عارفە:**

شەربەتا لام و بێیان ئەز ب حـەیاتێ نـادەم
بادەیـا لـەعلی ب ئاڤـا زوڵـوماتێ نـادەم

حوور و ویلدان و پەری جوملە جەمابن ئیرۆ
موویەکی پی ژ خەتێ وی بوت و لاتێ نادەم

گەر بدەت دەست تەوافا پی و دەستان بکرم
وی مـەجالێ ب وقووفـا عـەرەفاتێ نـادەم

ئەز و یار گەر شەڤەکی هـەر دوو هـەمئـاغووش بـبین
«لیلةُالقدر»ە مە ئەو شـەڤ ب بـەراتێ نـادەم

جانی شیرین گو ژ یارا بخودان ئـەز دکـرم
نە ب یارێ خوە دوەقتێ سـەکەراتێ نـادەم

نە ب قانوون کو ئیشارەت بـشیفائێ بکـرت
ئەز هیلاکێ خوە دعیشقێ ب نەجاتێ نادەم

شەربەتا زەهری هەلاهیل کوحەبیبی مە بدەست
ب گولاب و شەکەر و قەند و نـەباتێ نـادەم

تەلبە کر وەسڵی ژ دڵبەر مە ب عنوانی زەکات
گۆ تو عەبدی و ب عەبدێ خوە زەکاتـێ نـادەم

وی ب پەیکی بکرین مـات ڕەقـیبی دیـسا
ب ڕوخ و فیل و فەرەس ئەز شەهوماتێ نادەم

د سەمایا سەحەرێ دەست ب کەس دی ئیرۆ
غەیری شیرین قەد و مەوزوون حەرەکاتێ نادەم

هاتە دەستێ مە درەقسێ و دگو بل ژ مەلێ
دەست ب کەس دی د سەمایا کو «مەلا»تـێ نـادەم

* * *

نێرگزین شەنگ دمەستن چـەپ و ڕاسـت
سـاقیان جـام د دەسـتن چـەپ و ڕاسـت

ڕاست و چەپ تێن جگەر و سـینە کـەباب
عەرعەرین شەنگ دلەستن چەپ و ڕاسـت

تـۆخ و عـالا کـو خویـان بـوون ژ عەجـەم
عەرەبان تیپ شکەسـتن چـەپ و ڕاسـت

بـەر ڤـە شـەرقی د سـەحەر وەسـتایین
هینـدوێن ڕۆژپەرەسـتن چـەپ و ڕاسـت

قەیسەری ڕوومی ل سەرحەددی فـەرەنگ
تۆق و زنجـیر ڤەبەسـتن چـەپ و ڕاسـت

هەر دو دەسـتێن خـۆ حـەمایل شەڤـەکی
مە ژ بۆ یارێ دخوەسـتن چـەپ و ڕاسـت

ڤە «مەلێ» سـوڕ پـەرییا حـووری سرشـت
سەد مەلەک دەست بدەستن چەپ و ڕاسـت

ب حوسنا «احسن‌التّقویم» و زاهیر سوورەتی زاتی | نەزەر دی «عَلَّمُ‌الاسماء» و باتین عەینی میرئاتی
د پابووسا سەمەن‌سایێ م نێری بەژن و بالایێ | لعلّی أبلغُ الأسباب، أسبابُ السّماوات
ژڤی تەقویمی ئینسانی نەزەردا سیرڕی سوبحانی | «فَهذا الوجْهُ مِنْ اجْی براهینٍ و آیاتِ»
کونووری عیشقێ لامیع‌دەت ل تووری قەلبی جامیع‌دەت | د سەیرا «برزخُ الاسماء نِهایاتُ بدایاتِ»
نیشانین تورڕەیی توغرا د وەسفی زوهرە سیمایان | «لعنوان التَّجلّی مِنْ براعات العبارات»
دلۆوەر سەیری بالایان دگولزارا سەمەن سایان | «بِها تهْتُز باناتٌ لَنا مِنْ مَیْسِ قاماتِ»
سەمایا جوملە دیم دورتی ب ئیعجاز ئەهلی سور پورتێ | «بها تصتَفُّ قاماتٌ بِعیدانٍ وَ نایاتِ»
دبینی نەغمە یا چەنگێ دەما ئاڤیهتە ئاهەنگێ | ب قانوون وی دەخونت مە «لمیعادٍ و میقاتِ»
ژ ڕەمزین غەمزە چالاکی ب دل دی بێنە ئیدراکی | «معانٍ لم یَسعْها اللّفظُ مِنْ ضیقِ العبارات»
ژ نازک‌دلبەرا نازک د سەهمی دێمە ئیعجازک | «و کَمْ مِنْ خَشْف غزْلانٍ اهابتْ لیێ غاباتِ»
نە تەنها پیشبەری یارین، ژ ئەمری «کُنْ» خەبەردارین | «وَ مَنْ أهْواهُ سارٍ فی مَساری کُلِّ ذرّاتِ»
«هُوَ الاوّل، هُوَ الاخر، هُوَ الظّاهر، هُوَ الباطِن | هُو المعبُود و المشهُودُ فی کُلِّ الهویاتِ»
ژ لا شیئی ژ مەعدوومی مە ناسی سیرری قەییوومی | «سُجودی فی تُرابِ المحوِ مِنْ أعلی المقاماتِ»
د عیشقێ شێخی سانیمە ب دل بەحری مەعانیمە | «لذی حِجْرٍ و ذی قَلْبٍ شِفاءٌ فی اِشاراتِ»
د ئیقلیمی سوخەن میرم د شیعرێ دە جهانگیرم | «وَ یعلُو موکِبَ العشّاقِ أعْلامی و رایاتِ»
چخوەش نورەک زەلالی تۆ د قەلبی من شەمالی تۆ | «وَ قَلْبی حیثُ فیه الحبُ مِصباحٌ بمشْکاتِ»
تەقازا وە دەکر حیکمەت کو چەرخ و لەولەبی با بن | «هُو الفعال لا تَغْتَرْ بِأسبابٍ وَ آلاتِ»
تَعالی‌الله ژ ئیحسانی ب دلداری ب دل دانی | «مەلا» ئیرۆ تە کر پاشا ل سەر چەهڤێن «مەلێ» هاتی

*دیوانی مەلای جزیری*، هەژار شەرحی لێ کردووە، سرووش، تاران، ١٣٦١ ک. ه. *العقدالجوهری*، احمد ژڤنگی. *دەقەکانی ئەدەبی کوردی*، عەلائەدین سەجادی، ل٦١– ٦٥. مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی، ل١٥٥-١٧٩.

## زەکی ئەفەندی سۆرانی

مەولانا ڕەسوول زەکی‌ئەفەندی سۆرانی، کوڕی مەلا یەعقووب و ناسراو بە «ڕەسوولی ئەوەڵ»، لە زانایانی نیوەکانی چەرخی یازدە و خەڵکی گوندی «کولۆ»ی لای سەردەشت و موجازی عەللامە حەیدەری ئەوەڵی ماوەرانی بووە کە تا دواکاتی ژیان لە زێدی خۆیدا خوێندوویە و دەرسی گوتۆتەوە و نووسیوە؛ بۆ وێنە پەراوێز لەسەر «*تُحفَةُالمُحتاج*» لە فیقهدا.

شێخ حەسەنی نووردینی (؟– ١٠٧٨ ک. م.) لە شاگردانی هەڵکەوتەی بووە کە زەکی ئەفەندی، لە باری

کردەوە و زانستەوە، لەسەرووی هەموو مامۆستاکانی تری، داناوە. دەبێ بزانین زانایانێکی گەورە لە دەورانی مەولانا ڕەسوول زەکی ئەفەندیدا هەڵکەوتوون؛ وەکو: مەلا ڕەسوولی سانی، مەشهوور بە «مُحدِّث»، موحەممەد کوڕی ڕەسوول ناسراو بە «ابن‌الرّسول» و علی زەکی خاوەنی نامیلکەی *«اخلاقیه»* و *«مُختصر قانون ابن‌سینا»*.

*خُلاصة‌الأثر*، ب٢، ل٦٣. *تاریخ سُلیمانّیه*، ل٢٥٠.

## مەلا یەعقووبی قازی

کوڕی مەلا عەبدوللەتیفی قازی، زانایەکی بەشەرەف، دیندار و ئاکارپەسند بووە کە لە قەڵای حەسەناوا، ناوەندی میرانی ئەردەڵاندا دادوەری کردووە و لە سییەکانی چەرخی یازدەیەمدا، دنیای بەجێهێشتووە.

*تاریخ مردوخ.*

## عەبدورڕەحمانی شارەزووری

کوڕی ئوەیسی کوردی شافیعی، خەڵکی شارەزوور، پاش تەواوکردنی دەرس و وەرگرتنی ئیجازە لە دمشق، لە قوتابخانەی ناسرییەی ئەوشارەدا دەرسی گوتووە و چەند جاریش بۆ میسر چووە و ساڵی ١٠٦٣ کۆچی یەکجاری کردووە و لە دمشق‌یان ناشتووە.

*خُلاصة‌الأثر*، ب٢، ل٣٥١.

## فەقێ تایران

مەلا موحەممەدی تایرانی ماکۆیی، ناسراو بە «فەقێ تایران»، خەڵکی دەوروبەری شاری ماکۆ لە باکووری ئازربایجانی ئێرانە کە پیاوێکی زانا و شاعیرێکی وێژەوان و قسەزان بووە و وەک خۆی لە بەیتێکی هۆنراوەیەکیدا ساڵی هۆنینەوەی ١٠٤٠ ک. م. دەڵێ، لە چەرخی یازدەدا ژیاوە.

فەقێ تایران لەگەڵ مەلای جزیری شاعیری بەناوبانگدا هاوڕۆژگار بووە و پێکەوە شیعریان گۆڕیوەتەوە. یەک لەوانە زنجیرە پرسیار و وەرامێکە، فەقێ دەپرسێ و مەلا جوابی دەداتەوە. ئەوا دوو بەند لە پرسیارەکانی فەقێ:

خەرگە بمن حیجابە — ستار دەکت جەمالێ
عەورێ ڕەش و نیقابە — ل بەر وەجهێ هیلالێ
پەروانە لەو د عەزابە — مەحجووبە ژ شەمالێ

* * *

عەکسی ژ حەق دبینین — لدور وەجهی مەحبووبان

لحـــــالکی نـــــامینین ژ ســـوورا وان مـــەتلووبان
گەھ نالین، گـەھ دخـونین دوورین ژ وەسـڵی خووبـان

مامۆستا ئەمین زەکـیبـەگ لـە کتـێبی «*خـلاصـة الکـرد و الکردستان*»دا، دوو کتـێبی فـەقێ تـایران: «*حەکایەتی شێخی سەنعان*» و «*قەولی ئەسپا ڕەش*»ی ناو لێ بردووە و هەروەها دەورانی ژیانی فەقێ تایرانی لە نێوان ساڵانی ٧٠٧ و ٧٧٧ ک. م. نووسیوە؛ بەڵام وەک پێـشتر گوتمـان، فـەقێش لـە نیـوەی چـەرخی یازدەدا ژیاوە.

*مەلای جزیری*، هەژار شەرحی لێ کردووە، سرووش، تاران،١٣٦١ ک. ھ. ل ٥٧٦و ٥٧٧. *خلاصة الکرد و الکردستان*، وەرگێڕانی موحەممـەدعـەلی عـەونی، چـاپی میسر. *العقدالجوهری*، احمد ژقـنگی، ١٣٧٩ ک. م. .*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٠٩.

## عومەر ئەفەندی عادڵجەوازی

لە پیاوانی ناسراو و بەوەجی ڕۆژگاری خۆی بووە کە پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، لە عادڵجەواز دەرسی گوتوە و وەعزیداوە. عومەر ئەفەندی لە وتارداندا ناوی دەرکردووە و خەڵکی دوور و نزیک حەولیـانداوە بـۆ بیستنی قسەکانی، لە کاتی بڕیاردراودا، بگەنە عادڵجەواز.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٩٢.

## عەبدوڵڵا ئەفەندی

عەبدوڵلا ئەفەندی مودەڕڕیس، کوڕی موحەممەد، لە کوردانی باکوور و مامۆستایانی خاوەن کۆڕی دەرس و ئیجازە بووە کە لە ساڵی ١٠٤٩ ک. م. لە مزگەوتی ئەیاسووفیادا دەرسی گوتووە و شێخ موسـتەفا ئەفەنـدی چەلەبی ناسراو بە حاجی خەلیفە، دانەری کتێبی «*کشفُ‌الظّنون*»، بەلایەوە دەرسی خوێندووە.

عەبدوڵلا ئەفەندی ماوەیەک لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دادوەری شـاری مەدینـەی پـیرۆز بـووە و سەرەنجام لە ڕەجەبەمانگی ساڵی ١٠٤٦ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

چەند نووسراوەیان لە فیقهـ و تفسیردا بە ناویەوە، ناو لێ بردووە.

پێشەکی و پەراوێزی *کشف‌الظنون*، ب١، ل٤١. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٤٧٧.

## عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی

زانایەکی خەڵکی دیاربەکر بووە کە ماوەیەکی زۆر لـە زێـدی خـۆی دەرسـی گوتـووە و دوایـی لـە لایـەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ دادوەری لە شارێکی تورکدا ناوی دەرهاتووە؛ بەڵام پێش ئەوەی بگاتـە ئـەوێ لـە

دنیا دەرچووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٦.

## عەبدوڕڕەحمان سۆرانی دیاربەکری

عەللامەی توێژەر، عەبدوڕڕەحمان، کوڕی ئیبراهیمی سۆرانی شافیعی، لەدایکبووی دیاربەکرە کە پاش تەواوکردنی خوێندن، ساڵی ١٠٤٤ ک. م. لای عەللامە مەلای چەلەبی ئیجازەی وەرگرتووە و پاشان لە ئامید (دیاربەکر) دەرسی گوتووە و سەرەنجام ساڵی ١٠٦٥ لەو شارە کۆچی دوایی کردووە.

ئەم مامۆستایە دەوری چل کتێب و نووسراوەی هەبووە؛ وەکوو: تەفسیرێکی سوورەی یاسین و پەیوەستێک لەسەر پەراوێزی عیسامەدین بۆ جزمی سییەمی قورئان. هەروەها نووسەرێکی چاکیش بووە و جار وبارە شیعریشی گوتووە.

*خُلاصةالأثر*، ب٢، ل٣٤٥. *ذیل کشف‌الظنون*، ب١، ل٣٠٨.

## مەلا موحەممەدی چەلەبی

لە زانایانی هەرەبەرز و ئوستادی بێ‌قسە و داوەری دادوەرانی شام بووە کە سەرەتا لە کوردستاندا خوێندوویە و پاشان لە وڵاتی ترکان بەشوێن زانستدا چووە و گەیشتۆتە ڕادەیەک، لە هەموو لایەکەوە قوتابیان و خوازیارانی زانیاری، بۆ بەهرە گرتن لە زانست و ئاگایی ئەو مامۆستایە، خۆیان گەیاندۆتە کۆڕی دەرسی و لە خزمەتیدا چۆکیان‌داوە. لەو کەسانەی کە لە لایەوە خوێندوویانە، دوو مامۆستای گەورەی ترک: شێخ موحەممەدی عیززەتی و ئیسحاق‌زادەش ناویان براوە.

**لە کتێبەکانی**: «*لانموزج فی سبع مسائل من سبعة فُنون*» و «*التّحقیق و التّوفیق بین اهل الشّرع و اهل الطّریق*».

مەلا موحەممەدی چەلەبی دوای ئەوەی ماوەیەک لە تورکیا دەرسی گوتووە، پاشان بۆ شام چووە و بۆتە داوەری دادوەرانی ئەوێ و هەر لەوێ ساڵی ١٠٦٦ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

*خُلاصةالأثر*، ب٤، ل٣٠٨. *ایضاح المکنون*، ب١، ل١٣٦ و ٢٦٨. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٢٨٧.

## ئەمیر ئەبدالخانی بدلیسی

لە میرانی بدلیس و کوڕی ئەمیر خەلەف و برازای ئەمیر شەرەفخانی بدلیسی خاوەنی مێژووی «*شەرەفنامە*»یە کە بۆخۆشی پیاوێکی زانا، تێگەیشتوو، کارزان و خاوەن ماڵ وسامان بووە و شیعریشی گوتووە.

خوا لێخۆشبوو ئەمین زەکی‌بەگ لە کتێبی «*کوردانی بەناوبانگ*»دا، لە زمانی ئەولیا چەلەبییەوە دەڵێ: «ئەمیر ئەبدال‌خان وازێکی زۆری لە خڕکردنەوەی کتێب بووە و کتێبخانەکەی ژمارێکی بێ‌حەساو لە کتێبی فارسی و عەرەبی و ترکی تێدا کۆ بۆتەوە؛ لە دیوانی شیعر و وشەدان و زانستی ئایینییەوە بگرە تا دەگاتە هەیئەت و لەشکاوی (تەشریح) و زانستە سروشتییەکان و جوگرافی و مێژوو؛ کە هێندێکیان یەکجار نایاب و بە هەموو شێوە ڕەسم و نەخش و نیگارەوە ڕازاوە بووگن. ژمارێکی بەرچاو کتێبی نووسراوەی خۆیشی هەبووە و زیاد لەوانەش هێندێک کتێبیشی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە.»

ساڵی ١٠٦٦ ک. م. ئەحمەدپاشای والی وان، بە تەمای دارایی ئەبدال‌خان، شەوەناوێک بە هێزێکی زۆر و زەبەندی پڕچەکەوە هێرش دەکاتە سەر بدلیس و دەوەشێتە ناو ماڵ و سامانی ئەم میرەوە و هەمووی تالان دەکا و تەنانەت کتێبخانەکەشی گەسک لێ‌دەدا. ئەولیا چەلەبی بۆخۆی بینەری ئەم کارەساتە بووە.

ژماری کتێبە نایابەکانی میرئەبدال چوارهەزار بەرگ و باقی ئەوەی بە تالان چووە، باری حەوت وشتر بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٣٦. *کرد و پیوستگی نژادی و تاریخی او*، رشید یاسَمی.

## عیمادەدینی ئامێدی

عیمادەدین موفتی حەنەفی، کوڕی موحەممەدی ئامێدی، ساڵی ١٠٠٤ک. م. هاتە دنیا و کە پێ‌گەیشت، سەرەتا لای باوکییەوە، لە دمشقدا خوێندنی دەسپێکرد و دوای ئەوە گەیشتە خزمەتی حەسەن ئەفەندی بوورینی و ئیجازەی وەرگرت و پاش مردنی بابی، لە جێی ئەودا دانیشت و بوو بە موفتی شام و ماوەی هەژدە ساڵان (تا کۆتایی ژیان) ئەو کارەی هەبوو.

عیمادەدین دادوەرێکی زانا و درووستکار و پارێزکار بووە کە پێنجشەمبەی ١٥ی ڕەجەبی ساڵی ١٠٦٨ک. م. لە دنیا دەرچووە و لە زیارەتانی «بابُ‌الصّغیر»ی شام، لە پەنا باب و کاڵیدا نێژراوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٩١.

## مەلا قاسمی گۆرانی

مامۆستایەکی کوردەواری بووە کە بۆ شام چووە و لە شاری دمشق دانیشتووە و لە قوتابخانەی ئەحمەدییەی ئەو شارەدا دەرسی گوتووە.

مەلا قاسم مرۆیەکی جوامێر، دڵاوا و مەردمدۆست بووە و بۆ بەخشندەیی ناوی‌دەرکردووە. کۆچە دواییەکەی شەوی یەکشەمۆی شەشی موحەڕەمی ١٠٦٧ ک. م. لە دمشق ڕوویداوە و لە زیارەتانی «بابُ‌الصّغیر»ی ئەوشارەدا نێژراوە.

*خُلاصةالأثر*، ب٣، ل٢٩٢.

## مەلا ئەحمەدی مەجرووحی

مەلا ئەحمەد، کوڕی عوسمان، کوڕی ئەبووبەکری سۆرانی شافیعی، لە ساڵی ١٠٢٥ ک. م. دوای کۆتایی هاتنی خوێندن، دەڕوا بۆ شام و پاش دە ساڵان (ساڵی١٠٣٥) بۆ بەجێهێنانی حەج، ڕێی حیجاز دەگرێتە بەر و لەوێشەوە ئەچێتە میسر و تا ساڵی ١٠٥٠ ک. م. لەوێ دەمێنێتەوە. ئەو ساڵە ئەچێ بۆ ئەستەمبووڵ و پاش ساڵێک مانەوە، دەگەڕێتەوە بۆ دمشق. ساڵی ١٠٦٠ جارێکیتر ئەچێتەوە تورکیا و دەبێتە مامۆستای قوتابخانەی «قجماسیّە». لە دواییەکانی ژیانیدا دیسان ئەگەڕێتەوە بۆ دمشق و هەر لەوێ لە ساڵی ١٠٦٩ ک. م. کۆچی یەکجاری دەکا و لە مەدرەسەی «یونسیّە»دا ـکە شوێنی دەرس‌گوتنەوەی بووە ـ دەینێژن.

*خُلاصةالأثر*، ب١، ل٢٤٢و ٢٤٣.

## مەلا ئەحمەدی سۆرانی

کوڕی مەلا حەیدەری سۆرانی، لە کوردانی باشوور بووە کە بۆ وڵاتی ترکان چووە و لە قوتابخانەی «قجماسیّە» دەرسی گوتووە و بۆ کتێبە دەرسییەکان نامیلکە و پەراوێزێکی زۆری نووسیوە. بۆ نموونە: پەراوێز بۆ «*اثبات واجب*» و هەروەها «*شرح عقاید*»ی عەللامەی دەوانی.

یەک لە شاگردانی موجازی مەلا ئەحمەد، وەلییەدینی چەلەبی، مامۆستای حاجی خەلیفە، نووسەری «*کَشف‌الظنون*»، بووە.

مەلا ئەحمەد لە نێوان ساڵانی ١٠٦٠ و ١٠٧٠ ک. م. لە دنیا چووە.

*خُلاصةالأثر*، ب١، ل٢٤٢و ٢٤٣ (پێڕای باسی مەلا ئەحمەدی مەجرووحی). پێشەکی بەرگی یەکەمی *کشف‌الظنون*، ل١٥.

## سادق موحەممەدی سەقزی[1]

کوڕی عەلی، زانایەک بووە خەڵکی شاری سەقز لە باشووری موکوریان کە لە نیوەی دووهەمی چەرخی یازدەدا ژیاوە و لە نووسراوەکانی، «*صُرّةُ الفتاوی*» لە ساڵی ١٠٥٩ ک. م. نووسیوە.

---

١. ژینامە نووسان بەبۆنەی نەناسینی ئەم شارە و نەزانینی ناویەوە، وشەی «**سَقز**»یان هێندێک جار «**ساقز**» و جاروبارەش «**صاقس**» یان «**ساقص**» نووسیوە؛ هەروەک لە باسی شێخ مەحموودی سۆفی خەڵوەتی ئەبولمەواهیبی سەقزی، عارفی چەرخی دوازدەدا، تووشی ئەم هەڵە بوون.

*كشف‌الظنون*، ب٢، ل١٠٧٨. *لُغت‌نامەی دهخُدا*، پیتی ص، ل٦٣.

## عومەر ئەفەندی دیاربەکری

عومەر ئەفەندی دیاربەکری (ئامیدی)، نازناو «عومری»، شاعیرێکی کوردی ئامیدە کە ماوەیەک لە دەربـاری عوسمانیدا ئینشابەندی تایبەتی سوڵتان بووە و ساڵی ١٠٧٢ ک. م. لە دنیا چووە.

لەم شاعیرە دیوانێک بە زمانی ترکی ماوەتەوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٧٩٧.

## وەجهی کوردستانی

عەلی‌ئەکبەر نازناو وەجهی، کوڕی موحەممەد ساڵحبەگ، شاعیرێکی خاوەن هەست و زەوق و نووسەرێکی لێهاتوو و مرۆڤێکی خاکەسار و بێ دەمار بووە کە لە دواییەکانی چەرخی یازدەدا ژیاوە.

دووـ سێ نموونە لە شیعری:

می گفتم عشق و می‌ندانستم چیست — می گفتم یار و می‌ندانستم کیست
گر عشق آن است، کی توان با آن بود — ور یار این است، کی توان بی او زیست

* * *

برداشت سپیده‌دم حجاب از طرفی — بگشود نگار من نقاب از طرفی
گر نیست قیامت از چه رو گشته پدید — ماه از طرفی و آفتاب از طرفی

* * *

ای کاش که یار آید و نوروز کنیم — از آتش شوق سینه پر سوز کنیم
بر گرد سرش چو گردش لیل و نهار — روزی به شب آریم و شبی روز کنیم

*بهترین اشعار*، تهران، ل٧٠٨. *تذکرەی نصرآبادی*، ارمغان، ل٥٣. *فرهنگ سخنوران* ، ل٦٤٤.

## شێخ شەهابی کاکۆزەکەریایی

شێخ شەهابەدین، کوڕی شێخ ڕەزیەدین، کوڕی شێخ ڕەزا موعینەدینی کاکۆزەکەریایی، ساڵی ١٠٠٣ هاتۆتە دنیاوە و ١٠٧٢ ک. م. لە گوندی کاکۆزەکەریادا کاری بە دنیا نەماوە و هەر لەوێ نێژراوە.

شێخ شەهاب لە حەڤدە ساڵیدا خوێندنی لای بابییەوە دوایی هێناوە و بیست و دوو ساڵان پاڵی بە پێگەی ئیرشاد و تەریقەتی نەقشبەندیوە داوە. ئەم شێخە عارفێکی زانا بووە و خەڵک ڕێزیان لێ گرتووە.

کاتێ کە سەربازانی قزڵباش هێرشیان بۆ ناوچەی مـەریوان بـردووە و بەتایبـەت کاکۆزەکـەریایان تـاڵان کردووە، شێخ شەهاب شیعرێکی بە زبانی کوردی گوتووە، لەگەڵ نزا و سکاڵا، لای خوداوە، گێـرە و گـازەی لەو خێڵە کردووە؛ ئەوا چەند بەیتی:

پــیر یــۆنس! هانــا، پــیر یــۆنس! هانــا مەزڵـــوومان دایم لای تۆشـــەن هانـــا
نـــەبـــیرەی ئـــەکرەم شـــاە مـــەردانی فرزەنـــد دڵـــبەند شـــێخ زەکـــەریانی
پـــەی وایەمەنـــدان عەجـــەب دەرمـــانی چـــون شـــێر کـــەمین، حـــازر مەیـــدانی
ئینتقـــام جاگـــەی بابـــای ئـــەکرەمت بـــە شـــەپۆل کـــین قـــەلب قولزەمـــت
بستان جـە لەشـکر دوژمـن بـێ‌ئەنـدێش نـــەمازی یـــەکێ بـــشۆ وەجـــای وێـــش
«شەهاب» هەرچی هـەن نەسـڵ ڕەسـوولەن زوورپییـــەی تـــاهیر عـــەلی و بـــەتوولـــەن

ئەم شیعرانە شێخ لە سەفەری حەج و کاتی زیارەتی گڵکۆی پاکی پێغەمبەر(د) گوتوونی:

جەماڵـــیوەم دیـــەن، یـــاران، تـــەعالی ســـونعی ڕەببـــانی
مـــەلایک یـــا پـــەریزادەن، بـــەوێنـــەی شـــەکلی ئینـــسانی
یەدەینش چون یەدی بەیزا، دوو ئەبرووش نەقش «بسم‌الله»
دوو دیـدەش نەرگـسی شـەهلا و مـا «زاغ‌البـصر» خـوانی
بـە عـارز مەشـعەلی تـوورەن بـە بـاڵا شـەمعی کـافوورەن
جـــەمینش مەتلـــەعی نـــوورەن، پـــەرێ ئـــەفواج نـــوورانی
بە گۆنا یۆسفی چاهەن، بـە خـەت خـزر و بـە ڕۆح ماهـەن
بە لەب عیسی مەسـیحا هـەن، مەبەخـشۆ ئـاب حـەیوانی
بە دەندان شەککەر و قەندەن، بـە بـاڵا شـۆخی دڵـبەندەن
هەزار دڵ پەیش ئەرامەنـدەن، یـەکێ چـون پـیر کـەنعانی
جـە دەفتـەر خانـەیی شـاهیش هـەزاران سـەدهەزارانـەن
نییەن مەیلش جـە کـەس پەرسـۆ عیراقـی یـا خوراسـانی
دوو موشکین قەوسی ئەبرۆشەن ڕەوایی دڵـبەریش دۆشـن
«شەهاب»ش پەی سیاپۆشەن، خودا! وینـۆش بـە ئاسـانی

سەید عەبدوسەمەدی مورادی توداری لە کتێبی «*نورالانوار*»دا نووسیویە: «شێخ شەهابەدین ٩٩ موجازی هەبووە کە هەموویانی لە باری ڕواڵەت و دەروونەوە بە بانترین پلە گەیاندووە.» و بۆ وێنە ئـەم کەسـانەی نـاو بردووە:

«سەید عەبدوڵڵا هەورامی، سەید فەتحوڵا موسڵی، شێخ کەریمی بەرزنجی، سەید موستەفا نەهری، شێخ

عەبدورڕەحمانی مەردۆخی، شێخ ڕەسوولی قەرەداغی، سەید شەمامەی بـاینچۆیی، شـێخ موحـەممـەدی ئەباریقی بەغدایی، شێخ ئیبراهیمی خورخورەیی، سەید بایەزیدی سابلاخی، شێخ حوسـەینی ئەبولمـەعالی موسڵی، شێخ ئەبوویۆسف عەتای میسری، شێخ موحەممەد زاهیدی زەهاوی، شێخ موحەممـەدی دیـوانی، سەید هەیبەتوڵڵای تاڵشی، شـێخ عەبدولمەجیـدی داغـستانی، شـێخ مووسـای گـەیلانی، سـید مـەولانا ڕەجەبەدینی تاوەگۆزی، شێخ موحەممەدی خانەگایی، شێخ مەحموودی خانەقینی، شێخ عەبـدورڕەحیمی حافیزی دیاربەکری، سەید ئەحمەدی زەینی مەککی، سەید عەبدوڵڵای جەلیلی مەدەنی، سەید سـەلاحی حەماتی، شێخ موحەممەدی شیرزاد، سەید عەبدوسسەمەدی تووداری و سەید موحەممەدی مەولاناوایی».

*نورالانوار.*

## مەلا مەحموودی گۆرانی

زانایەکی چەرخی یازدەیە کە لە باری هۆش و زیرەکییەوە کەموێنە بووە؛ بـە شـێوەیەک ئەگـەر کتێبێکـی جارێک خوێندبێتەوە، دەقی نووسراوەکەی، بەبێ واوێک کەم و زیاد، لەبەر کردووە.

مەلا مەحموود شەست ساڵان لە دمشق دەرسی گوتووە و بـەهرەی گەیانـدووە و لـەو مـاوەدا کۆشـاویە کتێب و نامیلکەی زانایانی ئێرانی بە مامۆستایان و قوتابییانی شام بناسێنێ و زۆرتریان لەگـەڵ فەرهـەنگ و ئاسەوار و بیر و بۆچوونی ئێرانییان ئاشنا بکا. لەمەڕ خۆشیەوە، پیاوێکی پاک و پارێزکار بووە و چاوی بەدووی دنیاوە نەچووە و زۆر جاران کە لە مەدرەسەوە گەڕاوەتەوە، ڕێگای ماڵی لێ ون بووە و لـە خەڵـکی پرسـیوە! بەڵام خاوەن نەفەسێکی گەرم و هێزی ڕاکێـشانێکی تایبـەت بـووە و زۆرێـک لـە مامۆسـتایان و شـێخان، بەهرەیان لێ بردووە و ڕەوایەتیان لێ کردووە؛ کەسانی وەک: مەلا چەلەبی کوردی داوەری دادوەرانی شام، عەللامە ئیبراهیم کوڕی مەنسوور، ئەبووسەفا موحەممەد کوڕی ئەییووب و ...

مەلا مەحموودی گۆرانی ساڵـی ١٠٧٤ ک. م. لـە شـاری دمـشق، ئـەمری خـوای بـەجێهێنـاوە و لـە زیارەتانی فەرادیسدا نێژراوە.

*خُلاصة‌الأثر*، ب٤، ل٣٢٩.

## مەلازادەی کوردی

مەولا موحەممەد، مەشهوور بە «مُلازادەی کُردی» لە گەورە زانایانی چەرخی یازدەیە کە پاش ساڵـی ١٠٧٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێز بۆ «*عصام‌الدّین*»، لە شەرحی «*فوائدالضّیائیّه*» لە نەحودایە.

*کشف‌الظنون*، ب٢، ل٢٥٠.

## مەلا جامی

مەلا ئەبووبەکر، کوڕی مەلا عەبدوڕڕەحمان، ناسراو بە «مُلا جـامی» حـەریری شـافیعی، لـە کەڵـەپیـاوان و زانایانی بەناوبانگی چەرخی یازدەیە کە لە دمشق ژیاوە و شارەزای هەموو زانستە ئیسلامییەکان و مامۆستای بێقسەی ڕۆژگاری خۆی بووە.

مەلا ئەبووبەکر لە دمشق، ماوەیەک لە مەدرەسەی ئەمەوی و هێندێک لە قوتابخانەی سەلیمییە دەرسـی گوتووە و چەلێکیش دادوەری شاری سـەیدای لـە ئەسـتۆ گرتـووە؛ بـەلام زۆرتـر وازی لـە گۆشـەگیری و دوورەپەرێزی بووە و کەمتر لەگەڵ خەڵکدا دانیشتووە. یان دەرسیداوە یا بە ڕاز و نیاز و سکالاوە ڕایبواردووە و یەکجار لە کات بەبادان بێزار بووە.

ئەحمەدپاشای وەزیر ـکە لەو ڕۆژگارەدا والی شام بووە و پێشتر شاگردیی مەلای کـردووەـ یـەکجار زۆر ڕێزی لێ ناوە و زۆر جاران لێی داوا کردووە با مەقامێکی لە شانی خۆیدا قەبووڵ بفەرموێ؛ بـەلام ئـەو قـەت نەیویستووە و هەمیشە خۆی لێ پاراستووە. نووسەری کتێبی «*خُلاصَةُالاثـر*» دەڵی: «... و بالجُملـه فإنَّـهُ آخـر مَنْ أدرَکناهُم بدَمشقَ مِنْ مُحَقّقی الاکراد.»

کـۆچی دوایـی مـەلا جـامی ساڵـی ١٠٧٧ ک. م. ڕوویداوە و لـە زیارەتـانی فـەرادیس مەشـهوور بـە «مرجالدُّحداح» لە دمشقدا نێژراوە.

*خُلاصَةُالاثر*، ب١، ل٦٨.

## مەلا موحەممەد شەریفی سدیقی

کوڕی مەلا یۆسف[1]، کوڕی قازی مەحموود، کوڕی کەمالەدینی سدیقی گۆرانی شاهۆیی شـافیعی، لـە زانـا هەرەگەورەکانی ئیسلامییە کە کات و ساتی خۆی بە خوێندن و دەرسگوتن و سکالا کردن ڕابواردووە و بۆ زانیاری و پارێزکاری، ناسراوی هەموان بووە.

موحەممەد شەریف سەرەتا لای بابیەوە خوێندوویە. پاشان کۆڕی دەرسـی مامۆسـتایانی گـەورەی ئـەو ڕۆژگارەی شامی بینیوە و هێندە وازی لە خوێندن و فێربوون بووە کـە دەقـی زۆربـەی دەرسـەکانی لەبـەر کردووە و تەنانەت نووسیویانە تەفسیری بەیزاوی لەبەر بووە.

دوای تەواو بوونی دەرس و دەور، چووە بۆ یەمەن و شـانی داوەتـە ژێـر کـاری دەرسگـوتن و بارهێنـانی قوتابیان و تاقمێکی زۆر لە مامۆستایان ـ وەک عەللامە مەلا ئیبراهیمی گۆرانیـ شاگرد و موجازی ئەو بوون.

ساڵی ١٠٥٥ ک. م. لە ڕێگای بەغداوە چووە بـۆ حیجـاز و دووسـالان لـە مەککـە و مەدینـەی پـیرۆزدا

---

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٢٠٦.

لانشینی کردووە و ئەمجار گەڕاوەتەوە بۆ یەمەن و تا برانەوەی ژیان (۱۰۷۸ ک. م.) لەوێ درێژەی بە خزمەتی ئاینی خۆی داوە.

**لە کتێبەکانی**، پەراوێز بۆ تەفسیری «*بیضاوی*»، پەراوێز لەسەر «*تهافت الفلاسفه*»، کەنارە بۆ «*شرح اشارات*»ی شێخی تووسییان ناو بردووە.

*خُلاصةُالاثر*، ب٤، ل ۲۸۰. *هدیةالعارفین*، ب۲، ل ۲۹۱. *کشف‌الظنون*، ب۱، ل۱٤۲.

## شێخ حەسەنی نوورەدینی

کوڕی موحەممەد، کوڕی ئیبراهیمی سۆرانی نوورەدینی شافیعی، لە گەورە مامۆستایانی ڕۆژگاری خۆی بووە کە لە کوردەواریدا خوێندوویە و لای مەولانا ڕەسوولی سۆرانی و قەرەقاسمی ترک و عومەر کوڕی جەلی ئەفەندی، ئیجازەی گرتووە و لە بواری دەست و قەڵەم و ڕوون‌کردنەوەی گیروگرفتی زانستییەوە، کەسی پێ نەگەیشتووە.

شێخ حەسەن ساڵی ۱۰۳۵ ک. م. بۆ دمشق چووە و لە مەدرەسەی سەلیمییە، لەجێی مەلا ئەبووبەکری کوڕی مەلا جامی ـکە ئەو دەم لەو پەڕی پیری و زورهانیدا بووە و هێز و قەوەتی دەرس‌گوتنەوەی نەبووەـ دانیشتووە و ماوەی چل ساڵان بەهرەی گەیاندووە و ساڵی ۱۰۷۸ کۆچی یەکجاری کردووە.

**لە کتێبەکانی**: شرۆڤەیەک بۆ نامیلکەی «*بهائیه*» لە حیسابدا، نامیلکەیەک لە تەفسیری سوورەتی «*مُطَفَّفین*» و شەرحێک لەسەر «*قطرابن‌هشام*» لە نەحودا.

شێخ حەسەن زۆر پارێزکار بووە و بۆ بەجێ‌هێنانی دەستووری شەرع، یەکجار شێلگێری کردووە و هێندێک کەرامەتیشیان لێ گێڕاوەتەوە.

*خُلاصةُالاثر*، ب۲، ل٦۳.

## موحەممەد کوردئەفەندی

موحەممەد، کوڕی عەبدوڵڵای شارەزووری، ناسراو بە «کُرد اَفندی»، زانایەکی ناوچەی شارەزوور بووە کە بۆ ئەستەمبووڵ چووە و لەوێدا هێندەی نەخایاندووە، ناوبانگی داکەوتووە و چاوی سوڵتانی عوسمانی گرتووە و ماوەیەک بۆ هاوڕاوێژی خوی هەڵیبژاردووە. پاشان نیشتەجێی شاری برۆسە بووە و لەوێ تا دواساڵی ژیان (۱۰۸٤ ک م.) لە «جامیع‌الکبیر»ی ئەو شارە، وەکوو مامۆستایەکی گەورە، دەرسی گوتووە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێز لەسەر «*عصام‌الدّین استعاره*»، حاشیە بۆ «*شرح‌الادب*»، شەرحێکی «*قەصیدەی بُردە*» و شەرحێکی «*الطّریقه المُحَمَّدیّه*» بە ناوی «*الفواتحِ‌المکّیّه*» لە ئامۆژگاریدا.

*هدیةالعارفین*، ب۲، ل۲۹۳. *مَشاهیرالکُرد*، ب۲، ل ۱۲۰.



## عەلای حەسکەفی

عەلائەدین موحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەبدوڕڕەحمانی حەسکەفی، ناسراو بە «عَلاء حصکفی» لە زانایان و مامۆستایانی ناوداره کە لە شاری دمشق خاوەن فتوا بووه و ژیانی بە دەرس‌دانەوە و بەهره گەیاندن بە خەڵک ڕابواردووه و ساڵی ١٠٨٨ ک. م. لە دنیا دەرچووه.

**لە کتێبەکانی**: «*الدُّرّالمُختار فی شرح تنویر الابصار*» لە فیقهی حەنەفیدا، «*افاضەالانوار علی اصول المنار*»، «*الدُّرّالمنتقی*» لە فیقهو شەرحی «*قطرالنّدی*» لە نەحودا.

شیاوی باسە کە ساڵی لە دایک بوونی، «*هدیةالعارفین*» ١٠٢١ و «*الأعلام*» ١٠٢٥ی نووسیووه.

*الأعلام*، زرکلی، ب٧، ل١٨٨. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٢٩٦. *لُغت‌نامەی دهخدا*، چاپی ١٣٢٥، پیتی ح.

## مەلا موحەممەدی سۆرانی

زانایەکی خزمی شێخ حەسەنی کوڕی موحەممەدی سۆرانی نوردینی (؟- ١٠٧٨ ک. م.) و هاو دەورەی دانەری کتێبی «*خلاصةُالاثر*» بووه کە ماوەیەک لە ناوچەی سۆران دەرسی گوتووه و لە دوابەشی تەمەنیدا بۆ مووسڵ چووه و لە چارەکی دوایی چەرخی یازدەدا کۆچی دواجاریی کردووه.

*خُلاصةالأثر*، ب٢، ل٦٣.

## مەولانا مەحموودی زێباری

جێگری عەللامە مەولا حەسەنی زێباری و لە زانایانی ناوداری ئاخرەکانی چەرخی یازدەیە کە لە مەنتیق و حیکمەتدا هێندێک نووسراوەی هەبووه.

*کشف‌الظنون*.

## وەهمی کوردستانی

تەهماسب‌قولی‌خانی کوردستانی، نازناو «وَهمی» لە شاعیرانی ئاخر و ئۆخری چەرخی یازدەیە کە دانەری «*تذکرەی نصرآبادی*» وای لە بارەوە نووسیوه: «... لە مەزنانی کورد بووه کە وڵاتی خۆی بەجێ‌هێشتووه و بۆ قەندەهار چووه و ماوەیەکی تێدا ڕابواردووه. خاوەن زانست و ئاگادارییەکی بەرچاو بووه و لە شیعردا نازناوی وەهمی هەڵبژاردووه.»

**لە شیعرەکانی**:

ز یغمای تو دل را فکر من نیست — کە سامان رفتە را فکر وطن نیست

نــــە بـــالی دارم و نــــە شــــوق پـــرواز          چــو مــن آزاده مرغــی در چمــن نیــست

* * *

کجا در گوش جانان می‌رسد از ضعف فریادم          که گر آهی کشم از بس ضعیفی می‌برد بادم

* * *

خط از پهلوی رخسار تو زان چون دود برخیزد          که هر کس کُو بود نزدیک آتش زود برخیـزد

*تذکره‌ی نصرآبادی، تاران*، ١٣١٧ ک. ه. ل٦٣.

## مەلا موحەممەدی سۆرانی وانی

کوڕی مەلا ئەبووبەکر، کوڕی مەلا موحەممەد، کـوڕی مـەلا سـلێمان، لـە زانایـانی بـەناوبانگ و تـوێژەرانی گەورەی باکووری کوردستانە کە بۆ دەربڕینی بیر و ڕای دینی خۆی ڕاشکاوییەکی لە ڕادە بـەدەری بـووە و بەبێ کۆکردنەوە، قسەی خۆی کردووە.

کتێبی زۆری نووسیوە؛ بۆ وێنە شەرحێکی بۆ کتێبی «*الطریقـةُ المُحمّدیّه*» دانـاوە و تێیـدا لـە چەنـد شـوێنان لـە نووسەری کتێبەکە ـکە مامۆستایەکی ترک بووەـ ڕخنەی گرتووە. دڵپیسان ئەمەیان لێ قۆستۆتەوە و لە بابی عالیدا بۆیان تێچاندووە. لە لایەن سوڵـتانەوە دەسـتووری تارانـدنی لـە وڵات دەردەچـێ (ساڵـی ١٠٦٣). ئـەویش ناچـار قوستەنتەنییە بەجێ‌دێڵێ ڕوو لە کوردستان دەنێ و لە گوندێکی پەرتدا خۆ دەشارێتەوە و هەر لەوێ دنیا بەجێ‌دێڵێ.

*کشف‌الظنون*، ب٢، ل١١١٢. *مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٣٥.

## مەلا عەبدولکەریمی خالیدی

کوڕی مەلا سولەیمان، کوڕی مەلا موستەفا، کوڕی مـەلا حوسـەینی قـازی، خوێنـدنی لـە کوردسـتاندا دەسپێکرد و دوای فێربوونی وانە سەرەتاییەکان، تەفسیری بە لای مەلایۆسـفی گـۆرانی، حەدیـسی لـە خزمەت مەلا موحەممەدی کوردی و فیقهی لە دەرسی مەلا ئەحمەدی عومەرئابادییەوە فێربوو. ئـەمجار چوو بۆ دمشق و لە قوتابخانەیەکدا دەرسی گوتـەوە و تـاقمێکی بـەرچاو وەکـوو: شـێخ موحـەممـەدی عەیشی، شەمسەدین موحەممەدی حەسەنی و سەید موحەممەدی کوڕی کەمالەدینی نەقیب لە کۆڕی دەرسی بەهرەیان برد.

شێخ عەبدولکەریم لە تەریقەتیشدا دەستێکی باڵا و پلەیـەکی واڵای هـەبووە و لـە بڕانـەوەی چـەرخی یازدەدا کۆچی دوایی کردووە.

*خُلاصةالأثر*، ب٣، ل٤٧٤ و ٤٧٥. *مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٣٤.

## شێخ موحەممەدی شارەزووری

زانایەکی پارێزکار و عارفێکی وشیار بووە کە لە شارەزوورەوە بۆ مەککەی پیرۆز چووە و تا دوایی ژیان لەو شارە خوێندوویە و دەرسی گوتۆتەوە و خوداپەرستی کردووە. کتێبێکی لەمەڕ مێژووی کوردستانەوە نووسیوە کە ساڵی ١٠٧٣ ک. م. تەواوی کردووە و وەک «*تاریخ سُلیمانیه*» دەڵێ، تاکە بەرگی ئەو کتێبە لە کتێبخانەیەکی بریتانیادایە.

*تاریخ سُلیمانیه*، ل ٢٨١.

## مەلا عەلی گۆرانی

کوڕی مەلا موحەممەدی گۆرانی ، ئیمام و مامۆستای مزگەوتی جرجیسی نەبی لە مووسڵ کە ساڵی ١٠٩٤ یا ١٠٩٥ ک. م. لە دنیا دەرچووە و زانایەکی پارسا و دوورەپەرێز بووە کە بێژگە دەرس گوتن و عیبادەت، نەیپەرژاوەتە سەر کاریتر و هەموو چینێکی خەڵک، یەکجار ڕێزیان بۆی داناوە و بڕوایان پێ بووە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێزێک بۆ «*شرح شَمسّیه*» و پەیوەست لەسەر «*شرح عقاید نَسَفی*».

*خُلاصةُالاثر*، ب٣، ل٢٠٣. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٧٦٢.

## وانی ئەفەندی

موحەممەد ئەفەندی حوسەینی، ناسراو بە «وانی ئەفەندی»، کوڕی بەستام، لە کوردانی خوشابی ناوچەی وان، پیاوێکی زانا و قسەزان و گفت ڕەوان بووە کە پاش ماوەیەک دەرس گوتن و وتاردان، بۆ دادوەری چەکداران و پەرەدانی ئایین لە شاری فینا (وینە) ڕاسپێراوە و هەر لەوێ ساڵی ١٠٩٦ ک. م. ئەمری خوای بەجێ هێناوە.

**لە کتێبەکانی**:«*عرائس القرآن و نفائس الزَّمان*» لە مەڕ حیکایەتەکانی پێغەمبەران لە قورئاندا، «*عرائس المجالس*»، «*خلاصةالتفاسیر*»، «*رسال المبدأ و المَعاد*»، «*اعمال الیوم و اللیل*» و «*مُنشآت*».

*کشف الظنون*، ب٣، ل١١٣١. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٢٩٩.

## دامادی وانی

مستەفا، کوڕی عەبدوڵڵای کوردی شارەزووری، بۆ خوێندن بەرەو وڵاتی ترکان چووە و پاش گەیشتنە ڕادەیەکی بان و وەرگرتنی ئیجازە، لە شاری ئەستەمبووڵ نیشتەجێ بووە و کچی مامۆستاکەی (عەللامەی وانی) خواستووە و بەو بۆنەوە بە «داماد وانی» ناوی دەرکردووە. بەشوێن ئەوەدا لە شاری بروسە دەرس گوتنی دەسپێکردووە و سەرەنجام ساڵی ١٠٩٨ ک. م. هەر لەو شارە دنیای بەجێ هێشتووە.

**لە کتێبەکانی**: «*مسأله التعلیل مِن مزالقاا لاالقدام*» و پەراوێز بەسەر «*تفسیر انوار التنزیل*»ی بەیزاوی لە تەفسیردا.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٤٤٢.

## دوڕڕی

ئەحمەد ئەفەندی وانی، نازناو «دُرّی»، شاعیرێکی خەڵکی وانە کە لە چەرخی یازدەهەمدا ژیـاوە و دیـوانێکی شیعری ترکی لێ بەجێماوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١١٠.

# چەرخی دوازدەهەم

## شێخ بورهانەدینی شارەزووری

شێخ ئەبولعیرفان بورهانەدین ئیبراهیم، کوڕی حەسەن، کوڕی شەهابەدینی شارانی گۆرانی شارەزووری، لە مامۆستایان و حەدیس‌زانانی گەورەی چەرخی یازدە و سەرەتای چەرخی دوازدەیە کە ساڵی ١٠٢٥ ک. م. لە شارانی سەر بە شارەزوور لەدایک‌بووە و کە پێ‌گەیشتووە و وانە سەرەتاییەکانی تەواو کردووە، لە کۆڕی دەرسی مامۆستایانی وەک مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، کوڕی مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی و مەلا موحەممەد شەریفی گۆرانی سدیقی بەهرەی بردووە و پاش ئەوەش ماوەیەک لە بەغدا و هێندێک لە بەسرە و چەلێک لە شارانی شامدا درێژەی بە خوێندنەکەی داوە و سەرەنجام بۆ حیجاز چووە و لە مەدینەدا نیشتەجێ بووە و هاوکاتی تۆژینەوە و نووسین، دەرسیشی گوتووە.

کتێب و نووسراوەی ئەم زانایە زۆرن؛ لێرەدا بڕێکیان ئاماژە پێ دەکەین:

١. *مسالکُ السَّداد إلی مَسألة خَلقِ افعال العباد*

٢. *تکمیل التَّعریف*

٣. شەرحی *عوامل جُرجانی*

٤. پەراوێز لەسەر کتێبی *شرح الاندُلسیّه*

٥. *ضیاء المصباح فی شرحِ بهجة الارواح*

٦. *النّبراس لکَشفِ الالتباس فی الاساس*

٧. *الامم لا یقاظ الهِمَم*

٨. *القول المُبین فی مَسالة التکوین*

٩. *إتحافُ الخَلَف بَتحقیق مذهب السَّلَف*

١٠. *إبداء النّعمة بتحقیق سبقِ الرَّحمه*

١١. *إشراق الشَّمس* لە مەتنتیقدا.

بورهانەدین زمان و وێژەی فارسی و ترکیشی زانیوە و بەم دوو زمانەش بەرهەمی هەبووە. لە شاگردانی بەناوبانگی ، عەللامە سولەیمان، کوڕی هەورامی شارەزوورییە کە لە شوێنی خۆیدا باسی ئەویش دەکەین.

ئەم مامۆستا زانایە ساڵی ١١٠١ ک. م. لە شاری مەدینەی پیرۆزدا ڕووی لە شاری خامۆشان ناوە.

*عجایب‌الأثار فی التَّراجُم و الأخبار*، ب١. *الأعلام*، ب١، ل٢٨. *ایضاح المَکنون*، ب١، ل١٠. *ذیل کشف‌الظنون* ، ب١، ل١٧ و ١٨ و ٧٨ و ١٠٤ و ١٥٩.

## سەید عەبدوسەمەدی توودار

سەید عەبدوسەمەدی موڕادی تووداری، کوڕی شێخ ساڵح، کوڕی سەید مراد، کوڕی شێخ موحەممەد، ناسراو بە سەلاحەدین، خەڵکی گوندی «توودار»ی لای شاری سنە و لە سەیدە حوسەینییەکانە. ساڵی ١٠٤٦ ک. م. دوازدە ساڵان بووە کە لەشکری قزڵباش هێرش دەکەنە سەر گوندەکەیان و پاش تاڵانوماڵانێکی تەواو، ئەکەونە قەڵتوبڕی خەڵک و شێخ ساڵحی بابی و سەید عەبدولمەجیدی برای دەکوژن و خۆیشی بریندار دەکەن. کە قزڵباش دەچن، بە نهێنییەوە لە توودار هەڵدێ و بە هەرچۆنێک بێ خۆی دەگاتە گوندی کاکۆزەکەریا و پەنا دەباتە خانەقای شێخ شەهابەدینی کاکۆزەکەریایی. شێخ شەهاب کە ئاگاداری کارەساتەکە دەبێ، ئەیخاتە ژێر باڵی خۆی و ئەمر دەکا برینەکانی دەرمان کەن و باشی بحاوێننەوە. کە تەواو دەژووژێتەوە، بە فەرمانی شێخ، سەرئەکاتە خوێندن و لەبەر تێکۆشانی بێ وچان و زیرەکی و لێهاتوویی سرشتی، دوای چەند ساڵ ئیجازە وەردەگرێ و بەشوێنیدا سەر بەشێخ دەسپێرێ و ئەچێتە نێو ڕیزی مریدانی تایبەتیەوە.

کاتێ کە شێخ شەهاب سەفەری حیجاز دەکا، ئەمیش لەگەڵ خۆیدا دەبا و ماوەی ٢٢ ساڵان لە خزمەتی شێخ، لە مەدینەدا دەمێنێتەوە. لە گەڕانەوە بۆ کوردستان، ساڵێکی‌تر لە کاکۆزەکەریا دادەنیشێ و سەرپەرشتی خانەقا و مریدان لە ئەستۆ دەگرێ و بۆخۆشی درێژە بە سەیر و سولووکی دەدا و تا پلەیەکی بەرز، تێیدا سەردەکەوێ. لەم کاتەدا ـ کە ٦٣ ساڵی تەمەن بووەـ ژن دەخوازێ و دەستی ژنەکەی دەگرێ و دەگەڕێتەوە توودار و چاکی لێ بەلادا دەکا زێدەکەی ـکە ئەوسا تەواو کاول بووە ـ ئاوەدان بکاتەوە.

سەید عەبدوسەمەد عارفێکی دڵ لە لای خودا و زانایەکی ئاگا بووە و تا سەرەتاکانی چەرخی دوازدە ژیاوە. هێندێک کتێب و نووسراوەشی داناوە؛ یەکیان کتێبێکە بە ناوی «*نورالأنوار*» بە زبانی فارسی لە باسی بنەماڵەی سەید و شێخەکانی کوردستان؛ کە ساڵی ١٠٩٩ بەرهەمی هێناوە. ئەم کتێبە چاپ نەکراوە؛ بەڵام لەم دواییانەدا کورتەیەکی بریەتی لە ٥٠ لاپەڕە، کراوەتە کوردی و لە بەغدا چاپ بووە. بەرگێک لەو نامیلکەیەم دەس‌کەوت و بۆ نووسینی ئەم کتێبە کەڵکم لێ گرت.

کورتەیەک لە*نورالأنوار*، چاپی بەغدا.

## جامی چۆڕی

سەید مەلا جامی، پشتی دووهەمی عەللامە مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چـۆڕی، لـە زانایـانی هەڵـکەوتەی ڕۆژگاری خۆی بووە کە هێندێک پەراوێزی بایەخداری بۆ کتێبە دەرسییەکان نووسیوە.

بوداق‌سوڵتان، کوڕی شیرخان، کوڕی شێخ حەیـدەرخـان، حـاکمی مـوکری، ساڵـی ١٠٨٣ ک. م. کـە مزگەوتی جامیعەی سابلاخ (مەهاباد) یان «مزگەوتی سوور»ی کردۆتـەوە و مـەوقووفاتێکی بـۆ دانـاوە، مـەلا جامی لە چۆڕی مەریوانەوە، بۆ بەڕێوەبردنی ئەوێ بانگ کردووە. مەلا جامی ئەم بانگێشتنەی وەرگرتووە و تا ئاخری ژیانی (سەرەتای چەرخی دوازدە) دەرس‌گوتنەوەی ئەوێ لە ئەستۆ بووە.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٤٤. *مرآت البُلدان ناصری*، محمّد حسن‌خان صنیع‌الدّولـه، چـاپی تـاران، ب٤، ل١٠٥.

## سەید موحەممەدی بەرزنجی

سەید موحەممەد، کوڕی عەبدوڕڕەسوول، کوڕی عەبدوسسەید، لە سەیدەکانی بەرزنجـە و بـرای سـەید بابـا ڕەسوولی کەبیر ـکە پێشتر باسیمان کرد ـ لە ١٢ی ڕەبیعول‌ئەوەڵی ساڵی ١٠٤٠ ک. م. لە بەرزنجە هاتە دنیا و دەرسە سەرەتاییەکانی لای بابیەوە خوێند و بەشوێنیدا چووە خزمەتی مەلا شەریفی کوڕی یۆسـفی سـدیقی شاهۆیی و مەلا ئیبراهیمی گۆرانی و ماوەیەکی زۆر لە کۆڕی دەرسی ئەم دوو مامۆستا گەورەیە بەهرەی برد. ئەوجار کەوتە گەشت و هەمەدان و بەغدا و دمشق و ئەستەمبووڵ و قاهیرە گـەڕا و لـە هەرکامـدا ماوەیـەک مایەوە و هاوبەشی کۆڕی وێژەوانان و زانیارانی کرد و لە هەر گۆشەیەکدا تۆشەیەکی هەڵگرتەوە و سـەرەنجام گەیشتە مەدینە و دەستی لە سەفەر کردن هەڵگرت و شانی لە دەرس‌گوتن و بەهرە گەیاندن شل‌کرد.

سەید موحەممەدی بەرزنجی لە باری زیرەکی و بڕشتی زەین و زانستی هەمەلایەنەوە، پیتۆڵی ڕۆژگـاری خۆی بووە؛ تا ڕادەیەک کە تاقمێ لە زانایانی هاوچەرخی، نوێکار (مُجَدِّد)ی چەرخی یازدەیان پێ گوتووە:

حـادی عَـشَر قَـدْ کـانَ برزَنْجـیٌّ مُجَـــدّداً و شَـــرطُهُ جَلـــیٌّ

بەرزنجی توانایی شیعر گوتنیشی هەبووە و ئەم چەند بەیتە کە بۆنی خۆهەڵکێشان و پاڵەوانیشی لێ دێ، هی ئەوە:

جـذْعان فخـری یَـشْهدان بفَـضْلی جـذْع هُنـا قَـدْ کـانَ حَـنَّ لجـدَی
ثـــان بِبَـــرزنج بمَـــسْجدها الَّـــذی مُوســـی و عیـــسی أسَّـــسا بمَجْـــد
جَـدّی وَ عَمّـی امتَـدَّ فـی أیـدیهما أعظـــمْ بخـــارق جـــذْعنا الْمُمْتَـــدّ
مَـنْ لَـمْ یُـصَدِّقْ فَلْیَـسَلْ مـنْ هٰهُنـا مـــنْ أهْـــل بَلَـــدتنا لَیَکْـــسب وُدّی

سەید موحەممەدی بەرزنجی ساڵی ١١٠٣ ک. م. لە مەدینە ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

**ئه م کتێب و به رهه مانه ی لێ به جێ ماوه:**

١. *الاشاعة فی أشراط السّاعة*

٢. *قدحُ الزَّند فی رَدّ جهات الهِند*

٣. وەرگێڕانی کتێبی *الجانب الغربی فی حَلّ مُشکلات ابن العربی*، نووسراوەی مزەفەری بەرزنجی، لە فارسییەوە بۆ عەرەبی

٤. *الاعجوبة فی اعمال المَکتوبة*

٥. *ضَوء الوهّاج فی قصّة الإسراء وَ المِعراج*

٦. *رجِلُ الطاووس فی اغلاط القاموُس*

٧. *انهار السّلسَبیل لِریاض انوار التَّنزیل*

٨. *تلخیص النَّواقص*.

*الأعلام*، ب٧، ل٧٥. *ایضاح المکنون*، ب١، ل٨٦.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٧٧. *هدیة العارفین*، ب٢، ل٣٠٢.

## شێخ ئیسماعیلی قازانقایی

شێخ ئیسماعیل، کوڕی سەید موحەممەدی نۆدێیی، لەدایکبووی قازانقای، گوندێکی کوردستانی باشوور، ناسراو بە «کبریت أحمَر» و لەسەیدەکانی بەرزنجە و باپیری شێخانی «قەرەچیوار»ە کە لە سەرەتای لاویدا، دوای تەواو کردنی دەرس و دەور، لای بابی تەریقەتی «عەلەوییە» و «خەلوەتییە»ی وەرگرتووە و پاش ماوەیەک بۆ بەغدا چووە و چۆتە ڕیزی مریدانی شێخ ئەحمەدی ئیحسایی و لەگەڵ تەریقەی «قادری»دا ئاشنا بووە و پشت دووساڵ گەڕاوەتەوە قازانقای.

تەریقەتی قادری تا پێش شێخ ئیسماعیل لە کوردستاندا باسی نەبووە و ئەو یەکەم کەسە کە ئەم ڕێبازە عیرفانییەی بە کوردان ناساندووە.

شێخ ئیسمایل لە دواییەکانی ژیانیدا کۆچی کردۆتە گوندێکی ناوچەی مووسڵ بەناوی «ولیان» و ساڵی ١١٠٣ ک. م. لەوێ کۆچی یەکجاری کردووە. ئەم دوو بەیتەیان بۆ مێژووی مردنی گوتووە:

امامٌ بأنوار الطَّریقَة قدرقی وَبَحْرٌ بأسْرار الحَقیقة قدْ طما
سَمیٌّ ذَبیح الله أرَّخْت مادحاً: «لفَقْدک اسْمعیل قَدْ بکَت السَّما»[1]

گۆڤاری مانگانەی *دەنگی گیتی تازە*، ژ١، س ١٩٤٥ز.

---

١. ؟

## مەحیەدین ئەبووبەکری ئەییووبی

شێخ مەحیەدین ئەبووبەکر، کوڕی تەقیەدینی سوڵتی ئەییووبی دمشقی، ویژەوانێکی هۆزانڤان بووە کە لە دمشق دانیشتووە و ساڵی ١١٠٤ یان ١١٠٨ کۆچی دوایی کردووە. دیوانەشیعرێکی بە عەرەبی لێ بەجیٚماوە؛ بریتی لە هەموو شێوە شیعری ئەوسەردەمە.

*فهرس مخطوطات دارالکُتُب الظاهریة*، دکتر غزّت حسن،
چاپی دمشق، ١٣٨٤ ک. م. ل١١٩ و ١٢٠ و ١٦٣.

## فامی دیاربەکری

ئیسماعیل ئەفەندی لە زانایانی دیاربەکر بووە کە دواتر بۆ ئەستەمبوول چووە و پاش ماوەیەک دیسان وەکوو سەرپەرشتی دیوانی دادوەری، گەڕاوەتەوە دیاربەکر و ساڵی ١١٠٥ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

ئیسماعیل ئەفەندی شیعریشی گوتووە و ناز ناوی «فامی» هەڵبژاردووە؛ کتێب و نووسراوەشی هەبووە؛ یەکیان هۆنراوەیەکە لە فەرائیزدا بە زبانی ترکی، بریتی لە دەوری سیٚهەزار بەیت.

*کشف‌الظنون*.

## عیززەت موحەممەد ئەفەندی

لە کوردانی ناوچەی وانی باکووری کوردستان و شاعرێکی شیعرڕەوان و نووسەرێکی قەڵەمجوان و ویژەوانێکی زمانزان و مرۆڤێکی پاک و پارێزکار بووە کە ساڵی ١١٠٥ ک. م. لە ئەستەمبوول لە دنیا چووە.
*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٦٨.

## یەحیا وانی

یەحیا وانی حەنەفی، کوڕی نووح، کوڕی عەبدوڵلا و برای بەدرەدین عومەرە کە پیاوێکی زانا بووە؛ زۆرتر وتاری داوە و خەڵکی ئامۆژگاری کردووە و لە بیستەکانی چەرخی دوازدەدا دنیای بەجیٚهێشتووە.

**لە کتێبەکانی**: *«المباحثُ الدُّرّیة فی بیان السَّنَة الشَّمسیّة و القمَریّة»*.

*الأعلام*، ب٩، ل٢٢١. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٣٤.

## شێخ شەمسەدینی مەردۆخی (دووەم)

شێخ شەمسەدین، کوڕی شێخ عەبدولغەفاری دووەم، زانایەکی ژیٚهاتی، گفتڕەوان، خۆشبەیان و نووسەرێکی بەتوان بووە کە لە تەجوید و قەرائەتدا ناوبانگی دەرکردووە و بە خەتی جوانی زۆر کتێبانی

نووسیوەتەوە. دو کوڕی لێ بەجێ ماوە: شێخ عەبدول‌موئمینی یەکەم و شێخ حەسەن (باپیری شێخانی باقلاوا).

زا و مەرگی شێخ شەمسەدین سالآنی ١٠٢٣ و ١١١٤ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخچەی خاندان مردوخ*

## عەلی ئامێدی

ویژەوانێک بووە لە کوردانی ئامێدی کە دواجار بۆ شام چووە و ساڵی ١١١٧ ک. م. لە دمشق کۆچی یەکجاری کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٧٤.

## تالیبی بەرسووی

موحەممەد، کوڕی موستەفای بەرسووی کوردی، نازناو «طالب»، زانا و ویژەوانێکی مژیور بووە کە ماوەیەکی زۆر لە شارانی ترکدا دادوەری کردووە و ساڵی ١١١٨ ک. م. لە دنیا چووە.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٣١٠.

## ئەحمەدی خانی

هەستیار و چیرۆکڤانی ناوداری کورد، شێخ ئەحمەدی خانی، کوڕی ئەلیاس، خاوەنی چیرۆکی بەرزی «مەم و زین»، وەک خۆی لە کۆتایی هۆنراوەکەیدا دەڵێ، ساڵی ١٠٦١ ک. م. بەرامبەر بە ١٦٥٠ز. لەدایکبووە و ٤٤ ساڵان ئەو چیرۆکەی هۆنیوەتەوە:

وەللەهـ ژ سفیدی و سیاهی — وی قەسد و غەرەز تۆوی ئیلاهی
ئەمما بە مورککەبا قەبایح — ڕووڕەش کەرنە گەلەک سەفایح
خەتی تیە سەرنوشت و سەرمەشق — سی‌ساڵە خەتی خەتا دەکەت مەشق
لەو ڕا کۆ دما ژ غەیب فەک بوو — تاریخ هەزار و شەست و یەک بوو
ئی ساڵە گهشتە چهل و چاران — وێ پیشرەوی گوناهکاران

کەوابوو مێژووی دارشتنی مەم و زین دەبێ ساڵی ١١٠٥ ک. م. (١٦٩٢ز.) بێ، نەک وەک هێندێک دەڵێن ١٥٩١ز. (یان ١٥٩٢)؛ کە ئەم ساڵە مێژووی کۆچی هۆزی خانی ـ پێش لەدایکبوونی ئەو ـ بۆ ناوچەی بایەزید لە باکووری کوردستانە.

وەک مامۆستا عەلائەدینی سەجادی لە «*مێژووی ئەدەبی کوردی*»دا دەڵێ: ڕستەی «طار خانی الی ربّه»[١] کە بە حیسابی ئەبجەد ئەبێتە ١١١٩، ساڵی کۆچی دوایی ئەحمەدی خانییە و کە دەزانین ١٠٦١ هاتۆتە دنیاوە، دەردەکەوێ تەنیا ٥٨ ساڵ ژیاوە.

ئەحمەدی خانی یەک لە ئەستێرە گەشەکانی ئاسمانی وێژە و زمانی کوردە کە بێژگە زمانی خۆی، عەرەبی و فارسی و ترکیشی باش زانیوە و لە مزگەوت و قوتابخانەکانی بایزید و ئورفە و خەلات و بدلیسدا خوێندوویە و سەفەری قاهیرە و قوستەنتەنییە چووە و لەگەڵ زانایان و وێژەوانانی عەرەب و ترکدا دانیشتووە و باس و ڕاوێژی زمانەوانی کردووە. لە دەورانێکدا کە کەس لە زانایان و مامۆستایانی کورد زمان، ئاوڕیان لە زمان و فەرهەنگ (کولتوور)ی خۆیان نەداوەتەوە و هەر بە خزمەت‌کردنی غەوارەوە سەری خۆیان قاڵ کردووە، ئەم زانا پایەبەرزە، بێ ئەوی چاوی لە دەستی میر یان وەزیرێک بێ و بیەوێ بە هۆی زانست و لێهاتووییەکانیەوە، شتێکی دەسکەوێ، لە ڕێ‌وشوێنی ڕابوردوان لای‌داوە و بە هەموو هەست و هێزیەوە، بۆ زیندووکردنەوەی میراتی میللەتەکەی تێکۆشیوە. ساڵی ١٠٩٤ ک. م. فەرهەنگێکی هۆنراوەی وەکی «*نصاب صبیان*»ی ئەبوونەسری فراهانی، بەڵام عەرەبی-کوردی، بۆ قوتابیانی کورد نووسیوە و «*نۆبار*»ی ناو ناوە. ئەم کتێبە یەکەم جار ساڵی ١٣١٠ ک. م. لە پاشەرۆکی فەرهەنگی «*الهدایة الحَمیدیة فی‌الغه الکُردیّة*»دا، لە شاری ئەستەمبووڵ چاپ کراوە. نۆبار بریتی لە نۆ بەشە کە هەر بەشێکی لەسەر کێشێکی عەرووزی جیاواز هۆنراوەتەوە. ئەوا بۆ وێنە، سێ بەیت لەو کتێبە:

رِجْـل: پێ و رُکْبَه: ئەژنۆ، بَطْن: سک ... صَدْر: سنگ و جید: ئەستۆ، عَیْن: چاڤ
بیدا، فَلاة و سَبْسَب، فَیْفاء و بَدو: دەشتە ... یَنْبوع و عَیْن: کانی، جُبّ و قلیب: بیرە
اکْحل، مرۆڤی چاڤ‌بەکل، أشْهَل: مرۆڤی چاڤ‌بەڵەک ... أشْقَر مرۆڤی چاڤ‌هشین، ڕەنگی گەنم‌گوون: ئەسمەرە

بەیتی یەکەم بەحری: «رَمَل مُسَدَّس مَحذوُف یا مَقصوُر» بەیتی دووەم: «مُضارع مُثَمَّن أخرَب» و بەیتی سێ بەحری: «رَجَز مُثَمَّن سالم».

بەڵام شاکاری خانی «مەم و زین»، چیرۆکی دوو ئەوینداری مێژوویی کوردە کە وەکوو لاوکێک دەماودەم هاتووە و نەختە-نەختە کاڵ بۆتەوە و خەریک بووە لەبیر بچێتەوە؛ خانی بەزمانی کوردی کرمانجی باکوور و بەجوانترین شێوە و لەوپەڕی ناسکی و هەروەها قەوەتدا، داستانێکی هەست‌بزوێن لە ئەوین و جوامێری و پاڵەوانی و بەزە و مرۆڤایەتی لە بەرامبەر هەڵەڕۆیی و دڵڕەشی و شۆفارکارییەوە داناوە و وای پێکهێناوە قەت کۆنەبوون نەناسێ و لەبیر نەچێتەوە؛ بەڵکوو باشترین هاندەری هەستی نەتەوایەتی میللەتەکەی و پارێزەری زمانەکەی بێ، لەو ڕۆژگارە و تەنانەت ئەمڕۆژ و تا هەتایە. وەک بۆخۆی دەفەرموێ:

---

١. **واتا**: خانی گەڕاوە لای پەروەرندەی خۆی.

شـــــەرحا غـــــەم دڵ بکـــــەم فـــسانە زیـــن و مـــەمی لـــێ بکـــەم بەهانـــە
نـــــەغمی وە ژ پـــــەردەیێ دەریـــــنم زینـــــا و مـــــەمێ ژنـــــۆ وەژیـــــنم
ئـەڤ نامـە ئەگـەر خەرابـە گـەر قـەنج کێــشایەمە وی دەگــەڵ دوســەد ڕەنــج
نـــــەو بارەیـــــە تفـــــڵ نەورســـــیدە هەرچەنـــد نـــەهین قـــەوی گوزیـــدە
ئـــــەڤ میـــــوە ئەگـــــەر نـــــە ئابـــداره کرمانجییـــە ئـــەو قـــەدەر لـــە کـــاره

خانی لەم هۆنراوەیەدا پێڕای گێڕانەوەی چیرۆکی مەم و زین، با دەداتەوە سەر دواکـەوتوویی و دامـاوی و دەرەتان لێبڕاوی میللەتەکەی و لەو هەموو تاڵە نالەبارە و غەدری مـەردمی ئـەو ڕۆژگـارە دەناڵـی و وەکـوو ئاواتێک بە دڵیدا دێ کە ئاخۆ دەبێ ڕۆژێ...؟

دا کەشف ببت ل بـۆ مـە ئـەحوال کاتـێ دبـتن مویەســسەر ئیقبـال
ئیــدبار مــەوی گــەها کــەمالی ئایـــا بویـــە قـــابیلی زەواڵـــی
قەت مومکنە ئەپ ژ چەرخ لەولەب تـالع بـبتن ژ بـۆ مـە کەوکـەب
بـەختی مـە ژ بـۆ مـەرا ببـت یـار جـارەک بـبتن ژ خـاب هوشـیار

سەرەنجام پاش هەموو گلە و گازندە لە میللەتانی تر، بـەم ئاکامـە دەگـا کـە دەرمـانی هـەموو دەردان و چارەی ڕزگار بوون لە سەرگەردانی و بێ ناو و نیشانی، تەنیا و تـەنیا یـەکگرتنـە و بـەس. چمـان لـەبـەر لێکبڕاوی لەدەس چووە و بەسەر هاتووە، بە یەکیەتی دەسمان دەکەوێتەوە و هەوری نەگبەتی لە سـەرمان دەڕەوێتەوە:

لـەو پیکـڤە هەمیـشە بـێتفـاقن دایم بـــە تەمـــەڕڕود و شـــقاقن
گـــەردی هـــەبوا مـــە ئیتتحـــادک ڤـــێکرا بکـــرا مـــە ئینقیـــادک
تەکمیل دکر، مـە دیـن و دەولـەت تەحسیل دکر، مە عیلم و حیکمەت
تـەمییز دەبـوون ژ هـەڤ مـەقالات مومتـاز دەبـوون خـودان کـەمالات

وەک باس کرا مەم و زینی خانی بە زمانی کرمانجی باکوورە و وێژەوانی هێژای کورد مامۆستا هەژار، هەر لەسەر کێش و دەقی خۆی، کردوویەتە موکوریانی، کە کوردی باشوری لێ بێبـەش نـەبن. پـێش ئـەویش پیرەمێردی نەمر بە زاری سلێمانی وەکوو شانۆنامەیەکی لێ کـرد. لـەو ناوانەشـدا مـەم و زیـن و چیرۆکـە لەمێژینەکەی چەند جاران لە شارانی برلین و پاریس و سەنپترزبـورگ و ئەسـتەمبووڵ و دمـشق و تارانـدا چاپ کراوەتەوە و گەڕاوەتەوە سەر زۆر زمـانی وەک ئاڵـمانی و فەڕانـسی و ڕووسـی و عـەرەبی و ترکـی و ئەرمەنی و لەم دواییانەشدا کاک عوبەیدیللای ئەییووبیان چیرۆکەکەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی.

شێخ ئەحمەدی خانی مرۆیەکی لەسەرخۆ، خاکەسار و پارێزکار بووە و جیا لە بـاری شـیعر و شـاعیری و وێژەوانی، وەکوو مامۆستایەکی زانا، زۆربەی زانستە ئیسلامییەکانی زانیـوە و لـە شـاری بایزیـد، تـا کۆتـایی

ژیانی، قوتابی ڕاگرتووە و دەرسی گوتووە.

پێشەکی *مەم و زین*، موسکۆ، ١٩٦٤ ز. پێشەکی *مەم و زینی هەژار*، بەغدا، ١٩٦٠ ز. چریکەی *مَم و زین* (فارسی)، ترجمەی عبدالله ایّوبیان، تبریز، ١٣٤٤ ک. هـ. *مێژووی ئەدەبی کوردی*، عەلائەدین سەجادی، بەغدا، ١٣٧١ ک. م.

## شێخ ئەبووبەکری تەختی

عارفی پایەبەرز شێخ ئەبووبەکر، کوڕی شێخ موستەفای مەردۆخی و برای شێخ ئەحمەدی عەللامە، لە کەڵەپیاوانی زانست و عیرفانی خانەدانی مەردۆخییە کە ساڵی ١١٢١ ک. م. لە گوندی «تەختە» ئەمری خوای بەجێهێناوە و هەر لەوێ نێژراوە.

*تاریخچەی مَشایخ خاندان تختە.*

## شێخ مستەفا خۆشناوی

شێخ موستەفا لە مامۆستا گەورەکانی چەرخی دوازدەی کۆچییە کە لە مووسڵدا ژیاوە و تا دوا کاتی ژیان دەرسیداوە و هەر لەوێ دەستی لە دنیا بەرداوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٩٤.

## مەحموودی کوردی

پیاوێکی زانا و شێخێکی پارسا و مامۆستایەکی ئاگای چەرخی دوازدە لە کوردانی مووسڵە کە دواجار ڕووی لە شام ناوە و لەوێ دەرس گوتنەوە و بەهرە گەیاندنی درێژەپێداوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٢٦٠.

## یۆسفی ئامیدی

کوڕی عەبدوڵڵای ئامیدی (دیاربەکری)، نووسەرێکی وێژەوانە کە کتێبێکی بە ناوی «*الملل و النَّحَل فی العقائد*»ی لێ بەجێماوە و ساڵی ١١٢٣ ک. م. ئەمری خوای بەجێ هێناوە.

لە «*کَشف‌الظنون*»دا هاتووە: «مولانا یوسف، بن عبدالله، بن عُمر کُردی الگورانی ابوالمحاسن من تالیفاتە: *بیان سِرِّالطّالبین فی التَّصوّف*».

ڕۆشن نییە ئایا ئەم یۆسف کوڕی عەبدوڵڵایەش هەر یۆسفی ئامیدییە یان دوو کەسی جیاوازن.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٦٨. *کشف‌الظنون*، ب١، ل٢٦٠.

## سەید ئیسماعیلی ئامیدی

کوڕی سەید ئیبراهیمی ئامیدییە کە لە مەدینەی پیرۆزدا ژیاوە و دادوەری کردووە و ساڵی ١١٢٤ ک. م. لە دنیا چووە.

**لە کتێبەکانی**: «*دُرَر النَّفائس فی زجر الاشرار و الخبائث فی السّیاسة الشرعیّة*».

*ایضاح المکنون*، ب ١، ل ٤٧٠.

## نابی ڕەهاوی

یۆسف ئەفەندی، نازناو «نابی» خەڵکی ئورفە (ڕەها)، ڕامیارێکی زانا و شاعیرێکی توانا بووە کە فارسی و عەرەبی و ترکی باش زانیوە و بێژگە کوردی، بەم سێ زمانەش شیعری نووسیوە.

یۆسف ئەفەندی لە دەورانی دەسەڵاتی سوڵتان موحەممەدی چوارەمدا (١٠٥٨-١١٠٤ ک. م.) بۆ ئەستەمبووڵ چووە و لە دەرباریدا کارێکی پەیدا کردووە. پاش ماوەیەک ڕووی لە حیجاز ناوە و لە گەڕانەوەدا سەرێکی حەڵەبی داوە و ماوەیەکی تێدا دامەزراوە؛ بەڵام دیسان گەڕاوەتەوە ئەستەمبووڵ و لە یانەی مامۆستایانی باڵای ئەوێدا پلەی ئوستادی پێ سپێراوە. دواجار جێگە و پێگەی بەرزتریشی پێدراوە و سەرەنجام پاش نەود ساڵ، لە سێهەمی ڕەبیعولئەوەڵی ساڵی ١١٢٤ ک. م. ئەمری خوای ملپێداوە.

**لە کتێبەکانی**: «*تُحفةُالحَرَمین*»، «*مُنشآت*» و دیوانی شیعر.

ئەم دوو بەیتە، شیعری نابییە:

لَنا حَبیبٌ و لی فی کلّ جارحةٍ     مِنْهُ جراحٌ بسیف اللّحْظ و المُقَل
تَقولُ و جنّتُهُ مِنْ تحْت شامته     لی أسْوةٌ بانحطاط الشَّمس مِنْ زُحَل

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل ٢١١ و ٢١٢.

## بەدرەدینی وانی

بەدرەدین عومەر، کوڕی نووحی وانی حەنەفی و برای یەحیای وانی، زانایەکی هەڵکەوتە بووە کە لە شاری وان دەرسی گوتووە.

**لە کتێبەکانی**: «*اشرَف الوسائل فی اوصاف سیّد الاواخر*»، «*أنیسُ الرَّمس فی تفسیر آیه جری الشَّمس*» و «*تواریخ الائمه*».

بەدرەدین عومەر موفتی وان بووە و شیعریشی گوتووە و چەند قەسیدەیەکی بە عەرەبی لێ بەجێماوە و زا و مەرگی لە ١٠٧٤ و ١١٢٦ ک. م. ڕوویداوە.

*ایضاح المکنون*، ب ١، ل ٨٨. *هدیةالعارفین*، ب ١، ل ٧٩١.



## لەشکری سۆرانی

لە شاعیران و ویژەوانانی بەناوبانگی چەرخی دوازدەی کۆچییە کە لە دەورانی دەسەڵاتداری ئەمیر سلێمانی سۆراندا ژیاوە و ئینشابەند و هاوڕاوێژی بووە و بێژگە دیوانی شیعر، کتێبی تریشی نووسیوە.

*مَشاهیرالکُرد*.

## عەبدوڵڵای زێباری

عەبدوڵڵا، کوڕی موستەفا، کوڕی حەسەن، کوڕی موحەممەد، زانایەکی خەڵکی زێبار بووە کە لە زمان و ویژەی عەرەبدا شارەزاییەکی باشی دەسکەوتووە و شیعری چاکی گوتووە و لە سەرەتاکانی چەرخی دوازدەی کۆچی، لە شاری حەلەبدا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم سێ بەیتە لە قەسیدەیەکە لە ساڵی ۱۱۰۲ ک. م. بۆ لاواندنەوەی شێخ موحەممەد، کوڕی نیزامەدینی قوسەیری گوتوویە:

لَعَمْـرِكَ مـا الـدُّنیا لا بنائهـا ذُخْـرُ    و لکنَّهـا دارُ الفنـاء بهـا الخُسْرُ
قـرارةُ أكْـدار و معـدنُ كُـرْبَـةٍ    حبـالَـةُ آثـام بهـا يُكْسَبُ الـوِزْرُ
فَتَبْـدُو بلَـذّات و عَـيش مُزَخـرف    وَ مـا عنـدها الّـا الخديعَـةُ و المَكـرُ

*مَشاهیرالکُرد*، ب۲، ل ٤٠.

## عەلی سنجاری

کوڕی تاجەدین، لە زانایان و مامۆستایانی فیقهی حەنەفییە و لە بەرهەمەکانی کتێبێکە بە ناوی «***القُربة بكَشف الكربة، عَن بَيان عَدَم صحة صلاة المُؤتَمّ بالامام الخارج وَ هوَ فـى جَوف الكعبة***» کە دەور و بەری ساڵی ۱۱۰۹ ک. م. لە شاری مەککەدا نووسیویە.

شیاوی باسە «ئیبنو عەلی سنجاری، کوڕی وەهەب»یشمان هەیە کە لە چەرخی شەشەمدا ژیاوە.

*لُغت‌نامەی دهخدا*، چاپی ۱۳۲٥، پیتی س، ل۲۰۹، بە گێڕانەوە لە *مُعجَم‌المومنین*، ب۷، ل٤۹. *ایضاح‌المكنون*، ب۱، ل۲۲۲.

## فەیزی وانی

ساڵحئەفەندی وانی، نازناو «فەیزی»، برای ئەحمەدی دوڕڕی، لە شاعیرانی کوردی وان بووە کە لە دەربـاری عوسمانیدا جێ خۆی کردۆتەوە و بۆ وێنە ئینشابەندی تایبەتی سوڵتان بووە و ساڵی ۱۱۲۷ ک. م. مردووە.

*قاموس الأعلام*.

## ئەمیرکوردی

مورتەزا بەگی حەنەفی سۆفی، ناسراو بە «ئەمیرکوردی»، کوڕی میرمستەفا، کوڕی میرحەسەن، لە شاگردانی نابلوسی، میرێکی ڕامیار و وێژەوانێکی پارێزکار بووە کە لە شاری دمشق ساڵی ١١٢٧، وەک «*تاریخ آداب اللغة العربیّة*» دەڵێ، یان ١١٥٥، بەرامبەر بە واتەی «*هدیه العارفین*» لە دنیا چووە.

**لە کتێبەکانی**: «*تهذیب الاطوار فی عَجائب الامصار*»، «*شرح الُلوک فی رضاء الحق الغنی بشَرح قصیدة النابُلسی*»، «*عبدالغنی و عُقُود الجمان فی عدم صُحبة ابناء الزَّمان*».

*تاریخ آداب اللغة العربیة*، ب٣، ل٣٢٥. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٤٥٢. *ذیل کشف‌الظنون*، ب٢، ل٤٤.

## عیسای بوولەوی کوردی

عیسا، کوڕی عەلی، کوڕی حەسەنی بوولەوی، لە دنیا چووی ساڵی ١١٢٧ ک. م. لە زانایان و مامۆستایانی سەرف و نەحو بووە و لەم دوو بوارەدا کتێبیشی نووسیوە؛ یەکیان: «*مُفیدالاعراب فی النحو*».

*ایضاح‌المکنون*، ب٢، ل٥٣١.

## شێخ عەبدولموئمینی مەردۆخی (یەکەم)

شێخ عەبدولموئمین، کوڕی شێخ شەمسەدینی دووەمی مەردۆخی، مرۆیەکی زانا و تێگەیشتوو بووە کە کاتی خوێندن، هەموو کتێبەکانی بۆخۆی نووسیوەتەوە و لە هەر وانەیەک لای کەم دەقێکی لەبەر کردووە.

شێخ عەبدولموئمین لە نووسینی فارسی و عەرەبیدا دەستێکی باڵای هەبووە و ساڵانێکی زۆر ئیمامەتی جومعەی شاری سنەی کردووە.

زا و مەرگی شێخ، ساڵانی ١٠٦٦ و ١١٢٨ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخ مَردوخ*.

## حەیدەری ماوەرانی[١] (دووەم)

عەللامە حەیدەری دووەم، کوڕی ئەحمەد، کوڕی عەللامە حەیدەری ئەوەڵ، لە زانایانی ناوداری بنەماڵەی حەیدەرییەکان و بەرپرسی فتوا و ئیجازەی قوتابیان و شێخولیسلامی میرانی سۆران بووە کە ساڵی ١٠٣٦ چاوی بە دنیادا کراوەتەوە و ١١٢٩ ک. م. لە دنیا چووە.

١. بۆ باشتر ناسینی ناودارانی ئەم بنەماڵە، بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١٨٦، باسی حەیدەری یەکەمی ماوەرانی.

دانەری «*هدیةالعارفین*» بۆ ناساندنی حەیدەری دووەم ئاوای نووسیوە: «حیدر بن الشّریف احمَد الحریری الصفوی الحُسین آبادی الشافعی نزیل موصل، وُلِد سنه ١٠٣٦ و تُوَفّیَ سنه ١١٢٩ ...».

حەیدەری دووەم هێندێک نووسراوەی لە حیکمەت و فەلسەفە و ئوسوولدا هەبووە کە هیچیان چاپ نەکراون.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٤٢.

## مەلا سولەیمانی هەورامی

عەللامە مەلا سولەیمان، کوڕی سولەیمانی گۆرانی، لە هەورامان لەدایکبووە و بۆ خوێندن بەرەو شارەزوور چووە و لەوێوە ڕووی لە شارانی تری عیراق ناوە و لە هەر شوێنێ بەشێکی وەبەر خۆی داوە تا گەیشتۆتە بەسرە؛ لەو شارە گیرساوەتەوە و لە خزمەتی مامۆستایانی ئەوێدا ئیجازەی وەرگرتووە.

ئیجازەنامەی ئەم ماموستایەم لە پشتی بەرگێکی دەسنووسی تەفسیری بەیزاوی لە کتێبخانەی خوا لێ خۆشبوو مەلا مەحموودی موفتی کوردستاندا چاو پێ کەوت کە لە ساڵی ١١١٧ ک. م. بۆ شێخ شەرەفەدین ناوێکی کوڕی شێخ حوسەینی ئوزبەکی خوراسانی هیرەوی لە بەسرەدا نووسرابوو. پێم جوان هات دەق بە دەقی لێرەدا بێنم:

«بِسْمِ اللهِ الرحمنِ الرَّحیم وَبه نستعینُ، الحمدُ لله ربّ العالمینَ و صَلَّی الله علی سیِّدنا مُحمَّد النَّبی الامّی و علی آله و أصحابه اَجْمَعینَ و سلَّم صَلوةً و تسلیماً فایضی البَرکات علی السّابقین و اللاحقین عَدَدَ خَلْق الله بدَوامِ المَلک الحقّ المُبین. أمّا بَعْدُ ـ فانَّ منْ نعَمِ الله تعالی وَ منحه المُهْداة الیَّ، أنْ وَفَدَ عَلَیْنا ببَصْرَةَ اَلفیْحاء الأخُ الفاضل الادیب الکامل اَلوارعُ الزّاهدُ الصّادقُ الحامدُ الشِّیخُ شَرَفُ الدین بنُ الشَّیخ حُسَیْن الازبَکیُّ الخُراسانیُّ الهَرَویُّ مع جماعة منْ اَهْلِ العلمِ و الصّلاحِ و باتُوا عنْدنا مُدَّةً، فَحَصَلَ لَنا بهِم الأنْس الکاملِ و اللّطفُ الشاملُ معَ مشارکتهِمْ لَنا فیما جَرَت به مقادیرُ الله تعالی، و قد قَرَأَ عَلَیَّ فی مدّة قرائتهِمْ طَرَفاً منْ تَفْسیر البیضاوی منْ اوَّل سُورَةَ البراءة الی قُرب الجُزء، وَ صحیحِ الْبخاری من أوَله الی اَنْ قَرَأَ شیئاً منْ ابوابِ المواقیت، معَ سماعِ فتحِالباری من اولیة الی الحَدِّ المذکُور. فأجَزْتُ لَهُ روایَتَها و روایَةَ سایر ما یجُوزُ لی و عَنّی روایَتُهُ، سیَّما ما تَضَمَّنَهُ الأمم لایقاظ الْهمَم و غَیْره منْ تألیف العَلامَة وَحیدَ الدَّهْرِ و نادرَةَ العَصْر، شَیْخی الشّیخ ابی طاهر ابراهیمبن حَسَن بن شهاب الدّین الکُردی الگورانی الشهرزوری الشَّهرانی، ثمَّ المَدَنی قُدّس سرُّهُ ـ بشرطه المُعْتَبَر عندَ اَهل هذا الشَّأن ـ نَفَعَهُ الله بالعلمِ و جَعَلَهُ منْ اَهْله، و شَرطْتُ عَلَیْه اَنْ لا یَنْسانی منْ الدُّعاء فی جَلَواته و خَلَواته. وَ أرْوی تَفسیر البَیْضاوی عَنْ شَیْخَنا ـ قُدّس سرُّهُ بقَرائتی لطَرَف عَلَیْه منْ اَوَّله و طَرَف من أوْسَطه و طَرَف مَنْ آخره، و اجازةً لکُلّه منْ الأستاد مُلا مُحَمَّد شریفبن الملا یُوسُف الگورانی الصّدیقی سماعاً و اجازةً و عن الشیخ العارف بالله صَفیالدّین اَحْمَد بن مُحَمَّد بن مَطیر الیمنی عن الشَّیخ ابن حَجَر المکّی عَن القاضی زَکَریّا عَن الحافظ ابن الحجر العَسْقَلانی عَن الحافظ اَبی هُرَیْرَةَ الذَّهَبی عَن اَبیه الحافظ ابی عبْدالله الذَّهبی عَنْ عُمَرَ بن الیاس المراغی عَن البیضاوی و بروایة

الثانی عَنِ الشَّمس محمَّد بن احمَد الرَّملی عَنِ الزّین زکریا عن النَّجمِ عُمَر بن فَهْد المَکی عَنِ الجمال المُرشیدی المکّی عنِ العلامة حُسامالدّین بنْ عَلی الابیوردی عَنِ الشیخ شهاب الدین احمد الکُردی عَنِ الشَّیخ نُورالدین الاربلی عن الشیخ زَیْنَ الدین التَّبریزی عَنِ البیضاوی ـ رَحمهُ الله تعالی ـ وَ برَوایةِ الثانی اَیْضاً عَنْ شَیخ المحَققین اَحْمَد بن عَلی الشَّناوی ثمَّ المَدَنی عَنِ الرَّملی عَن زَکَریّا عَن ابن حَجَر العَسْقَلانی عَنِ الحافظ ابیهُریرَةَ الی آخر الاسْناد، و بروایةالشَّناوی اَیضا عَنِ الدُنْجَیهی عَن الجلال السُّیوطی عَنِ الشَّمسِ محمَّد بن اَحمد المَخْزومی عَن یحْییبن محمد یُوسف الکرْمانی شارِحِ البخاری عَنْ ابیه عَن القاضی عضدالدّین الایجی عَنِ الشَّیخ زَیْن الدین الهنکی عَنِ البیضاوی ـ رحمهالله و شَکَرَ سَعْیه ـ قال ذلکَ و کتبهُ العبد سلیْمانْ بن سُلیمان الکُردی الگورانی الشَّهرزوری الاورامی ثُمَّ الْبَصری، لیلَة الجمُعه ٢٥ رجب سنهٔ ١١١٧ مَضتْ من الهِجرَةِ ـ کانَ الله لَهْ و عَفی عَنْهُ ـ و صلَّی الله علی سیّدنا مُحَمَّد و علی آله و أصحابه و سَلَّم».

*هدیةالعارفین* و یاداشتەکانی نووسەر.

## مەولانا عەبدوڵڵای ماوەرانی

مەولانا عەبدوڵڵای حوسەینابادی ماوەرانی، کوڕی مەولانا حەیدەری دووەم لە زنجیرە زانایانی بنەماڵەی حەیدەری و مامۆستایانی بەناوبانگی چەرخی دوازدەی کۆچییە کە بەرهەمی نووسراوەی زۆری هەبووە؛ بۆ نموونە: زنجیرە پەراوێزێک بۆ کتێبی «*میرابولفتح*» لە ئادابدا کە ئاوا دەسپێدەکا:«الحَمدُ لمَن لا صوابَ معَ مُناظره و الشُّکرُ لمَن لا أدبَ معَ مُکابره و الصّلوة و السّلام عَلیالباذلِ وجُودَهُ فی مُباحَثة المُعاندینَ الناصبِ نفسَهُ لإفحام المُعارضین و علی آله الّذینَ لَم یطلعوا علی خَلَلٍ فی الدّین، الا دَفعوا و لَم یَعثُروا عَلی زَلَلٍ فی الیَقین إلا مَنَعوا و اصحابِهِ الصّائبین فی کُلَّ ما نَقَضُوا ـ رَضیالله تَعالی عَنْهُم و رضوا ما استَنَدتِ المَعیشةَ بِالمَلَوَین و ما شَهِدَت المَوْوودَة علی الابَوین».

مەولانا عەبدوڵڵا بەسەر «*قول احمَد فَناری*»دا زنجیرە پەراوێزێکی نووسیوە کە سەرەتاکەی ئاوایە: «حَمداً لمَنْ تَمَثَّلَ منْ مَرائی أجناس العالَم جَمالُهُ و شُکراً لمَنْ تَجَلّی فی نَوْعِ المصلَحة أفعالُه. فَصَّل الإنسانَ بِالمَنْطقِ الکاملِ العیار و فَضَّلَهُ بخَصایصَ لایَلیقُ بالاغیار...».

وەک زانای هێژا مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ لە «*گۆڤاری کۆڕی زانیاری*»دا دەڵێ، لە نووسراوەکانی مەولانا عەبدوڵڵای ماوەرانی، زنجیرە پەراوێزێکە بە ناوی «*مُحاکَمات*» بەسەر شەرحی جەلالەدین موحەممەدی دەوانی (؟-٩٠٧ ک. م.) لە «*عقاید عضُدیّه*» و پەراوێز بۆ «*تحفةالمُحتاج*»ی شێخ ئیبنوحەجەری هەیتەمی مەککی.

هەروەها بەرامبەر بە نووسراوە ، مەولانا عەبدوڵڵا ساڵی ١١٣٠ ک. م. کۆچی دوایی کردووە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، پاش بابی تاقە ساڵێک ژیاوە.

نووسراوەکانی مەولانا عەبدوڵلا. گۆڤاری *کۆڕی زانیاری* کورد، بەغدا، ١٩٧٣ ز.

## شێخ موحەممەد جەسیمی مەردۆخی (یەکەم)

عەللامەی پایەبەرز شێخ موحەممەد جەسیم، کوڕی شێخ مەحموود، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامە، کوڕی شێخ موستەفا تەختی مەردۆخی، لە زانایان و مامۆستایان و پارسایانی گەورەی کوردستانە کە شیعریشی گوتووە و بەرهەمی بایەخداری زۆری، لە شیعر و پەخشان هەبووە کە بەداخەوە هەموویان پاش خۆی لە سووتمانێکا سووتاون و تەنیا هۆنراوەیەک بە زبانی کوردی هەورامی لە عەقایددا لێی ماوەتەوە کە ئەوا تاقە بەیتێکی کە تێیدا ئاماژەی بە ناوی خۆی و بابی کردووە:

ئیبن شێخ مەحموود بە ئیخلاس تەرسیم          داعی بێنەوا موحەممەد جەسیم

شێخ جەسیم ساڵی ١١٣٣ لە دنیا چووە و ساڵەمەرگی بە حیسابی ئەبجەد، لەگەڵ ڕستەی «پیوستە برحمت»دا بەرامبەر دێتەوە.

جونگێکی دەسنووس.

## شێخ ئەحمەدی عەللامە

کوڕی شێخ موستەفا، کوڕی شێخ شەمسەدینی وەلی، لەدایکبووی ساڵی ١٠٢٦ ک. م. لە گوندی تەختە و لە بنەماڵەی مەردۆخی، کەڵەپیاوێک هەم لە باری زانستی و هەم لە بواری عیرفانییەوە هەڵکەوتوو بووە؛ لە لایەکەوە قوتابیان و خوازیارانی زانست حەولیان داوە لە کۆڕی دەرس‌گوتنەوەیدا بەهرەمەند ببن و لە لایەکی ترەوە خەڵکی تینووی ئامۆژگارییە بەنرخەکانی، چاوەڕوانی وادەی وتاردانی بوون؛ کە حەوتوویەک دووجاران پێک هاتووە.

شێخ ئەحمەد لەگەڵ ئەوەدا یەکجار زیرەک و گفت‌جوان و قسەڕەوان بووە و لە کێشەدا کەس خۆی لەبەری نەگرتووە، مرۆیەکی خاکەسار و بێ دەماریش هەڵکەوتووە و بەسەر کەسدا دەماری نەنواندووە؛ بەو بۆنەوە هەموو خەڵک یەکجار خۆشیان ویستووە و ڕێزیان لێ گرتووە.

لە عەللامە شێخ ئەحمەد ناملکەی زۆر بە زبانی عەرەبی و فارسی، لە پەند و ڕێنوێنی و ناساندنی داب و نەریتی ئیسلامی بەجێ ماوە. دوایین دانیشتنی ئامۆژگاری شێخ، دوای نیوەڕۆی سێ‌شەممە نۆی شابانی ساڵی ١١٣٤ ک. م. بووە و شەوی دوایی (دەیەمی شابان)، لە بەرەبەیاندا گیانی پاکی بە خودای تاک سپاردووە. مەرقەدی لە گوندی تەختە، لە پەنای بابی بەڕێز و پایەبەرزی، شێخ موستەفادایە.

مەلا ئیسحاق ناوێک بۆ مێژووی کۆچی دوایی ئاوای گوتووە:

دریغا احمد آن شیخ زمانە          برون رفت از جهان، بگذاشت منزل



قبـول خـاص و عـام خلـق مـی‌بـود / بـه پـیش جملـه عـالم بـود مُقبـل
ز فـوت او جهـانی گـشت غمگـین / از آن تاریخ مرگش شد «غمین دل»[١]

شێخ ئەحمەد بـە زبـانی کـوردی و فارسـی و عـەرەبی شـیعری گوتـووە. لـە شـیعرە فارسـییەکانی هۆنراوەیەکە بە شێوەی مەسنەوی، دەوری هەشتا بەیتە؛ ئاوا دەسپێدەکا:

کـودک نورسـتەی بـاغ حیـات / ای دهَنـت غنچـه، لَبانـت نبـات
سـیر ننوشـیده ز پـستان تـو شـیر / ای شـده در دسـت حـوادث اسـیر
مـام تـو را رانْـد ز آغـوش خـویش / کرد دریغ از تـو بَـر و دوش خـویش
نُـوز نـشد عُمـر دو سـالت تمـام / چشمەی نوش از تـو نگـه داشت مـام
تربیتـت را پـدر آغـاز کـرد / بـر تـو در رنـج و محـن بـاز کـرد
سـیلی و مُـشت اسـت تـو ُرا از پـدر / اینـت بـه رخـساره و آن بـر کمـر
زمزمـەی کودکیـت ای حبیـب / جـز دو سـه سـالیت نگـردد نـصیب
عمر تو چون رفت و رسیدی بـه پـنج / شـور صـباوت شـودت درد و رنـج
هفت چـو گردیـد تـو را سن و سال / از کـف اُسـتاد خـوری گوشـمال
رهـسپُر گوشەی مکتـب شـوی / تـا کـه فرهمنـد و مـؤدب شـوی

تا دەگاتە ئەوە، دەڵێ:

دورەی برنائیـت ای بـی‌خبـر / رفـت و نمانـد اثـری زان دگـر
پیریـت آیـد ز کمینگـه بـرون / مـی کُنـدت چـون مـن نـالان، زبـون
قامـت شمـشاد تـو را خـم کنـد / قـدرت و نیـروی تـو را کـم کنـد
راەشناسـان کـه گهـر سُـفتەانـد / «پیر ی و صـد عیـب» چنین گفتەانـد
وز پـس پیریـت بـود درد مـرگ / آه تـو را گـر نبـود سـاز و بـرگ

لە دوامین بەیتیشدا ئێژێ:

«احمـد» از ایـن حالـت پُرهـایهوی / دم مَـزن و قطـع کـن ایـن گفتگـوی

ئەمەش پارچەهەڵبەستێکی کوردی گۆرانی لە عەللامە شێخ ئەحمەد:

تەرزی خەزان دیم جـە فەسـڵ هـامن / بـە گرِسـوو چیـا بـەتـەرتر جـامن
واتم: ئـەی خـەزان یـە فەسـڵ تـۆ بی / ئی گرِەی ئاهر پـەی تـۆ جـە کـۆ بی
واتـش تـۆ حـاڵزان فەسـڵ خـەزانی / چ تەورەن بەی حاڵ هـەواڵ نـەزانی؟

---

١. بەرامبەرە بە ساڵی ١١٣٤.

هەر خەزان ڕەشتەی فەسڵ سوەیلەن ئەو بە خۆنازیش ئەندکی مەیلەن
بەو بدیەوە بیخ بەرگ و بالآمان من دڵسفتەنان ئاد بە شاد ئامان
ئەوە نەڕای دۆس بەرگڕێزەنان من بەرگ و بێخم پەی ئاد بێزەنان
هەوای شەوق دۆس، گەرمی ڕووی هەمن بێئیختیار سەند، ئیختیار جەمن
هەرکەس بێتاوەن جە شەوق ئازیز کەی قەرار دارۆ تا وەخت پاییز
مەولام! هەرکەسیو دەروون پڕ دەردەن جە گشت فەسڵیدا زایف و زەردەن

چەند بەیاز و جونگی دەسنووس.

## موحەممەد شەریفی بەرزنجی

عارفێکی سەربەست لە سەیدەکانی بەرزنجەیە کە پاش کۆچ کردن بۆ حیجاز، لە مەدینەی پیرۆز دانیشتووە و سەری کردۆتە خوێندنەوە و دەرس گوتنەوە و عیبادەت و ساڵی ١١٣٤ ک. م. کتێبێکی بە ناوی «*عُمدة الانسان لمعرفة تداخُل الشّیطان*» نووسیوە و هێندێک دوای ئەوە لە دنیا دەرچووە.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٣١٦.

## موحەممەد ئەفەندی ئامێدی

موحەممەد، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی عەبدوڕڕەحمان، خەڵکی ئامێدی بووە کە بۆ خوێندن شارێکی زۆری دیوە و خزمەتی مامۆستایانێکی زانا گەیوە و سەرەنجام لە دمشق نیشتەجێ بووە و هەر لەوێ لە ساڵی ١١٣٥ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە و لە زیارەتانی «بابالصغیر»یان ناشتووە.

موحەممەد ئەفەندی شاعیریش بووە و ئەم بەیتە سەرەتای یەک لە قەسیدەکانیە:

هَلْ لقَلْب قَدْ هامَ فیكَ غَراما راحَة مِنْ جناك تَشْفی السَّقاما؟

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٢٩.

## فائیز ئەفەندی

عەبدوڕڕەحیم فائیز ئەفەندی ناسراو بە «ئەسعەدزادە»، لە پشتی عەللامە شێخولیسلام موفتی ئەبوسسوعوود، پیاوێکی زانا و ئاگا بووە کە پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، لە شارانی ترک زمان، بۆتە مامۆستا و جاروبارەش دادوەری کردووە.

ئەسعەدزادە ساڵی ١١٣٨ ک. م. چووە بۆ قاهیرە و هەر لەوێ پاش مانگێ ـ دوو مانگ کۆچی یەکجاری کردووە.

لەم مامۆستایە چەند نووسراوە و دیوانێکی شیعر بەجێماوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٢٢.

## شێخ ئەلیاسی گۆرانی

عەللامە شێخ ئەلیاس، کوڕی شێخ ئیبراهیم، کوڕی داود، کوڕی خدری گۆرانی، لە زانایان و هەڵکەوتوانی چەرخی یازدە و دوازدەیە کە ساڵی ١٠٣١ ک. م. هاتۆتە دنیا[١] و دوای خوێندن، باری تەریقەتیشی گرتۆتەبەر و پاشان بۆ شام و میسر و حیجاز چووە و لە هەر شارێکیاندا ماوەیەک لایداوە و کەسانی وەک شێخ ئەحمەدی مەلوی و شێخ شەهابەدینی ڕامنینی بەهرەیان لێ بردووە و تەریقەتیان لێ وەرگرتووە. دوایی گەڕاوەتەوە دمشق و تێدا ماوەتەوە و سەرەنجام لە ڕۆژی چوارشەمبەی شازدەی شابانی ساڵی ١١٣٨ ک. م. لە قوتابخانەی «جامع‌العراس»دا ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە زیارەتانی«الصغیر»، لە پەنا مەرقەدی شێخ نەسری موقەدەسیدا نێژراوە.

**لە کتێبەکانی**: «*شرح‌الاستعاره*»، «*شرح‌الایساغوجی*»، پەراوێز بۆ «*جمع‌الجوامع*» لە ئوسوولی فیقهدا، شەرحێک لە «*عَوامِل*»ی جورجانی و شەرحی «*الفقةُالاکبر*»ی ئەبووحەنیفە.

*عجائب‌الاثار*، پەراوێزی *تاریخ‌الکامل*، ابن‌اثیر، چاپی میسر، ١٣٠١ ک. م. ب١، ل١٨٣. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٢٢٦.

## مەلا موحەممەدی کلوولانی

لە زانا گەورەکانی نیوەی چەرخی دوازدەیە کە لە قەڵاچوالان، ناوەندی حوکمەتی بابانییەکاندا ئەستۆگری دەرس‌گوتنەوە و فتوادان بووە و لەوێدا ناوی‌دەرکردووە. دواجار لەسەر داخوازی میری موکری، خاکی بابانی بەجێهێشتووە و بەرەو موکوریان چووە و لەوێ دەرس‌گوتنەوەی لەسەرڕا دەسپێکردووە.

کاتێ کە لەسەر فەرمانی نادرشای ئەفشار (١١٤٨-١١٦٠ ک. م.) کۆڕێک لە مامۆستایانی گەورەی شیعە و سوننە بۆ وت‌وویژ و پێک‌هاتن و کۆتایی هێنان بە بەربەرەکانێ دامەزراوە، مەلا موحەممەدی کلوولانی یەک لە زانا سونییەکانی ئەو کۆڕە بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٤٠.

## نوورموحەممەد ئەفەندی

کوڕی ئیسحاق ئەفەندی، مەشهوور بە «ئیسحاق‌زادە»، پیاوێکی هەڵکەوتە لە کوردانی باکوورە کە ماوەیەک بە دەرس‌گوتنەوە خەریک بووە و پاشان لە چەند شاری برووسە و ئەستەمبووڵ و مەککەی پیرۆزدا

١. لە «*هدیةالعارفین*»دا ساڵی ١٠٤٧ ک. م. نووسراوە.

دادوەری کردووە و سەرەنجام ساڵی ١١٤٢ ک. م. لە ئەستەمبووڵ دنیای بەجێهێشتووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٢١٧.

## خوسرەوی سنەیی

خوسرەو بەگی مونشیباشی[1]، کوڕی ئیسماعیلبەگ و لە پشتی خواجە شاوەیش[2]، نازناو «خوسرەو»، ویژەوانێکی زانا، شاعیرێکی توانا و مرۆیەکی ئاکارپەسند و لە نزیکانی میرانی ئەردەڵان بووە کە لە دەزگای خوسرەوخانی والی ئەردەڵاندا پلەی مونشیباشی لە ئەستۆ گرتووە.

خوسرەوبەگ ماوەیەک میرنشینی ئەردەڵانی بەجێهێشتووە و بۆ وڵاتی عوسمانی چووە؛ بەڵام دواجار گەڕاوەتەوە سنە و وەک مەستوورە خانم لە «*تاریخ اردلان*»دا دەڵێ، ساڵی ١١٤٢ ک. م. لە شەڕێکدا شەهید کراوە.

**چەند نموونە لە شیعری خوسرەو بەگ:**

بـر گـرد مـاه، هالـه ز عنبـر کـشیده‌ای　　خورشـید را میـان دو شـب جـای داده‌ای
هـر دم هـزار دل بـه نگـه صـید کـرده‌ای　　صـیادوار در پـی دلهـا فتـاده‌ای

* * *

گـردن تـسلیم در طـوق رضـا بایـد کـشید　　خویش را در زیـر فرمـان قـضا بایـد کـشید
نیـست داب عـاقلان، آلـوده‌ی دنیـا شـدن　　خویشتن را بر کنـار از ماسـوی بایـد کـشید

* * *

دنبال چشم شوخ وی آن خال مُشک‌رنگ　　بر تخت گُل نشسته بـه تمکـین شـاه زنـگ
عـالم پُـر ازشـهید شـود، هرگهـی بـه نـاز　　دلـدار مـن ز غمـزه بـر ابـرو نهـد خـدنگ
«خسرو» اگر چه هست سرآمد بـر اهـل نظـم　　در عشق دوست، مرکب ادراک اوست لنگ

*حدیقه‌ی امان‌اللهی*، ل٣٤٠. *تاریخ اردلان*، مستوره‌ی کُردستانی، ل٧٤.

## شێخ ئەبووتاهیر موحەممەدی گۆرانی

عەللامە شێخ ئەبووتاهیر موحەممەدی کوردی گۆرانی، کوڕی عەللامە شێخ ئیبراهیمی بورهانەدین[3]، کوڕی

---

١. خوسرەو بەگی موسەنیفی جەوهەریشمان هەیە کە لە ناوەڕاستەکانی چەرخی سێزدە و دەورانی خوسرەو خانی ناکام «دووەم»دا ژیاوە. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٣٨٥.

٢. خواجە شاوەیسی سووزی غەیبی؛ بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١١٠.

٣. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٢١٣.

حەسەن، کوڕی شەهابەدینی شارانی شارەزووری، لە مامۆستایانی بەناوبانگ و وەگێڕانی جێ بڕوای «*صِحاح سِتّه*»یە کە لە مەدینەی پیرۆز، لای بابی و زانایانی تر خوێندنی تەواو کردووە و هەر لەوێ ئەستۆگری دەرس‌گوتنەوە و فتوا دان بووە.

**لە کتێبەکانی**: «*مُنتَخَبُ کنزالمُعال فی سُنَنِ الاقوال*» لە پێنج بەرگدا و کورت‌کراوەی «*شرح شواهد الرضی*».

زا و مەرگی ئەم زانایە ساڵانی ١٠٨١ و ١١٤٥ ک. م. ڕووی‌داوە.

*مناقب احمدیّه و مقامات سعیدیّه*، سنندج، ل١٠٢ و ١٠٥. *الأعلام*، ب٦، ل١٩٥. *الانوار القُدسیّه*، ل٢٢٠. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٢٣١.

## حەسەنی بانەیی

حەسەن، کوڕی مووسا ـ کە «بانەوی» و «بانی»شیان پێ گوتووە ـ زانایەکی عارف و سۆفی‌مەشرەبی خەڵکی شاری بانە بووە کە دواجار بۆ دمشق کۆچی کردووە و هەر لەوێ، ساڵی ١١٤٨ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

**لە کتێبەکانی**: «*شرحُ‌الحکم*» لە عیرفاندا، «*شرحُ‌العوامل*» لە نەحودا، «*شرح مواقع‌النجوم لابن‌العربی*»، «*شرح رسالة الشّیخ ارسلان*» و پەراوێز بۆ «*عقاید قیروانی*».

*الأعلام*، ب٢، ل٢٣٩. *لُغت‌نامەی دهخدا*، پیتی ح، ل٥٨٤.

## ئەمیرئەحمەدی زەنگەنە[1]

ئەمیرئەحمەد لە سەرۆکە ناودارەکانی هۆزی زەنگەنەیە کە لە نیوەکانی چەرخی دوازدەدا ژیاوە و بێژگە لە باری جوامێری و گەڕناسی و مرۆدۆستی، پیاوێکی شیعرزان و وێژەوانیش بووە. ئەو شیعرەی خوارەوە، میرئەحمەد بۆ خزمێکی بەناوی موحەممەدئاغای زەنگەنە نووسیوە کە بریکاری بووە؛ بەڵام بە بۆنەیەکەوە دڵی ئێشاندووە و ئەویش تۆراوە و ڕووی لە ئێران ناوە. میرئەحمەد لەم شیعرانەدا پێڕای دڵدانەوەی، لێی داوا دەکا بگەڕێتەوە و لەسەرڕا بریکاری ببێتەوە:

هامسەران! خەیاڵ، هامسەران! خەیاڵ — خەیاڵ دامە ویر، ویر دامە خەیاڵ
دڵ‌بەردم وە بەحر مەوج ماڵاماڵ — بەراوەرد دانەی جەواهیر وەڵال
شکۆفەی چەمەن، شەفافەی گوڵان! — هام‌بەزم مەجلس نەغمەی بولبولان!
یە خەیلێ وەختەن نیەنی دیار — وە بێ‌تۆ تەختم بەیۆ یەختەسار

---

١. «**زەنگەنە**» لە هۆزە گەورە و کۆنەکانی کوردە کە لە بەشی دووهەم، تایبەت بە خوونکاران و ماڵەمیراندا بە وردی باسیان دەکەین و لە بەسەرهاتی میر ئەحمەدیش دەکۆڵینەوە؛ لێرەدا وەکوو شاعیرێک بۆی دەڕوانین.

وە بــێ تــۆ عــومرم نــەما لــە جیهــان
تەخت و بەخت و جام گشت و تـۆ ڕەوان
تــۆش وێنــەی جــام جیهــانبینــەنی
ڕەونــەق ئــاوەردەی ڕۆی زەمینــەنی
نــەواچی مــیرزام حــەرفێ نەواتــەن
بینــایی دیــدەم بــێتــۆ زوڵــماتەن
پــەی چــی دەلیلــێ نــەکیانای وەلام
وێم و ســوپام و ســامم فــدات بــام

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، بەغدا، ١٩٤٥ ز. ل١ تا ٥.

## شێخ زەکەریای تەختی

حاجی شێخ زەکەریای مەردۆخی، ناسناو «ئەبوویـەحیا»، کـوڕی مـەولانا ئیـبراهیم و خوشـکەزای شـێخی ئەجەل، شێخ موستەفای تەختی، لە پاکان و زانایانی بەناوبانگی بنەماڵەی مەردۆخییە کە ساڵـی ١١١٠ ک. م. لای شێخ موحەممەد کامیلی دمشقییەوە خوێندنی تەواو کردووە.

شێخ موحەممەد وسیم، پیتۆڵی خێڵی مەردۆخ لە هەیئەت و بیرکاریدا، بەشێ لە خوێندنی لـە خزمـەتی شێخ زەکەریادا بووە.

*تاریخچەی خاندان مردوخ*.

## عومەر ئەفەندی شارەزووری

لە زانایانی ناوچەی شارەزوور بووە کە پاش خوێندن بۆ ئەستەمبووڵ چووە و لـە یانـەی دادی ئەوێـدا کـاری کردووە و بەشوێنیدا ساڵی ١١٤٤ لە «سلانیک» و چەند ساڵ لە «ئەدرنە» دادوەر بووە و ساڵـی ١١٥٠ کـۆچی دوایی کردووە.

عومەر ئەفەندی لە شاعیری و وێژەوانیشدا سەری دەرچووە و بە هۆی بـیری تیژیـەوە، زۆرێـک شـیعری فارسی و عەرەبی لەبەر بووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زکی‌بیگ، ب٢، ل٩٥.

## ئیبراهیمی حەیدەری ماوەرانی

عەللامە ئیبراهیم، کوڕی حەیدەری دووهەم، کوڕی ئەحمەدی حـەریری، لـە بنەماڵـەی حەیدەرییـەکانی ماوەرانــە کــە پــاش عومرێــک تۆژینــەوە و نووســین و بەهرەگەیانــدن، ساڵــی ١١٥٠ ک. م. دنیــای بەجێهێشتووە.

**لە کتێبـەکانی**: «*الرِّسالة القُدسيّة الطاهرة بشَرح الدُّرَّة الفاخرة*» و شــەرحێکی قەســیدەی مەشــهووری «*بانَـت سُعاد*»، کە ساڵی ١١١١ نووسیویە.

*ذیـــل کـــشف الظّنـــون*، ب ١، ل ٥٦٧. *فهـــرس مَخطوطات دار الکتب الظّاهریّه، قسم الشعر*، ل ٢٦٠.

## زیوەری گەڕووسی

خاتوو زیوەری گەڕووسی، سەرناو «زیبُ‌النِّساء» لە خانزادەکانی «عەلی‌شوکر»ە کە ئێستا گەڕووسی پێ ئێـژن. ئەم خاتوونە شاعیرە بەتایبەت لە غەزەل دانان و فڕ کردندا دەستێکی بالای هەبووە؛ شیعری زۆری گوتووە و کەمی ماوە. ئەم سێ بەیتە هی ئەوە:

دور باد از تـن، سَـری کـارایش داری نـشد　　　کُور به چشمی که لذّت‌بین دیـداری نـشد
حَیف از عمامه‌ی زاهد که با صد و پیچ و تاب　　　رشـته‌ی تزویـر گـشت و تـار زنـاری نـشد
در دیـار دوسـتی بـی‌قـدری «زیـور» ببـین　　　پیر شـد «زیـب‌النسا» او را خریـداری نـشد

زیوەر لە نیوەی چەرخی دوازدەی کۆچیدا ژیاوە.

*خیراتُ حِسان*، ب ٢، ل ٤٩.

## حامیدی پاڵۆیی

ئەحمەد، کوڕی عەبدولفەتاح، نازناو «حامد»، خەڵکی پاڵۆی لای دیاربەکر، زانایەک بووە کە ساڵی ١١٥٢ ک. م. لە دنیا چووە و هێندێک کتێب و نووسراوەی بەجێ هێشتووە؛ یەکیان بە ناوی: «*زُبدةالعرفـان فـی وجـوُه القُرآن*» چاپ کراوە.

*هدیةالعارفین*، ب ١، ل ١٧٢.

## مەلا وەلەدخانی گۆران

مەلا وەلەدخان شاعیرێکی توانا و زانایایە کە هەڵبەست و هۆنراوەی زۆری بە زاری گۆرانی لێ بـەجێ‌مـاوە؛ وەکـوو: «*شیرین و فەرهاد*» و «*نادر و تۆپ‌ئاڵ*» کە دەستەڵاتی هەم لە شیعری ئەوینی و هەم لە شیعری پاڵەوانیدا دەردەخا.

مێژووی هۆنینەوەی *شیرین و فەرهادە*کەی بەرامبەرە بە ساڵی ١١٥٠ ک. م. وەک خۆی دەڵێ:

«غ» و «ق» و «ن» جـــەم کـــەر وە حیـــساب　　　لێـش مەبۆ ڕۆشـن چون قـورس ئافتـــاب[1]

**بەشێک لەو شیرین و فەرهادە:**

فەرهاد وەی بەرگ خـوونین رەختـەوە　　　دەم نیـــا نـــە جـــای زام ســـەختەوە

---

١. بە حیسابی ئەبجەد، سەرجەمی سێ پیتی غ، ق، ن، دەبێتە ١١٥٠.

شیرین کە ئاما، دی فەرهاد وەی ڕەنگ
ساتێ تەواسا بی وەنەقش سەنگ
دەم نیا نەزام فولەنگ تیشەوە
ڕۆی فەرهاد مالا وەڕووی ویشەوە
یەک سیاخاڵێ نەڕووی غەبغەو داشت
شێوەی دانەی لاڵ باهووی خەسرەو داشت
دەس‌برد پەری زنج زەنەخدان زەرد
هۆرش کەند جە بیخ فیرووزەی بێ‌گەرد
واتش ئەر زینەت جام جەمینەن
ئەی خاڵە هوونی شازادەی چینەن
سەرت هۆرداره ئەمن شیرینم
وە سەودای زامت دڵ‌ئاگرینم
جە دمای فەرهاد وەی چنین حاڵم
کێ زانۆ قیمەت خالان لاڵم؟
پەرێ کێ بدەم تەرتیب خالان
کێ پێم بپۆشۆ بەرگ عەبدالان
من کە فەرهاد دیم نەگێژاو خوون
خەسرەوم بەتوون، تەخت و بەخت بەتوون
بەی تەور پەی فەرهاد شین و زاری کەرد
دەرد و مەینەتش جەدڵ کاری کەرد
پرشنگ هوونا و سورخ خاسە ڕەنگ
سەرازێر وەبان لێمووی زەڕد ڕەنگ
یەقەی بەقیەدۆز پارەپارە کەرد
بە مەقەس ناخون جەبین پارە کەرد
واتش هەی غەریب! بێ‌خویش و بێ‌فەرد
شازادەی مەحبووب، مینای دڵ بێ‌گەرد!
ئەرێ نەتیجەی خاقان چینی!
پەی چی سەرتاپا ڕەنگ بەستەی هوینی
بێ‌ناو و نیشان! خەڵتان خوونم!
وە بێ‌کەس مەردەی پای بیستوونم!
فیدای نامت بام دڵدار دیرین
وێت نیای نەڕای شووم بەخت شین
شازادەی چینم! بیدادم پەی تۆ
سەد گیان شیرین وە قوربانت بۆ
یەکام کافر بی دام نەراگەت کەند؟
یە پەی چی کارت وە نیمەچڵ مەند؟
مەر تۆ نەزانای خەسرەو بە ئەفسوون
هانە قەسد تۆ کەرۆت سەرنگوون
مەرگ پەی من خاسەن هاوڕاز دەردم
وانە زێد وێت ئاوارەت کەردم
تۆ پەی من نە تەخت شایی ویەردی
تۆ پەی من ڕاگەی بیستوون کەردی
یە شەرت من بێ چەنی تۆ فەرهاد
چەنی دمای تۆ نەنیشووم وەشاد
شەرت بۆ ڕەخت وێم پارە پلاس کەم
شەرت بۆ وێم بە تیخ ئەڵماس خەلاس

بۆ ناساندنی شیرین، ئاوای پێدا هەڵدەڵێ:

شیرین قەرار داد، شیرین قەرار داد
شیرین ئەساسەی سەروێن قەرار داد
دەستەی زولف دێز دەیجووری شەوڕەنگ
تاکێش پرپیچ سەرمەدای چڵ‌چەنگ
سیا سەراوێز، چین‌وەردەی چەمەر
چین دا نەدەوران دایرەی قەمەر
دەس بەرد عەرقچین تورمەی تاقیزەر
قەرار دا نە فەوق فەرق بۆرچین‌پەر

کەچی ئەگریجان، حەلقەی عەقرەبچەم
برِشتدا وە نیش سەر مەودای دوودەم
پرپاچ پایپرچ پای عەرقچین کەرد
نە پای عەرەقچین پرچ وەپەرچین کەرد
کۆرپە ئەگریجان چەتر تاووس دەم
مەر نەرمی پاپەر سەرسەوزان چەم
لوولەن، پەشێوەن وە جەبینەوە
نەخشەن وە پای چین عەرەقچینەوە
پەشێوەن وە ڕووی سیمای لاڵەوە
تەفرەقەن وە پێچ پای دەسماڵەوە

**دیسان شیعرێکی مەلا وەلەد خان:**

بەدەن سیم ساف سەدەفڕەنگ چوون بەت
سفیدتەر نە پەڕ بەتان سەر شەت
دەستەی شاماران، سیای حەنایی
چینوەردەی پای خاڵ گەردەن ڕەعنایی
سەراوێز وەپای کەکولای کەچدا
شێوەی لوول قەزح قازاخی پێچدا
سەیر ورشەی نەقش وەنەوشەخالان
شەونم پەروەردەی گۆنای نەوهالان
تەماشای ئالای دوگمەی دورنەدەم
زڕەی دەسبازی قوفڵ یەخە و مەم
«مەلا» تەجرەبەی خاڵ لەیلش بی
مەجنوون بەرنشین کۆی دوجەیلش بی

لە جونگێکی دەسنووس.

## خواجە سادقی ئەردەڵانی

خواجە سادق شاعیرێکی بەرزی شاری سنە و لە سەرقەڵەمان و نزیکانی میرنشینی ئەردەڵان بووە کە بەداخەوە بۆخۆی شیعرەکانی کۆ نەکردۆتەوە و بەو بۆنەوە زۆربەی فەوتاون کەمی لێ ماون.

**ئەمە چەند نموونە لەوانەی دەسم کەوتوون:**

چشم تو به ناحق ریخت خون دل زار من
از زلف تو برهم خورد سررشتەی کار من
از بسکه به دل دارم داغ غم روی تو
جز لاله نمی‌روید از خاك مَزار من
رُخسارەی زرد من گُل گُل شده است از اشک
بنگر رخ زرد من، وین نقش و نگار من
خون می‌خورم و در دل، غمهای تو جمع آرم
این است ز عشق تو کار من و بار من
چون داد خداوندت خوبی و توانایی
رحمی به گدا می کُن ای شاهسوار من
تر دامَنم ار گویند مردم، نه عجب باشد
از اشک بود دایم طفلی به کنار من
«صادق» نَکشد خاطر سوی گُل و گُلزارم
خار سر کوی او باغ است و بهار من

* * *

نمود طرف بُناگوش کاخر سَحَر است این
ز پرده سر به در آورد، هان طلوع خور است این
ز بهر دیده دوا خواستم، به ناز همی کرد
به خاك پاش اشارت که سُرمەی بصر است این

مَبین حقیر به چشم اشک ارغوانی ما را / به راهت از نظر افتاده، پارەی جگر است این
نهال قَد تو پروردەام به خون دو دیده / ندیده حاصلی از آن و نَخل بی‌ثمر است این
فتاده «صادق» دلخسته سخت در دل بستر / مَحَبّتی کُن و پایی بنه که مُحْتَضَر است این

* * *

هر که آمد گُل ز باغ زندگانی چید و رفت / آمد و بر سُستی اهل جهان خندید و رفت
از اَزَل «صادق» به دنیا میل آمیزش نداشت / چند روزی آمد و یاران خود را دید و رفت

تێهەڵکێشی شیعرێکی حافیز بەشێوەی پێنجباڵ (تَخمیس):

بازم از عشق فتاده است به سر سودایی / رهزن دین و دلم گشته بُت ترسایی
هست با بادەفروشم همەدَم غوغایی / «در همه دیر مغان نیست چو من شیدایی»
«خرقه جایی گرو باده و دفتر جایی»

جان من عاشقی و عشق به بازی مشمر / بایدت خورد بسی خون دل و لخت جگر
با لب خُشک من غمزده هر شام و سحر / «جویها بستەام از دیده به دامان که مگر»
«در کنارم بنشانند سهی بالایی»

ای خوشا آن که در این میکده یاری دارد / با وفادار بُتی قول و قراری دارد
در نهانخانەی دل عشق نگاری دارد / «دل که آیینەی صافی‌است غُباری دارد»
«از خُدا می‌طلبم صحبت روشن رایی»

روز اوّل نظرم بود بر آن نرگس مست / داد پیمانه و پیمان وفا با من بست
من همان بیخودم از نشئەی آن جام اَلَسْت / «سخن غیر مگو با مَن معشوقه‌پرست»
«کَز می و جام مَیَم نیست به کس پروایی»

بود درمجمع اَرباب صفا گفت و شنفت / بَحث می‌رفت ز تحقیق در اسرار نفهت
همه شب هر کسی از حالت خود دُر می‌سُفت / «این حَدیثم چه خوش آمد که سحرگه می‌گفت»
« بر در میکده‌ای با دَف و نَی ترسایی»

«صادق» ار چند که آرایش ظاهر دارد / گر کسی دیده بر اعمال بَدَش بگمارد،
دانم این بیت پسندیده به خاطر آرد / «گر مسلمانی این است که حافظ دارد»
«آه اگر از پی امروز بود فردایی»

خواجه سادق تا نیوەکانی چەرخی دوازدە ژیاوە.

*حدیقەی امان‌اللهی*، ل٣٩٨ و ٣٩٩. *مجمَع‌الفُصحا*، ب٢، ل٣١٦. و چەند جونگی دەسنووس.

## ئەڵماس خانی کەنووڵەیی

سەرهەنگ ئەڵماس خان خەڵکی گوندی کەنووڵەی لای کرماشان، لە دەورانی دەسەڵاتی نادرشای ئەفشار (١١٤٨-١١٦٠ ک. م.)دا ژیاوە و یەک لە ئەفسەرانی هێژا، لێهاتوو، جوامێر و ئەمینی دەزگای والی ئەردەڵان بووە.

لە شەڕێکدا کە لە نێوان سپای نادر و لەشکری عوسمانی، لەسەر بەغدا و لە زێواری دەجلە و نزیک بە شاری سامەڕەوە قەوماوە، هێزی پێشەنگی نادر، شەڕوانانی ئوردووی ئەردەڵان بوون کە سەرهەنگ ئەڵماس خان سەرپەلیی کردوون. سەرهەنگ و چەکدارانی لەم شەڕەدا کوردانە بەشەڕ هاتوون و ڕێگەی پێشڕەوی ئەرتەشی نادریان بۆ ئاوالا کردوون. بەڵام پاش گرتنی بەغدا و کوژانەوەی ئاوری شەڕ، ئەڵماس خان بە بۆنەیەکەوە دڵی لە خانی ئەردەڵان ئێشاوە و ڕێگای کەنووڵەی گرتۆتە بەر و بە شوێن ئەوەدا، تا کۆتایی ژیانی گردەنشین بووە.

ئەڵماس خان ئەگەرچی پیاوی شەڕ و مەیدانی پێکدادان بووە، هەرکاتێک دەرفەتێکی دەسکەوتووە، دەستی بۆ کتێب و دەفتەر و قەڵەم بردووە و بە خوێندن و شیعر گوتن و داستان نووسینەوە ڕایبواردووە.

لە بەرهەمەکانی ئەڵماس خان «*خورشید و خەرامان*»، «*حەفت لەشکەر*» و «*نادرنامە*»یان ناو بردووە کە هەرسێکیان بە زبانی کوردی گۆرانی هۆنراونەتەوە.

ئەڵماس خان منداڵ و زاروزێچێکی نەبووە و بە سەڵتی لە کەنووڵە کۆچی دوایی کردووە.ساڵی هاتنە دنیا و لە دنیا دەرچوونیشی نەنووسراوە؛ بەڵام کە دەورانی نادرشا دەزانین و هەروەها دەزانین کە لەگەل شاعیرێکی تری کورد، میرزا شەفیعی دینەوەریدا، ئامۆشۆ و شیعرگۆڕینەوەیان هەبووە، دەردەکەوێ کە لە نیوەکانی چەرخی دوازدەدا ژیاوە.

**ئەوا شیعرێکی ئەڵماس خان کە بۆ میرزا شەفیعی نووسیوە:**

میرزام! شادەنی، میرزام! شادەنی — میرزام شاد بە تۆ، خاتر شادەنی
سەید سارا و کۆ سەر ئازادەنی — خاتر بێ ئازار، خەم وە بادەنی
نەک چون مـن پابەست بەند بەڵانی — مورغئاسای قەقنەس قەهر قەڵانی
چیش واچوون میرزام جە وەسواسەی دەرد — سەوداییم جە دەس هەناسان سەرد
سمکۆی سیاست سامانم سا کەرد — گەڵای خەزانم باد سەبا بەرد
میرزام! شاد بە تۆ، شادیت نە بەختەن — ئەڵماس ئالوودەی عەزاب سەختەن

ڕۆژنامەی *کوردستان*، تاران.

## شێخ عەبدوڵڵای ڕێتکی

شێخ عەبدوڵڵای مودەڕڕیس، ساڵی ١٠٦٠ لە گوندی ڕێتک لە کوردستانی باشوور، لە دەرکی دنیا هاتۆتە ژوور و ١١٥٩ ک. م. لە دەروازەکەی چۆتە دەر. شێخ لەگەڵ زانابیدا، شاعیریش بووە و هێندێک قەسیدە و

غەزەلی عەرەبی لێ بەجێماوە. کتێبیشی لە فیقهـ و ئوسوولدا نووسیوە؛ یەکیان بهناوی: «*نهج المَنهَج*»، لـە فیقهی ئیمام شافیعیدایە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زکی‌بیگ، ب٢، ل٤١.

## مەنووچیهری کەولیوەند

مەلا مەنووچیهر یان مەنووچەرخان، لە تایفەی کولیوەندی سەربە ئەلشتەری لوڕستان، پیاوێکی زانا و خۆش زەوق بووە و لە بەرگی دەروێشدا ژیاوە و بە فارسی و کەڵـهوڕی شـیعری دانـاوە. ئەمـەش نموونەیـەک لـە شیعرەکانی کە لەمەڕ کاول بوونەوەی شوێنێک بە ناوی «دەرٍەشەهر»ەوە گوتوویە:

یــە ڕۆژێ مــەغمووم ژ کــردار دەهــر	ڕام کەت ئـەو مـەخرووب جاگـەی «دەرەشـەهر»
بــازاڕش ژ بــەزم خاســان تــوهی دیم	خـالی جـای شـیران، سـەر سـوهی دیم
جوز ئاواز جوغد، شـەهرش خـامۆش دیم	نە زەرڕین‌باف بی، نـە زەرڕیـن‌پـۆش دیم
نـە وەعـز واعیـز، نـە دەرس، نـە مینبـەر	نــــە بانـــــگ تـــــەکبیر «اللهُاَکــــبر»
نە میر، نە سەریر، نـە سـەر، نـە سـەروەر	نــە سپەســالار، نــە ســپا و لەشــکەر
نــە تــاجِ گەوهــەر، نــە تــەخت زەڕ دیم	قەســر و شانــشین بی‌زیــب و فــەڕ دیم
نــە ســەف پــەنابی، نــە ســان هــەر ڕووژ	نــە مــیر شــکار بی، نــە بـاز و نــە یــووز
نــە ســەدای قەهقــەهە بادەنۆشــان دیم	نــە ســەروقامەتان، ئەتـڵەس‌پۆشـان دیم
نــە مەیخانــە بی، نــە مــوتیرب، نــە ســاز	نــە مــەهتەلعــەتان، ســاقی خــوەش‌ئـاواز

مەلا مەنووچیهر تا ناوەندەکانی چەرخی دوازدە ژیاوە.

*جُغرافیای تاریخی و تاریخ لُرستان*، علی محمد ساکی، خرّم‌آباد، ١٣٤٣ ک.هـ. ل٦٦. جونگێکی دەسنووس.

## شەریفی جۆڵەمێرگی

شەریف‌خان لە نێوان ساڵانی ١١٠٤ تا ١١٦١ ک. م. ژیاوە و بە پشت دەگاتەوە بنەماڵەی میرانی بـدلیس و شیعری بە کوردی و فارسی گوتووە کە زۆربەیان غەزەل و ئەویندارین.

*خلاصةالکُرد و الاکراد*، ل٣٥٦.

## مەجدەدینی مەردۆخی

عارف و پارسای زانا، کوڕی شێخ ئەبووبەکر، کوڕی شێخ موستەفا تەختی مەردۆخی، لەو شێوە کەسانە بـووە

که بەختەوەری خۆی لە دوورەپەرێزی و خۆ لەخەڵک پارێزیدا بینیوە و بۆ ڕزگاری تەواو و کرانەوەی بەرچاو و دامەزرانی بەندایەتییەکەی، سووچێکی گرتووە و کارێکی بە کاری کەسەوە نەبووە و سەری لە سوژدە نـاوە و دەستی لە دنیا بەرداوە و سەرەنجامساڵی ١١٦٣ ک. م. ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە گونـدی تەختـە نێژراوە.

بۆ میژووی مەرگی شێخ گوتوویانە:

«رفیق گُل‌های بهشت»[١]     دنیـای فـانی را بهِـشـت

*تاریخچەی خاندان مشایخ تخته.*

## عەبدوڵڵای «أصَم»ی ئەربیلی

زانایەکی ویژەوان و شاعیر، خەڵکی شاری هـەولێر بـووە کـە لـە چـەرخی دوازدەدا ژیـاوە و دیـوانێکی لـێ بەجێماوە. عەبدوڵڵا کاری کردووە و لە ڕەنجی شـانی خـۆی ڕایبـواردووە و بـاقی کـاتی بـە خوێندنـەوە و دەرس‌گوتنەوە گوزەراندووە.

*مَشاهیرالکُرد*، امین زکی‌بیگ، ب٢، ل٤٦.

## عەلی ئامیدی

عەلی، کوڕی سەید موحەممەدی شافیعی ئامیدی، مامۆستای قوتابخانەی ئەحمەدییەی شاری قاهیرە بووە کە دواجار بەرەو حیجاز چووە لە شاری مەککەی پیرۆزدا لانشینی هەڵبژاردووە و هەر لـەوێ ساڵـی ١١٦٦ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

**لە کتێبەکانی**: شەرحێک لەسەر «*الدّوْرُالاعلی*»ی شێخ مەحیەدینی ئیبنولعەرەبی.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٧٦٨.

## ئەبووتەییبی گۆرانی[٢]

ئەبووتەییب موحـەممـەد، کـوڕی ئەبولحەسـەن عیـسا،کوڕی ئـەبولعیرفان بورهانـەدین ئیـبراهیم، کـوڕی حەسەنی حوسەینی گۆرانی شافیعی مەدەنی، کوردێکی نیشتەجێی دمـشق و لـە زانایـان و مامۆسـتایانی ناودارای ئەوێ بووە کە ساڵانێکی زۆر دەرسی گوتووە و کتێبی نووسیوە و ساڵی ١١٦٧ ک. م. لە دنیا چووە.

---

١. بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ١١٦٣.

٢. دەبێتە برازای ئەبووتاهیر موحەممەدی کوردی، کە پێشتر باسمان کرد.

**لە نووسراوەکانی**: «*اَعلامُ التَّحقیق و اِعلامُ الجاهلِ و الزَّندیق بِمَراتبِ النَّبیِّ الصدّیق*» کە ساڵی ١١٦٣ نووسیویە.

*هدیة العارفین*، ب٢، ل٣٢٩ . *ذیل کشف الظّنون*، ب١، ل١٠٢.

## مستەفا شێخولئیسلام

مەلا موستەفا، کوڕی مەلا عەبدولکەریمی قازی، کوڕی مەلا موستەفا، کوڕی مەلا یەعقووبی قازی حەسەن‌ئاباد، لە زانایانی بەناوبانگی بنەماڵەیەکی گەورەی شاری سنەیە کە لە ساڵی ١١٦٠ ک. م. پلەی شێخولیسلامی پێ دراوە و خوا لێخۆشبوو مەلا هادی گەورە ـکە ئەویش هەر لەم بنەماڵە بووە ـ ئەم سێ بەیتەی بۆ پیرۆزبایی پێدا گوتووە:

گشت چون شرع شریف از مصطفی | باز و بُطلان گشت از حُکمش ضعیف
شد مَرَمَّت رخنەی بنیان عدل | گشت بار ظُلم از او یکسر خفیف
زین مُناسب‌تر چە اُفتد در جهان | قاضی و تاریخ او «شرع شریف»[1]

مەلا موستەفا حەوت ساڵ پاش ئەم خەلاتە (ساڵی ١١٦٧) شەهید کراوە.

*تاریخ مردوخ*.

## موحەممەدی عیمادی

کوڕی ئەحمەد، لە زانایان و مامۆستایانی شاری ئامێدی دێتە ئەژمار کە لە دەورانی دەسەڵاتداری سوڵتان ئەحمەد خانی سێهەمی عوسمانی (١١١٥-١١٤٩ ک. م.)دا ژیاوە و لە یەک ـ دوو شاری ترکدا دەرسی گووتووە و هێندێک نووسراوەشی هەبووە؛ بۆ وێنە: «*عُمدة العاملین لمرضاة ربّ العالمین*»، «*کواکبُ الانوارِ الاحمَدیّه فی اسرارِ المُعجِزات المُحَمَّدیّه*» بە زبانی عەرەبی.

*مَشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٣٠.

## شێخ حەسەنی مەولاناوا

«مەولاناوا» یان «مەولائاوا» گوندێکی ناوچەی خوڕخوڕەیە، سەر بە شاری سەقز. ناوی ئەم دێیە، بە بۆنەی لێ هەڵکەوتنی کەسانێکی بەناوبانگەوە، بۆ زۆرێک ناسراوە.

سەرباشقەی ئەو ناودارانە، عارفی زانا و دڵ‌ئاگا، شێخ حەسەنە کە زۆربەی کات و ساتی بە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە و عیبادەت کردن ڕابواردووە و بە بۆنەی خواناسی و پارێزکاری و هەروەها زانایی و ئاگاییەوە،

١. بەرامبەرە بە ساڵی ١١٦٠ ک. م.

لە لای خەڵک وەج و ڕێزێکی یەکجاری هەبووە و وەک دەڵێن بۆ ڕیازت کێشان و بڕستی برسیەتی هێنان، کەمتر لفی هەڵکەوتووە.

کتێبی «*تاریخ مردوخ*» دەڵێ: «شێخ حەسەن مامۆستای مەولانا گوشایش (٧٩٠-٨٧٣ ک. م.) بووە». بەپێی ئەوە دەبێ شێخ لە نێوان چەرخی هەشت و نۆدا ژیابێ؛ بەڵام هێندێک شوێن و نیشانە، هەڵە بوونی ئەوقسانەمان بۆ دەردەخەن:

یەکەم ئەوەی کە هەر ئێستا لە مەولاناوادا قورئانێک هەیە بە خەتی مەلا ڕەسوول ناوێکی کاتیب، کە وەرگەڕاوە و تەفسیریشی لەگەڵە. لە پەراوێزی ئەم قورئانەدا مۆرێکی چوارگۆش چەسپاوە کە ناوی «شیخ حسن» و لە ژێریدا «١١٣٥هجری» دەخوێنرێتەوە. لە ئاخریشیەوە، دو بەیت شیعر نووسراوە کە دەڵێ: «لا» نگویم جوابِ «ختمِ حَسَن». واتا «ختم حسن» کە بە حیسابی ئەبجەد دەبێتە ١١٥٨، ئەگەر «لا=٣١»ی لێ لابەین، دەکاتە ١١٢٧؛ کە ساڵی کۆچی ـ مانگی دوایی هاتنی نووسینەوەی ئەو قورئانەیە. هەروەها لە پەراوێزی ئەم قورئانە بەنرخەدا جاروبارە خودی شێخ حەسەنیش نووسیویە و لە ئاخرەوە وشەی «ویم»، واتا «خۆم»ی لێ زیاد کردووە.

خاڵی ئاخر ئەوەیە کە نادرشای ئەفشار لە کاتی تێپەڕین بە کوردستاندا ـ کە ساڵی ١١٤٧ ک. م.[1] بووە ـ بۆ مەولاناوا دەڕوا و خزمەتی شێخ حەسەن دەگا و کەسایەتی شێخ، زۆری لەسەر کار دەکا و بەو هۆیەوە گوند و ئابادی ناوچەی خورخورە دەکاتە وەقفی خانەقای مەولاناوا و وەک دابی ئەو ڕۆژگارە بووە، گۆچانێکی جواهیر نیشان و سفرەیەکی چەرمی، وەکوو پێشکەشی، بە شێخ دەدا. ئێستاش ئەو سفرە ـ کە سفرەی نادرشاهی پێ دەڵێن ـ لە پەنا قورئانەکە، ماوەتەوە؛ بەڵام گۆچانەکەیان بردۆتە ئابادی «بست»؛ کە مەرقەدی شێخ ئیبراهیم، مامی شێخ حەسەنی لێیە.

کەوابوو دەبێ شێخ حەسەن لە چەرخی ١١ و ١٢ دا ژیابێ، نەک ٧ و ٨.

شێخ شیعریشی گوتووە؛ بەڵام بەداخەوە جگە لە دوو ـ سێ بەندی تێهەڵکێشێک نەبێ، هێچم دەست نەکەوت. ئەویش لەبەر بێسەوادی ڕوونووسەکەی پڕ ببوو لە هەڵە و پەڵە. هەرچۆنێک بێ، ئەوا ئەم بەندەی کە دیسان چاترە:

تا بر کمر آن زلف چلیپای تو پیوست      عاشق خم زنّار اطاعت به کمر بست
تاب سر زُلفین تو دامی است که هرکس      در حلقەی آن بند شد آنجا ز خطر رست
تیر مژەات جان کسی را چو هدف ساخت      پیش از زدن از شوق تو از روزن تن جَست
تیمار کن این دل‌شده، بیمار غمت را      ز آبی که خضر گر بچشد مست شود مست

١. نادر لە ١٨ی مانگی سەفەری ساڵی ١١٤٧دا گەیشتۆتە شاری سنە.

تُربَتگه مـن سـاز قَـدمگاه پـس از مـرگ | کاخْیا شده، در دامن لطف تو زنم دست
تشبیه تو با حُور و پری سخت محـال اسـت | کز جان به جهان گر نگری فَرق جَلی هست
تا گـشت زمـین از فَـر رُخـسار تـو تابـان | بـازار مـه چـرخ بـرین بـر زده بشکـست

قەولێک وایە کە شێخ حەسەن قەت ژنی نەخواستووە و شێخانی مەولاناوا و خوڕخوڕە، زاروزێچـی شـێخ حەیدەری برای شێخ حەسەنن. قەولێکیش شێخ حەسەن بە باپیرەگەورەی ئەم بنەماڵە دەزانن.

یاداشتی مامۆستا عەلی ڕوخزادی. *تاریخ مردوخ*. چەند جونگی دەسنووس.

## شێخ جەمالەدینی مەردۆخی (یەکەم)

کوڕی شێخ عەبدولموئمینی یەکەمی سنەیی، مامۆستایەکی شارەزا لە فیقهـ و حەدیس و وێژەی عەرەبـدا بووە و ئیمامەتی جومعەی شاری سنەی کردووە.

زا و مەرگی شێخ جەمالەدین ساڵانی ١١٠٨ و ١١٦٩ ک. م. ڕوویداوە.

*تاریخ مردوخ*.

## شێخ موحەممەد وەسیمی مەردۆخی (یەکەم)

زانای بێ هاوتا، شێخ موحەممەد وسیم، ناسراو بە «عەللامەی قەڵاچوالان»، کوڕی عەللامـە شـێخ ئەحمـەد، کوڕی شێخ موستەفای تەختی مەردۆخی، لە مامۆستا بەناوبانگەکانی چەرخی دوازدەیـە کـە ساڵـی ١١١٨ ک. م. لە گوندی تەختە هاتۆتە دنیـا و وانـە سـەرەتاییەکانی لای حـاجی شـێخ زەکـەریا، کـوڕی مـەولانا ئیبراهیمی تەختەییەوە خوێندووە و پاشان بۆ درێـژەدان بـە دەرس و دەور، بـەرەو وڵاتی غـەریب چـووە و ماوەیەک لـە شـاری مووسـڵ لای سـەید یـەحیا، کـوڕی سـەید فـەخرەدینی حوسـەینی، مەشـهوور بـە «قەرەموفتی» و زانایانی تری ئەوشارە خوێندوویە و ئـەوجار ڕووی لـە بەغـدا نـاوە و لـە مامۆسـتایانی زانـای ئەوێش بەهرەی بردووە و دوای وەرگرتنی ئیجازە، گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و دەرسیگوتۆتەوە و خەڵکی بـە داب و دەستووری ئایینی ڕاهێناناوە.

شێخ لە بەشی دوایی ژیانیدا چووە بۆ کوردستانی باشوور لە قەڵاچوالان ـکە ئەو دەم ناوەنـدی میرایـەتی بووەـ و لەوێ دانیشتووە و بەم بۆنەوە «عەللامەی قەڵاچوالان»یان پێ گوتووە.

شێخ وەسیم بە زمانی کوردی (گۆرانی) و فارسی و عەرەبی، بە شێعر و پەخـشان، کتێـب و نووسـراوەی زۆری هەبووە؛ لێرەدا هێندێکیان ناو دەبەین:

١. هۆنراوەیەکی فارسی لەمەڕ «*اُسطُرلاب یَمینی و شمالی*» و شێوەی کارکردنی
٢. نامیلکەیەک لە بارەی ساتی نوێژی دوایනیوەڕۆ و کاتی فەوتانی و دۆزینەوەی قیبلە

٣. هەڵبەستێکی فارسی، لە هەیئەتدا

٤. «*شرح اوراذُالقُصیری*» بە عەرەبی

٥. «*مُصطلَحاتُ علم العروض*»

٦. هۆنراوەیەکی گۆرانی، لەمەڕ ساڵی کەبیسەوە

٧. هەڵبەستێک بە کوردی گۆرانی لە بەیاندا

٨. هۆنراوەیەکی فارسی لە بەیاندا

٩. نامیلکەیەکی فارسی بە ناوی «*کُرەی چَغْمینی*»

١٠. نامیلکەیەک بە عەرەبی، بە ناوی «*بیان افضل الصلوات و السلام*»

١١. ژیانی پێغەمبەری ئیسلام (د)، بە کوردی

١٢. هەڵبەستێکی کوردی بریتی لە ئامۆژگاری

١٣. هۆنراوەیەک لە مەڕ حیساب و داب و دەستووریەوە، بە کوردی

١٤. «*شمایل حضرت رسول*»، بە شیعری کوردی

١٥. هۆنراوەیەک لە بارەی ناوی ئەسحابی شەڕی بەدرەوە، بە کوردی

١٦. دو هەڵبەستی کوردی و فارسی لە بارەی سوورەتە مەککی و مەدەنییەکانی قورئانی پیرۆزەوە.

١٧. هۆنراوەیەکی کوردی گۆرانی، لە تەجویددا

١٨. هەڵبەستێک لە حیکمەت و کەلامدا، بە فارسی

١٩. هەڵبەستێک لە مەنتیقدا، بە عەرەبی

٢٠. هۆنراوەیەک لەمەڕ شێوە خەتی نەسخ و نەستەعلیق و ڕێسای نووسینیانەوە

٢١. هەڵبەستێک لە سەرف و نەحودا بە کوردی

٢٢. «*مجموعه فی الادعّیه المأثوره*» و ...

شیعرێکی عەرەبی شێخ وەسیم لە بارەی قیبلە و قوتبنوێنەوە:

انْ کُنْــتَ تَــرُومُ قبْلَـــةً یــا وَلَـــدی    فــادْر مَـعَ الأنْحــراف سَـمْتَ البَلَـد
وَ الإبْــرةُ هــذه تُــری القُطْـبَ لَنــا    قَـدْ سُـمِّیَ ذا، قُطْـبنمـا، فاجْتَهـد
فــالابْرةُ حــاذ خَـطاً نــصفالنهــر    ضــعْ فــالمُری لمثْـل مــا بالجلــد
عَــنْ نُقْطَـــة شَــمْأل، وَ الا فَجنــوب    فــالْقبْلَــــةُ مـــا یُریکَـــهُ، فاعتمـــد

هەر لەو بارەوە بە فارسی:

انحراف و جهت قبلـه بـدان اوّل خـوب    ساز پس ابره مُحاذی به شمال و بـه جنـوب
زانحرافش چو نهایت به تو گردد معلـوم    به مُری ساز عیانش کـه نمانـد محجـوب

باشد آن قبلەی آن شهر و در آغاز نماز — روی خود آر بدو، دل به خداوند قلوب
نام ایـن اَلَه نهادیم مُرائی‌الافاق — زآنکه در جملەی آفاق چو گردد مطلوب،
قبله زین‌گونه توان یافت که کردیم بیان — خُذْبذا منْ بَدَل القُطب فَنعْمَ المطلوب

ساڵی ١١٧١ ک. م. نەخۆشی تاعوون داکەوت و ئەم زانا گەورەیە تووشی هات و لە شەوی پێنجشەممبە نۆی مانگی شەوالی ئەوساڵەدا، دەستی لە ژیان بەردا و ڕووکردە بارەگای خودا.

ئەحمەد بەگ، کوڕی خوسرەو بەگی سنەیی بۆ مێژووی مەرگی گوتوویە:

روح جناب شیخ وسیم آنکه بود او — یکتای عصر و قطب زمین، نادر زمان
چون شاهباز ناگه از این خاکدان پرید — شادی‌کُنان، به خُلد برین ساخت آشیان
تاریخ سال رحلت او هاتفی ز غیب — گفتا که «پیشوای اهل جهان رفت از جهان»[1]

*تاریخ خاندان مردوخ.*

## مەلا موحەممەدی دێلێژەیی

مەشهوور بە «مەلای گەورە»، زانایەکی ئاگا و هێژا بووە کە لە ئابادی دێلێژەی سەر بە سلێمانی قوتابخانەیەکی گەورەی درووست کردووە و خۆی تێدا دەرسی‌گوتووە و ساڵی ١١٧٣ ک. م. هەر لەوی دنیای بەجێ‌هێشتووە.

مەلا موحەممەد سەرباشقەی بنەماڵەیەکە وا تێیاندا مامۆستایانێکی گەورە سەریان هەڵداوە و لەم کتێبەدا باسی چەند کەسێکیان دەکەین.

پاش مەرگی مەلا موحەممەد، کوڕە زاناکەی (مەلا ئەحمەد) جێی گرتۆتەوە.

لە پێشەکی *دیوانی مەلا مەحموودی بێخود*، چاپی بەغدا.

## عەبدالانی شارەزووری

مەحموود،کوڕی عەبباس، کوڕی سلێمان، زانایەکی خەڵکی عەبدالانی سەربە هەولێرە کە ماوەیەک لە زێدی خۆی و پاشان لە کۆیە دەرسی گوتووە و لە دوایی ژیاندا بۆ شام چووە و چەلێک لە حەلەب و هێندێک لە دمشق بووە و سەرەنجام ساڵی ١١٧٣ ک. م. دوایین کۆچی خۆی کردووە و دنیای بەجێ‌هێشتووە.

---

١. وشەی «اهل» لەم باڵی ئاخری شیعرەدا، لە باری کێشییەوە زیادە و شاعیر ناعیلاج بۆ پڕکردنەوەی ڕەقەمی ئەبجەدەکەی، کە ببێتە ١١٧١، هێناویە!

عەبدەلانی چەند کتێب و نووسراوەشی هەبووە؛ یەکیان بە ناوی «*زُبدةالأنفاس*» تەفسیری سوورەی ئیخلاسە.

*الأعلام*، ب٨، ل٥٢. *کَشف الظنون*، ب١، ل٦٠٩.

## نۆرسی کەرکووکی

عەبدورڕەزاق ئەفەندی، کوڕی عەبدوڵلا، ناسراو بە «نۆرس»، خەڵکی کەرکووک، دوای وەرگرتنی ئیجازە، چووە بۆ ئەستەمبووڵ و لەوێ دەرسی گوتۆتەوە و ساڵی ١١٥٩ ک. م. دادوەری شاری «بوسنە»ی پێ سپێراوە؛ بەڵام پاش ماوەیەک بەهۆیەکی سیاسییەوە خراوەتە شاری «کووتاهیە» و ساڵی ١١٧٥ ک. م. لەوێ لە دنیا چووە.

**لە کتێبەکانی**: وەرگێڕانی «*رسالەی خواجه عبدالله انصاری*» لە فارسییەوە بە ترکی.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٥٦٧. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٢١٧.

## شێخ حەسەنی گڵەزەردە

عارف و زانای گەورە، شێخ حەسەن، کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ عەلی، کوڕی بابارەسوولی حوسەینی بەرزنجی سەعدانی، ساڵی ١٠٨٨ ک. م. لە «بەرزنجە» لەدایکبووە و دوای تەواوکردنی دەرس و دەور، لەگەڵ شێخ ئیسماعیلی برایدا، بەرزنجەیان بەجێ‌هێشتووە؛ شێخ ئیسماعیل گوندی «قازانقای» و شێخ حەسەن «گڵەزەردە»ی هەڵبژاردووە و بەو بۆنەوە کە هەردوو گوند هی ئەحمەدبەگی زەنگەنە بووە، زۆر قەدریانی گرتووە و بۆ هەردوویان مزگەوت و مەدرەسەی کردۆتەوە و هەموو پێداویستییەکی ژیان و دەرس‌گوتنەوەی بۆیان ئامادە کردووە.

شێخ حەسەن زانایەکی پارێزکار و عارفێکی خاکەسار بووە و نووسراوەی زۆری لێ بەجێ‌ماوە؛ بۆ وێنە: «*إزلة الوهم و الالتباِس وَ إزاحة الوَسواس عَن بَعض النّاس*» و «*اسرار القُلوب و کشفُ الحجاب عَن المَحجوب*».

شێخ حەسەن ساڵی ١١٧٥ ک. م. لە گڵەزەردە ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە و هەر لەوێ نێژراوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٢٩٩. *ایضاح المَکنون*، ب١، ل٦٥. *تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٤٥.

## فەخریزادە

خەلیل، کوڕی ئیبراهیم، مەشهوور بە «فەخریزادە»، لە وێژەوانان و شاعیرانی دەوروبەری مووسڵە کە دوای تەواو کردنی دەرس و دەور، لە بەغدا دانیشتووە و هەر لەوێ ساڵی ١١٧٦ ک. م. دنیای بەجێ‌هێشتووە.

نازناوی فەخریزادە لە شیعردا «بەسیری» بووە و دیوانێکی شیعری عەرەبی لێ بەجێ‌ماوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٥٦.

## عەبدولقادری قادری

عەبدولقادر، کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی ئیسماعیل، لە کوردانی عەبدالانە کە ساڵی ١١٤٣ ک. م. هاتۆتە دنیا و لە عیراقدا خوێندنی دەسپێکردووە و پاشان بۆ حەلەب چووە و دوای وەرگرتنی ئیجازە، گەیشتۆتە دمشق و لەوێ نیشتەجێ بووە و کچی مامۆستایەکی ئەوێ بە ناوی شێخ مەحموودی کوردی ـکە قوتابی بابی بووە ـ خواستووە. پاش ماوەیەک سەفەرێکی میسر و حیجازی کردووە و حەجی بەجێهێناوە و گەڕاوەتەوە دمشق و تا کوتایی ژیان، لەوێ دەرسی گوتووە.

لەم مامۆستایە کتێب و نووسراوەی زۆر بەجێماوە، هێندێکیان بریتین لە: «*رحلة إلی الحجاز*»، «*السَّفر فی مایوجبُ الظَّفر*»، «*الجمع الأوفی فی الصَّلوة علی المُصطَفی*»، «*رغبة الزَّوار فی الارتحال لزیارة الابرار*»، «*تُحفةُ الاحباب فیما یَجِب بِهِ الخطاب*»، «*عینُ الصَّحو فی عوامل النَّحو*»، «*تُحفة الاحِبّة*»، لە حەدیسدا «*زُبده اللیالی*»و شەرحی «*الجامع الصَّغیر*».

کۆچی دوایی ئەم مامۆستا زانایە، ڕۆژی چوارشەممەی ١٦ی زیحەججەی ساڵی ١١٧٨ لە شاری دمشق ڕوویداوە و لە زیارەتانی «*صالحیّه*»دا نێژراوە.

*الأعلام*، ب٤، ل١٦٦. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٦٠٤.

## شێخ عەلی ئەفەندی

کوڕی عەبدوڵڵا، کوڕی ئەحمەد، کوڕی ئیسماعیل، ساڵی ١٠٧٤ ک. م. لە دێیەکی ناوچەی شارەزوور هاتە دنیا و خوێندی و بووە مامۆستا و دەرسی گوتەوە.

شێخ عەلی زانایەکی ئاگا بووە و لەوپەڕی پارێزکاری و دژکامیدا ڕایبواردووە؛ لە لایەن دەوڵەتی عوسمانلییەوە چەند جاران پێشنیاری کاری فەرمی پێ دراوە، بەڵام بایەخی پێ نەداوە و بە هەژاری و ئابڕووداری ژیاوە.

شێخ لەو دواییانەی ژیانیدا کەوتۆتە گەڕان و ساڵی ١١٧٩ک. م. لە شاری دمشق کۆچی یەکجاری کردووە.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٧٦.

## خانای قوبادی

شاعیر و چیرۆکوانی کەموێنەی کورد، خانا پاشای قوبادی، لە عەشیرەتی گۆرانە کە شیعر و هۆنراوەی زۆری داناوە و بەداخەوە زیاتریان لە ناوێک زیاتری لێوە نەماوە.

یەک لە کارە بایەخدارەکانی خانا، هەڵبەستی «*خوسرەو و شیرین*»ە، بریەتی لە داستانێکی ئەویندارییە بە لایەنی مێژوویی، کۆمەڵایەتی و ئاکارییەوە کە ساڵی ١١٥٣ ک. م. بە زاری گۆرانی دایڕشتووە و وەک خۆی دەڵێ، لەسەر دەقی «*خسرو شیرین*»ی نیزامی دایداوە و تێکۆشاوە لەگەڵی بڕوا و لێ بەجێ نەمێنێ. وەرگێڕاوەکەی خانا، تژێ لە قسەی نەستەق و زاراوە و پەندی کوردییە، لەوپەڕی جوانی و ڕەوانیدا، بە شێوەیەک کە لە باری زبانی و وێژەوانیشەوە، بێ شک یەک لە بەرهەمە نایابەکانی کوردی گۆرانی دێتە ئەژمار. دیارە خانا خۆشەویستییەکی تایبەتی لە دڵدا بووە سەبارەت بە *خسرو شیرین* و خاوەنەکەی، یانی نیزامی گەنجەوی. هۆی ئەمەش دوور نییە هەستی هاوزمانی و هامڕەگەزییان بووبێ؛ کە نیزامی بۆ خۆی دەڵێ:

گر مادر من رئیسەی کُرد / مادرصفتانه پیش من مُرد
از لابەگری کە را کنم یاد / تا پیش من آردش بە فریاد[1]

مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم، ڕوونووسێکی ڕێکوپێکی لەم هۆنراوە هێژایە ئامادە کردووە کە ساڵی ١٩٧٥ ز. لە ٨٧٤ لاپەڕەدا لە چاپ دراوە. ئەوا پاژێکی:

مونشی ئی ئینشای شیرین‌تەر جە قەند / بەی تەور تەحریر کەرد نەزم دڵپەسەند
ئەوڕۆ کە خامەی عەنبەر شەمامە / وەشبۆ کەرد جە موشک ئینشای ئی نامە
تاریخ هیجرەت «خَتْمُ المُرسَلین» / موتیع دیوان شەرح شەرع دین
ڕۆی دووشەنبە بی زیحەججەی حەرام / هەزار و یەک‌سەد، پەنجا و سێ تەمام[2]
ناگاه جەوەخت مینای سوبحدەم / جە جام خوەرشید ڕەوشەن بی چوون شەم
جە پەردەی ئەسرار لامەکان ماوا / سورووشێ بەی تەور وەگۆشم یاوا
واتن هەی شاعیر خوەش‌نەزم و شێوە / جانشین قەیس پەی لەیلێ لێوە
چێش مەبۆ چون نەزم نیزامی دوڕسەنج / بە لەفز شیرین بە بێ لار و لەنج
جە وەسف فەرهاد شیرین و پەروێز / باوەری وە ڕەقس خامەی عەنبەربێز
عەیبەن پەرێ تۆ دانای دوڕشناس / دەمێ چوون سەڕڕاف یاقووت و ئەڵماس
جەی بازار عشق جەرای پڕ هۆشی / مەشغوول بی بە کار جەوهەرفرۆشی
حەیفەن وێنەی تۆ جەوهەری لاڵسەنج / دانای دوڕشناس، گەنجور کۆی گەنج
هەرکەس وێنەی تۆ گەوهەر بارشەن / دانا بزورگان خەریدارشەن

١. هێندێک لەسەر ئەو بڕوایەن کە نیزامی بابیشی هەر کورد بووە.

٢. واتا: ١١٥٣.

گوشـــادکەر زەبـــان جـــەواهیربارت	تا گـەرم بـۆ زەریـف سـەودای بـازارت
بەندەیچ «حَسْبُ‌الامر» ئەو سرووش غـەیب	بە ڕەشحەی خامەی موشکین بێ‌عەیب
بەی تـەورە کـەردم ئـی نامـەی نـامی	ئینــشا بــە دەســتوور نــەزم «نیزامــی»
ئومیـدەن بـە زات دانـای شـیرین‌کـار	مــەزموون ئــی نــەزم جــەواهیرنگار
چــون ڕاز شــیرین نــادرەی ئــەییام	شیرین بۆ بە کام کافەی خـاس و عـام

ئەم شاعیرە گفتخۆشە هەموو جارێ نازناوی «خانـا»ی بـۆ خـۆی دانـاوە؛ وەک لـەم بەیتـەدا کـە باسـی پێغەمبەر (د) دەکا:

«خانــا» وە ســەرگەرد بــەرز پایــەش بــۆ	وەفیــدای ڕەوزەی فەلــەکســایەش بــۆ

بە داخەوە ساڵی زا و مەرگی خانامان لێ ڕوون نییە؛ هەر وەکوو لە باسی ژیانیشی شتێکی وا نازانین.

ئەمجار بەشێکی تر لە *خوسرەو و شیرین*:

ئومێـــدم بـــە زات بەخـــشندەی داوەر	خانـــای خەمخـــەیاڵ، زام دڵ خەتـــەر
ببەخشۆش گونا جە عەرسەی مەحشەر	بەو شـەمع میحـراب ڕەسـول سـەروەر
یاحــەی بــە فــیراق فــەرهاد کۆکــەن	بەو خورشید حوسـن شـیرین ئەرمـەن
بە ئیستیلای عەشق خەسـرەو پـەروێز	بە خوەش‌خەرامی گوڵگوون و شـەودێز
بـە خامـەی موشـکین شـاپوور چـینی	بـــە نـــاز شـــیرین بـــەو نـــازەنینی
بــە ســاز و بــە لــەحن شــۆخ نەکیـسا	بــە مــەهین‌بــانوو، بــانووی پەریــسا
بە توغیـان دەرد بـێ‌دەرمـان عـەشـق	بە تۆفان سەخت بەسر مەینەت مەشـق
وێنــەی نیزامــی ســەیقەل دەر زەیــنم	بە سورمەی دانش ڕەوشەن کەر عەینم
تـا کـە ماجـەرای شـیرین و خەسـرەو	سەنگتاشی فەرهاد سەرگوزەشـت ئـەو
باوەرون وە نەزم خاستەر جـە گەوهـەر	بـەرەشـحە خامـەی شـۆخ بـۆ عەنبـەر
جەلای عاقڵان، ساحیب فـەهم و دیـن	دانــا بوزورگــان کوردســـتان زەمـــین
ڕاستەی مـەواچان فارسـی شـەکەرەن	کوردی جە فارسی بەل شـیرین‌تـەرەن
پەی چێش نەدەوران ئەی دونیای بەدکـێش	مەحزووزەن هەرکەس بە زەبـان وێـش
مەعلوومەن هەرکەس بـە هـەر زەبانـێ	بواچـــۆ نـــەزمێ جـــە هـــەر مـــەکانێ
جـەلای خـرەدمەنـد دڵ‌پەسـند مـەبۆ	شیرین‌تر جە شەهد شیرەی قەند مەبۆ

چەند بەیت لە بە خۆدا هەڵگوتنی شیرین:

وەرنە من هێمان چوون سەوڵەن بـاڵام	بـــازارم گەرمـــەن ڕەنگینـــەن کـــاڵام
هێمان گوڵ‌غونچەی باغم نەشـکوفتەن	ئەڵماس دانەی دوڕ بەختم نەسـوفتەن

هێمـــان تـــاف جـــۆش نەوجەوانیمـــەن داوای تـــاج و تـــەخت جیهانبانیمـــەن
شـــــیرینەن وێنـــــەی نـــــام وێم ڕازم کوشەندەن چـــون تـــیر نـــیمنگـــای نـــازم
پڕ موشـــکەن گیـــسۆم بـــۆ عەنبەرینـــەن بـــەهای هـــەرماچم، مولـــک ماچینـــەن

*«خوسرەو و شیرین»*ی خانا جارێکیش لە تاران، ساڵی ١٣٤٨ ک. هـ. بـە هیممـەتی سـەرهەنگ مـورادی ئەورەنگ چاپ کراوە.

گۆڤاری *گەلاوێژ*. گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ٧، ل١٢٢. پێشەکی *خسرو و شیرین خانا*، تاران، ١٣٤٨ ک. هـ.

## زەینولعابدین جەعفەری بەرزنجی

عەللامە زەینولعابدین جەعفەر، کوڕی حەسەن، کوڕی عەبدولکەریمی حوسـەینی بـەرزنجی مـەدەنی، لـە سەیدەکانی خانەدانی بەرزنجە و یەکێک لە ناودارانی گۆڕەپانی زانـست و وێـژە و عیرفانـە کـە لـە شـاری مەدینەی پیرۆزدا ژیاوە و موفتی و وتاربێژی شافیعی بووە. ئەم مامۆسـتایە لـە زبـان و وێـژەی عەرەبـدا تـا ڕادەیەک سەرکەوتووە کە ئیبنولفاریزی دەورانیان پێ گوتووە.

**لە کتێبەکانی**:

١. *قصةالمولدالنبی*، کە ساڵی ١٣٠٧ لە میسردا چاپکراوە و یەک لە نەوەکانی بە ناوی جەعفـەری کـوڕی ئیسماعیل شەرحێکی بۆ نووسیوە

٢. *قصّةالمعراج*

٣. *مَناقِبُ السّید حَمزة و مناقب عبدالقادر گیلانی و مناقب احمد بن علوان*

٤. ***جالیة الکدر باسماء اصحاب سیّد البشر***

٥. ***الشَّقایق الأُترجَّیة فی مناقب الاشراف البرزنجیّة***

٦. ***البُرءُ العاجل باجابة الشّیخ محمّد غافل***

٧. *عقـدُ الجـوهر فـی مولـدالنّبی الازهـر*، کـە سالـی ١٣١٥ ک. م. چـاپ کـراوە و سـەرەتاکەی ئـاوای دەسپێدەکا:*«أبتدءُ الاملاء بِاسمِ الذّات العلیّة، مُستَدِرًّا فیضَ البرکات عَلی ما أنالَهُ و اولاهُ و أُثنی بِحَمد مَواردُهُ سائغة هَنیّه، مُمتَطیاً من الشکر الجمیل مَطایاهُ ...»* کە تا ئاخری کتێبەکە هەر بەم شێوە سەجعی هەیـە و دانـەر لەم دوو سەجعە لای نەداوە.

*آدابُ‌اللغةالعربیّة*، ل٣١١. *الأعلام*، ب٢، ل١١٧. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٢٥٥ . *ذیل کشف‌الظّنون*، ب١، ل١٧٦.

## شێخ موحەممەدی قاری

شێخ موحەممەدی قاری سۆفی شافیعی، کوڕی حاجی حوسەین، خەڵکی شارەزوور، زانایەکە خوێندنی لە شارانی عیراقدا تەواو کردووە و لە بەسرە ئیجازەی وەرگرتووە و پاشان گەڕاوەتەوە شارەزوور و لە گوندی هەزارمێردی لای سلێمانی نیشتەجێ بووە وهەر لەوێش ساڵی ١١٨٠ ک. م. لە دنیا چووە.

**لە بەرهەمەکانی**: کتێبی «*رَفْعِ الخفاء*»، شەرحی «*ذاتِ الشِّفاء*»ی ئیبنولجەزەرییە، سیرەی پێغەمبەری مەزن (د).

*ایضاحُ المَکنون*، ب ١، ل ٥٧٨.

## شێخ ئەحمەدی مەردۆخی (دووەم)

شێخ ئەحمەدی دووهەم، کوڕی شێخ مەحموود، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامە (ئەوەڵ)، کوڕی حاجی شێخ موستەفا تەختی مەردۆخی، لە زانایانی ناوداری کوردستانە کە ژیانی بە خوێندن و دەرس‌دان و عیبادەت کردن ڕابواردووە و ئەگەریش پەرژابێ، خەڵوەنشینی کردووە.

شێخ ئەحمەد دوو کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ موحەممەد قەسیم و حاجی شێخ موحەممەد سەعید کە هەردوو لە مامۆستایانی زانا و هایای ڕۆژگاری خۆیان هاتوونەتە ئەژمار.

زا و مەرگی شێخ ئەحمەد سالانی ١١٠٦ و ١١٨١ ک. م. ڕووی‌داوە.

*تاریخچەی خاندان مشایخ تخته*.

## مەلا موحەممەد شەریفی کوردستانی

حاجی مەلا موحەممەد شەریف، پیاوێکی زانای خەڵکی هەورامانە کە لە وێژەی فارس و عەرەبدا شارەزاییەکی زۆری بووە و عەرەبییەکی یەکجار بەقەوەتی نووسیوە. ماوەیەک لە هەورامان و هێندێک لە شاری سنە و دێهاتی دەور و بەری و چەلێکیش لە شارەکانی کوردستانی باشوردا ژیاوە و لە دوایی ژیانیدا ڕووی لە بەغدا ناوە و هەر لەوێ ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

مەلا شەریف ماوەیەک هاودەمی شێخ وەسیمی مەردۆخی (١١٧١- ١١١٨ ک. م.) بووە و لە خزمەتیدا شاگردی کردووە و بەهرەی بردووە. جارێک نامەیەکی بە زبانی عەرەبی بۆ نووسیوە کە دەردەخا لەم بوارەدا تا چ ڕادەیەک دەسەڵاتی هەبووە. ئەوا بەشێک لەو نامە: بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحیم حامِداً و مُصلِّیاً وَ مُسَلِّماً، انَّ اَحْسَنَ ما یُهْدی منَ التَّسلیمات أرْوَجُها، وَ منَ التَّحیات أبْهَجُها، وَ منَ الأثْنیةَ اعلاها، وَ منَ الادعیة أشْفاها، الی سَیِّد رَضَعَ ثَدْیَ المَعارف وَرَقا، و وَقَفَ مَواقفَ الفاضلین فَارْتقی، یَنْبُوعُ موانحِ مُلْهَماتَ الفَضایل، حاوی التَّجْرید عَنِ الدَّنّاآت و الرَّذائلِ، مَطْلع طَوالعِ مَطالعِ العلا، وَصاف مَقامات قَلایِد المَلا، مَخْتَصَرُ مُطَوَّل العُلُومِ، و الشّفاء الکافی لاهْلِ المَنْثُورِ و المَنظومِ، رَیْحانَة اولی الالْباب، نتائجِ اَفکار اَهْلِ الأداب، الدُّرِ المنظوم، وَ النَّهرِ الفائق، و

العَقْد النَّفیس بَلْ وَ البحرِ الرائق، دُرَرِ غُرَرِ رَوْضِ الاداب، **تُحفَةَ** المُلوک و روضة الصَّفا فی کُلّ باب، **تحفة** نهایة البیان، مُوجزنُصوص غایةالإتقان...» تا دەڵێ: «الفاضلِ الألْمَعی، وَ الکاملِ اللَّوْزعیّ، خَریدةالکرم، **حُجَّة** لسان العَرَبِ وَ العجَم، مَوْلانا و مُقتَدانا الشَّیخِ الاجَل مُحَمَّد الوسیم، لازال بِالفَضْلِ مقیم و بِطُولِ العُمْرِ مُستَدیم...». لەم نامەدا، کە یەکجار دوور و درێژە و ئەمە بەشێکی بوو، نووسەر نێوی کتێبە دینی و وێژەییەکانی وا لە ڕستەکانیدا جێ کردۆتەوە، ئەگەر کەسێ ئەو کتێبانە نەناسێ، زەحمەتە لێی تێبگا؛ کتێبانێکی وەکوو: صواعِقُ زَواجر، اهل‌الضلال، مَفاکِهَه‌السَّمیر، دلا یل‌الخیرات، الحصنُ‌الحصینُ فی المُهمّات، کیمیاءُالسَّعاده و...

مەلا شەریف تا دواییەکانی چەرخی دوازدە ژیاوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## عەبدولغەفوور ئەفەندی

عەبدولغەفوور ئەفەندی ئامیدی دیاربەکری، مامۆستایەکی زانایە کە لە دیاربەکر پلەی ئیفتای هەبووە و دەرسیداوە وجاروبارەش شیعری گوتووە و نازناوی «لەبیب»ی هەڵبژاردووە و سەرەنجام ساڵی ١١٨٥ ک. م. لە دنیا دەرچووە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێز لە «*تفسیرانوار التَّنزیل*»ی قازی بەیزاوی، نامیلکەیەک لە ئوسوول و کتێبێک لە سیاسەتدا.

*هدیةالعارفین*، ب ١، ل٥٨٨. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل١٢٣.

## سیبغەتوڵای حەیدەری ماوەرانی

سیبغەتوڵا ئەفەندی، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی حەیدەری دووەم، کوڕی ئەحمەد، کوڕی حەیدەری یەکەم، لە بنەماڵەی حەیدەرییەکانی ماوەرانی هەولێرە کە کاتی لەدایکبوونی، باپیری حەیدەری دووەم زیندوو بووە؛ لە ئیبراهیمی کوڕی دەپرسێ: ناوی بنێن چی؟ ئەویش جواب دەداتەوە «صِبْغَةُالله»[1]. ئێژێ: بەهە! «وَ هوَ صَبَّغَه»[2]. بە هەڵکەوت ئەم ڕستە بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ١١١٤، ساڵی لەدایکبوونی.

سیبغەتوڵا ئەفەندی حەیدەری، یەکەم زانای بنەماڵەی حەیدەرییە کە کۆچی کردۆتە بەغدا و بۆتە هۆی ڕووتێکردنی ژمارێکی زۆر لە قوتابییان و مامۆستایانی کوردستان بۆ ئەو شارە.

کۆچی سیبغەتوڵا ئەفەندی لە نیوەی دووهەمی چەرخی دوازدەدا بووە و ئەحمەد پاشا، والی ئەو سەردەمەی بەغدا، زۆری ڕێز لێ گرتووە و بەخێری هێناوە و زۆری نەخایاندووە بۆتە سەرۆکی کۆڕی زانیاری ئەوێ و «شیخ‌المشایخ»یان پێ گوتووە.

---

١. صِبغةُالله: نەخش و نیگاری کاری خودا.

٢. وَ هوَ صَبَّغَة: خودا ئافراندوویە و نەخش و نیگاری داوە.

ئەم مامۆستا گەورەیە پاش ساڵانێکی زۆر دەرس گوتنەوە و بەهرەگەیاندنی زانستی و ئایینی، ساڵی ١١٨٧ ک. م. کۆچی دوایی کردووە و دوو کوڕی زاناو هێژای لێ بەجێ ماوە: حاجی موحەممەد ئەسعەد سەدرەدینی حەیدەری و عوبەیدوڵا ئەفەندی حەیدەری.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێز بۆ «*المُحاکَمات*» و «*العقائد*»ی باپیری ئەحمەد کوڕی حەیدەر و هەروەها هێندێک پەراوێزە لەسەر کتێبی «*الفوائد الضیائیّة*» لە نەحودا.

*الأعلام*، ب٣، ل٢٨٦. پەراوێزی *البیتوشی*، شیخ محمّد خال.

## شێخ عەبدولکەریمی مەردۆخی

شێخ عەبدولکەریم، عارفێکی ئاگا و مامۆستایەکی هێژا، لە کەڵەپیاوانی بنەماڵەی مەردۆخی بووە کە دەرسی گوتووە و واتاری داوە و خەڵکی ڕێنوێنی کردووە و ساڵی ١١٨٨ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە. شاعیرێک لە شینیدا گوتوویە:

قُطب عالم سپهر دانش و دین — بحر زَخّار فضل شیخ کریم
شُد چو اتمام مُدّەی عمرش — کرد رحلت از این سراچەی بیم
یوم اثْنین آخر شوّال — در سرای نعیم گشت مقیم
بهر تاریخ او خرد گفتا — زَد رقم «در بهشت باد کریم»[١]

*تاریخچەی خاندان مشایخ تخته*.

## مراد خانی بایەزیدی

شاعیرێکی کوردستانی باکوورە کە تا نیوەی دووهەمی چەرخی دوازدە ژیاوە و هێندێک قەسیدە و غەزەلی بە کرمانجی و سۆرانی لێ بەجێ ماوە و زۆربەی شیعرەکانی گەپ و گاڵتەیە.

*خلاصةالکُرد و الکُردستان*، ل٣٥٦. *مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٨٨.

## سەید عەلی بەرزنجی

سەید عەلی بەرزنجی شافیعی مرۆیەکی پارێزکار و خاکەسار، زانا و ئاگا بووە کە لە ئاخر و ئۆخری چەرخی دوازدەدا ژیاوە.

**لە کتێبەکانی**: «*نظمُ اسماء اهل بِدر*» و «*نظمُ مولِد النَّبی*» (د).

١. بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە: ١١٨٨.

*هدیة‌العارفین*، ب٢، ل ٢٧٠.

## شێخ نیعمەتوڵای کاکۆزەکەریایی(دووەم)

لە نێو مەشایخی کاکۆزەکەریادا دوو نیعمەتوڵلا ناویان لێ هەڵکەوتووە. یەکەمیان لە لاپەڕەی ١٢٩دا ناوی هات و ئەمەش باسی دووهەمیان:

شێخ نیعمەتوڵای دووهەم لە مەشایخی ناوداری کاکۆزەکەریایە کە شاعیر و وێژەوانیش بووە و ساڵانێکی زۆری بە گەڕان و سەیران ڕابواردووە. بە داخەوە ساڵی لەدایکبوون و لە دنیا چوون و هەروەها ناوی بابی بۆم دەرنەکەوت. لە جونگێکی دەسنووسدا غەزەلێکم بینی کە نویسیارەکەی لە کۆتاییدا نووسیبووی: «ئەم غەزەلە شێخ نیعمەتوڵای کاکۆزەکەریایی ساڵی ١١٨٣ ک. م. لە نزیک شاری بەغدادا هۆنیویەتەوە». ئەگەر وابێ، دەبێ لە ناودارانی چەرخی دوازدەی بزانین و دوور نییە تا ئاخری ئەوچەرخە ژیابێ.

شێخ شاعیرێکی باشیش بووە و شیعرەکانی، پەرژ و بڵاو، لە نێو جونگ و بەیازە دەسنووسەکاندا دەس دەکەوێ. لە کتێبخانەی مامۆستای هێژا شێخ موحەممەدی خاڵدا ــوەک خۆی لە ژمارەیەکی *گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا* دەفەرموێ ــ دەفتەرێکی دەسنووس لە شیعرەکانی هەیە.

ئەمەش دوو غەزەل لە شێخ نیعمەتوڵای دووهەمی کاکۆزەکەریایی:

یا دوایی از دو لبهای شراب‌آلود خویش — یا نگاهی از دو چشم مست خواب‌آلود خویش
شاد کُن ما را به دشنامی ز روی مهر و کین — از مُرُوَّت کَم مَکُن حرف عتاب‌آلود خویش
می‌وَزَد بر من سحرگاهان نسیم کُوی تو — با صبا ده نکهت زلف گُلاب‌آلود خویش
از حَیا خوَی کرده یا از تابش خُور چهره‌ات — یا زمن پوشیده‌ای روی حجاب‌آلود خویش
یا به فضل خویش «نعمت» را به کام دل رسان — یا هلاکش کن بدان دست خضاب‌آلود خویش

* * *

به پیش گلشن رویت نزاکت گُل چیست؟ — به پای زُلف رسای تو گوی سنبُل چیست؟
به بَزم مجلس میخوارگان ندارم کار — چو چشم مست تو باشد گوارش مُل چیست؟
گرفته شهر دلم، پیچ و تاب زلف کَجَت — هجوم رشته‌ی کافردلان کاکُل چیست؟
شهید غمزه‌ی خود کرده‌ای دو عالم را — به کُشتن من بیچاره این تأمُل چیست؟
به زعم مدَّعیانم نواختی اول — بگو در آخر کار این همه تغافُل چیست؟
در آن زمان چو کشم آه و ناله‌ی دلسوز — ز هجر گُلشن رویت فغان بلبُل چیست؟
تُرا به بند کشد، تا کُشد، شبی «نعمت»! — وگرنه حلقه‌ی زُلف پُر از تسلسُل چیست؟

گۆڤاری *کۆڕی زانیاری کورد*، بەغدا. چەند جونگی دەسنووس.

## شێخ ئەبولحەسەنی مەردۆخی

شێخ ئەبولحەسەنی مەردۆخی غەففاری باقلاوایی، کوڕی شێخ نەجمەدین، کوڕی شـێخ ئیـبراهیم، کـوڕی شێخ شەمسەدین، کوڕی شێخ عەبدولغەفار، زانایەکی توانا و عارفێکی هێژا لە بنەماڵەی مەردۆخیان بووە کە لە شاری سنەدا ژیاوە و هەمووخەڵک ڕێزیان لێ ناوە و سەریان پێ سپاردووە.

شێخ لە کاتی میرایەتی سلێمان پاشـای دووەمـی بابانـدا(١١٦٤– ١١٧٨ ک. م.) ئـەچێ بـۆ سـلێمانی و ماوەیەک دەمێنێتەوە. بەڵام دیسان دەگەڕێتەوە بۆ سنە و پاش ماوەیەک دەگوێزێتـەوە بـۆ گونـدێکی لای دیواندەرە و سەرەنجام ساڵی ١١٩٠ ک. م. هەر لەوێ دنیا بەجێ‌دێڵێ.

ئەم مامۆستایە ساڵی ١١٧٤ کتێبێک لەمەڕ هەیئەت و ئوستورلابەوە دەنووسێ و بەو بۆنەوە کە ئەودەم لـە سلێمانی بووە، «*تحفەی سُلَیمانیّە*»ی ناو دەنێ.

ئەم چەند بەیتە شێخ موحەممەد موقیمی مەردۆخی، بۆ شینی شێخ ئەبولحەسەنی گوتووە:

فاضل دهر شیخ ابوالحسن آنـک — طینــت او بــه معرفــت بــسرشت
ایـزد او را بـه نـور کـشف علـوم — ظُلمــت جهــل در خیــال نَهــشت
در جهــــان ادّخــــار عُقبـــــی را — مَـدَّەی عمـر، تخـم نیکـی کـشت
شــب پــــنجم ز شــــهر ذیحجــه — بست احرام حج بـه سـوی بهـشت
پا به صوب جنـان چنـان برداشـت — در جَنانهـا[1] غُبـار حَـسرت هـشت
بــا دَم سَــرد فــرقتش افروخــت — دل اَحبــاب لا ز غــم انگــشت[2]
پَــی تــاریخ رحلــتش خامــه — «بَــرَّدَ الله مَــضْجعه» بنوشــت[3]

لە جونگێکی دەسنووس.

## عەبدوڕڕەحمانی ئامیدی

عەبدوڕڕەحمان، کوڕی عەبدولکەریمی ئامیدی (دیاربەکری) حەنەفی،لـە مامۆسـتایانی ناسـراوی چـەرخی دوازدەیە کە بۆ ئەستەمبوول چووە و لەوێ بە دەرس‌گوتنەوە خەریک بـووە و ساڵـی ١١٩٠ ک. م. کـۆچی یەکجاری کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*شرحُ السَّراجیّە*» لە فەرائیزدا و «*شَرحُ الوَلَدیّە*» لە مەنتیقدا.

---

١. **جِنان**: بەهەشت؛ **جَنان**: دڵ
٢. **اَنگشت**: زوخاڵ، خەڵووز
٣. دەکاتە ساڵی ١١٩٠ ک. م.

*هدیة‌العارفین*، ب١، ل٥٥٣. *ایضاح‌المکنون*، ب٢، ل٧١٥.

## عیسا حەیدەری

شەرەفەدین ئەبورڕووح عیسا، کوڕی سیبغەتوڵا ئەفەندی، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی حەیدەری دووەم، لە زانایان و مامۆستایانی ناوداری بنەماڵەی حەیدەرییە کە لە بەغدا ژیاوە و دەرسی‌داوە و ساڵی ١١٩٠ ک. م. لەو شارە ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

**لە کتێبەکانی**: زنجیرە پەراوێزێکە بۆ بەشی عیباداتی کتێبی «*تُحفەالمُحتاج*»، نووسراوەی شێخ ئیبنوحەجەری هەیتەمی.

وتاربێژی بەناوبانگ شێخ موحەممەد ئەمین عومەری مووسڵی، ساڵی ١١٧٨ ک. م. لە بەغدا لای شەرەفەدینەوە خوێندوویە و لە شاگردانی بووە.

*هدیة‌العارفین*، ب١، ل٨١٢.

## ڕاجی

عەبدوڵڵابەگی مونشی، نازناو «ڕاجی»، کوڕی خوسرەو بەگی مونشی[١] و بابی عینایەتوڵا بەگی وەکیل، لە پشتی خواجە شاوەیسی غەیبی (سووزی)[٢]، پیاوێکی زانا و زیرەک و هێژا و لە شیعر و پەخشاندا یەکجار توانا و ئینشابەندی والی ئەوسەردەمەی ئەردەڵان، خوسرەو خانی گەورە (؟- ١٢٠٤ ک. م.) بووە. بە داخەوە دیوانەکەی لەناو چووە و دانەـ دانەیەک لە شیعرەکانی لە «*حدیقەی أمانُ‌اللهی*» و هێندێک لە جونگەکاندا ماوەتەوە، کە یەکیان ئەم غەزەلەیە:

مُبتلی در تنگنای وادی حیرانیم — آبلەپا ماندە در صحرای سرگردانیم
مُنشی دیوان قدرت نقش کردە از اَزَل — داغ حرمان را بە روی صفحەی پیشانیم
فاش شد از شعلەی آهم میان مردمان — داغهای دل‌گداز و سوزش پنهانیم
گر نمایی عید رخسارت بە سالی ای صَنَم — من بە تیغ آبرُوت از جان و دل قربانیم
گر چە هستم بینوا اما ز استغنای طبع — صد شرف دارد بە تشریف شهان عُریانیم
«راجیا» دور از وصال دوست بر دل لالەسان — بسکە دارم داغ، پنداری کە داغستانیم

جارێک عەبدوڵڵا بەگی ڕاجی شیعرێک بۆ خوسرەو خان دەنێرێ و تێدا پاش پەسنی والی، ڕادەگەیەنێ

١. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٢٣١.
٢. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ١١٠.

ماڵەکەی کەلاوەیەکە و ئەگەر بکرێ پارەیەکی بۆ ماڵکردنەوە بدرێتێ. والی داخوازەکەی بەجێ دێنێ و شیعرێکیشی بۆ دەنووسێ. دیسان ڕاجی بۆ سپاس شیعرێک دادەنێ و بۆ والی دەنێرێ. ئەوا شیعری والی و جوابی ڕاجی:

مُخلص دیرینه عبدالله‌بیگ — آنکه فضل اوست بر خلق آشکار
قطعه‌ای در مدح ما گفت و نوشت — جمله الفاظش چو درّ شاهوار
لیک از مسکن شکایت کرده بود — کاندر او ساکن شده او جُغدوار
ای وکیلُ‌الشان رشید دولتم! — یک بر آتش ده، دو عباسی هزار
تا بسازد آشیانی بهر خویش — همچو شهبازی در او گیرد قرار

* * *

مَنشور عزّ و دولت و اقبال سرمدی — فرمان کامرانی اعیان روزگار
حُکم جهان مطاع و تمنّای بندگان — اَغْنی نشان خُسرو ذی‌شان کامگار
کاندر جواب بنده‌ی دیرین خود رقم — فرموده، یافتم ز مضامینش افتخار
با آنکه بی‌مُطایبه از صَعْوَه کمترم — خط شریف داد به شهبازیم قرار
بهر عمارت دل و دار خرابه‌ام — از جود بی‌نهایت و از بذل بی‌شمار
از نقد خالصی که به دینار چون کُنی — تعداد آن عَطیّه بود چارصدهزار
بنوشت بر وکیل و رسانیده بنده را — ایزد دهادش از عوض درهمی هزار

ڕاجی ئەم پارچە شیعرەی ساڵی ١١٧٨ک. م. بەبۆنەی کوژرانی سلێمان پاشای بابان، کوڕی خالد پاشاوە داناوە:

والی عصر و سلیمان زمان — آنکه گرد ستم از دهر برُفت
وانکه تا چرخ به کامش گردید — کام خویش از همه اعدا بگرفت
آشکارا چو به شغل دنیا — بود مشغول، و لیکن به نهفت
اهتمامش همه دینداری بود — نه به کام دل خود خورد و بخُفت
بود در عدل دراین عالم طاق — با کَفَش تیغ سیاست هم جفت
چند سالی که بدین قانون زیست — یافت تشریف شهادت را مُفت
مُفسدی نیمه‌شبی با خنجر — گوهر جسم گرامیش بسُفت
بَعد نُه روز ز رضوان جنان — بانگ بازآی به جنّت بشنُفت

از خـــرد ســـال وفـــاتش جُـــستم «جعــل الجَنَّـــة مَثْـــویً لـــه»[١] گفـــت

بۆ مێژووی دروستکردنی ئۆرووسی و دەرک و دەروازەی تالاری «سەرتەپۆڵە»ی شـاری سـنە، ئـەم دوو بەیتەی گوتووە:

بـــــاقر نجـــــار، از نـــــوّاب‌خـــــان چـون بـه امـر ایـن بنـا مـأمور گـشت

یافـــت اتمـــامش بـــه امـــر خُـــسروی در هــزار و یکــصد و هــشتاد و هــشت

عەبدوڵلا بەگی ڕاجی سەرەنجام لە شەڕێکی نێوان موحەممەد پاشای بابان و خوسرەو خانی ئەردەڵانـدا، ساڵی ١١٩١ ک. م. کوژراوە.

*حدیقەی أمان‌اللهی*، ل ٣٧٠.

## شێخ یۆسفی نایب

لە زانایانی شاری مووسڵ بووە کە لە قوتابخانـەی «جِرجیـسیّە»دا دەرسـی‌داوە و لـە هەندسـە و حیـساب و هەیئەتدا ناوی دەرکردووە . هەروەها جێگری موفتی مووسڵ لە کاروباری بە شەرع و دادوەریـدا بـووە و لـە بڕانەوەی چەرخی دوازدەدا کۆچی دوایی کردووە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٢٧٧.

## میرزا مەحموودی قازی موکری

زانا و هونەرمەندێکی خەڵکی موکوریانە کە دادوەری کردووە و لە ئوسوول و فیقهی شافیعیدا یەکجار شارەزا بووە و خەتی نەسخ و نەستەعلیقی هێندە جوان نووسـیوە، مـیری خـەتخۆشـانیان پـێ گوتـووە. کتـێبی «***تحفةالمُحتاج***»ی شێخ ئیبنوحەجـەری لـە عەرەبییـەوە وەرگێڕاوەتـە سـەر زبـانی فارسـی؛ بـەڵام تـەواوی نەکردووە.

میرزا مەحموود لە دواییەکانی چەرخی دوازدەدا ژیاوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل ١٨٠.

## شێخ موحەممەد سەلیمی ئەردەڵانی

شێخ موحەممەد سەلیمی ئەردەڵانی زانایەکی خەڵکی سنەیە کە تا ئاخر و ئۆخری چـەرخی دوازدە ژیـاوە و ئیجازەی لە عەللامە سیبغەتولا ئەفەندی حەیدەری و ژمارێک لە مامۆسـتایانی نـاوداری ئەوکاتـەی مووسـڵ

١. دەکاتە ١١٧٨.

وەرگرتووە و بە شوێنیدا لە مزگەوتی عومەری ئەوشارە دەرسی گوتووە و خێڵێکی گەورە لە قوتابییانی ڕاهێناوە و هێندێک کتێب و نووسراوەشی لێ بەجێماوە و دوایی هەر لە مووسڵ دەستی لە ژیانی دنیا بەرداوە.

شێخ موحەممەد سەلیم مرۆیەکی بەئاکار، لەسەرخۆ و پارێزکار بووە و هەموو خەڵک ڕێزیان لێ گرتووە.

پەراوێزی کتێبی *البَیتوُشی*، ل٢٦٨. *مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٣٤.

## مەلا عەبدوڵڵای بێڵەواری

مەلا عەبدوڵڵای مەشهوور بە «واعـظ»، مامۆسـتایەکی شـارەزا و پارسـایەکی پیـاوی خـوا بـووە کـە وێـڕای دەرس گوتن و وتاردان، کشتوکاڵیشی کردووە و بە ڕەنجی شانی خۆی، ژیانی بەڕێوە چووە.

مەلا عەبدوڵڵا نیشتەجێی ئاواییەکی ناوچەی بێڵەواری سـەر بـە شـاری سـنە و کامیـاران بـووە و ساڵـی ١١٩١ک. کۆچی دوایی کردووە. ئەم سارستە، بە حیسابی ئەبجەد، لەگەڵ ئەوساڵەدا دێتەوە: خـرد گُفتـا بـە «رحمت شاد گردید»[١].

لە بەیازێکی دەسنووسی ساداتی لۆن.

## شێخ موحەممەدی کوردی

شێخ موحەممەد، کوڕی سلێمانی کوردی شافیعی، ساڵی ١١٢٧ ک. م. لە دمشق هاتۆتە دنیـا. یەکـساڵان بووە بە ماڵەوە چوونەتە مەدینەی پیرۆز و لـەوێ بـایباڵـیداوە و گەشـەی کـردووە و خوێندوویـە و پـاش وەرگرتنی ئیجازە لە عەبدوڵڵای کوڕی سالمی بەسری، ئیشی فتوادانی گرتۆتە ئەستۆ.

شێخ موحەممەد هەر وەکوو بابی، لە زانایانی بەناوبانگی ڕۆژگاری خۆی بووە و کتێب و نووسـراوەی زۆری لێ بەجێماوە؛ بۆ نموونە: «*عُقُود الدُّرَر فی مُصطَلَحات تُحفة ابن حَجَـر*»، «*الحواشی المَدَنیّة للمُقَدَّمة الحَـضرَمیّة*»، «*الفوائدُالمَدَنیة*»، «*الانتباهُ فی فضل الصّلاة*»، شەرحێک لەسەر «*فرائض تُحفـة*»، پـەراوێز بـۆ «*شَـرح خَـضرمیّه*» و «*فَتاوی الکُردی*» لە دوو بەرگدا.

شێخ موحەممەد شەوی پێنجشەممە، ١٦ی ڕەبیعولئەوەڵی ساڵـی ١١٩٤ ک. م. لـە شـاری مەدینـەی پیرۆز چاوی لێک ناوە و لە پەنا زیارەتی باوکی، نزیک بە مەرقەدی حەزرەتی عەباس، مـامی پێغەمبـەر (د)، نێژراوە.

*الأعلام*، ب٧، ل٢٢. *المُعجَم الأعلام الشَّرق و الغَرب*، پاشکۆی *المُنجِد*، ل٤٣٥. *ذیل کشف الظّنون*، ب١، ل١٢٩و ٣٤٥، ب٢، ل١٥٧ و ١١٣. *هدیةالعارفین*، ب٢، ل٣٤٢.

---

١. «رحمت شاد گردید» دەکاتە: ١١٩١.

## مەحیەدینی بەرزنجی

شێخ موحەممەد، کەسناو «محیی‌الدین»، کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیی، زانایەکی پارسا و عارفێکی ئاگا لە سەیدەکانی بەرزنجەیە کە دەوروبەری ساڵی ١١٧٩ ک. م. لە زێدی خۆی دەرکەوتووە و بۆ گوندی «قووڵە» چووە و ماوەیەک لەوێ دەرسی گوتووە و ڕێشاندەری خەڵکەکە بووە. پاشان ڕووی لە کەرکووک ناوە و لەوێ دامەزراوە و سەرەنجام ساڵی ١١٩٤ یان ٩٥ ک. م. لەو شارە ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

**لە کتێبەکانی**: «*اَلسَّیفُ‌القاطع*»، «*مَجمَعُ‌الجواهر*»، «*کشفُ‌الاعمال*»، «*اصلاحُ‌النُّفوس*» و «*کشفُ‌الکُروب*».

ساڵی لەدایکبوونی مەحیەدین، ١١٣٣ ک. م. نووسراوە.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٨٧.

## شێخ ئەحمەدی شارەزووری

کوڕی شێخ ئەلیاس، لە وێژەوانان و شاعیرانی ناوداری کوردی نیشتەجێی وڵاتی عەرەبانە کە بابی بە خاوخێزانەوە لە شارەزوور کۆچی کردووە و لە شام سەقامی گرتووە.

شێخ ئەحمەد پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، بۆ ئەستەمبووڵ چووە و لە کۆڕە ئەدەبییەکانی ئەوێدا، شاعیران و وێژەوانانی ناسیوە. دوای ماوەیەک گەڕاوەتەوە ترابلوس لە شامدا و لەو شارە، ژنی خواستووە. ساڵانێکی پاش ئەوە بۆ میسر چووە و لە لایەن ئەدیبانی ئەوێوە پێشوازییەکی گەرمی لێ کراوە. دواجار گەڕاوەتەوە حەلەب و ساڵی ١١٩٥ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

شێخ ئەحمەد لەبەر شارەزایی زۆری لە زبان و وشەی عەرەبدا، قامووسی گەڕۆکیان پێ گوتووە. لەگەڵ ڕاغیب پاشا، لە وەزیرانی خاوەن زانست و ئەدیبی دەوڵەتی عوسمانی ـ کە ماوەیەک والی میسر بووە ـ دۆستایەتی هەبووە و جاروبار شیعریان گۆڕاوەتەوە؛ ئەم بەیتە سەرهۆنەی قەسیدەیەکە شێخ ئەحمەد بۆ ڕاغیب پاشای نووسیوە:

هــذی مُنــایَ بَلَغتــُها لاوانهــا      فَالحمــدُ للافــلاک فــی دَوَرانهــا

باوکی شێخ ئەحمەد ـ وەک گوتمان ـ ناوی ئەلیاس بووە و دوور نییە هەر ئەو ئەلیاسی کوڕی شێخ ئیبراهیم، کوڕی داودی گۆڕانییە بێ کە ساڵی ١١٣٨ ک. م. لە دنیا چووە و پێشتر باسیمان کردووە.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٣٩. *فهرس مَخطوطات دارالکتب الظّاهریّه*، ل٢٢.

## شێخ مەحموودی خەڵوەتی

ئەبولمەواهیب مەحموود، کوڕی موحەممەدی کوردی سۆفی خەڵوەتی شافیعی، لە کەڵەپیاوانی زانست و عیرفانی چەرخی دوازدەی کۆچی ـ مانگییە کە شێخ عەبدوڕڕەحمانی «جبرتی» لە کتێبی «*عجائبُ‌الاثار*

*فی التّراجم و الاخبار*»دا، بە دوور و درێژی باسی دەکا و ئاوای پێدا هەڵدەڵێ: « وَ فی سَنة خَمس وَ تسعینَ وَ مائة وَ ألف توفّیَ شیخُنا وَ اُساذُنا الشّیخ مَحمود الکُردی الخَلوَتی، حَضَرَ الی مصرَ مُتَجَرداً مُجاهداً مُجتَهداً فی الوصول الی مَولاهُ، زاهداً کُلَّ ما سواهُ ...» دیسانەکەش لەسەری دەڕوا و دەڵێ: « شێخ مەحموود لە شاری صاقص[١]، لە ناوچەی گۆرانی کوردستان لەدایکبووە و لە پازدەساڵانەوە، لەگەڵ ڕیازەتکێشان و خۆ لە سەخڵەتداندا ڕاهاتووە؛ زۆربەی ڕۆژان بەڕۆژوو بووە و زۆرێک لە شەوانی بەدەم شەونوێژەوە ڕۆژکردووتەوە. بابی ماڵ و سامانێکی فرە و فراوانی هەبووە و شێخ مەحموود ئەوی بە میرات پێ گەیشتووە، هەمووی بۆ ڕەزای خودا بەخشیوە و بەشوێن زانست و سەیر و سولووکدا، پشتی لە هەموو خۆشییەک کردووە».

شیخ مەحموود لە تەمەنی هەژدەساڵاندا شێخ موحەممەدی حەفناوی، عارفی بەناوبانگی میسری، بە خەو دەبینێ و بە دڵیدا دێ کە ئەوەتا شێخ و مورشید و مورادی تۆ. بە شوێن ئەو شەوە و ئەو خەوەدا، ئەوینێکی بێبن لە قووڵایی دڵیەوە لە حاندی شێخی نەدیتوو هەستپێدەکا؛ تا سەرەنجام بۆ میسر دەڕوا و خزمەتی شێخ موحەممەدی حەفناوی دەگا و داب و دەستووری تەریقەتی خەڵوەتییەی لێ وەردەگرێ. هەروەها لە پێشگای دوو عارفی گەورەی ئەوسەردەمەی میسر، شێخ شەمسەدینی حەنەفی و سەید موستەفا بەکری، بەهرە دەبا و لە ماوەیەکی کەمدا خێروبێری دلۆڤانی ڕەبانی، دێتە هانای دڵ و دەروونی خاوێنیەوە و تا دوامین پلەی عیرفان بەرز دەبێتەوە.

شێخ مەحموود تا ڕادەیەک وازی لە عیبادەت بووە کە لە کاتی پیری و زورهانیشدا نەیویستووە بە دانیشتنەوە نوێژ بکا و داویە گۆچان ئاسایەکیان بۆی دروست کردووە، ڕاوەستاوە و شانی بەسەریدا داوە و بەپاوە نوێژەکانی بەجێهێناوە. یەک لە شاگردانی کە ماوەی دەساڵان لەگەڵی بووە و خزمەتی کردووە، گوتوویە: لەو هەمووساڵەدا تاقە سووچێکی، تەنانەت وردیلەیەشم پێوە نەبینی.

ئەم پیاوە شیاوە، کتێب و نووسراوەی زۆریشی لێ بەجێماوە؛ بۆ وێنە: «*الحکَمُ الکُردیّة*»، «*الانوار اللّائحه فی الاشرار الناجحة*»، «*نصیحةالاحباب*» و «*اَلسُّلوُک لابناء المُلوُک*». بۆ ئەم کتێبە ئاخرەی، زانایانی ئەو سەردەمە، بە شیعر و پەخشان، پەسندی زۆریان نووسیوە؛ یەکیان قەسیدەیەکی عەرەبییە کە سەیدد عەبدولقادری میسری هۆنیویەتەوە و ئاوا دەسپێدەکا:

بحَمْدکَ یا مَولایَ یَرتاحُ ناطقُه — و تَبْدُو لاربابِ الیَقین بَوارقُه
وَ منْکَ أتانَا الفیضُ و الفَضلُ وَ الهُدی — و جادَ بمَکْنُون اللَّدُنّیّ وادقُه

تا دەگاتە ئەوێ دەڵێ:

---

١. وەک پێشتر گوتمان، دەبێ هەر سەقز (**سَقِّز**) بێ؛ بەڵام بۆ لە ناوچەی گۆران؟ هەرچۆنێک بێ، لە هیچ شوێنێکی کوردستاندا «صاقص»مان نییە!

وَلـــی حُجَّـــةُ فیمـــا أقـــولُ، دلیلُهـــا  یُریـــکَ طَریـــقَ الرُّشْـــد قَـــدْ لاحَ بارقُـــه
رســـالَـــةُ مَوْلانـــا ألْمُحقّـــق أشْـــرَقت  وَ أهْـدَتْ لغُـرْب الغَـرْب نـوراً مَـشارقُه
لـــسَیِّدنا المحمـــود فـــی کُـــلّ خَـــصْلَة  عَلـی خُلُـق المُخْتـار جـاءَتْ خَلائقُـه

ئەم قەسیدە یەکجار دوور و درێژە و لێرەدا هەر بەوەندە بەسندە دەکەین.

عەللامە شێخ موستەفاش پەسندێکی بە شیعری بۆ ئەو کتێبە داناوە، کە لە سەرەتاوە وا دەسپێدەکا:

مُریـــدَ الرِّضـــا أقْبِـــلْ فَقَـــدْ لاحَ بـــشرُهُ  و فـاحَ بطیـب الهَـدْی فـی الکـون نَشْرُهُ
اذا جـــاءَ نَـــصرُ الله وَ الفَـــتح، أینَعَـــتْ  ثمـــارُ التَّجلّـــی للْقُلُـــوب وَ زَهْـــرُهُ
رســالَــةُ صــدْق وَهْـیَ للْخَلْـق رَحْمَـةٌ  و غَـوْثٌ و غَیْـثٌ جـادَ بـالنُّور قَطْـرُهُ

لە دواییدا ئێژێ:

و أسْـــتاذُنا «الکُـــرْدیُ» قُطْـــبُ زَمانـــه  و مَظْهَـــرُ مَکْنـــون الوجُـــود وَ حَبْـــرُهُ
أدامَ لَنـــا الــــرَّحْمنُ طـــولَ حَیاتـــه  و طـالَ لَنـا ضـمْنَ الـسَّلامَـة عُمْـرُهُ
عُبَیْـدُکَ یـا مَـوْلایَ یَرْجـوکَ للَّـذی  یُحَـــطُّ بـــه یَـــومَ القیـــامَـــة وزْرُهُ

شێخ مەحموودی خەڵوەتی سەرەنجام لە سێهەمی مانگی موحەڕڕەمی ساڵی ١١٩٥ ک. م. لە میسردا ئەمری خوای بەجێهێنا و شێخ سلێمانی جەمەل، شۆردن و کفن‌کردنی وەئەستۆ گرتووە و لە زیارەتانی شێخ موستەفای بەکرییان ناشتووە.

*عجائبُ الاثار فی التّراجمِ و الاخبار*. پەراوێزی *تاریخ الکامل*، ب٤، ل٩٢. *الأعلام*، ب٨ ل٦٢. *هدیة العارفین*، ب٢، ل٤١٧. *ذیل کشف الظّنون*، ب١، ل٥٦٤ و ب٢، ل٢٦.

## عەبدورڕەحمانی بانەیی

کوڕی حەسەن، کوڕی مووسا قادری، خەڵکی شاری بانە، لە پیاوچاکان و شێخان و مامۆستایانی ناوداری چەرخی دوازدەیە کە ساڵی ١١٤٨ ک. م. کاتێ کە بابی لە دمشق لە دنیا چووە، لە جێی ئەو دانیشتووە و دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکردووە؛ هەتا ساڵی ١١٩٥ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

**لە کتێبەکانی**: شەرحێک لەسەر کتێبی «*لطائف المَعارف*»ی عیدرووسی، لە سۆفییەتیدا.

موحەممەدی کوڕی موحەممەد، مەشهوور بە ئیبنوغەزی، قەسیدەیەکی بۆ لاواندنەوەی عەبدورڕەحمانی بانەیی گوتووە کە سەرەتاکەی ئاوایە:

خطْـبٌ أَلَـمَّ وَ سُـوء الخَطْـب قَـدْ دَهمـا  وَ انهَـــدَّرُکْنُ ذُرَی الْعَلْیـــاء وَ انْهَـــدما

*هدیة العارفین*، ب١، ل٥٠٥. *مَشاهیر الکُرد*، ب٢، ل١٩.



## مستەفا گۆرانی

کوڕی ئەبووبەکر، کوڕی تاجەدینی گۆرانی، زانایەکی ویژەوان، خۆش‌زمان و قسەزان بووە کە بابی بە ماڵەوە بۆ شام کۆچی کردووە و موستەفا ساڵی ١١٤٧ ک. م. لە حەلەب لەدایکبووە و هەر لەوێ خوێندنی تەواوکردووە؛ پاشان دەرسی گوتووە و جار-جاریش شیعری داناوە و سەرەنجام ساڵی ١١٩٨ ک. م. ئەمری خوای بەجێهێناوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٩٤.

## عەلی ئەفەندی

حاجی عەلی ئەفەندی، کوڕی حەسەن، لە کوردانی ئەرزڕۆم و لە زانایانی هەرەبەرزی دەوڵەتی عوسمانلی بووە کە ساڵانێکی زۆر دەرسی گوتووە و بەهرەی گەیاندووە و ماوەیەکیش بازڕەسیی ئەوقافی کردووە. پاشان بۆ دادوەری بۆ مەککەی پیرۆز چووە و سەرەنجام ساڵی ١١٩٨ ک. م. مردووە.

*هدیةالعارفین*.

## ئیبنولحاجی هەزارمێردی

عەللامەی هێژا و عارفی ئاگا، مەلا موحەممەد، کوڕی حاجی حەسەن، ناسراو بە «ئیبنولحاج»، لەدایکبووی گوندی «سنجوێ» سەر بە سەردەشت، لە حەدیس‌زانان و کەلامییانی گەورەی ئیسلامە کە بەبۆنەی شارەزایی یەکجاری لە بواری کەلامدا، بە ناوی «عەللامەی کەلامی» ناسراوە.

مامۆستا سەرەتا، خوێندنی لە زێدی خۆدا دەسپێکردووە وپاشان کەوتۆتە گەڕان و لە هەر گۆشەیەک تۆشەیەک و لە هەر خەرمانێ باقەیەکی کۆ کردۆتەوە، تا ڕادەیێ کە هیچی تێدا نەهێشتۆتەوە؛ ئەوجار ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە سنجوێ و کۆڕی دەرس‌گوتنەوە و دەورکردنەوەی دامەزراندووە. ماوەیەک لەودوا بۆ ژیان، «هەزارمێرد»ی لای سلێمانی هەڵبژاردووە و لەوێ بووە تا ئەوکاتەی لە دنیا چووە.

تاقمێکی زۆر لە مامۆستایانی ناوازەی کورد، شاگردی مامۆستا بوون؛ کەسانی وەک: مەلا عەبدولڵای بەیتووشی و شێخ مەعرووفی نۆدێیی، کە باسیان لەم کتێبەدا دەکەین.

شاعیرێک ئاوای بە باڵای ئیبنولحاجدا گوتووە:

| | |
|---|---|
| ملا محمد آن که ز دریای علم خویش | گوش زمانه پُر دُرَر شاهوار کرد |
| ذکری چو ذکر او نبود در هزار ذکر | مَردی به سان او نبود در هزار مَرد |

**لە کتێبەکانی**: «*إیقاظُالضَّرام عَلی مَن یوقعُ طلاقَ العَوام*» کە ساڵی ١١٨٦ ک. م. نووسیویە، «*مَحاسِنُ الغُرَر*» لە پەسنی پێغەمبەر(د) و شەرحێک بەسەریدا، «*رَفعُ الخفا*» لە شەرحی «*ذات الشِّفا*»دا، «*رسالة فی الاکراه الشَّرعی*»، «*حُرمة المُتعة*»، پەراوێز لەسەر «*سیوطی*» نەحو و ڕیزێک پەراوێز لە «*نُخْبة الفکر فی مُصطَلَح اَهل الاَثر*».

ئیبنولحاج هۆنراوەیەکی بەزمانی کوردی هەیە بە ناوی «*مەهدی‌نامە*» کە ساڵی ١١٨٦ داینـاوە و پارچە

هەڵبەستێکە بە شێوازی موسەممەت لە ٦٤ بەنددا، هەر بەندێک چوار باڵ. ئەوا بەشێکی کە سەبارت بە هاتنی ئاخرزەمانە:

هەر دەمێنن «اشرارُ النّاس» چیش نازان دە کەر و کاس پیریان دەبێتە اَلْخَنّاس
لێی وەردەگرن تەریقەتێ

خۆ دەکا بە شەیخی زەمان دەیانکاتە عەبدی ئەوسان نە خەیر دەزانن، نە ئیحسان
هاوار لەبەر وی غەفڵەتێ

ئیسرافیل بە ئەمری جەببار نەفخی سووری ئەکا ئیزهار چی دبیین دەنگی کوببار
هەموو دەمرن بە سەیحەتێ

چل ساڵ دەبێ چۆڵ و وێران ئەڵڵا دەبارێنێ باران هەر بە شیبهی مەنی ئینسان
ئەجساد دەڕوێن بە قودرەتێ

نەفخی دووەم کە ڕادەبێ هەموو ئینسان قایم دەبێ ئەسەر قەبری هایم دەبێ
لەبەر حیرەت و دەهشەتێ

دەیانئاژۆن بۆ مەحشەرێ بۆ جەزایێ خەیر و شەڕێ هەرکەس غەمی دێتە بەرێ
دەکێشێ ئاه و حەسرەتێ

بەحسی عیسای عالیڕوتبەت تەقدیر وەبوو کەوتە فیترەت بە هەشتادی «قَدْ تَمت»
دەگەڵ باقی عەلامەتێ

خەتمی عەلامەتان تەمام ئەوجا کۆتا بکەین کەلام ئەرجوور لە «ربّ ذی الانعام»
خەلاسن کا لە قیامەتێ

نەزمکرا بە ناخۆشی دڵ پڕ لە غەم و بیهۆشێ لە تەئریخی حەفتا و شەشی
بَعْدَ اَلْف و مێئەتێ

نەزمم کرد بە قەولی سەحیح بە لەفزی کوردی زۆر فەسیح بۆ مونسفان لا« لِلشَّحیح»
بۆ ئینتفاعی عاممەتێ

ئەزم موحەممەدی دڵڕێش حاڵم وەکی حاڵی دەروێش پەردەی غەمان دایم لە پێش
لەبەر خەوفی عاقبەتێ

وەقتی دەچینە ژێرگڵێ غەمم زۆرن لەسەر دڵێ وەک مەنجەڵی پڕ دەکوڵێ
لە خوای دەخوازین ڕاحەتێ

ئیبنولحاج دەوری ٨٠ ساڵ ژیاوە و لە دوا ساڵانی چەرخی دوازدەدا، ئەمری خوای بەجێهێناوە.

*دەقەکانی ئەدەبی کوردی*، عەلائەدین سەجادی، بەغدا، ١٩٧٨ز. ل٧٢-٨٠.

پەراوێزی *کتاب البیتوشی*، شیخ محمّد خال سُلیمانیەای، بغـداد، ١٣٣٧ ک. م.

## میرزا شەفیعی کولیایی[1]

شاعیرێکی ئاگا و زانا لە ناوچەی کولیایی و بێڵواری کرماشـان و دانیـشتووی گونـدی «ڕەزڵـە» لـە دەورانی دەسەڵاتی خوسرەو خانی والی ئەردەڵان (؟-١٢٠٤) بووە و شیعری پێدا هەڵگوتووە.

شەفیع لەگەڵ سەرهەنگ ئەڵماس‌خان ـکە پێشتر باسیمان کرد ـ دۆستایەتییەکی قورسی هـەبووە و زۆر جاران شیعریان گۆڕاوەتەوە. جارێک میرزا شەفیع بە ئارەزووی دیتنی ئەڵماس‌خانەوە لە ڕەزڵە دەردەکەوێ و بەرەو «کنووڵە» دەچێ و کە دەگاتێ، تازە دەزانێ چەند ڕۆژە عەمری خوای کردووە و کورد گوتـەنی: «نـە دۆست دیارەن نە سامانی دۆست». بە جێ سەرهەنگ، کێلەکـەی لـە ئـامێز دەگـرێ و فرمێـسکی بەسـەر گڵکۆدا دادەبارێنی و بە سۆزی دڵ شینی بۆ دەگێڕێ و شیعری بۆ دەڵێ.

میرزا شەفیع لە شیعریدا «حاجی» و جاروبار «شەفیع»ی نازناو کردووە و تا دواییەکانی چـەرخی دوازدە زینـدوو بووە. لە بەرهەمەکانی هەڵبەستێکی موناجاتە بە گۆرانی، لێرەدا بەشێکی چاو لێ دەکەین:

تـــاک تــــەوانا! تـــاک تــــەوانا! ئەڵـــڵاها! لاشـــەریک! تـاک تـــەوانا!
فەرمانفەرمای مولک وە هەفت تەبـەق بێ‌میسل، مەعبوود، بێ‌چـوون موتـڵەق
زات بـێ زەواڵ پـشت‌پـەردەی غـەیب بەحران جاری‌ساز جە لەقای بێ‌عـەیب
دەهەنـدەی نیـزام سـەبعەی سـتاران دانـنـدەی حەسـاب قەتـەرات بـاران
فـــالق شــــەفەق نەمەعرەکـــەی داج بەرەندەی مەحموود مورەسەل بە میعـراج
مەعـــسیەت‌ئـــامورز ڕەنـــد بـــادەنۆش بە تاعەت مـەغزووب جامـەی ڕیـاپۆش
شەوق‌ئەفزای گـوڵان فەسـڵی ڕەبیعـی بە موخلیسان بـەخش پایـەی ڕەفیعـی
شاهان ئیخـراج‌کـەر نـەتـەخت شـاهی ئاگا جە ئـەحواڵ مـەهــ تـا بـە مـاهی
قادر بـە ئیعجـاز شـوعلەی نـوور تـوور سـامع ئـاواز شـنۆی ڕیجـل مـوور
جە هەم سیواساز نـەهار چـەنی لـەیل میعمـار تـەڕڕاح موفەسـسەڵەی زەیـل
یەعنێ ئاب و خـاک بـێ‌عـەیب تـاهیر خاس جەیەک خاستەر هوەیدا و زاهیر
مـن عەبـد موزنیـب حـەقیر خـوارم گرفتـــار دەرد بـــــەدی کـــــردارم
حوجرەی قـەلبم کـەرد وە کاروانـسەرا وێم کەرد وە شەریک نە بـەیع و شـەرا
وەلبـووس ئەڵـوان پۆشـام وە قامـەت بـێ‌پـەروا جـە کـار فـەردای قیامـەت

١. بڕێک بە «**شەفیعی دینەوەری**» ناویان لێ بردووە.

ڕۆ نه فیکر و زیکر وەسواسەی وەسواس     شەو نە سیاسەت مەکر «الخَنّاس»
نەواتەنیم وات، نە کەردەنیم کەرد     ڕام وە سەرمەنزڵ نافەرمانی بەرد
هەر ئەمرێ خیلاف شەرع ئەنوەر بی     تەقالام پەرێش تەواناتەر بی
ڕەویەی بەدکاران کەردم وە پیشە     جەواهیر نیام نە ڕەهن شیشە
گەوهەردانەی پاک ئیمانم هاڵا     هانە بەیع شەرت خەرید کاڵا
چ خاک وەسەر کەم، چ تەور بسازم؟     ئاخر مەکەرووش وە بەیع لازم
ئیسە چون مەستان مەیزەدەی بێعار     جە خاب غەفڵەت بیەنان بێدار
تەماشای تۆمار کەردەی وێم کەردەن     تەقریر خەتام جە حەد ویەردەن
مونشی دەستچەپ نامەی ئەعماڵم     بەزەییش ئاما وە بەدی حاڵم
کارنامەی عسیان گشت نیام نە مشت     وە جەڕووی دەفتەر مەرقوومەن وە زشت
نامەی دەستڕاست نگام کەرد پێدا     حەرفێ جە خاسە هیچ نەبوو تێدا
مونشی وات: ئەعماڵ خاسەی تۆ چێشەن؟     نامە سەرتاپا سفیدی وێشەن
سەترێش نویسان جە ڕووی کنایە     ئەبله! سیابەخت! جە کۆن سەرمایە؟
مایەت سووچیان، عیسیانبارەنی     فەردا جە دیوان شەرمەسارەنی
ئیسە زانانم دونیا بێوەفان     بازاڕ بێسوود پڕ جەور و جەفان
تۆنی فەریادڕس، مەعبوود دانا     بارخانە سەنگین، تەن ناتەوانا
نامەی سفیدیم سیاکەرد وەزشت     وێم کەرد وە حەممال دەین عالەم گشت
گەوهەر بیم ئەو فەسڵ کنیام نەسەدەف     جسم مەلەک بیم، وێم کەرد وە کەشەف
تاوان وێمەن، جە وێمەن تاوان     بەدکاریم تاوان، نیکیم نەتاوان
ئیسە جە کردار وێم پەشیمانم     شەرمەسار ڕووی سارای دیوانم
نە بەحر عسیان کەشتیم شکەستەن     ئومیدم بە زات پاک تۆ بەستەن
قادر! بە قودرەت زات قەدیمت     بە نوور حیجاب عەرش عەزیمت
بە ئایەی قورئان، کەلام قەدیم     بە ئینجیل عیسی بە تەورات کەلیم
بە پەیغەمبەران، ئادەم تا خاتەم     بە ئاڵ و ئەسحاب پاک و موعەززەم
بەشق «ابوبکر» خەلیفەی ئەکبەر     جادار میحراب ڕەسووڵ سەروەر
ڕەفێق شەفێق مەحموود موختار     «ثانیَ اثْنَیْنِ اِذْهُما فیالغار»
بە عیشق ئەمیر مومینان (عُمر)     ئاشکارا ساز دین پەیغەمبەر
بەشق «ذیالنُّورَیْن» پڕ حەیا و شەرەف     گردئاوەرەندەی ئەوراق موسحەف

باجــەتی «حَیــدر» کــەرِڕار ســەفدەر
قــاتڵ عەبــدوەد، کوشــەندەی عەنتــەر

بــە دو لولــوی پــاک نــازدار ڕەســوول
جگەرگۆشــەکان فاتمــەی بــەتوول

بـــە بانـــگ تـــەکبیر غازیـــان ڕەزم
ڕەزاشان بـە عـەزم غـەزا مـەبۆ جـەزم

بـە ئـیخلاس خـاس تەوبـە دوروسـتان
بە پاکی دامـەن عیـسمەت پەرەسـتان

بـە حاجـەتی قـەدر قـورب گردێـشان
تەقـسیر «شـفیع» ببەخـشی پێـشان

ئـەو سـاحیب تەقـسیر، تـۆ پادشـاهی
ڕای عــەرزش بــڕیا جــە ڕووســیاهی

غەرقەن نە عیسیان جەرای بەدنەخشی
مەغفیرەت جـە تـۆن مـەبوو ببەخـشی

ئومیـد نـە دەرگـات پـەی خەلاسـیەن
ئافەریـدەی تـۆن ئـەر سـەد عاسـیەن

*مُناجات‌های جاویدان ادب کُردی*، ل٩٢. چەند جونگی دەسنووس.

## عەبدولوەهابی ئامیدی

عەبدولوەهابی کوڕی حوسەین، کوڕی وەلییەدینی ئامیدی، زانایەکی هێژا لە مامۆستایانی شـاری دیاربـەکر بووە کە بەرهەمی نووسراوەشی لێ بەجێ ماوە؛ یەکیان: شەرحێکە بۆ نامیلکەی «*وَلَدیّه*» کـە سالّـی ١١٩٠دا تەواوی کردووە و بۆخۆشی سالّی ١١٩٩ لە دنیا چووە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٦٤٧.

## عەبدولەتیفی گۆرانی

کوڕی ئەحمەدی گۆرانی و لەدایکبووی سالّی ١١٥٠ ک. م. زانایەکی ویژەوان و شاعیر بووە کە ماوەیەکی زۆر لە شاری حەلەبدا دەرسی گوتووە و فتوای داوە و تا دواییەکانی چەرخی دوازدە ژیاوە.

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل٣٧.

## موحەممەد ئاغای زەنگەنە

موحەممەد ئاغا لە کوردانی هۆزی زەنگەنەی سەر بە کەرکووکە کە ئەحمە بەگی زەنگەنە، سـەرۆکی خـێڵ ـ کە خزمی نزیکیشی بووە ـ سەرپەرشتی و دابین‌کاری سوارانی پێ سپاردووە.

موحەممەد ئاغاش وەکوو ئەحمەد بەگ، سەری لە شیعر و شاعیری دەرکردووە و ماوەیەک «زەبـوونی» و پاشان «غەمناک»ی بۆ نازناو هەڵبژاردووە و بەو بۆنەوە کە غەمناکێکی تریشمان دوای ئەو هەیە، موحەممـەد ئاغا بە ناوی غەمناکی گەورە دەناسین.

وەک لە باسی ئەحمەد بەگی زەنگەنەدا گوتمان، جارێک موحەممەد ئاغا دڵی لە ئەحمەدبـەگ ئێـشێ و



لێ دەتۆرێ و سەری خۆی هەڵدەگرێ.

ئەم پاچە شیعرە، موحەممەد ئاغا لە جوابی ئەحمەد ئاغادا ـکە بە شیعرێک دڵیداوەتـەوە ـــ نووسـیویە و بۆی ناردووە.

میرزام! سیاسەنگ، مـیرزام سیاسـەنگ
میرزام وەدەس تۆن دڵ وە سیاسـەنگ
میرزام ئاوەردی سیاسـەت سـەدڕەنگ
ئاخر ئاوەردی سەنگ سـەرد وەدەنـگ
حـــەقم دای وەدەس حـــەقدارانـــەوە
مینــــای دیـــدەم دای وەخارانــــەوە
ئاخ بـۆ زەڕڕیـن کـۆ، قوللـە خورمـادار
ســـەیر مـــەهرەوان ویـــەرد عومـــەریار
«زەبـوونی» وەی ڕەنـگ دڵهەراسـانن
ئـازیز تـەرک زێـد جـە تـۆ ئاسـانەن
ئازیز، هامسەران! عـومرم هـەر زێـدەن
زێدش وە بێخـۆیش هـەر نائومێـدەن
هەرچەند هـوێم مـەدەم زەوی قێنـەگا
نـازم جـــۆش واردەن دی ناخوێنـــەگا
ئـــاو عەواســـان، ســـەدای ڕۆڵـــەڕۆ
خـەیلێ خاسـتەرن جـە بـوزورگی تـۆ
غەمان گشت کۆکۆ جەم جـە لام جەمـەن
شـــینەن، زاریـــەن، زایـــڵەن، تەمـــەن

موحەممەد ئاغا لە کۆتایی چەرخی دوازدەدا، ژیانی کۆتایی هاتووە.

گۆڤاری مانگانەی *دەنگی گیتی تازە*، س ١٩٤٥ز. ژ١و ٢.

# چەرخی سێزدەهەم

## زینەدینی سوورەبەردی

عەللامە شێخ زینەدین موحەممەدی کوردی، کوڕی عەلی، خەڵکی سوورەبەرد، لە زانایان و مامۆستایانی دەورانی خۆی بووە کە ساڵی ١٢٠٠ ک. م. لە دنیا چووە.

**لە کتێبەکانی**: «*تَنویعُ العُلُوم*»یان ناو بردووە.

بە گێڕانەوە لە: پێشەکی ئایەتوڵڵا نەجەفی مەرعەشی، بۆ بەرگی یەکەمی *کشفُ الظُّنون*، اُفست، تهران. ١٣٨٧ ک. م.

## عیسای خۆشناوی

عیسا، کوڕی ئەحمەد، کوڕی میکاییلی خۆشناوی، لە شەرعزانانی شافیعی و موفتی و مامۆستای شاری کەرکووک بووە کە لە سەرەتای چەرخی سێزدەدا کۆچی دوایی کردووە.

**لە کتێبەکانی**: تەفسیرێکی *قورئان* لە سوورەتی مەریەمەوە تاکوو ئاخر، بە عەرەبی. تەفسیری سوورەتی فەتح و ئیخلاس بە ترکی و سەرجەمێک نامیلکە و پەراوێز لە بەرگێکدا.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٣٤٦. *ذیل کشف‌الظّنون*، ب١، ل٣٠٦ و ٣٠٧.

## کامی ئامیدی

شێخ موحەممەدی شەعبانی کامی، کوڕی ئەحمەد، کوڕی مەحموود. لە بنەڕەتدا خەڵکی حسن‌کیفا و لەدایکبووی ئامید، زانایەکی ناوداری دیاربەکر بووە کە ساڵی ١٢٠١ لە دنیا چووە.

**لە کتێبەکانی**: «*اَلرَّدُّ عَلَی النَّصاری*»، «*مَوْلِدُالنَّبی*»، «*مُنشَآت*» و دیوانی ئەشعار.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٣٤٦.

## مەلا مەحموودی موفتی ئامێدی

زانایەکی ئاگا و مامۆستایەکی شارەزا و موفتی شاری ئامێدی بووە کە ساڵی ١٢٠٢ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

مەلا مەحموود کتێبێکی لە تەفسیری سوورەی فاتیحەدا نووسیوە و تێیدا تەنیا پیتە بێخاڵەکانی هێناوە. بە واتەیەکیتر لەو کتێبەیدا تاقە خاڵێکی دانەناوە!

*مَشاهیرالکُرد*، ب٢، ل١٨٧.

## موسافیر

شێخ موقیمی موسافیر، لە زانایانی گەورەی شاری سنە و مەشایخی بنەماڵەی مەردۆخی تەختە بووە کە جاروبارە شیعریشی داناوە. تا درنگێک لە تەختە و ساڵانی دوایی عومری لە سنەدا، دەرسی گوتووە و سەرەتای چەرخی سێزدە دنیای بەجێهێشتووە.

**شیعرێکی موسافیر**:

تـا بـه کـی شـبها رسـانم بـر فَلَـک فریـاد را — چون کُنم راضی من این پژمان دل ناشـاد را
گر چنین گـردد عَلـی‌رغْـم مـن بیچـاره چـرخ — سیل غـم زیـن کُلبـه ناگـه مـی‌کَنَـد بُنیـاد را
هر کُجا رو می‌نهم ظلم است حـاکم بـر جهـان — چنـد بتـوانم تحمـل ایـن همـه بیـداد را
هر طـرف گسـترده‌انـد ایـن نابکـاران دام مکـر — مَر خدا خـود دفـع سـازد ایـن همـه شیّاد را
بسکه دیدم زین به ظاهر دوستان، مکـر و نفـاق — دوش کـردم آگـه از درد درون اسـتاد را
گفت: گر خواهی سلامت، گوشه‌ای فارغ نـشین — از کسی زین ناکسان هرگز مخـواه امـداد را
خود به فکـر چـاره‌ی درد درون خـویش بـاش — نفکَـن انـدر قیـد منَّـت خـاطر آزاد را
با «مُسافر» گر دو روزی بخت یاور شـد، چـه شـد — با خـس و خاشـاک رَه باشـد رفاقـت بـاد را

*حدیقه‌ی امان‌اللهی*، ل٤٠٦.

## نامی کەلهوڕی

ئاغا موحەممەدی نامی لە تایفەی کەلهوڕ و لە نزیکانی ئەلاقولیخانی زەنگەنە، حاکمی کرماشان بووە کە تا ساڵی ١٢١٤ ک. م. ژیاوە و وەک نووسەری «*تُحفة‌العالَم*» دەڵێ: ئاغا موحەممەدی نامی پیاوێکی جوانچاک، ناودار لە توندنووسیدا و خاوەن دیوانی شیعرێکیش بووە و ئەم دوو غەزەلە هی ئەوە:

کاکل عنبرفشان، یار من افشان کـرد بـاز — یک جهان جمعیت دل را پریشان کـرد بـار
روزگارم را سیه کرد از دو چشمان سیاه — سینه‌ام را چاک از چـاک گریبـان کـرد بـاز

وعـدەی قَتـل مَـرا داد آن مَـه نامهربـان | طـالع وارون مـن او را پـشیمان کـرد بـاز
خط او خضر و دهانش چشمەی حَیوان بـود | خضر مسکن در کنار آب حیـوان کـرد بـاز
یار در سَر کَی هوای پُرسش «نـامی»ش بـود | از گدای بی‌نشانی یاد، سـلطان کـرد بـاز

* * *

دور از جانان نمردم، سخت‌جانی را ببین | زنده ماندم بی‌جمالش، زندگانی را ببـین
با رقیبان مهربان گشت و بـه مـا نامهربـان | مهربـانی را نگـر، نامهربـانی را ببـین
من فشانم جان ز مهر و او ستاند جان ز کین | جانفشانی را نظر کُن، جان‌ستانی را ببـین
شادمان غیر، از رُخش، من بی‌رخش ناشادمان | شـادمانان را نگـر، ناشـادمانی را ببـین
ای که می‌پُرسی ز اَحـوال دل «نـامی» مـا | چهرەی کاهی و اشک ارغـوانی را ببـین

*تذکرەی شُعرای کرمانشاه*، ل١٣٨. *تُحفه‌العالَم*، ل١٢٥.

## سیرِڕی سنەیی

میرزا لوتفوڵا، نازناو «سرّی»، کوڕی عەبدوڵڵا و وەزیری حاجی میرزای وەزیری و لە بنەماڵەی وەزیرییەکانی شاری سنە، لە سەرەتای چەرخی سێزدەدا ژیاوە و پیاوێکی زانا و وێژەوان و شاعیر بووە.

ئەم غەزەلە فارسییە هی ئەوە:

فـراق آمـد پـیش و غـم دل از اَثَـرش | چو مُرغ بسْمل، در خون نشست بال و پَرَش
غـم جـدایی لعلـت بـه بـاده مـی‌گفـتم | بود کباب جگـر، زاد و توشـەی سَفَرش
بـه راه منـزل جانـان غریـب عاشـق را | چنان گریست که خون اوفتـاد در جگـرش
ز درد هجـر همـی‌گـریم و همـی‌گـویم | درخت دوستی این است عاقبت ثمـرش
بیـا و پیکـر خـونین کُـشتەی خـود بـین | چگونه لکەی خون گشته است زیب و فَرَش
در این سفر نرسیده به دوست، «سرّی» مُرد | نبـود یـار کنـار مُحـبّ مُحْتَـضَرش
بـه اختیـار نـشد عـازم سـفر «سـرّی» | فراق دوست، ز کاشـانه کـرد دربَـدَرش

لە جونگێکی دەسنووس.

## ساڵحی سنەیی

سەید موحەممەد، نازناو «صالح»، مرۆیەکی بەئیمان، خاکەسار و شاعیرێکی خـۆش زەوقـی خەڵـکی سـنە بووە کە لە چەرخی سێزدەدا ژیاوە. ئەم شیعرە هی ئەوە:

آی به دنیا شده مغرور و ز عُقبی شده دور | از اَجَل غافلی و لیک به خویشی مغـرور

چند نازی تو به این سیم و زَر و مَنصب و جاه
چند خواهی که شوی در نَظر حق مقهور
گر خوری، یا بدهی با تو همان می‌مانَد
جُز کَفَن، با تو زر و سیم نیایند به گور
خود به تلخی زیَد و شهد به عالم بخشد
کوشش و جُود و کَرَم یاد بگیر از زنبور
این همان کهنه رباطی است که بود اندر آن
سنجر و خُسرو و دارا و قُباد و فغفور
همه رفتند و همین کُهنه‌سرا باز به جاست
من و تو نیز نمانیم و بماند مَعمور

*حدیقه‌ی امان‌اللهی*، ل٣٩٩.

## مەلا خدری ڕوواری

مەلا خدر، کوڕی مەلا ئەحمەد، خەڵکی گوندی ڕووار، لە ٨٠ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی باشووری سنە و سەر بە هەورامانی تەخت، زانایەکی کارا و مامۆستایەکی ئاگا و شاعیرێکی توانا بووە کە دوابەشی خوێندنی لە قەڵاچوالانی لای سلێمانی، لە خزمەتی مەلا موحەممەدی بیاری و پاشان لە سنە و لە بەردەستی عەللامەی ئەو سەردەمە، شێخ وەسیمی یەکەمی تەختی مەردۆخی بووە.

**لە کتێبەکانی**: بە کوردی و عەرەبی هێندێک کتێبی داناوە؛ لەوانەدا دوو هۆنراوەی کوردی گۆرانی بە ناوی «*ڕۆڵە بزانی*» و «*دەوڵەتنامە*» بەناوبانگن. *ڕۆڵە بزانی* هەڵبەستێکە لەمەڕ بڕوای ئایینی و فەرمانی دینەوە، بۆ منداڵان و ئاوا دەسپێدەکا:

ڕۆڵە بزانی! ڕۆڵە بزانی!
فەرزەن وەر جە گشت مەبۆ بزانی
ئەسڵ و فەرع و دین چەنی ئەرکانی
چەنی ئەحکامان پەی موسوڵمانی
مەبۆ بزانی، هەریۆ پەنجەنی
ئەرچی پەنجەنی، ئەمما گەنجەنی
ئەسڵ دینمان زاتەن و سیفات
مەبدەء و مەعاد، پەنجوم نبووات
فەرع دینمان نمانە و ڕۆچی
زەکات، حەج، غەزا، بزانە تۆ چی

ئەم هۆنراوە لە ساڵی ١٣٣٨ ک. هـ. بە خەتی خوالێخۆشبوو عەلینەقی هوشیار، لە تاران چاپ کرا.

*دەوڵەتنامە* باس لەو داب و دەستوورانە دەکا کە مەلا خدر لە قسە و ئاکاری موسوڵمانانی پێشوو خوێندوویەتەوە و کردوویەتە شێعری کوردی. ئەوا چەند بەیتی دوایی ئەو هۆنراوە کە ساڵی ١١٩٧ ک. م. هۆنیویەتەوە:

بە مەعنی نامش هەن دەوڵەتنامە
خامەی وەش‌کەلام ئامە یا نامە
یە واتەی خدر ئیبن ئەحمەدەن
موحتاج ڕەحمەت خوای ئەحەدەن
بە نەزمش ئاوەرد پەریٚ ئەتفاڵان
پەی مەکتەبیان و ساحیب‌ئیقباڵان
بۆ بە نموونە پەی کەماڵشان
نیشانیٚ وەبۆ جە ئیقباڵشان

تــــاریخ نــــەزمش مـــەبۆ شــــنەفتەن هــەزار و یەکــسەد نــەوەد و هەفتــەن
مانـــگ ڕەمـــەزان شـــەهر موبــارەک ئی نەزمە پـەی خـەیر دریـا تـەدارەک
جـە مەسـجید نـوێ ئـاوایی سـەربەند بـەڵ موسوڵـمانێو پـێش بگێـرۆ پەنـد

زا و مەرگی مەلا خدر ساڵانی ١١٣٨ و ١٢٠٥ ک. م. ڕوویداوە.

جونگێکی دەسنووس و سەرجەمی کارەکانی مەلا خدر.

## مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی

مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلا موحەممەد، لە زانایان و مامۆستایانی ناوداری کوردە کـە لـە گونـدی دێلێـژە، لـە قوتابخانەکەی بابیدا دەرسی گوتۆتەوە و وەعزی داوە و هێنـدێک کتێـب و نووسراوەشـی لـێ بـەجێ مـاوە و سەرەنجام ساڵی ١٢٠٦ ک. م. ئەمری خوای بەجێ هێناوە.

پێشەکی دیوانی بێخودی سلێمانیەیی.

## مەلا جرجیسی ئەربیلی

مەلا جرجیس، کوڕی مەلا موحەممەدی ڕەشادی، دوای فێربـوونی وانـە سـەرەتاییەکان، بـۆ درێـژەدان بـە خوێندنەکەی، لە زێدی خۆی دەرکەوتووە و ماوەیەک لە ماوەران، فەقێ دوو مامۆستای گەورەی حەیـدەری: مەلا فەتحوڵا و براکەی (مەلا ئیسماعیل) بووە و پاشان خزمەتی سیبغەتوڵا ئەفەندی حەیدەری گەیـشتووە و دوای تەواوکردنی دەرس و دەور، لە هەولێر ئیجازەی وەرگرتووە و هەر لەوێ دەرس گوتنەوەی دەسپێکردووە.
ساڵی ١١٨٠ ک. م. مەلا بۆ مووسڵ چووە و ماوەیەک لەوێ دەرسی گوتووە و ئەمجار گەڕاوەتەوە هەولێر و پاش شەش ساڵان، لەسەر داوای سلێمان پاشای جەلیلی، والی مووسـڵ، دیـسان چۆتـە ئـەو شـارە و لـە مزگەوتی عومەرییەدا درێژەی بە کاری خۆی داوە. ساڵی ١٢٠٤ ک. م. شێخ موحەممەد ئەمینی عومەری، لە زانایانی گەورەی مووسڵ، وەفاتی کردووە و مەلا جرجیس لـە جێـی ئـەو دانـدراوە و سـەرەنجام ساڵـی ١٢٠٦ ک. م. لەو شارە، ئەمری خوای بەجێ هێناوە.

مەلا جرجیس فەقیهی بێ قسە و عەللامـەی دەورانی خـۆی بـووە و لـە پارێزکاریـدا نـاوی دەرکـردووە و تاقمێکی زۆر لە زانایانی مووسڵ و هەولێر، وەکوو شـێخ سـەلاحەدین یۆسـف ئەفەنـدی، کـوڕی ڕەمـەزان، قوتابی و موجازی ئەو بووگن.

مەلا جرجیس شاعیریش بووە و ئەم چەند بەیتە عەرەبییە هی ئەوە:

وَ رُبَّ حَمـامَـة بالـدَّوْح باتَـتْ بأشْـجان وَ حُـزْن مُـسْتَكنِّ
علـی أیـام وَصْـل حیْـثُ فاتَـتْ تُعیـدُ النَّـوْح فَنّـاً بَعْـد فَـنِّ

أُقاسـمُها الهُمُـومَ اذَا اجْتَمعْنـا — وَ تَـرْوی قـصَّةَ الاشْـواق عَنّـی
عَلَـی حُکْـم الهـوی فینـا اقْتَـسَمنا — فَمنْهـا النَّـوْحُ وَ العبَـراتُ منّـی

ئەم شیعرەشی بۆ دۆستێکی بە ناوی سەعد ـکە نەخۆش بووە ـ نووسیوە:

کُـنْ مُعافـاً و بالـسَّعادة دائـم — وَ عَمُـودُ الـسُّعُود بـالْعزّ قـائم
اَنْـتَ سَـعْدُ الزَّمـان فـی کُـلّ حـال — کَیْفَ نَرْضی بأنْ نَـرَی الـسَّعْدَ نـائم
أرْتَجـی رَبَّنَـا الکـریم شـفاءً — عـاجلاً سـیّدی! رَفیـعَ الـدَّعائم
بـارکَ الله صَـوْمَکُمْ بهنَـاء — وَ ثَنـاء وَعـز مَجْـد مُلائـم

*غایةُالمرام.*

## شێخ موعینەدینی کاشتەری

شێخ موعینەدین،کوڕی شێخ مەجدەدین، کوڕی شێخ ئەبووبەکر، کوڕی حاجی شێخ مستەفا تەختەیی مەردۆخی، یەکەم کەس لە باپیرانی نووسەری ئەم کتێبەیە کە تەختەی بەجێهێشتووە و لە ئاوایی «کاشتەر» ـکە کەوتۆتە ٧٠ کیلۆمیتری ڕۆژاوای باشووری سنەوە ـ نیشتەجێ بووە.

موعینەدین سەرەتا لە گوندی تەختە خوێندوویە و دواجار بە قوتابخانەکانی کوردستاندا گەڕاوە، تا بەتەواوی شارەزا بووە. ئەوجار خزمەتی شێخێکی تەریقەتی سوورەبەردی گەیشتووە و لە کۆڕی مریدانیدا دانیشتووە و دوای ماوەیەک سەیر و سولووک، گەڕاوەتەوە تەختە و سەرەنجام لەسەر داخوازی خەڵکی کاشتەر ـکە زۆریان بڕوا پێ بووە ـ بۆ ئەو شوێنە کۆچی کردووە و کۆچی یەکجاریشی لە ساڵی ١٢٠٩ ک. م. هەر لەوێ ڕوویداوە.

شێخ موعین زانایەکی هەڵکەوتە و عارفێکی ئازادە بووە کە لە شیعریشدا سەری دەرچووە و جاروبار شیعری عیرفانی بریتی لە ئامۆژگاری و ڕێنوێنی، بە ناوی «مُعینی»وە گوتووە. ئەمەش چەند نموونە لە شیعرەکانی:

تا کی ای دل پایبند جلوەی دنیا شدن — لعبت نامهربان را عاشق و شیدا شدن
راه حق گُم کرده، در دنبال شیطان تاختن — پشت بر دین کرده، دنبال هوس پویا شدن
نابکاری تا بدانجا چون بَهایم زیستن — مردمی را ترک گفتن، سخت بی‌پروا شدن
ترک گفتن نابکاری‌ها و اعمال شنیع — توبەکردن، عفو حق را عاقبت جویا شدن
عُمر در غفلت گذشت ای دل دگر بیدار شو — حَیف عُمری صرف کردن، تابع اَهوا شدن
اَی «مُعینی» حبّذا در سایەی حُسن عَمَل — مَورد آمرزش خَلّاق بی‌همتا شدن

* * *

آنکـــــه مـــــا را ز خَلـــــوت نــــابود — مـــی‌بَـــرَد تـــا بـــه جلـــوه‌گـــاه سُـــجُود
بـــار دیگـــر کـــه از ســـموم هـــلاک — رُخ بتـــابیم زیـــر پـــردەی خـــاک
هـــم توانـــد بـــه امـــر کُـــن فَیَکـــون — آرد از پـــــردەی عـــــدَم بیـــــرون

شێخ موعینەدین لە کاشتەردا، بە یارمەتی و هاوقۆڵی خەڵکەکە، مزگـەوت و مەدرەسـەیەک دەکاتـەوە و مامۆستایەکی هێژای لە هەورامانەوە بۆ بانگ دەکا. قوتابیان لە هەموو لایەکەوە ڕوو لـەوێ دەکـەن و شـێخ بۆخۆشی تا دەستی داوە، دەرسی‌گوتۆتەوە و بۆ ڕاهێنانی فەقێیان تێکۆشاوە.

لە بەیازێک کە بە خەتی خودی شێخە و ماوەتەوە، دەردەکەوێ کە خوێندنی لە قەرەداغ تـەواو کـردووە. لە خوار هەموو لاپەڕەکانی بەیازەکەیدا مێژووی ڕۆژ و مانگیشی نووسیوە. بەوەدا دەردەکەوێ کـە سـاڵانی ١١٧٢ تا ١١٧٦ لە قەرەداغ بووە. بەشێکی دواییشی لە کاشتەردا نووسیوە و تا ساڵی ١٢٠٨ ـ ساڵێک پـێش کۆچی دوایی ـ درێژەی پێ داوە.

سەرباشقەی شێخان، شێخ عەبدولغەفوور «مُذنِب»،کوڕی شێخ موعین، بۆ ساڵی لە دنیا چوونی بابی، ئـەم چەند بەیتەی داناوە:

مُعـــین دیـــن و دانـــش شـــیخ کامـــل — مُریـــد راه حـــق بـــا ذکـــر و توحیـــد
چـــو بَـــست از دارفـــانی بـــارِ رحلـــت — روان شـــد ســـوی کُـــوی خُلـــد جاویـــد
فـــراقَش ناگهـــانی رنـــج بـــی‌حَـــدّ — بـــه «مُـــذْنب» انـــدر ایـــن عـــالم چـــشانید
بـــه تـــاریخ وفـــاتش هـــاتفی گفـــت — «معـــین مـــا بجَنَّـــت شـــاد گردیـــد»[1]

*تاریخچەی خاندان مَردوخ.*

## ئەحمەدی کۆر

شاعیرێکی عارف و سۆفی مەشرەب بووە کە هێندێک کەرامەتیشی لێ دەگێڕنـەوە. بـە قـەولێک خەڵـکی دێیەکی لای شنۆیە و بە قەولێکی تر، هـی گونـدی «عـەمبار» لـە نزیـک بۆکانـە. تـاقمێکیش دەڵـێن لـە ناوچەیەکی نێوان دهۆک و زاخۆوە هاتۆتە دنیا و دواجار چۆتە موکوریان و لەوێ ماوەتەوە. هـەرچۆنێک بـێ زیارەتی لە عەمباری لای بۆکانە.

کۆر بە هەورامی واتا کوێر و بەو بۆنەوە وایان پێ گوتووە کە نەیبینیوە؛ بەڵام نەنووسراوە ئاخۆ لـە سـەرەتاوە کوێر بووە یان پاشان تووشی هاتووە؟

ئەحمەدی کۆر لە ماوەی ژیانیدا سەفەری زۆری کردووە و بـە شـارانی کوردسـتان و عـیراق و حیجـازدا

١. بە حیسابی ئەبجەد، دەکاتە ١٢٠٩، ساڵی کۆچی دوایی شێخ موعین.

گەڕاوە و تا سەرەتاکانی چەرخی سێزدە ژیاوە. سەیر لەوەدایە چەندی لەمەڕ پاکی و پارێزکاری و دینداریيەوە قسە کراوە، لە ژین‌نامەکاندا ئاماژەیەک بە ساڵی هاتنە دنیا و لە دنیا چوون و چۆناوچۆنی ژیانی نەکراوە و هیچیان لەو بارەوە هیچیان نەنووسیوە! دیسان وەک دەڵێن شیعری کوردی زۆری بووە؛ بەڵام بێجگە لەوەی لێرەدا دێ، چیتر دەستی نووسەری ئەم کتێبەی نەگرتووە:

دیم لە خەودا شاد و خوڕڕەم یاری من بادەی دەوێ
دەس لە ناو دەس دەم لە ناو دەم، وەی لە شادی ئەو شەوێ
ئەو شەوە عەیش و نیشات بوو، کەیف و ئاهەنگ و بیسات
بۆکزەی دڵ ئەو نەجات بوو، ناگەهان ڕابووم لەوێ
وەختێ بێدار بووم نە کەس بوو، تەن سەراسیمەی هەوەس
ڕۆح هەراسانی قەفەس بوو، لاڵ و کەڕ کەوتم لەوێ
لاڵ و کەڕ وەک «ذوالعیوب»ان کەشفی ئەبسار و قولووبان
بمەدەنێ بێڕووی حەبیبان، «حاشَ لله» نامەوێ
خاکی نەعلی ئەسپی تاها سورمەیە بۆ چاوی ئەعما
ئاخ لە ئەم دونیا و لە مەکری، کەس بە ڕاحەت ناخەوێ
«ئەحمەدی» کوڕ دڵ وفاق‌دە، مەیلی وەسڵی یار تەلاق دە
یەک دەخوازی، یەک تەلاق دە، تێکڕا نابن دوو هەوێ

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ١٦، ل ٣٤٠ و ٣٤١.

## مەلا شەریفی قازی

کوڕی مەلا مستەفا شێخولیسلام، لە بنەماڵە گەورەکانی کوردستان و پیاوێکی زانا، وێژەوان و خۆش‌خەت بووە و لە ئەستێرەناسی و ئاسمانپێویشدا سەری‌دەرچووە.

وەک مەستوورە خانمی ئەردەلان، شاعیر و مێژوو نووسی سنەیی، لە «*تاریخ اردلان*»دا دەڵێ: قازی کتێبێکی لەمەڕ مێژووی بنەماڵەی ئەردەلانەوە نووسیوە؛ کە بەداخەوە دەستم نەکەوت.

مەلا شەریف ساڵی ١١٥٢[١] ک. م. لە دایک بووە و لە سەرەتای چەرخی سێزدەدا لە دنیا چووە.

١. خواجە سادقی ئەردەلانی بۆ ساڵی هاتنە دنیای مەلا شەریف گوتوویە:

سپاس و ثنا لایق خالقی — که بر بندگان هست دایم
ز بحر کَرَم مُصطفی را بداد — دُری همچو روح مجسم

←

*تاریخ اردلان*، مَستورەی کُردستانی.

## مەلا عەبدوڵڵای بریفکانی

مەلا عەبدوڵلا، کوڕی مەلا ئەحمەد، زانایەکی خەڵکی «بریفکان»ی سەربە مووسڵە کە لە زاخۆ ژیاوە و ماوەیەکی زۆر موفتی و مامۆستای ئەوشارە بووە و کتێب و پەراوێزی زۆریشی داناوە و ساڵی ١٢١٠ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

*مَشاهیرالکُرد*.

## عەلی حەزووری ئامیدی

عەلی کوڕی موحەممەدی حەزووری ئامیدی شافیعی، زانایەکی تەفسیر و فیقهـ و لە شاری ئامید (دیاربەکر) بەرپرسی فوتوا و دەرس‌گوتنەوە بووە و ساڵی ١٢١٠ک. م. لە دنیا چووە. لە بەرهەمەکانی تەفسیرێکی سوورەتی فاتیحە بە زمانی عەرەبییە کە پیتی خاڵداری تێدا نییە.

*لُغت‌نامەی دهخدا*، چاپ ١٣٢٥، پیتی ح، ل٧٦.

## شێخ ئەحمەدی بستی

شێخ ئەحمەد خەڵکی گوندی «بست» سەربە شارەدێی «خوڕخوڕە»ی لای دیواندەرە، پیاوێکی پاێزگار، عارفێکی بەئاکار و لە مریدانی شێخ ئیبراهیمی بستی، عارف و ئەولیای گەورەی ئەو سەردەمە بووە و «رئیس‌ُالاولیا»یان پێ گوتووە.

شێخ لە شیعریشدا دەستێکی بووە و ئەم غەزەلە هی ئەوە:

هر بنده که منظور بُود در نَظَر صُبح — پیوسته قَسَم یاد نماید به سر صبح
روشندل آگاه نهد رو به سحرگاه — شبهاست که خورشید بود در سفر صبح
از لذَّت شیرین تو تا چند، خدا را — در مَزرع دل سبز شود نیشکر صبح
آن لحظه که مرغان چمن گرم وداعند — صد قافله فریاد بود پی سپَر صبح
در موج صفا دیده چمن صورت خود را — شبنم بود آیینه‌ی نظّاره‌گر صبح

---


محمد شریفش از آن نام — که اشرف بود بر وضیع و
بگفتا به تاریخ او هاتفی — «شد از جنس آدم، محمد

سەرجەمی پیتەکانی باڵی ئاخر، بە حیسابی ئەبجەد، دەبێتە ١١٥٢.



سايد فلك از مَوج شَفَق هر شَبَه صَندل          شايد كه به تخفيف رسد دردسر صبح
عُمرى است كه در عالم دل ساخته «احمد»          دَرِيُوزه‌ى اقبال مَرا در بَدَر صبح

شێخ ئەحمەد لە نیوەی یەکەمی چەرخی سێزدەدا ژیاوە.

*حدیقه‌ی اَمان‌اللهی*، رونَق سنندجی، ل١٣٨.

## شێخ ئەبووبەکری دووریسانی

شێخ ئەبووبەکر، کوڕی بابەشێخ، کوڕی شێخ ئەبووبەکری یەکەم، کوڕی حاجی شێخ مستەفا تەختی، کەڵەپیاوێکی پارسای خاوەن خانەقا بووە کە تا سەرەتاکانی چەرخی سێزدە ژیاوە و کەراماتێکی لێ بینراوە. شێخ ماوەیەک لە «پاڵنگان» و دوایی لە «دووریسان» ـ هەردووک لە ناوچەی بێڵەواری کوردستان ـ نیشتەجێ بووە.

مەشایخی سیویە لە پشتی ئەم شێخ ئەبووبەکرەن.

*تاریخچه‌ی خاندان مَردوخ.*

## شێخ حەسەنی خووشابی

کوڕی عەبدوڵڵای خووشابی لە کوردستانی باشوور، زانایەکی ئاگا و پارسا کە سەری لە تۆژینەوە و دەرس‌گوتنەوەدا بووە ساڵی ١٢١١ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

لە بەرهەمەکانی شێخ حەسەن، پەراوێزێکە بۆ کتێبی «*اَنوار*» لە فیقهی شافیعیدا.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٠١.

## شێخ عەبدولموئمینی سنەیی (دووەم)

کوڕی شێخ جەمالەدینی یەکەم، زانایەکی پارسا و لە بیرکاری و ئەستێرەناسیدا شارەزا، بە ڕوومەتێکی ڕازاوە و ناوچاوێکی کراوەوە، خاوەنی هێندێک بەرهەمی نووسراوەش بووە؛ یەکیان بە ناوی «*الدُّرالنَّظیم*» کە ساڵی ئاخری ژیانی دایناوە.

زا و مەرگی شێخ موئمین ساڵانی ١١٥٢ و ١٢١١ ک. م. ڕوویداوە. شاعیرێکی سنەیی چەند بەیتێکی بۆ ساڵی مەرگی هۆنیوەتەوە، کە لە پشتی ئەو کتێبەیدا نووسراوە:

شيخ مؤمن كرد خَتم اين كتاب          اَز قضا شد ختم عُمرش بالصَواب
در صَفَر شد ناگهان سوى بهشت          مزرع دنياى فانى را بهشت

چنــــد روزی بـــــود بـــــا درد و اَلَـــم عاقبـــت رَسْـــت از جهـــان پـــر ســـتم
چـون بـه وقـت نـزع مـی‌گفـت اُخْرَتـی «اُخرَتـی[١]» شـد، سـال مـرگش، ای فَتـی

*تاریخ مَردوخ.*

## شێخ عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

زانایەکی شارەزا، لە سەیدەکانی بەرزنجە بووە کە لە شـاری سـلێمانی دانیـشتووە و لـە قوتابخانـەی شـێخ عەبدوڕڕەحماندا دەرسی گوتووە و زۆرێک لە زانایان و هەڵکەوتوانی کوردی بەرەی دوای خۆی، ئەو دەرسی پێ داون و ڕایهێناون؛ کەسانی وەک: مەولانا خالیدی شارەزووری و مەولانا ئیبراهیمی بیارێ و سەید عەلی بەرزنجی و شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی.

شێخ عەبدولکەریم ساڵی ١٢١٣ ک. م. بارگەی بەرەو دنیای هەتاهەتایی پێچاوەتەوە.

*تاریخ سُلیمانیّە*، ل ٢٧١.

## شێخ ئیسماعیلی هەزارمێردی

حاجی شێخ ئیسمایل زانایەکی دیندار و عارفێکی ئاگادار لە سەیدەکانی بەرزنجە بووە کە سەرەتا لە گوندی هەزارمێردی کوردستانی باشووردا ژیاوە و پاشان ڕووی لە ڕۆژهەڵات ناوە و لـە گونـدی «ژنـێن»ی ناوچـەی ژاوەرۆدا گیرساوەتەوە و دەستی داوەتە ئامۆژگاری و ڕینوێنی خەڵـکەوە و سـەرەنجام ساڵـی ١٢١٣ ک. م. ڕووی‌کردۆتە بارەگای خوای خاوەن بەزەوە.

شێخ ئیسمایل لەبەر ئەوەی کورتەباڵا و خڕکەڵە بووە، «گردەڵـە»یـان پـێ گوتـووە. ئـەم پیـاوە گەورەیـە زۆربەی کاتی بە عیبادەتەوە ڕابواردووە؛ شەوان خەریکی شەونوێژ و ڕۆژان بەڕۆژوو بووە و هێندێک کەشـف و کەرامەتیشیان لێوە بینیوە. مەرقەدی لە ژنێنە و ئێستاش خەڵک لە دوور و نزیکەوە، بۆ زیارەتی ڕوو لە ژنێن دەنێن.

جونگێکی دەسنووس.

## میرزا سەلیمی کوردستانی

میرزا سەلیم، کە نازناویشی «سەلیم» و پیاوێکی زانا و شاعیرێکی توانا بـووە و ساڵـی ١١٥٤ لـە شـاری سـنە هاتۆتە دنیا و ١٢١٤ ک. م. لە دنیا چووە.

---

١. بەرامبەرە بە ١٢١١.

سەلیم لە بەرامبەر چەوتی ڕۆژگار و سەخڵەتی کاروبارانەوە، زۆر خۆڕاگر بووە و قەت ورەی‌بەرنەداوە؛ خەتی شکستەی جوان نووسیوە و لە دام و دەزگای والی کوردستانیشدا جێگە و پێگەیەکی دەسکەوتووە.

**چەند نموونە لە شیعرەکانی**:

تا ز چشم تو رسد مَستی سرشار مَرا — نیست با آرزو نَشئەی مَی کار مرا
می‌پرستم گُل روی تو شب و روز ولی — بهرەای نیست چو خاک سر دیوار مرا
کفر و اسلام بە هم ساختە، سرگردانم — زُلف و روی تو چنین کردە گرفتار مرا
گفتمش: زان دَهَنم دە خبری، گفت: خَموش — آگهی نیست ز کیفیّت اسرار مرا
شاد گشتم کە دلم منزل او گشت وَلی — می‌دهد تنگی جا خجلت بسیار مرا

* * *

باز خون دلم از دیدە روان است کە تو، — تافتی رُخ ز من و حیرتم آن است کە تو،
یار من باشی و باشی همە دم با اَغیار — مرگ نزدیک بە جان من از آن است کە تو،
می کُنی رَم ز من و با دگران هستی رام — بر دل زار من این شیوە گران است کە تو،
هرگزت نیست نگاهی بە مَن از گوشەی چشم — این سُخنها بە خدا عین زیان است کە تو،
رحم بر عاشق دلباختەی خود نکنی — هر دَمَم نالە و فریاد از آن است کە تو،
یک نَفَس هم‌نفس من نشوی در همەعُمر — شرط انصاف مَە من نە چنان است کە تو،
می کُشی زارم و پُرسی کە«سلیم» از خوبان — قاتلت کیست؟ چە حاجت بە بیان است؟ کە تو

*حدیقەی اَمان‌اللهی*، ل٣٧٥. *مجمع الفصحاء*، ب٢، ل١٠٥.

## خەستەی سۆرانی

«خەستە»، نازناوی شاعیرێکی کوردە کە بە کوردی سۆرانی شیعری گوتووە و هێندێک شیعری لێ بەجێ‌ماوە. ئەم خەستە، جیا لە سەید عەبدولکەریمی خانەگایی نازناو خەستەیە کە بە گۆرانی شیعری گوتووە.

خەستەی سۆرانی لە چەرخی سێزدەدا ژیاوە؛ بەڵام نازانین خەڵکی کوێنەی کوردستان بووە.

**ئەمەش چەند شیعرێک لەم شاعیرە بێ ناو و نیشانە**:

لە هیجرانی گوڵی سوورم دەکەم شین — دەڕێژم دەم‌بەدەم فرمێسکی خوێنین
وەکوو کۆتر دەناڵم شەو هەتا ڕۆژ — نیشاتم دەرد و ڕەنجە، سوحبەتم شین
لە بازاڕی غەرامی عیشقی کوڵدا — تەڵەف بوو مایەیی عومر و مەتای دین
بڵێسەی ئاگری کوورەی دەروونم — دەپێکێ قورسی ماهـ و عیقدی پەروین
هەمموو عالەم لە ناڵەی من بە تەنگ هات — لەبۆ بەختم دەنێرن لەعن و نەفرین

له حەسرەت عەنبەرین زوڵفی سیاهت
تەپ و دووی دڵ ئەچێ بۆ گونبەدی شین
وەهـا دەردم گـران و سـەختە، بـۆمن
فەڵەک دەگری، مەلایـک دێنـە ناڵـین

* * *

ئەگـەر کردوومـە تەقـسیر و گوناهـێ
هـەزاران تەوبـە تـا ڕۆژی مـەماتم
لـە مـن عـاجز مەبـە ئیتـر بـەقوربان
خوەشە ئەر بمکوژی، ئەر کەی خەڵاتم

*شیعر و ئەدەبیاتی کوردی*، ڕەفیق حیلمی. *تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٤٦.

## زەبوونی زەنگەنەیی

سلێمان بەگی زەنگەنە، نازناو «زەبوونی»، خەڵکی ئابادی «قەیتووڵ» و لە بنەماڵەی میر ئەحمەدی زەنگەنـە، مرۆیەکی بەمشوور و خاوەن هزر و هونەر بووە کە بە گۆرانی شـیعری گوتـووە و هێنـدێک لـە شـیعرەکانی ماوەتەوە؛ یەکیان شیعرێکی دوور و درێژە بە ناوی «خوەرنەوەزان»[1]؛ کە ئەوا بەشێکی:

هامـسەران ڕۆیـێ، هامـسەران ڕۆیـێ
ڕۆیێ جـە تەقـدیر، جـە ڕۆیـان ڕۆیـێ
غارێـک دیم نـە چـاک دامـان کۆیـێ
چەنی بیگلـەران، خـەسـرەوان خۆیـێ
چ غار؟ بە وێنەی کەڵلـەی کـۆی قـاف
فەرقەش چەنی فەرق قاف مەدا گەزاف
ئیـسم مەعرووفـەش «خوەرنەوەزانـەن»
بەهەشتەن مـاچی جـە ئـی جەهانـەن
باغاتـەن وەدەور حاشـیەی دەربـەن
هەیوان و سەیوان، سەیر سای سـەمەن
سـەیل بـەفراوان، سـەر تـاف کەلبـەز
مـەواران جـەو تـاق بـەرز هـەزار گـەز
بـەڕەزا جـەڕووی تـاش وەرمـەغار
پەراوێز چون زوڵف مەیاش جە ڕوخسار
نمنمـەی واران مـەیا جـەڕووی تـاش
عەتر وەرکەمەر جـە تـاش مـەبۆ پـاش
تەکیەگایێ دیم جـە پـای ئـەو شـاخدا
جە سـای ئـەو شـاخ بوڵـەند دەماخـدا
نەغمەی قومریان، جای قوشخانە و بـاز
نـەوای دڵنـشین، بولبـول وەش‌ئـاواز
پرسام ئەی جەننەت! بیستوون میسال
ئافەریـدەی سـونع بینـای لایـەزال
بەشق شای ئەوکەس تـەرحت نەواختـەن
ئی جای بەزمگا، کێ جەسـات ساختەن؟
ئامـا وە جـواو چـون دەردەداران
ناڵـەش چـەنی ئاهـ ڕووی ڕۆزگـاران
واتـش هـەی دەردیـن ڕەنـج ویـەردە
خار غەم چوون من جگەر ڕێش کەردە
ئەگەر مەپرسی شەرحێ جـەی گـوزەر
پـەرێت مـەواچۆ جـە پـا تـا وە سـەر

---

١. **خوەرنەوەزان**، واتا شوێنی خۆرنەگر، سابات. مرازی شاعیر کۆشـکی ئەحمـەد بەگـە کـە لـە نـاو باخێکـدا کراوەتەوە و داری بەرز و چڕوپڕ وا دەوری گرتووە، تیشکی خۆری کەمتر لێ کەوتووە.

«ئەحمەدبەگ» نامێ جە نەوەی شێران — سەردار سپای ئێڵ زەنگزوان
«ئەحمەدبەگ» نامێ جە نەوەی ئەڵقاس — نمۆ چەنی کەس بکریۆ ئەو باس
خولاسەی یەکڕەنگ خاس‌خەیاڵان بی — سەردار سپا و سیاماڵان بی
وەخت بەزم و ڕەزم خەسرەو کەی بی — بە سەخا و بەخشش حاتەم تەی بی
هەروەخت مەکەرد عەزم بازشکار — مەخێزا جە بورج قەڵعەی خورمادار[1]
مەنیشتن نە کۆڵ ئەسپان ڕاهڕەو — باد چوست و چابوک بە دەوان، تێژڕەو
جە تاو پڕتاف تازی ترمەپۆش — مەکێشان وەچەنگ، جێران و خەرگۆش
دەنگ قوای قووی شکارەوانان — مەنیشت نە جەبەل، کۆ و سەربانان
وە ڕۆ ڕاو مەکەرد تا خوەر مەوی گەرم — ئاما وە سای من پەی مەزاق وەرم
جە «سەلاحەدین» هەتا وەی دەورە — نەدیم بیگلەرێ وەی تەرز و تەورە
وەختێ هۆرگیلا چەرخ چەپڕەوشت — میر و بیگلەر و ساقی و مونشی گشت،
یەکایەک خەڵتان خاک سارا کەرد — چوون خەیاڵ خاو ئاما و زوو ویەرد
منیش ها عومرم پادا وە پەنجا — دونیام وە میزان عەقڵ وێم سەنجا
منیش وێنەی جوغد وێرانەی هەردە — ڕۆ ڕۆمەن پەی عومر، گەنج باد بەردە

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ٥، ل ٨١.

## مەلا ڕەحمانی جەلی کۆیی

مەلا عەبدورڕەحمان، کوڕی مەلا عەبدوڵلای یەکەم، کوڕی مەلا موحەممەد (مەلازادە)، لە زانایان و مامۆستایانی بەناوبانگ و سەرگەورەی بنەماڵەی جەلی کۆیە (کوێسنجق) بووە کە تا دوایی ژیانی لەو شارە دەرسی گوتووە ئەوڕەحمان پاشای بابان (؟ – ١٢٢٨ ک. م.) قوتابخانەکەی بۆ بەڕێوەبردووە.

مەلا ڕەحمان ساڵی ١٢١٧ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

*عُلَماونا فی خدمة العلم و الدّین.*

## سەید سەمەدی بەرزنجی

سەید عەبدوسسەمەد کەسناو فەزڵەددین، کوڕی شێخ حەسەن، کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی عەلی، کوڕی باباڕەسوولی بەرزنجی شارەزووری، عارفێکی زانا بووە و چەند نووسراوەشی لێ بەجێماوە؛ وەکوو:

---

١. **خورمادار**، ناوی پێشووی **قەیتوول**، ناوەندی دەسەڵاتداری ئەمیر ئەحمەدی زەنگەنە بووە.



«*شَرحُ دلا یلِ الخیرات*»، پەراوێز بەسەر «*شرح الفیّه*»ی شێخی سیووتی لە نەحودا، هۆنراوەیەک لە «*مُثَلَّثات*»دا، «هەڵبەستێک لەمەڕ شێخانی تەریقەتی قادری و هۆنراوەیەک بە ناوی «*تُحفه الصّلاه*».

ئەم مامۆستایە ساڵی ١٢٢٠ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.[١]

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٥٧٤. *ذیل کشف‌الظنون*، ب١، ل٢٥٢.

## بەیتووشی

عەللامە مەلا عەبدوڵڵا، کوڕی مەلاموحەممەد، کوڕی ئیسماعیل، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی عیززەددین، کە بە «ئەبوو موحەممەد، عەبدوڵڵای بەیتووشی[٢]، ئالانی[٣]، خانخلی[٤]، ئیحسائی[٥] ناوی لێ براوە، مامۆستایەکی زانـا، شـاعیرێکی توانـا، نووسـەرێکی قەڵـەمڕەوان و وێژەوانێکـی گفـتجـوان و ئیمـامێکی پیتـۆڵ لـە زانـستە ئیسلامییەکانە کە کتێب و نووسراوەی یەکجار هێژای، لە شیعر و پەخشان، داناوە.

بەیتووشی لە بنەماڵەیەک هەڵکەوتووە کە زۆرێکیان لە بواری زانـست و زانیارییـەوە ناویـان دەرکـردووە و ناوبانگیان هەبووە. بۆ وێنە: شێخ موحەممەدی بابی پیاوێکی زانا و وێـژەوان بـووە و لـە بـەیتووش دەرسـی گوتووە. هەروەها شێخ مەحموودی براگەورەی کە لە باری هۆش و بیرەوە کەمتر هاوتای هەڵکەوتووە.

ساڵی لەدایکبوونی مەلا عەبدوڵایان ١١٣٠، ١١٤٠ و تەنانەت ١١٦٠ نووسیوە و وەک نووسـراوە، سـەرەتا خوێندنی لە بەیتووش و لای بابیەوە دەسپێکردووە و پاشان لەگەڵ شێخ مەحموودی برایدا بـۆ «سـنجوێ» چوون و چەند ساڵێک لە کۆڕی دەرسی عەللامە ئیبنولحاج بەهرەیان بردووە و دوای ئەوە چوونەتە ماوەران و ماوەیەکیش لە خزمەتی عەللامە سیبغەتوڵا ئەفەنـدی بەهرەمەنـد بـوون. ئـەوجار بـەرەو وڵاتی عـەرەب چوون و لە کۆتاییدا گەیشتوونەتە ئیحسا و هەرکام لە قوتابخانەیەکدا بە دەرسگوتنەوە خەریک بـوون و تـا ساڵی ١١٧٨ ک. م. ئەم کارەیان درێژەی بووە. سەرەنجام ئەوینی نیشتمان و ئـارەزووی دیـداری ئـازیزان، بەرەو بەیتووش هەڵیناون.

خەبەری گەڕانەوەی ئەم دوو برا زانایە کە دەگاتە بـەیتووش، خەڵـکی بـەرەوپیریان دەچـن و لـە شـێخ مەحموود داوا دەکەن لەوێ بمێنێتەوە و جێ بابی بگرێتەوە و دەرس بێژێتەوە. شێخ مەحموود بەقـسەیان

١. برێک ساڵی ١٢٣٤ ک. م. یان نووسیوە.
٢. **بەیتووش**: گوندێکی لای سەردەشتە.
٣. **ئالان**: ناوچەیەکی سەر بە شاری سەردەشتە لە ڕۆژاوایەوە.
٤. **خانخلی**: گوندێک لە ڕۆژهەڵاتی باشـووری بەیتووشـە کـە پێـشتر بـابی مـەلا عەبدوڵـلای بەیتووشـی لـێ دانیشتووە و مەلا عەبدوڵڵا لەوێ لەدایکبووە و پاشان بۆ بەیتووش چووە.
٥. **ئیحساء**: شارێکی وڵاتی عەرەبانە.

دەکا و لەوە بەدواوە تا دوایی ژیان لە بەیتووش دەبێ. شێخ مەحموود زانایەکی پارێزکار و ڕێزدار بووە و مەلا عەبدوڵلا لە نووسراوەکانیدا، بە ناوی «شێخم» و «مامۆستام»، ناوی لێ بردووە.

مەلا عەبدوڵلا ساڵی ١١٨٠ ک. م. جارێکی تر بە نیازی گەیشتنە ئیحساء، لە بەیتووش دەردەکەوێ و لە بەسرەدا لای دۆستێکی بە ناوی شێخ دەرویشی گەوازی عەبباسی، ماوەیەک دادەنیشێ و پاشان بە کەشتی دەچێتە ئیحساء و تا ساڵی ١١٨٦ ک. م. لەوێ دەمێنێتەوە. لەم ساڵەدا دەگەڕێتەوە بۆ بەیتووش و لەوێشەوە بە ئارەزووی دیداری مامۆستای گەورەی، ئیبنولحاج، بۆ هەزارمێرد دەچێ. لەم کاتەدا شێخ مەعرووفی نۆدێیی ــکە باسی ئەویش دەکەین ــ لەوێ فەقێ بووە و ناو و ناوبانگی بەیتووشی زۆر بیستووە؛ هەست دەکا هەلێکی باشی بۆ هەڵکەوتووە، بەهرەیەکی تەواوی لێ دەستکەوێ. بەو بۆنەوە لە مامۆستا ئیبنولحاج داوا دەکا تا بەیتووشی لە هەزارمێردە، با میوانی حوجرەکەی ئەو بێ. بەم جۆرە شێخ مەعرووف لەو ماوەدا، شەوان تا درنگانێک لەو دەریای بێبنی زانست و ئاگایی و شیعر و وێژەوانییە بەهرەمەند دەبێ.

لە دواییەکانی ساڵی ١١٨٨دا بەیتووشی بە یەکجاری کوردستان بەجێدێڵێ؛ سەرەتا سەرێکی بەغدا دەدا و لەوێوە دەگاتە بەسرە و لە دەسپێکردنی ساڵی ١١٨٩دا لە قوتابخانەی ڕەحمانییە سەری بە دەرس گوتنەوە گەرم دەبێ. هێندەی پێ ناچێ، سادق خانی زەند، لەشکر دێنێتە سەر شارەکە و ماوەی ١٦ مانگ ئابڵۆقەی دەدا و بەیتووشیش بیەوێ و نەیەوێ، تووش دەبێ. لە کۆتایی ساڵی ١١٩٠دا لە بەسرە دەڕوا و دەگاتە ئیحسا و کچی شێخ عەبدولقادری قازی ئیحسا مارە دەکا و بەم شێوە لەوێ دادەمەزرێ و شان لە دەرس گوتنەوە و نووسین شل دەکا و تا دوا کاتی ژیان، زۆر کتێبی بایەخدار دادەنێ و زۆر زانای هێژا ڕادێنێ.

بەدرەدین عوسمانی کوڕی «سندنَجدی» وائیلی (١١٨٠-١٢٤٢) کە بۆخۆی قوتابی بەیتووشی بووە، لە کتێبێکی بە ناوی «*أصفَی الموارِد فی سِلسال اَحوال الامام خالد*»دا ساڵی کۆچی یەکجاری مامۆستای ١٢١٠ ک. م. گوتووە؛ کەچی لە کتێبی تریدا بە ناوی «*سَبائكُ العسجَد*»، ساڵی ئەم ڕووداوەی ١٢١١ نووسیوە. لە لایەکی ترەوە، شێخ موحەممەدی قزڵجی لە کتێبی «*التَّعریفُ بِمَساجِد السُّلَیمانیّه*» و موحەممەد ئەمین زەکیبەگ لە «*تاریخ سُلَیمانیّه*»دا، ساڵی ١٢٢١یان گوتووە!

هەرچۆنێک بێ، وەک بەدرەدین عوسمانی وائیلی دەڵێ، مامۆستا دوایین ساڵی ژیانی گەڕاوەتەوە بەسرە و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە. جا ئەگەر بۆ لەدایکبوونی ساڵی ١١٤٠ و لە دنیا چوونی ١٢٢١ لەبەرچاو بگرین، مامۆستا دەوری هەشتا ساڵ ژیاوە.

مامۆستا بەیتووشی لە زمان و وێژە و شیعری عەرەبدا یەکجار شارەزا بووە و زۆرێک لە بەرهەمەکانی بە شیعری عەرەبی هۆنیوەتەوە. ئەمەش بەشێکیان:

١. «*الکافی*»، هەڵبەستێکە لە عەرووز و قافیەدا، بریتی لە ٣٢٧ بەیت کە لە سەردەمی لاوی، ساڵی ١١٧٩

دایناوە:

| | |
|---|---|
| هذَا ابتدا نَظْمی فی الشّباب | فلا تُبادرْ صاح بالعتاب |
| وَ انْ تجدْ فیه خلافَ الاَدَب | فَالطَّبْعُ کُرْدیٌّ وَ هذا عَرَبی |

٢. «*الوافی بحَل الکافی*»، کە شەرحێکە لەوی پێشوو

٣. «*تحفُ الخُلاّنلاإشْحاذالأذهان*»

٤. «*حَدیقة السَّرائر فی نظم الکَبائر*»، کە لەسەر شێوازی «*زَواجر*»ی شێخ ئیبنووحەجەری هەیتەمی مەککی، ساڵی ١١٩٠ هۆنیویەتەوە، بریتی لە ٧٢٩ بەیت

٥. «*طَریقة البَصائر الی حَدیقة السَّرائر*»، کە شەرحی پێشووەکەیە و ساڵی ١١٩٥ ک. م. نووسراوە

٦. «*الخصالُ المُکَفِّرَة للذُّنوب المُتَقَدَّمة وَ اللمُتأخَّرة*»، هۆنراوەیەکە باسی ئەو تاقمە چاکەیە دەکا بۆیان هەیە تاوانی برێک سووچ بن کە ٤٩ بەیتە و ساڵی ١١٩٤ دانراوە

٧. «*المُبَشِّرات*»، شەرحی پێشووەکەیە

٨. «*کفایه المُعانی فی نظم حُروف المَعانی*»، هەڵبەستێکە بریتی لە ٦٧٢ بەیت، کە باسی پیتی مەعانی دەکا و ساڵی ١١٩١ لە ئیحساءدا هۆنراوەتەوە و یەکەم جار ساڵی ١٢٨٩ ک. م. لە ئەستەمبووڵ چاپ کراوە

٩. «*الحفایه بشَرح الکفایه*»، شەرحێکی تێر و تەسەلە لەسەر *کفایه* و ساڵی ١١٩١ ک. م. دانراوە

١٠. «*صَرفُ العنایه بکَشف الکَفایه*»، کە کورتکراوە و هەڵبژاردەیەک لەوی پێشووە و ساڵی ١١٩٨ دانراوە و ساڵی ١٩٢٢ز. لە بەسرە چاپ کراوە

١١. پەراوێز بۆ «*شرح فاکهی*»، لە نەحودا کە ساڵی ١٢٠٩ ک. م. نووسراوە و بریەتی لە ٥٤٥ لاپەڕەیە

١٢. پەراوێز بۆ کتێبی «*البهجَه المَرضّیه فی شَرح الالفیّه*»، لە سەرف و نەحودا

١٣. هۆنراوەیەک لە ٥٥ بەیتدا، باسی ئەو کردارانە (اَفعال) کە هەم بە شێوەی تێپەڕ (مُتَعَدّی) و هەم تێنەپەڕ (لازم) بەکار دەچن

١٤. شەرحێک بۆ ئەو هۆنراوەیە

١٥. هۆنراوەیەکی ٧٧ بەیتی لەمەر ئەو کردارانەوە کە هەم (واوی) و هەم (یایی) بەکار دەچن

١٦. شەرحێکی ئەو هۆنراوە

١٧. هەڵبەستێک لەمەڕ «*مثَلَّثات اَفعال وَ اَسماء*»

١٨. شەرحی ئەو هەڵبەستە

١٩. «*المَوائدُ المَبسوطة فی الفوائد المَلقوطة*»، بریتی لە ١٥٠ بەیت

٢٠. هۆنراوەیەک لە باسی «*موَنَّثات سماعی*»دا، ٣٥ بەیت

٢١. هۆنراوەیەک لەمەڕ «*مصادرِ شاذَّه*»وە

٢٢. هەڵبەستێک لە پەسنی پێغەمبەر (د) و باسی هێندێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەو زاتە
٢٣. هۆنراوەیەک لەمەڕ ژمارەی پیتی «مَعانی»، «أحادی» و «خُماسی»یەوە و ...

بەیتووشی لە قەسیدەیەکدا کە ڕووی قسەی لە مامۆستاکەی (ئیبنولحاج) کردووە، وای داناوە کە دەکرێ ١٦ قەسیدە و ١١ قەتعەی بە کێشی جۆراوجۆرەوە، لێ دەربێنی. ئەمە سێ بەیتێک لەو قەسیدە:

یا سیِّدی زادَ اکتسابی، فی الهَوی — کَرْبی عَلا، منْ زَفْرَتی و عَویلی
رَبْعی عَفا، فَارْحَمْ شَبابی قَدْ شَوی — قَلْبی الصّلا، منْ حُرقتی، وَ غَلیلی
داو الحَشا، وَ ادْفَعْ عَذابی بالدَّوا — یا ذا العُلی، یا قبْلَتی، وَ قَبیلی

لە باسی قسەزانی و دەمپاراوی و لەسەربیری و قسەپێبووندا، بەیتووشی پیتۆڵێک بووە هاوتای نەبێتەوە و کەس لە کێشەدا خۆی لە بەرامبەریدا ڕانەگرتووە. نموونەیەک لە بیرتیژی مامۆستا دەگێڕنەوە: کاتێ لەگەڵ شێخ مەحموودی برایدا لێبڕاون بچن بۆ بەغدا، بۆ خەرجی سەفەر هیچیان شک نەبردووە و هەموو دارایییان دوو کتێبی «*قاموسُ المُحیط*»ی فیرووزابادی و «*تُحفةُالمُحتاج*»ی شێخ ئیبنوحەجەر بووە و بەس. چ بکەن؟ لە ماوەی چەند ڕۆژدا، شێخ مەحموود «*تحفە*» و بەیتووشی «*قاموس*» لەبەر دەکەن و ئەوجار کتێبەکان دەفرۆشن و ئەوەش پارەی سەفەر!

مامۆستا بەیتووشی لە ماوەی ژیانیدا، تاڵی و سوێری زۆری چێشتووە و سەختڵەت و نالەباری ڕۆژگاری زۆر بینیوە. وەک خۆی دەفەرموێ:

قُسمَتْ هُمُومُ ابی البَریَّـ — ـة و البَریَّةُ شاهدَه
فَحُبیتُ ثُلْثَیْها وَ هُم — فیما بَقی مُتَواردَه
فَکَأنَّ آدَمَ ماتَ عَنْ — ابْن وَ بِنْت واحدَه

**واتا**: خەم و مەینەتی بابەدەم بۆتە سێ بەشەوە؛ دوو بەشی لە من کەوتووە و باقیش هەموو بەشێک! تۆ دەڵەی ئادەم مردووە و تەنیا کوڕێک و کچێکی لێ بەجێماوە ئەمن کوڕەکەم و دووم پێ بڕاوە!

لە ماڵ و سامانی دنیا بەشێکی وای نەبووە و بۆخۆشی ئەو شێوە ژیانەی هەڵبژاردووە؛ وەک لەمەڕ پارێزکاری و نەوس‌کوژییەوە دەڵێ:

اقْنَعْ منَ الدّنْیا بمَیْسُورها — وَ اشْرَب قَراحَ الماء فی الکَفّ
وَ کُفَّ نَفْساً طالَ إهْمالُها — فَإنَّما الرّاحَةُ فی الکَفّ

**یانی**: لە دنیا ئەوی بۆت دەست دەدا، پێ قانیع بە و (ماتڵی پەرداخ مەبە و) بە لاوێچ ئاوت بخۆوە! بەر بە نەوست بگرە! کە لەمێژە بەرت بۆ شل کردووە؛ بەڕاستی ئاسایش لە نەوس‌کوژیدایە.

دیسان لەبارەی پشت‌کردن لە دنیا و دوورگرتن لە دنیاپەرستانەوە دەڵێ:

تَجَنَّبْ مُوالاة أهْل الغنی — فَدُنْیا هُمُ عَنْ قَریب تَبید

وَ لازِمْ مُـــــصافاةَ اَهْــــلِ التُّقــــی وَ لا تَعْــدُ عَیْنــاکَ عَــنْهُمْ تُریــد

**واتا**: لەگەڵ دەوڵەمەندان دۆستی و تێکەڵاوی مەکە! زۆری پێ ناچێ ئەو پووڵ و پارەیەت نامێنێ. پێویستە لە پارسایان نزیک ببیەوە و چاویان لێ هەڵنەگری؛ نەک لە خەیاڵی زەرق و بەرقی ژیانی دنیادا بی.

باڵی دوامینی ئەو دوو بەیتە، لە ئایەتی ٢٩ی سوورەی کەهف گیراوە کە دەفەرموێ: «وَاصبِر نَفسَکَ مَعَ‌الَّذینَ یَدعونَ رَبَّهُم بِالغَداه وَالعَیشی یُریدُنَ وَجهَهُ وَ لا تَعدُ عَیْناکَ عَنهُم تُریدُ زینَهَ الحَیوه الدُّنیا..».

لەمەڕ گوێ نەدان بە ماڵ و مەقامی دنیاوە دەفەرموێ:

أَلامُ فـــی طَلَـــبِ الآمـــال، یَـــدْفَعُنی وَجْـــهُ البَـــسیطَة یُمْناهـــا و یُـــسْراها
وَ اللهِ لَـمْ تُرْضــنی الــدُّنْیا وَ لَـوْ قَـدَمی فَـوْقَ الثُّرَیّـا وَ نَعْلــی فَـوْقَ جَوْزاهــا

بەیتووشی پێڕای گەڕان بە وڵاتە عەرەبەکاندا، جارێکیش بۆ حیجاز چووە و پاش بەجێهێنانی حەج، لە شوێنە پیرۆزەکانیدا لایداوە و لەگەڵ زانایان و پیاوچاکان و پاکانی ئەو خاکە بەهەشتئاسایەدا، دانیشتووە و وەک خۆی ئێژێ، داوای دۆعایەکی بەخێری لێیان کردووە:

مــا أَمَــرَّ الفــراقَ یــا خیــرَةَ العُــرْ بِ وَ أَحْلَـــی الوصـــالَ بَعْــدَ البعـــاد
یـــا أُهَیْـــلَ الحجـــاز انَّ غَرامـــی للقـــاکُمْ، مـــا إنْ لَـــهُ مـــنْ نَفـــاد
أَحْـــسَنَ الـــدَّهْرُ أَمْ أَسـاً، فَرَجـــائی نَظْـــرَةٌ مـــنْکُمْ تَجـــی بِمُـــرادی

مەلا عەبدوڵڵا پیاوێکی پارسا و گوێڕایەڵ بە فەرمانی دین، پێداگر لە بەجێهێنانی واجیبات و بەڕێوەبردنی سوننەتی پێغەمبەر و خۆپارێز لە داهێنان و گۆڕانکاری لە ئاییندا بووە. خوێندنەوەی قورئانی لە چوون و بووندا پەک نەخستووە و لە تەجوید و قەرائەتیشدا شارەزاییەکی ئەوتۆی هەبووە. هەموو کاتێک خودای لە بەرچاو بووە و تەنیا دڵی بەو خۆش کردووە. وەکوو خۆی دەڵێ:

بـــالحَقّ لُـــذْ یـــا مَـــنْ غَـــدا فـــی تیـــه حَیْرَتـــه یَهـــیْم
مَـــنْ یَعتَـــصمْ بـــالله یُهـــدْ ـــدَ إلـــی صـــراط مُـــسْتَقیم

ماممۆستا کات و ساتی زۆر بە شیعر گوتنەوە تێپەڕ نەکردووە و وەج و پلەی زانستی خۆی سەرتر لەوە زانیوە کە بە شیعرەوە خەریک بێ. لە قەسیدەیەکدا لەم بارەوە ئێژێ:

مـــع أَنَّنـــی لا أرْتَـــضی بالـــشِّعْر لـــی لَقَبـــاً وَ انْ یـــکُ کُلُّـــهُ مـــنْ عَـــسْجَد
یَأبـــاهُ لـــی علْمـــی وَ آبـــائی الأُولـــی وَرِثُـــوا المَکـــارِمَ ســـیِّداً عَـــنْ سَـــیِّد
لکـــــنَّ أَحْیانـــــاً أَذُودُ بِنَظْمـــــه عَـــنْ خـــاطری هَـــمَّ الزَّمـــان الاَنْکَـــد

**واتا**: نامەوێ بە بۆنەی شیعرەوە ناو دەرکەم و بە شاعیرم بناسن؛ ئەگەرچی هەموو شیعرێکم وەکوو

گەوهەر وا بن. ناوبانگی شاعیری لەگەڵ پلە و پایەی زانستی و کەسایەتی بنەماڵەی مندا، کە هەموو باب و کاڵم زانا و ئاگا و مامۆستا بوون، یەک ناگرێتەوە. بەڵام جاروبارە بۆ سڕینەوەی مەینەتی ڕۆژگار لەسەر دڵم، شیعرێک دەڵێم.

زۆربەی شیعری بەیتووشی زانستین؛ بەڵام بەوحاڵەش لە بواری پەسن و ئەوین و ڕاگەیاندنی تووڕەیی و گلەیی و گەپ و گاڵتەشەوە دەستێکی باڵای هەبووە و قەسیدە و غەزەل و قەتعە و دووبەیتی زۆری گوتووە؛ کە بەداخەوە فرەیەکیان لەناو چووە.

زانای هاوچەرخ، مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ، کتێبێکی گەورە و پڕبایەخی لەبارەی ژیانی مەلا عەبدوڵڵای بەیتووشییەوە نووسیوە، بە ناوی «البَیتوشی»، کە ساڵی ١٣٧٧ ک. م. چاپ کراوە و تێدا بەشێک لە شیعر و پەخشانی مامۆستای هێناوە و سەرچاوەی نووسینی بەشێکی ئەم چەند لاپەڕە بووە. ئەوا چەند نموونەی تر لە شیعری بەیتووشی کە لەو کتێبەدا هاتووە:

بەشێ لە غەزەلێک:

وَ مُحَیّاکَ عاذلی لَو رآکا    لَمْ یَکُنْ قَطُّ لا مَنی فی هواکا
قامَ بَدْرُالدُّجی یُباهیکَ لکنْ    معَ ذاکَ البَهاء لَیْسَ هُناکا
أخْبَرَتْنی الوُشاةُ أنِّی سال    صَدَقوا، قَدْ سَلَوْتُ لَکنْ سواکا

ئەم قەتعەیە سەرەتای نامەیەکە بۆ عەللامە عوبەیدیللا ئەفەندی، کوڕی سیبغەتوڵای حەیدەری ماوەرانی موفتی بەغدا نووسیویە:

إنّی أحنُّ الی العراق وَ لَمْ أکُنْ    لا منْ رُصافَه وَ لا منْ کَرْخه
لکنَّ فی بَغْدادَ لی مَنْ قُرْبُهُ    أشْهی الیَّ منَ الشَّباب و شَرْخه
شَوْقی لَهُ شَوْقُ السَّقیم الَی الشّفا    ءأوالعَدیم إلَی الثَّراء أوالظَّلیم لفَرْخه
أوْ شَوْقُ أعْرابیَّة حَنَّتْ إلی    أطْلال نَجْد فارقَتْهُ و مَرْخه
قَلْبی أسیرٌ عنْدَهُ، دَنفٌ فَقُل    إنْ لَمْ یَحُلَّ أسارَهُ فَلیُرْخه

ئەم شیعرانەی لە غوربەت (ئیحسا)دا، بە یادی زێدی خۆی (بەیتووش) هۆنیوەتەوە و لە شەرحی «*صرفُ العنایه*»، لە ژێر ناوی «بَیتوشی»دا هێناویە:

ألا حَیَّ «بَیْتُوشاً» و أکْنا فَها الَّتی    یَکادُ یُرَوِّی الصّادیات سَرابُها
مَرابعُ یُزْری بالعَبیر رَغامُها    وَ تَهزَأ بالظَّبی النَّفُور کَعابها
«بلادٌ بها حَلَّ الشَّبابُ تَمائمی    وَ أوَّلُ أرض مَسَّ جلْدی تُرابُها»
لَقَدْ کانَ لی منْها عَرینٌ و کانَ منْ    مُقامی لها سُحْبٌ سَکُوبٌ رَبابُها
وَ لَمْ تَنْبُ بی انْ یَنْبُ یَوْماً بأهْله    مَکانٌ وَ لَمْ یَنْعَقْ عَلَیَّ غُرابُها

وَ لكــــنْ دَعـــانى لاغْترابـــىَ مَعْـــشَرٌ غيـــاثٌ إذا الاهَـــوالُ هـــاج عُبابُهـــا
فهاجَرْتُهـــا هَجْـــر الحُـــسام قرابَـــهُ عَلــى رغمهــا تَبْكــى عَلَــىَّ هــضابُها
يَعــزُّ عَلَــى االإنْــسان تَوْديــع نُــوره وَسُـــود جعـــاد، اَنْ تَنـــائى شَـــبابها
و رُبَّ قَـــضايا لا أبـــا حَـــسَن لَهـــا بهـــا بَعْـــدَ إبْعـــادى، فَجَـــلَّ مُـــصابُها
فَعُوِّضْـتُ عَنْهــا فــى اغْترابــىَ رِفْعَــة مـــنَ الـــدَّهر يُعْيــى النَّيِّـــرِيْن طلابُهـــا
عَلـــى أَنَّنـــى أهْتَـــزُّ مَهْمـــا ذَكَرْتُهـــا كَمـــا مـــالَ بـــالْقَوم الـــسُكارى شَـــرابُها
فَلِلْقَلْــب مــنْ شَــوْقى إلَيْهــا انْــصداعُهُ وَ لِلْعَـيْن مــنْ نَــوْحى عَلَيْهــا انْـسكابُها
لَعَـــلَّ اللَّيـــالى أن يُبَـــدِّلْنَ حـــالَـــةَ بـــأُخْرى فَمـــنْ عـــاداتهنَّ انقلابُهـــا

**چەند بەیتی فارسی بەیتووشی**:

به دیده می‌کنم از مردمـان نهانـت لیـک سواد دیده‌ی من هم تهی ز مردم نیست

* * *

لقمه‌ی غـم بـه گلـویم ره فریـاد گرفـت از ره عشق مرا بـاده حـلال اسـت امـروز
سُرمه‌ی فتنـه عزیـز اسـت بـه چـشم ایـام نرگس خسته‌ات ای سرو چه حال است امروز

* * *

از موج اشک دیده‌ی مـن در فـراق دوسـت بحـر مُحـیط از عَـرَق شـرم آب شـد

* * *

هـر شـب مَـه نَـو سـوی فزونـی تـازد تـا همچـو جمـال تـو، جمـالی سـازد
در چـاردهُم شـب چـو بـه خـود پـردازد چون نیست چو روی تو ز خود بگـدازد

**پەخشانی بەیتووشی**:

مامۆستا لە وشەی عەرەبدا، قامووسی گـەڕۆکیان پـێ گوتـووە و لـە بـاری زبـان و وێـژە و دەسـتەواژەی عەرەبییەوە، ئەگەر موتەنەببی و حەریری زەمانی خـۆی پـێ بێـژین، هـیچ زیادمـان نـەگوتووە. کەسـێک «*مُراسلات*» و «*مُنشأت*»ی بەیتووشی خوێندبێتەوە، لەم قسەدا لەگەڵـمانە. لێـرەدا وێنەیـەک لـە پەخـشانی مامۆستا، کە بەشێک لە نامەیەکە بۆ زانایەکی کوردی نیشتەجێ بەغدا نووسیوە و تێدا باسی چۆنیەتی بـڕانی لە نیشتمان و خەم و مەینەتی غەریبی و بێ‌کەسی و هەڵگرتنی دەرد و داخی دووری، لـە ڕێـی زانـست و ئاگاییدا دەکا و قسەی دەگاتە ئەوێ دەڵێ:

«وَ مِنْ كَثْرَةِ شَغَفى فى البُكَرِ وَ الأصائل، بارْتشاف رُضاب الطَّل منْ ثُغُور أقاحى تِلْكَ الخمائل، و وَفـرَةِ كَلَفـى بالمَقيل، فى سَجْسَج ظِلِّها الظَّليل، كُنْتُ أتنَكَّبُ، عَنْ صُحْبَةِ مَنْ لا يَدْأب، فى اجْتناء ثَمرَةِ الادب، وَ لا يَتعلَّـق مـن أهْدابِهِ بِهَدب، و لَوْ أنافَ فى التَّصَوُّف عَلَى الجُنَيْد، وَ فى التَّقَـشف عَلَـى عَمْـروبْن عُبَيْـد، ظَنّـاً مِنِّـى انّـهُ مـنْ أمْنَعِ

المعاقل وَ أوْثَق الوَسائل الَی النّائل، بَیْدَ أنّی کُلَّما زدْتُ فی ذلکَ أرتفاعاً، زادَ حَظّی نَقْصاً وَ اتّضاعاً، کَما قُلتُ فیما بَثّثتُ فیه شُجُونی، قَبْلَ اَنْ یَطلَعَ فَجْرُ المَشیب منْ لَیالی قُرُونی،:

حَتّی مَتی، أرْقَی المَعالَی وَ لا أبْرَحُ منْ دَهْری فی الهُون

أعْلُو وَ رَأسی فی انْتکاس إلی سُفْل کَأنّی «بیدُ مَجْنُون»

وَ أصْبَحَت اللَّیالی تَشُنُّ عَلَیَّ الغارَةَ بعد الغارَة، و تَتَلعَّبُ بی تَلَعُّبَ السَّنَّوْر بالفارَة، فأیْقَنْتُ أنَّ ذلک عُقُوبَةٌ ما کَسَبَتْ یدَیَّ و أنَّهُ منْ شُؤْم أدَبی الَّذی کانَ مُبْتَغایَ، فَصارَفیَّ زیادَه، أوْرَثَنی فی العُیُون زَهادَه...»

داخی گران له شیعر و بەرهەمی کوردی بەیتووشی، تاقەبەیتێک نەبێ کە لە گۆڤاری گەلاوێژدا نووسرابوو، شتێکم دەس نەکەوت؛ بەیتەکە ئەمەیە:

له دیباچەی کیتابی حوسنی عالەم هەر وەرەق لادەم دەبینم مەبحەسی وەسفت لە هەر فەسڵ و لە هەر بابێ

کە لەم بەیتە مەشهوورەی سەعدی وەرگیراوە:

بـرگ درختـان سبز در نظـر هوشـیار هـر وَرَقـش دفتریـست معرفـت کردگـار

*البیتوشی*، شیخ محمّد خال سُلیمانیّەای، بغداد ١٣٧٧ ك. م. *الأعلام*، ب٤، ل٢٧٥. *الآدابُ العربیّه فی القرن التاسع عشر و الرّبع الاول من القرن العشرین*، اب لویس شیخویسوعی. *أصفی الموارد فی سلسال اَحوال الامام خالد*، ل ١٠٢. سَبائكُالعسجَد، ل ٤٠. *التَّعریف بِمساجد السُّلیمانیّه*، شیخ محمّد قزلجی. *تاریخ سُلیمانیّه*، ل١٦٩ گۆڤاری *گەلاوێژ*، ب١، چاپی ١٩٤٥ ز.

## قودسی ئەفەندی

موحەممەد قودسی ئەفەندی موفتی، مەشهوور بە «حەلیمزادە»، کوڕی حەسەن، کوڕی عەبدوڕڕەحمان، کوڕی حەلیم، لە کوردانی ڕەها (ئورفە)، پیاوێکی زانا و وێژەوان و شاعیرێکی قسەزان بووە. چەند جاران سەفەری ئەستەمبووڵی کردووە و لە ١٢٠٠ ک. م. کراوەتە موفتی ڕەها؛ بەڵام بەبۆنەی توندوتیژی و گوێڕایەڵ نەبوونیەوە، دوای هێندێک لە کار وەلا نراوە و لەو شارە تارێنراوە. ماوەیەک لەودوا دیسان دەوڵەتی عوسمانی ئاشتی کردۆتەوە و بۆتە موفتی ئیزمیر و ساڵی ١٢١٥ ک. م. دادوەری ئەرزڕوومی پێ دراوە و کاتێ کە لەشکری عوسمانی بۆ سەندنەوەی میسر، ڕووی لەو وڵاتە ناوە، ئەویشیان لەگەڵ بووە و کە دەسەڵاتی میسریان دەسکەوتووە، دادوەری ئەوێیان پێ سپاردووە. دوای ئەوەش دادوەری مەککەشی کردووە و لە ئاخروئۆخری ساڵی ١٢٢١ ک. م. گەڕاوەتەوە ئەستەمبووڵ و لەوێ ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە پەنا گۆڕی سوڵتان بایەزیدی عوسمانی نێژراوە.

قودسی ئەفەندی، چ لە کاتی موفتی بوون و چ لە ماوەی دادگەری کردنیدا، گوێ بۆ کەس شل نەکردووە

و مرۆیەکی درووستکار، نەترس، توندوتیژ و داوێن‌پاک بووە.

*مشاهیرالکرد*، ب۲، ل۱۱۷و ۱۱۸.

## نەزیری زەنگەنە

ئەمانولاّ بەگ، نازناو «نظیر»، لە هۆزی کوردی زەنگەنە، شاعیرێکی باش بووە و ساڵی ۱۲۲٦ ک. م. لە دنیا چووە. ئەم بەیتە هی ئەوە:

بـرون نمـی‌رود ار حرفـی از میانـەی مـا　　　چنـان کـە غیـر ندانـد، بیـا بـە خانـەی مـا

*مجمع الفصحاء*، ب۲، ل۱۰۵.

## عەبدولقادری عیمادی

زانایەکی خەڵکی ئامێدییە کە دوای کۆتایی هاتنی خوێندن لە شارانی عیراق و شام و وەرگرتنی ئیجازە لە دمشق، هەر لەوێ دانیشتووە و ژنی خواستووە و تا دوایی ژیان (۱۲۲۸ ک. م.) دەرسی گوتوە.

*مشاهیرالکرد*، ب۲، ل۳۳.

## شێخ حەسەنی بەرزنجی

کوڕی شێخ بایەزید، کوڕی شێخ ئیسمایل و مامی شێخ تاهای کەبیری بەرزنجی، لە زانایان و مامۆستایانی بنەماڵەی سەیدەکانی بەرزنجەیە کە شیعریشی گوتووە و کتێب و نووسراوەشی هەبووە و سەرەنجام ساڵی ۱۲۲۹ ک. م. لە گوندی خەیوەتەی ناوچەی بازیان، لە دنیا چووە.

*ساداتُ‌البرزنجیّە*، ۱۳۷۵ ک. م.

## شایقی لوڕستانی

هادی بەگ، نازناو «شایق»، لە خێڵی شاکی لوڕستان، پیاوێکی زانا و شاعیرێکی توانایە و وەک خاوەنی «*مجمع الفصحاء*» دەڵێ، دیوانەکەی چوارهەزار بەیت شیعری بووە و ساڵی ۱۲۲۹ ک. م. لە ئەسفەهان کۆچی دوایی کردووە.

**چەند بەیت لە شایق**:

بارها رفتم بـە کـوی یـار و دیـدم یـار نیـست　　　باز می گویم برو! کاین کار چون هر بار نیست

* * *

کشیدم بارهـا بـا او بـە خلـوت جـام زاهـد را　　　پی انکار مـی رنـدان عَبَـث کردنـد بـدنامش

* * *

| | |
|---|---|
| به کجا می‌رود و با که سُخن می گوید | هر که با شوق تو از خانه نیامَد بیرون |

* * *

| | |
|---|---|
| با غَم او شادمان باشد دلم | گرچه با غم شادمانی مشکل است |

*مجمع الفصحاء*، ب٢، ل ٢٥٠. *بهترین اشعار*، ل٢٣٢.

## سەید زەکی شێخولیسلام

پیاوێکی زانا و مامۆستایەکی ئاگایە، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان شێخولیسلام بووە و ساڵی ١٢٣٠ ک. م. بە هۆی چەند بوختانی سیاسیوە، لەگەڵ کوڕەکەی شەهید کراوە.

*تاریخ مردوخ*.

## مەلا جەلالەدینی خورماڵی

لە مامۆستایان و زانایانی بەناوبانگی سەرەتاکانی چەرخی سێزدەیە کە ساڵی ١٢٣١ ک. م. لە دنیا چووە. مەلا جەلال لە گوندی خورماڵ دەرسی گوتووە و یەک لە فەقێیە هێژاکانی مەولانا خالیدی شارەزووری بووە. جارێک مامۆستا نەخۆش کەوتووە و چەند ڕۆژ لە سەرجێ بووە و دەرسی بۆ نەگوتراوە و سەری لە قوتابخانە و فەقێیان نەداوە. مەولانا خالید ئەم شیعرەی بۆ داناوە:

| | |
|---|---|
| میرزام! وەفاتەن، میرزام! وەفاتەن | قەدەم ڕەنجەکەر وادەی وەفاتەن |
| شەهەنشای شادیم مات ناماتەن | بوتپەرەستئاسا، ئەروام جە لاتەن |
| جە حوجرەی سەراو کەی مەبی ڕاهی | هێند مەمدرۆ ماه جە بورج ماهی |
| قەدەم ڕەنجە کەر ئامان سەد ئامان | تۆز ئامانت شیفان پەی زامان |
| وەرنە هاتەمام نایرەی دووری | وە کۆی نوورە کەرد سەرتاپای «نووری» |

*یادی مەردان*، ل١٤و ١٥.

## شێخ موحەممەدی سۆرانی

شێخ موحەممەد لە زانایانی شارەزوورە کە بۆ حەڵەب چووە و ساڵی ١٢٣١ ک. م. لەو شارە دنیای بەجێ‌هێشتووە. ئەم مامۆستایە بێجگە لەوەی فەقێ ڕاگرتووە و دەرسی گوتووە، سەر بە تەریقەتی قادری بووە و شێخیەتیشی کردووە.

*مشاهیر الکرد*، ب٢، ل١٥٦.



## سەید تاها کەبیر

کوڕی سەید ڕەسوول، کوڕی سەید بایزید، کوڕی سەید ئیسماعیل، ناسراو بە «کەبیر»، لە عارفـان و زانایـانی ناوداری بنەماڵەی بەرزنجەیە کە ساڵی ١٢٣٢ ک. م. پاش عومرێک ڕێنوێنی خەڵک و ڕاسپاردن بۆ چاکە و پرینگاندنەوە لە خراپە، ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە حوجرەیەکی مزگەوتی بەرزنجەدا نێژراوە.

*سادات البرزنجیّه*، ١٣٧٥ ک. م.

## عەوام

میرزا عەبدوڵلا، کوڕی میرزا ئەحمەد، کوڕی میرزا عەبدوڵلا، لە بنەماڵەی وەزیرییەکانی شاری سـنەیە کـە شاعیرێکی باش و پیاوێکی خاوەن ڕێز بووە و نازناوی «عـەوام»ی هەڵـبژاردووە و سـەردەمی دەسـەڵاتداری ئەمانوڵا خانی ئەردەڵان، پلەی وەزیری و پێشکاری خانی لە ئەستۆ گرتووە.

جارێک فەتحعەلیشای قاجار، وەکوو ئیلچی و بە ڕاسـپێرییەکی تایبەتـەوە، بـۆ وڵاتی ڕووسـی دەنێـرێ و ئەویش کارەکەی لەوپەڕی ڕێکوپێکیدا جێبەجێ دەکا و دەگەڕێتەوە.

عەوام بۆ ڕەوانبێژی و جوامێری و لاوچاکی و ڕووخۆشی، ناوبانگی دەرکردووە و سـەرەنجام ساڵـی ١٢٣٥ ک. م. لە بشێوەیەکدا کە کوردستانی داگرتووە، شەهید بووە.

**دوو نموونە لە شیعری عەوام**:

نازم به کشوری که مُدام از شراب عـشق　　مُفتـی قَرابـه‌کَـش بـود و شـهریار مـست
مستی رواج یافت به دهر آنچنان که شد　　صوفی به کُنج صومعه بـی‌اختیـار مَـست

* * *

در بُتکـده آن بُتـان کـه هـستند　　زیبـا بُـت مـا همـی پرسـتند
تُرکـان ختـا کـه دل‌ربایـنـد　　دلـدادەی آن دو چـشم مَـستند
صـد شَکر ز رَشـک مَـی‌فروشـان　　شَـیخان در خانقـاه بـستند

*حدیقەی ئامان‌اللهی*، ل٤٠١. *مجمع الفصحاء*، ب٢، ل٥٧٩.

## شێخ موحەممەد سەعیدی مەردۆخی

عەللامەی پایەبەرز حاجی شێخ موحەممەد سەعید، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شـێخ مـەحموود، کـوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامە، لە کەڵەپیاوانی ناوداری بنەماڵەی مەردۆخییە کە لە فیقهـ و ئوسوولدا شارەزا و لـە فەلسەفە و کەلام و ڕیازیدا مامۆستای بێهاوتای ڕۆژگاری خۆی بـووە. ئـەمانوڵا خـانی والی ئـەردەڵان، لـە

ساڵی ١٢٢٧ ک. م. بە خۆشـی ئـەو و براکەیـەوە (شـێخ موحـەممـەد قەسـیم) مزگـەوت و مەدرەسـەی دارول‌ئیحسانی کردەوە.

زا و مەرگی شێخ موحەممەد سەعید لە ساڵی ١١٥٢ و ١٢٣٦ ک. م. ڕووی‌داوە و لە مامۆستاوە چوار کـوڕ بەجیٚ‌ماوە (شێخ عەبدولقادری موهاجیر، شێخ موحەممەد وەسیمی دووەم، شێخ موحەممەد نسیم و شـێخ موحەممەد جەسیم) کە هەرچواریان لە پیتۆڵانی زانست و زانیاری هاتوونەتە ئەژمار.

*تاریخ خاندان مردوخ.*

## شێخ موحەممەد قەسیمی مەردۆخی

شێخ موحەممەد قەسیم، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ مەحموود، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامە و برای شێخ موحەممەد سەعید، کە پێش ئەم باسی کرا، زانایەک لە هەڵکەوتووانی ڕۆژگـار و مامۆسـتایانی نـاوداری دەورانی خۆی بووە کە وەکوو براکەی لە دارول‌ئیحسانی سنەدا دەرسی گوتووە و تاقمێکی زۆر لە ئوسـتادانی ئەو سەردەمە، لە کۆڕی دەرسی ئەودا پێگەیشتون و بەرزەوەبوون. بـۆ وێنـە مـەولانا خالیـد، عـارف و زانـای بەناوبانگی شارەزووری، حیکمەت و ڕیازی و ئەستێرەناسی لە لای ئەو خوێندووە و لەو ئیجازەی وەرگرتووە.

کۆچی دوایی شێخ موحەممەد قەسیم لە ساڵی ١٢٣٦ ک. م. بووە و شێخ عەبدولغەفاری مەردۆخی لـەو بارەوە ئاوای گوتووە:

بحـر علـم و آسـمان فـضل و دیـن — قُطـب عـالم حـضرت شـیخ قـسیم
کـرد رحلـت ناگهـانی زیـن جهـان — شـد مُقـیم انـدر گلـستان نعـیم
سـال تـاریخ وفـاتش هـاتفی — گفـت: «جنّـت زینـت افـزود از قـسیم»[1]

میرزا فەتحوڵای خوڕڕەم‌وەزیریش گوتوویە:

دریـغ از شـیخ دریـادل، قـسیم آن — کـه بـودی پادشـاه ملکـت علـم
دریـغ آن فاضـل کامـل کـه گـویی — بـه شـأنش گـشت نـازل آیـت علـم
بـه قـدر شـخص، اسـتعداد ذاتـش — مُطَـرَّز بـود، زیباکـسوت علـم
از او بگرفـت رونـق کـشور دیـن — وَزو دریافـت رفعـت رُتبـت علـم
غَـرَض چـون آن مَـه بُـرج فـضائل — بـه جنـت شـد روان از حُرمـت علـم
پـی تـاریخ سـال رحلـت وی — بـه «خُـرَّم» هـاتفی از غایـت علـم
بگفت ایـن طُرْفـه مـصرع بـا یکـی بیش — کـه «واویـلا نگـون شـد رایـت علـم»[2]

---

١ و٢. بەرامبەر بە ١٢٣٦.

*تاریخچەی خاندان مردوخ.*

## موشفیقی زەنگەنە

پیرمراد بەگی کرماشانی، سەر بە خێڵی زەنگەنە و نازناو «مُشفق»، شاعیرێکی زانا و ئاگا بووە و بەو بۆنەوە سەرەتی لاوەتی خزمەتی میرانی زەندی کردووە، بڕێک لە ژینامە نووسان «موشفیقی زەند»یان پێ گوتووە؛ بەڵام کە پیر بووە، ڕاهێنانی بەچکەمیرانی شیرازی لە ئەستۆ گرتووە.

«*فرهنگ سُخنوَران*» ساڵی لە دنیا چوونی ١٢٣٧ ک. م. نووسیوە و هیدایەت لە «*مَجْمَعُ الفُصَحا*»دا دەڵێ بۆخۆی دیویە و چەند شیعریشی لێوە هێناوە.

موشفیق بۆ دیوانی حافیز شەرحێکی نووسیوە کە سەرنجی وێژەوانانی ڕاکێشاوە.

**چەند شیعری موشفیق**:

عشقبازی بود از روز اَزَل پیشەی ما　　　خوشتر است از همه اندیشەای اندیشەی ما

* * *

نمودم بیقراری، تا دلش را مهربان کردم　　　پس از این بیقراری‌ها، قراری کردەام پیدا

* * *

زیان نبود نظر کردن کسی را　　　که منظورش تماشای تو باشد

* * *

بُوَد دور از وَفا مرغ چمن را در قَفَس کُشتن　　　اگر داری سر قَتلم، قفس را در گلستان بَر

چه حاجت زحمت خنجر کشیدن، از پی قتلم　　　ز حَسرت تا دهم جان، بر زبان نام شهیدان بَر

* * *

هرچه آید بر سر ما بگذرد　　　وصل او بگذشت و هجران نیز هم

*مجمعُ الفُصحاء*، ب٢، ل٣٣٦. *تذکرەی شعرای کرمانشاه*، شاکری، ل ١٢٨. *فرهنگ سُخنوران*.

## شێخ تاجەدینی شنۆیی

خاوەنی کتێبی «*دانشمندان آذربایجان*» بە گێڕانەوە لە «*تاریخ گُزیده*» ناوی لێ بردووە و دەڵێ: زیا پاشا لە بەرگی دووەمی کتێبی «*خرابات*»دا ئەم دوو بەیتەی بە ناوی ئەوەوە هێناوە:

اگر تن است به جُز خستەی هوای تو نیست　　　و گر دل است به جُز تشنەی وَلای تو نیست

ز فَرق تا بە قَدَم ذرّەای نمی‌بینم　　　که آن از آن تو ای دوست، یا برای تو نیست

شێخ تاجەدین دەبێ لە سەرەتای چەرخی سێزدەدا ژیابێ.

*دانشمندان آذربایجان*، ل ٨١.

## خوڕڕەم وەزیری

میرزا فەتحولا، کوڕی میرزا عەبدوڵلا، نازناو «خُرَّم»، لە بنەماڵەی وەزیرییەکانی سنە، پیاوێکی زانا و وێـژەوان و شاعیرێکی توانا بووە کە لە زێدی خۆی کۆچی کردووە و بۆ لای ئاغا موحـەممـەدخـانی قاجـار (١٢٠١-١٢١١) چووە و خان خۆشیویستووە و بۆتە یەک لە نزیکانی. پاش ئـەوەی لوتفعـەلیخـانی زەنـد (١٢٠٣-١٢٠٩) شیرازی گرتووە، لەبەر هەستی هاونەژادی، لای ئەوی هەڵبژاردووە و چۆتە ڕیـزی یارانییـەوە. بـەڵام کە گولۆڵەی بەختی خانی زەند کەوتە لێژی، ڕۆژی ڕووناکیش لە لای خـوڕڕەم ـکـە خـۆی شـاردبووەوەـ تارمایی هات و بە فەرمانی خانی قاجار، دۆزیانەوە و گرتیان و چاویان هەڵکۆڵی.

خوڕڕەم بە شوێن ئەو کارەساتەدا، گەڕاوە سنە و سیساڵان ژیـا. لـەو سـاڵانە زۆرتـر لـە دەزگـای والیـدا ڕایدەبرد و کاتی بە شیعر گوتنەوە تێپەڕ دەکرد.

وەک ڕەونەق دەڵێ: دیوانی شیعرەکانی پتر لە پێنجهەزار بەیت بووە و بۆ «مـادەتـاریخ»، واتـا دەرهێنـانی باڵی شیعر بە حیسابی ئەبجەد، بەرامبەر بە ساڵـی ڕووداوێـک، کەسـی پـێ نەگەیـشتووە. بـۆ وێنـە لەمـەڕ کردنەوەی مزگەوت و مەدرەسەی دارولئیحسانی سنەوە، قەسیدەیەکی دور و درێژ و تەڕ و پاراوی داناوە کە لە هەموو بەیتێکیدا، باڵی یەکەم بەرامبەر بە ١٢٢٧، ساڵی دەسپێکردن و باڵی دووهەم ١٢٢٨، ساڵـی دوایـی هاتنی کارەکە هاتۆتـەوە. ئـەم قەسـیدەیە بـە خـەتێکی زۆر جـوان لەسـەر بـەردی هـەیوانی ڕۆژهـەڵاتی مزگەوتەکە هەڵکەنراوە. ئەوا چەند بەیت لەو قەسیدە:

منّـت ایـزد را ز عـدل والـی ایـام شـد — این همایون سرزمین بَس به ز فردوس بَرین
شـاهباز اوج عزّوجـاه اَمـانالله خـان — آن که باشد فَرّ یـزدانیش طـالع از جَبـین
آن که کرد از لُطف و احسان زنده نام سروران — و آن که داد از عقل و عرفان رونق دین مُبـین
آن گو بهرام بازویی که درهفت آسمان — زیبد ار کیوان نامی را کَشد از روی زین
و آن هژبر ارسلان بیمی که لَرزد بیدرنگ — گاه کین از بـازو وی، پیکـر شـیر عَـرین
یُمن یزدان کشور او را بود محکم قـلاع — اَمْن سُبحان ملکت او را بود حصن حَـصین

تا لە دواییدا دەڵێ:

باد «خرّم» از عطـا و لُطـف یزدانـی مُـدام — بَـر عُلُـوِّ همّـت اعطـای والـی آفـرین
تـا بـود از بهـر تحمیـد وَدود لـمیَـزل — جَرگەی کَرّوبیان در مسجد گـردون مَکین
دار احـسان «اَمـانالله» خـان بـادا مُـدام — مجمع طاعات و احسان، منهج صدق و یقین

چەند شیعریتری خوڕڕەم:

در بـساط چمـن از مرحمـت یزدانـی — کـرد بـاز اَبـر گُهربـار، گُهرافـشانی

باغ افراشت دگر پرچم کیکاووسی  شاخ بنهاد به سر اَفسر نوشروانی
کرد چون مُشک‌فشان طُرَّه‌ی جانان، در باغ  سنبل از طُرَّه‌ی طَرّار عبیرافشانی
به چمن سرو برافراشت قَد حورایی  به دَمَن لاله برافروخت رُخ غلمانی
کرد در بَزمگه عشرت سلطان بهار  بلبل مَست به صد عیش و نوا خوشخوانی
خواند این نظم دلارا ز کَلام حافظ  «حمَدُالله عَلی مَعْدلَة السُّلطانی»
ای که از درک کمالات تو باشد قاصر  فکرت بوعلی و معرفت لُقمانی
ماه از لمعه‌ی روی تو کند کسب ضیا  مهر از پرتو روی تو بود نورانی
چرخ بر حَنْجر او خَنْجر مریخ کشد  سرکشد با تو هر آن کس که به نافرمانی
تا در آفاق بود دولت و بخت و اقبال  مایه‌ی عیش و نشاط و طَرَب انسانی
باد پیوسته تورا دولت و اقبال قَرین  باد همواره تو را عیش و طَرَب ارزانی

* * *

ز اَورنگ شَبه‌گون شد نگون دیو سیه‌پیکر  سُلیمان فَلَک چون کرد، در انگشت انگشتر
امیر قَیروان زد بر زمین تاج گُهرآگین  خَدیو باختر بنهاد بر سر زرنگار افسر
ز کاخ آبنوسی شد شه هندوستان بیرون  قدم زد تاجدار روس بر فیروزگان منظر
درآمد شهریار خطّه‌ی زنگ از سیه توسَن  به گُلگون رَخش شد کشورگُشای روم جَولانگر
سپهدار حَبَش بدرید بر تن آهنین جوشن  سپهسالار تُرک آراست بر سر زرنشان مغْفَر
عُقاب قیرگون شب نهان شد از نظر ناگه  زرافشان چتر چون آراست این طاووس زرین‌پر
ز بهر انهزام لشکر فرعون ظُلمت شد  نمایان در کف موسای چرخ، آتشفشان اژدر
همی افکند هندو دختری مشکین نقاب از رُخ  همی‌آراست چینی دلبری زرّین قَبا در بر
به هوش آمد ز مستیهای شب، دُردی‌کش گردون  سَحَرگه ریخت صهبای شَفَق در لاله‌گون ساغر
شَه خاور به تیغ آتشین بگرفت عالم را  بدان سان صیت عدل بیرکان خان فَرّخ‌فر
خدیود عهد «امان‌الله» که در بزم جلال او  بود ناهید مُطرب، مهر ساقی، ماه رامشگر
درخت شوکتش دارد ز علم و عقل شاخ و بُن  نهال حشتمش آرد ز عدل و جُود برگ و بر
شرار نار قهرش جانگزا چون شعله‌ی دوزخ  شراب ناب لُطفش جانفزا چون جُرعه‌ی کوثر
ز باد آتش‌افشان گرز و آب خون‌چکان تیغش  از این یک آب گردد خُشک و زان یک خاک گردد تر
ز بهر چشم بدبینش فلک هر صبح سوزاند  کواکب را سپندآسا در این یاقوتگون احمر
نباشد حاجت مدح مَنَش همچون تو ممدوحی  که خورشید جهان‌آرا بود مُستغنی از زیور
در آن دم کز خروش شیردل گُردان پیل افکن  شود صحرای کین پُرشور و شَر چون عرصه‌ی محشر

فتد شیران جنگی را ز وَحشت لرزه بر اَعضا
رسد پیلان زنگی را ز دهشت رعشه بر پیکر
ز آتشباری خمپاره و توپ شررافشان
فضای رزمگه دوزخ‌صفت گردد شَرر پرور
نهنگ تیغ از هر سو به خونخواری گشاید لب
عقاب تیر از هر جا به خونریزی گشاید پر
ز خون کُشتگان گردد زمین چون قامت عاشق
سنانها قد کشند از هر کنف چون قامت دلبر
ز گرز شیر سر، گاو زمین را پشت گردد خم
ز بانگ گاودُم شیر فلک را گوش گردد کَر
شکاف افتد به جوشنها ز نوک نیزه و ناوک
شکست آید به مغْفَرها ز ضرب ناچخ و ششپر
به سان ماهیان سیمگون در آتشین دریا
شناور گردد اندر لجّه‌ی خون آبگون خنجر
کُنی جا بر فَراز نیلگون رخش جهان‌پیما
بدان‌سان بَر فراز خنگ گردون خسرو خاور
شود از پویه‌ی رَخش و صَهیل اَشْهبت پیدا
به میدان لمعه‌ی برق و به کیهان نعره‌ی تُندر
گریزد فَوج دشمن از دَم تیغ شَرربارت
چنان کز پرتو خورشد تابان جرگه‌ی اختر
خدیو آسمان شوکت! سپهدارا! نمی‌دانم
چه گویم از جفای چرخ و دور ماه و جور خَور؟
بود همواره خندان تا ز ابر نوبهاران گل
بود پیوسته لرزان تا نهال بید، از صَرصَر،
حبیبت آنچنان خندان که گُل از اَبر آزاری
حسودت آنچنان لرزان که از صَرصَر نهال تر

ساڵی کۆچی دوایی خوڕەم ١٢٣٩ ک. م. بووە و ڕەونەق لەو بارەوە ئاوای گوتووە:

بە تاریخ او کلک رونق رقم زد
«بود در جنان جاودان جای خُرَّم»[١]

*حدیقه‌ی اَمان‌اللهی*، ل٣١٩. *مجمعُ الفُصحاء*، ب٢، ل١٠٨.

## مەلا مەحموودی پیرحەسەنی

مەلا مەحموود مەشهوور بە «پیرحەسەنی»، کوڕی مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی، مامۆستایەکی زانایە کە لای عەللامە ئیبنولحاجی جێشانەیی تەواو کردووە و پاشان گەڕاوەتەوە دێلێژە و لەوێ مزگەوت و قوتابخانەکەی گەڕاندووە.

ساڵی ١١٩١ ک. م. کە سلێمانی بۆتە شار، مەلا مەحموود ڕووی لەوێ کردووە و لەگەڵ عەللامە شێخ مەعرووفی نۆدێیی بەرزنجی، لە مەدرەسەیەکدا دەرسی گوتووە.

مەلا مەحموودی پیرحەسەنی زانایەکی پارسا بووە و کاتی بێکاری، بە خوێندنەوە و عیبادەت ڕایبواردووە. سێ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە کە هەرسێکیان ڕێگای بابیان گرتووە؛ مەلا حوسەین، مەلا ئەحمەد و مەلا حەسەن.

مەلا حەسەن لە دێلێژە دانیشتووە و شاعیری چاکیش بووە و ئەم بەیتە شیعری ئەوە:

---

١. بەرامبەر بە ١٢٣٩.

یاقووتە لـەبی لـەعلت؟ یـا قـووتی ڕەوانی دڵ؟ ڕەشماری سەری زولفـە؟ یـاخۆ ڕەشـەمارێکە؟

مەلا مەحموود ساڵی ١٢٣٩ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

وەرگیراو لە: پێشەکی *دیوانی مەلا مەحموودی بێخود*.

## شێخ عەبدوسسەمەدی کاشتەری

خواناسی پارسا و زانـای ئاگـا، حـاجی شـێخ عەبدوسـسەمەدی مـەردۆخی کاشـتەری، لـە پـشتی شـێخ مەجدەدین، کوڕی شێخ ئەبووبەکری تەختی، لە مامۆستا گەورەکان بووە کە لە گونـدی کاشـتەر، سـەر بـە ناوچەی بێڵەوار، دانیشتووە و هەموان، لە گەورە و پچووک، سەریان پێ سپاردووە. سێ جار بۆ حەج چـووە و جاری ئاخر (ساڵی ١٢٤٠ ک. م.) نەگەڕاوەتەوە و بە ڕێگادا، سەری یەکجاری ناوەتەوە؛ وەک عارفی پایەبەرز شێخ غەفوور لەم شیعرەدا ئاماژەی پێ کردووە:

مهـین عبدالـصَّمد چـون مهـر تابـان بـه چـرخ معرفـت چنـدی عیـان شـد
زهـی پـاکیزەخـصلت احـسن‌الحـاج وحیـد عـصر خـود در ایـن جهـان شـد
چـو بـودش یـاد حـق در دل همیـشه فقـط ذکـر حَقَـش ورد زبـان شـد
سەبارش گشت حق قسمت، در این کار موفـق از خـدای مهربـان شـد
ولـی بـار سـوم چـون کـرد عـودت مـرض بگرفـت و جـسمش نـاتوان شـد
بـه رَه در منـزل چـارم، روانـش بـه سـوی «جَنَّـةالمـأوا» روان شـد
دریـغ آن آفتـاب علـم و دانـش بـه غُربـت از نظَـر ناگـه نهـان شـد
رَقَـم زد خامـه سـال فـوت او را: «که وی از حـج بگُلگـشت جنـان شـد»[١]

*تاریخچەی خاندان مردوخ*. یاداشتەکانی نووسەر.

## عوبەیدیللا ئەفەندی حەیدەری

عوبەیدیللا ئەفەندی حەیدەری ماوەرانی، کوڕی سیبغەتوڵا ئەفەندی حەیـدەری (یەکـەم) و بـرای موحـەممـەد ئەسعەد سەدرەدین، لە بنەماڵەی بەناوبانگی حەیدەری و لقی ماوەرانییە کە دواجار بۆ بەغدا کۆچیان کردووە.

عوبەیدیللا، موفتی حەنەفی بەغدا و لە گـەورە زانایـان و عارفـانی عـیراق بـووە کـە هـەر لـە سـەرەتای لاوەتییەوە، لەو کاتەدا مەولانا خالیدی شارەزووری لە سلێمانی دەرسی گوتۆتەوە، بەردەسـتیی ئـەو زاتـەی کردووە و زۆری بەهرەبردووە تا تەواو پێگەیشتووە. کە لە هیندووستانیش گەڕاوەتەوە و بۆتە قوتبی تەریقەت،

١. بە ئەبجەد دەکاتە ١٢٤٩.

دیسان و بەڵکوو شێرگیرتر خزمەتی پێ کردووە و چۆتە ڕیزی مریدانییەوە و بـە هـەموو گیانییـەوە سـەیر و سولووکی دەسپێکردووە و لە سەفەر و هێبەری مورشیدیدا، لە خزمەتی بووە و بۆ سەفەری بەغـدا و دمـشق هاوڕێیی کردووە و وەک نووسیویانە، لە سەرەتای سولووکیدا، مەشکە و گۆزەی ئاوی لە سەر شان نـاوە و بـە بازاڕاندا گەڕاوە و ئاوی بە خەڵکی تینوو داوە و بە ڕیازەت کێـشان و نـەوس کوشـتن، گەیـشتۆتە ڕادەیـەک مەولانا ئیرشادی تەریقەتی پێ ئەسپاردووە و کە لە دمشقەوە گەڕاونەتـەوە بـۆ بەغـدا، بـە دەسـتووری ئـەو، هاوکات دەرس‌گوتنەوەشی دەسپێکردووە و سەرەنجام ـ وەک گوتمان ـ بۆتە موفتی حەنەفی شاری بەغدا.

بۆ ناسینی باشتری ئەم عارف و زانا پایەبەرزە، لێرەدا بەشـێک لـە نامەیـەکی عەللامـەی بەیتووشـی ـکـە پێشتر باسیمان کردـ چاو لێ‌بکەین کە لە جوابیدا نووسیویەتەوە. بەداخەوە نامەکـەی عوبەیـدیللا ئەفەنـدیم دەس نەکەوت کە لە پەنا یەکیان ببینین:

«أهدی مِنَ التَّسلیمات ریاضاً تَفَتَّقَتْ مِنْ کمـامِ الولاءِأزهارُهـا و تَـدَفَّقَتْ مِـنْ یَنـابیعِ الوَفـاءِ أنهارُهـا وَ سَـجَعَتْ بِمَحْضِ الوِداد أطیارُها و رَقَّتْ مِنْ نَسیمِ الإخْلاصِ أصائلُها و أسحارُها و...»: «الی مَنْ رَبَّتْهُ المَکارمُ فی حجْرِهـا، و غَذَّتْهُ مِنْ أفاویقِ دَرِّها حَتّی تَرَعْرَعَ و بَرَعَ و وَرَدَ مَنْهَلَ الفَضْلِ وَ شرَعَ و... رابِطَةُ نظامِ العقیدة الاشْعریَّـة و واسـطَةُ القلادَة الجوهَریَّة الحَیْدَریَّة، الَّتی صیغَتْ بِید االأقْدار عَلی أتْقَنِ صیغَة وَ صُبغَتْ مِنْ صِبغَةالله بِأحْسَنِ صـبْغَه و روی حَدیثَ قَدیمِ شَرَفِها الأعلام، بِأقْلامِ الألْسِنَة وَ ألْسنَةِ الاقْلام، و صارَ صَیتُها مَدی دَهْرٍ لاشَهْرٍ و ازْدَهَتْ بِهـا مـاوَرانُ عَلی ماوَراءِالنَّهْر و... أعْنی بِهِ شَمْسَ المَعارِفِ المُشْرِقَةَ فی الآفاق، شَیخَ مَشایخِ العراقِ عَلَی الاطْلاق، العَلامَةَ الَّـذی أصْبَحَ العِلْمُ مِنْهُ مُتَقَلِّداً بالصارِمِ الهِنْدی، حَضْرَةَ سیِّدنا المُکرَّمِ عُبَیْدالله بنْ صِبغَة الله أفَنْدی و...

| | |
|---|---|
| انْ فـاخَرَتْ دَجْلَـةُ فـی فَیْـضِها | عِلْـمَ عُبَیْـدالله، قُـلْ أقْـصری |
| فَعِلْمُـــهُ لَـــیْسَ لَـــهُ مَعْبَـــرٌ | وَ کَـمْ رَأیْنـا لَـکَ مِـنْ مَعْبَـر |
| وَدَّ الـسَّما تَـشْری عُـلاهُ وَ لَـوْ | بالـشَّمس وَ المـرّیخ وَ المُـشْتَری |
| أقْلامُـهُ تَفْعَـلُ فـی مُهْجَـة الْـ | ـحاسد مـا یَفْعَلـهُ الـسَّمْهَری |
| زَهَـتْ بِـهِ بَغْـدادُ زَهْـوَ الرُّبـا | بالنَّبْـت، غـبَّ العـارض المُمْطـر |

کتێبی *یادی مەردان*، لە باسی عوبەیدیللا ئەفەندیدا دەڵێ: « بە فەرمایشی مەولانا خالیـد، عوبەیـدیللا لـە تەریقەتدا بە ئاخر پلەی فەنا و بەقا گەیوە؛ کە ئەوپەڕی سولووکی مریدانە».

*بُغْیه الواجد فی مَکتوبات مَولانا خالد*، دمشق، ١٣٤٤ ک. م. ل ٢٠٠–٢١٨.

*البیتوشی*، شیخ محمّد خال سُلیمانیّەای، بغداد، ١٣٧٧ ک. م. ل٢٢٥–٢٥٢.

*یادی مەردان*، مەلا کەریمی مودەڕیس، ل ٩٩.

## مەلا مەهدی شێخولئیسلام (یەکەم)

مەلا موحەممەد مەهدی یەکەم، کوڕی مەلا حەسەن، کوڕی مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلا حوسەینی قازی، کوڕی مەلا موحەممەد ئەمین، کوڕی مەلا عەباس، کوڕی مەلا یەعقووب، پیاوێکی زانا و دڵاوا و خێرومەند لە بنەماڵە گەورەکانی شاری سنە بووە کە ساڵی ١٢٤٠ ک. م. لەو شارە لە دنیا چووە.

*تاریخ مردوخ.*

## یۆسفی خدری

یۆسف، کوڕی عەبدولجەلیل، کوڕی مستەفا خدری حەنەفی، لە مامۆستایان و تاربێژانی بەناوبانگی شاری مووسڵە کە لە قوتابخانەی «قەرەمستەفا پاشا»دا دەرسی گوتووە و لە مزگەوتی یۆنسی نەبی (د) وەعزی داوە و ساڵی ١٢٤١ ک. م. ئەمری خوای بەجێهێناوە.

**لە کتێبەکانی**: «*الأنتصار للاولياء وَالاخيار*» و «*كَشفُ الاسرار وَ الاستشفاءُ بِأحاديث المُصطَفی صَلّی الل عَليه وَ سَلَّم*».

*هدیة العارفین*، ب٢، ل ٥٧٠. *لُغت نامەی دهخدا*، چاپی ١٣٢٥، پیتی خ، ل ٣٠٠.

## عالی سنەیی

میرزا موحەممەد حوسەینی سنەیی، نازناو «عالی»، بە گوتەی نووسەری «*حدیقەی اَمانُ اللّهی*»، سەرەتا پێشکاری بابی ڕەونەق بووە؛ بەڵام پاشان لای ئەوی بەجێهێشتووە و بەرگی دەروێشی لەبەر کردووە و کەوتۆتە گەڕان و بۆ زیارەتی دوو حەرەمی پیرۆز و شوێنە مبارەکەکانی تر چووە و سەرەنجام ساڵی ١٢٤١ ک. م. لە شاری ورمێ دنیای بەجێهێشتووە.

عالی لە شیعر و شاعیریشدا دەستێکی باڵای هەبووە و دەوری سێهەزار بەیت شیعری گوتووە.

**چەند نموونە لە شیعری عالی**:

اسیر عشقم و یارب کَسَم نَصیر مَباد    وگربود به جُز آن یار دلپذیر مباد
شکیب و دین و جوانیم جمله صَرف تو شد    دلم نمود به من این همه، که پیر مباد
بریخت خونم و رنجید از تپیدن من    خدا کند که به عالم کسی فقیر مباد

* * *

بخت مرا اگر مَدَد این است، دست مَن    در حَشر هم به دامن قاتل نمی‌رسد

* * *

گر آن مه از پی تسکین دل حرفی به من گوید    دلم صد رَه فزون آن حرف را با خویشتن گوید

*حدیقەی اَمان‌اللهی*، ل ٤٠٠. *مجمعُ الفُصحاء*، ب٢، ل ٣٥١.

## مەولانا خالید

قوتبی تەریقەت و نوێنەری حەقیقەت، زانای ڕەببانی و پیری ڕۆحانی، سەرباشقەی ڕێبازی نەقشبەندی و سەرۆکی گەورەیی و خۆشەویستی و ئابڕوومەندی، نوێکاری چەرخی سێزدەیەم، زیائەدین ئەبولبەها مەولانا خالیدی «ذوالجَناحَین»ی شارەزووری نەقشبەندی، زاتێکی هێژا بووە؛ سەرانسەر ڕازاوە بە خشڵ و زەنبەری زانست و عیرفان، کە لە کوردەواریدا وەکوو هەتاوێکی تەیسان درەوشایەوە و لە ماوەیەکی کەمدا، بەشێکی بەربڵاو لە وڵاتە و موسوڵمانەکانی ڕووناک کردەوە.

خوالێخۆشبوو هیدایەت لە ژیننامەی *«ریاضُ العارفین»*دا سەبارەت بەم کەڵەپیاوە وای نووسیوە: «خالدبن احمد حُسینی سلیمانیەای، هو فخر العارفین و زین السالکین، شیخ خالد و در کمالات صوری و معنوی واحد، اصلش از اکراد سلیمانیه و در بغداد صاحب خانقاه و دستگاه، به صحبت علما و فضلای معاصرین رسیده و سالها در بادیەی تحصیل و طلب دویده و در خدمت عرفا و مشایخ این عهد ریاضات کشیده، تا بادەی معرفت چشیده، همواره آستانش مَلجأ فقیران و پیوسته محفلش مجمع امیران، به همت سخاوت معروف و به طاعت و عبادت موصوف، سلاسل بسیار دیده و طریقەی نقشبندیه گزیده. اکنون سلسلەی علیەی نقشبندیه را به وجودش افتخار است و شیخ بالاستقلال و الاستحقاق آن دیار است. از بلاد بعیده، طالبان خدمتش، مخصوص به تقبیل حضرتش می‌آیند و به مفتاح توجه و التفاتش قفل گنجینەی طلب می‌گشایند...»

مەولانا خالید لە عەشیرەتی میکاییلی جافە و لە شارۆچکەی قەرەداغ، لە پێنج فرسەقی شاری سلێمانی هاتۆتە دنیا. بابی مەولانا ئەحمەدی حوسەینی، لە پشتی پیر میکائیلی شەش قامکە کە ئەویش لە باوانەوە دەگاتە خەلیفەی سێهەم، حەزرەتی عوسمان (د). تایفەی مەولانا خالید بەوبۆنەوە کە زاروزێچی پیرمیکاییلی جافن، «پیرمیکاییلی»[1] یان پێ ئێژن. دایکی مەولانا خالید، سەیدزادە فاتمە خاتوون، لە تۆرەمەی سەید موحەممەد زاهیدە، ناسراو بە «پیر خدری شاهۆیی»[2].

ساڵی لەدایک بوونی مەولانایان ١١٩٢ و ١١٩٣ گوتووە؛ کە شێخ ئەسعەدی ساحیب، خزمی نزیکی مەولانا، لە کتێبی *«بغیەالواجد»*دا، ١١٩٣ ک. م. بە ڕاست زانیوە.

مەولانا لە پێشدا لە قەرەداغ، قورئانی پیرۆز و وانە سەرەتاییەکانی فارسی و عەرەبی فێر دەبێ و پاشان لە شوێن دەرس و دەور، ئەکەوێتە گەڕان و گەیشتنە خزمەتی زانایان، بە لادێ و شاراندا و لە خزمەتی کەسانی وەک: سەید عەبدولکەریمی بەرزنجی و براکەی سەید عەبدوڕڕەحیم، مەلا موحەممەد ساڵحی تەڕەماری، شێخ عەبدوڵڵا خەرپانی، مەلا مەحموودی غەزایی، عەللامە عەبدوڕڕەحیمی زیارەتی (زیاری) و

---

١. بڕوانە بۆ پەراوێزی ژمارە ١ی لاپەڕەی ١١٤.

٢. بڕوانە بۆ لاپەڕەی ٧١.

عەللامەی پایەبەرز مەلا موحەممەدی ئیبنوئادەمی باڵەکانی ـکە هەرکامیان کۆڵەکەیەکی پتەو لە بواری زانست و وێژەوانی بوون ـ دەرسی خوێندووە و بەهرەی بردووە.

مەولانا هەر لە سەرەتاوە خۆی لەگەڵ کەم خواردن و کەم خەوتن و ریازەتکێشان و بڕست هێنان لە سەخڵەتی و برسیەتیدا، ڕادێنێ و هەر لە خوێندنەوە و دەورکردنەوەی دەرسەکانی دەبێتەوە، ڕوو دەکاتە نوێژ خوێندن و قورئان و تەفسیران خوێندنەوە و دەروونی پاکی بۆ وەرگرتنی تیشکی پیرۆزی ئاگایی باردێنێ و هەروەها نامیلکەیەک دەنووسێ و هەڵبەستێک دەهۆنێتەوە و وردە وردە دەست و قەڵەمی لەگەڵ نووسین و شیعر گوتندا ڕادێنێ.

لە گەڕانەوەیدا بۆ قەرەداغ، ئەوڕەحمان پاشای بابان داوای لێ دەکا بچێ بۆ سلێمانی و لە قوتابخانەکەیدا دەرس بێژێتەوە. بەڵام مەولانا پێنەگەیشتووی خۆی ئەکاتە بیانووی نەچوونی و ڕوو لە ڕۆژهەڵات ئەکا و ئەگاتە سنە و ماوەیەک لای ئوستادی ڕیازی، عەللامە شێخ قەسیمی مەردۆخییەوە حیساب و هیندیسە و ئەستێرەناسی دەخوێنێ. ساڵی ١٢١٣ ک. م. دوای وەرگرتنی ئیجازە، ئەگەڕێتەوە قەرەداغ و بە هەڵکەوت لەم کاتەدا مامۆستای پێشووی، شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی لە سلێمانیدا کۆچی یەکجاری دەکا و مەولانا ـلەسەر داخوازی تاقمێک لە زانایانی ئەوشارە ـ لە جێی دادەنیشێ و قوتابیان و خوازیارانی زانست لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێدەکەن و لەو سەرچاوە پڕپیتە بەهرەمەند دەبن.

ساڵی ١٢٢٠ مەولانا بۆ بەجێهێنانی حەج و زیارەتی گڵکۆی پاکی دوایین ناردروای خوا، موحەممەدی مستەفا (د) بەرەو حیجاز کەوتە ڕێ و لە مووسڵ و دیاربەکر و زەها و حەلەب و باقی شارەکانی شام و فەلەستین لایدا و لەگەڵ زانایان و پارسایانی ئەوشارانە دانیشت؛ وەک لە شامدا خزمەتی شێخ موحەممەدی «کزبری»، مامۆستای «دارُالحدیث» و شێخ مستەفا کوردی ـکە هەکیان لە باری زانست و ئاکارەوە، ناوازەی شار و عەللامەی ڕۆژگارێ بوون ـ گەیشت و لە سێبەری پڕپیتیاندا ئیجازەی گەڕاندنەوەی حەدیس و خویندنەوەی ویرد و زیکری وەرگرت و داب و دەستووری تەریقەتی قادری ناسی.

پاش گەیشتنە مەککە و بەجێهێنانی حەج، بەرەو مەدینەی پیرۆز کەوتەڕێ و کە چاوی کەوتە «**قُبّةُالخَضرا**»، قەسیدەیەکی دوور و درێژی بە فارسی هۆنیەوە کە ئەوا چەند بەیتێکی:

عجایب نشئەای زین دامن کُهسار می‌آید تو گویی با نسیم صُبح بوی یار می آید
ز خاکش یافت تسکین زخمهای سینەی ریشم تَعالَی‌الله چەسان از مُشکْ این کردار می‌آید
نشانی از هلال عید وصل دوست می‌بخشد هر آن نقشی ز سُمّ توسن رهوار می‌آید
نمی‌دانم کجا می‌آید اما این‌قدر دانم دَمادَم نفحەهای طبلەی عطار می‌آید
علامتهای روز و شب به کلی از میان برخاست زهی بگسسته از هم پرتو انوار می‌آید
اگر نه جای آن سر حلقەی مشکین غَزالان است چرا زین خاك بوی نافەی تاتار می‌آید؟

بلی این جلوه‌گاه دلربای عالم‌آشوبی است — کـه تـصویر نظیـرش بـر خـرد دشـوار مـی‌آیـد
نشانی از کف پایش به هر منزل که شد پیدا — از آنجـا سُـرمه‌ی چـشم اُولُوالابـصار مـی‌آیـد

تا دەڵێ:

دلا هشیار بـاش از پرتـو حُـسن ازل کاینجـا — تَجلیهـــا دَمــــادم بـــر دل هـــشیار مــــی‌آیــــد
به بیداریم دادند آنچه در خوابش نمی‌دیـدم — سـعادت بـین مَـرا کَـز دولـت بیـدار مـی‌آیـد
سُخَن سربسته تاکی با نسیم صبحدم «خالـد» — شـمیم خـاك کـوی «اَحمـد مُختـار» مـی‌آیـد
ز یُمن پایبوسش فرش را بر عرش تفصیلی است — سُـعود نحـس را انکـار در ایـن کـار مـی‌آیـد
جهان را می‌توان در دانه‌ی خشخاش جـاکردن — وَلـی مـدحش کجـا در حَیّـز گفتـار مـی‌آیـد
کسی کُو هر دو عالم زو به سلك انتظام آمـد — چه سود ار گویَمَش بـر سـروران سـالار مـی‌آیـد
در این موسم بیابان طَی مَکُن بیهوده ای حـاجی — کـه بیـت‌الله بـه طـوف روضـه‌ی دلـدار مـی‌آیـد
بنامیزد کریمی کَـز وجـود فـایضُ‌الجُـودَش — دُر از دریا، گُهـر از خـاره، گُـل از خـار مـی‌آیـد

ئەم قەسیدە یەکجار زۆرە و هەمووی لێرەدا جێ نابێتەوە.

مەولانا لە ماوەی مانەوەی لە مەدینەدا، بە چاوبڕین لە مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی، حەوت بەندێکیشی بە فارسی نووسی کە ئەمە بەندێکیە:

سـرور عـالم! مـن دلـداده حیـران تـواَم — واله و سرگـشته‌ی سـودای هجـران تـواَم
شاه تخت قاب‌قَوسینی تو، من کمتر گدا — کی بود یارای آن گویم که مهمان تـواَم
رحمت عامی تو، آب زندگی، من تـشنه‌ای — مُـرده بهـر قطـره‌ای از آب حیـوان تـواَم
دیگران بهر طَواف کعبه مـی‌آینـد و مـن — کُو بـه کُـو اُفتـاده‌ی کـوه و بیابـان تـواَم
دوش در خوابم نهادند افسر شاهی به سر — گوییا پـا مـی‌نهـد بـر فَـرق، دربـان تـواَم
«جامیا» ای بُلبـل دستانـسرای نعـت دوسـت — این سُخن بَس حَسْب‌حال آمد ز دیوان تواَم
«بر لب افتاده زبان، گرگین سگی‌اَم تشنه‌لب — آرزومنـــد نَمـــی از بحـــر احـــسان تـــواَم»

مەولانا خالید دوای گەڕانەوە بۆ سلێمانی، وەکوو پێشوو، دەرس‌گوتنەوەی دەسپێکردەوە و لـە کاتـەکانی تریشیدا خەریکی خوێندنەوە و عیبادەت و زیکر و نـزا و سـکاڵا دەبـوو؛ بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا هەمیـشە چاوەڕوان بوو دەروێکی لێ بکرێتەوە و چاوی بە دیتنی شێخێکی گەورەی نەقشبەندی ڕوون ببێتەوە.

ساڵی ١٢٢٤ ک. م. پارسایەکی دنیاگەڕ بە ناوی مـیرزا ڕەحیمـی عـەزیم‌ئابـادی هیندووسـتانی، ئەگاتـە سلێمانی و لەڕێوە ئەچێتە مەدرەسەی مەولانا. مەولانا پاش بەخێرهێنان، لێی دەپرسـێ خەڵـکی کوێیـە و کاری چییە. جواب دەداتەوە: دەروێشێکی غەریبم لە موسوڵمانانی هیند و کارم گەڕان و گەشت و گێـڵە و ئەگەر ڕێم هـەبێ، بـەنیازم چەنـد ڕۆژێـک لێـرەدا میـوانی ئێـوە بم. مـەولانا کـە مرۆیـەکی خێرومەنـد و

میوانخۆشەویست بووە، بەوپەڕی ڕووخۆشـی و گەشـییەوە ڕایـدەگرێ و حوجرەیـەکی مزگەوتەکـەی بـۆ تەرخان دەکا تێدا بحاوێتەوە و هەموو خزمەتگوزارییەکیشی بۆخۆی دەگرێتە ئەسـتۆ. مانگێـک بـەم شـێوە ڕادەبرێ و مەولانا وردە ـوردە هۆگری دەبێ و بە دانیشتن و قسە لەگەڵ کردنی کەیفی دەیگرێ. بەتایبـەت پارێزکاری و شەونوخوونیکێشان و چۆناوچۆنی هەڵسوکەوتی، زۆری کار لەسەر دڵ دەکا.

ڕۆژێک لە نێوان قسەدا مەولانا لێی دەپرسێ: کام تەریقەت دەناسی؟ دەروێش ئێژێ: ئەمن نەقـشبەندیم و لە مریدانی سەرباشقەی ئەم تەریقە، عارفی پایەبەرز، شاعەبدوڵلای دیهلەویم. مەولانا هەر ئەمە دەبیـسێ، ڕادەپەڕێ و باوەشی پێدا دەکا و سەروچاوی ڕادەمووسێ و لێی دەخوازێ هێنـدێک لـە داب و دەسـتووری ئەم تەریقەتە و هەروەها کورتەیەک لە مەڕ کەسایەتی مورشیدەکەیەوە بۆ بـاس بکـا. عـەزیمئابـادی پـاش وەرامی تێروتەسەلی هەموو پرسیارێک، ڕادەگەیەنێ: ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەمن مورشیدم ڕایسپاردووم لێرە بم و ئەتۆ بۆ لای ئەو بەرم و ئەوا ماوەیەکە چاوەچاوی هەلێکم ڕاسپێرییەکەم ڕابگەیەنم. ئێستا ئەگـەر دڵـت لەسەر قسەکانم دامەزراوە، بە زووترین کات تەیاری ئەو سەفەرە ببە با ڕێکەوین! مەولانا کـە دەبینـێ ئاواتـە گەورەکەی ئەوا خەریکە دێتە دی، وەخۆ دەکەوێ و کۆڕی دەرس و کاری مەدرەسـە وەلا دەنـێ و ڕوو لـە ڕۆژهەڵات دەکا و بەرەو هیندووستان دەکەوێتە ڕێ.

مەولانا لەو سەفەرەشیدا بە شـار و بازێـڕێکی زۆر وەکـوو: سمنـان و بەسـتام و خـەرەقان و نەیـشابوور و مەشهەد وجام لە ئێراندا تێدەپەڕێ. لە بەستام کاتی زیارەتی مەرقەدی سوڵتانولئەولیا، بایەزیدی بەستامی، شیعرێک دەڵێ کە ئاوا دەسپێدەکا:

| | |
|---|---|
| یـا رب بـە حـق تُربـت سُـلطان بایزیـد | یـا رب بـە قاطعـیت بُـرهان بـایزید |
| یـا رب بـە آشـیانەی شهـباز لامکـان | یعنـی بـە قُـرب و منزَلَـت جـان بایزیـد |

تا لە کوتاییدا ئێژێ:

| | |
|---|---|
| بر «خالـد» شـکستەی بیـچـارەی غریـب | بگـشا دری ز مَخـزن عـرفان بـایـزید |
| او را بە خود رسان و ز خودبینیش رهـان | او هـم شـود یکـی ز غُـلامـان بایـزیـد |

هەروەها لە مەشهەد کە دەگاتە بارەگای ئیمام ڕەزا، لە پەسنیدا، قەسیدەیەکی جوان دەهۆنێتەوە کە بـەم بەیتەوە دەسپێدەکا:

| | |
|---|---|
| ایـن بارگـاه کیـست کـە از عـرش برتـر است | وز نـور گنبـدش همـە عـالم منـوّر اسـت |

لە شاری «جام»یش کە دەگاتە سەر گڵکۆی شێخ ئەحمەدی نامیقی، شیعرێک بەو بۆنەوە دەهۆنێتەوە.

مەولانا دەگاتە خاکی ئەفغان و شارانی هەرات و قەندهار وکابول تێپەڕ دەکا و لەوێشەوە پێ دەنێتە خاکی هیندوستانی ئەو سـەردەمەوە و پیـشاوەر و لاهـوور دەبینـێ و لـە هـەموو ئەوشـارانەش لەگـەڵ زانایـان و مامۆستایانی گەورەیاندا دادەنیشێتە پای وتوویژ و زۆری ڕێز لێ دەگیرێ. پاشان ڕوو دەکاتە شاری دیهلی.

سەفەری مەولانا لە سلێمانییەوە تا دیهلی، ساڵێک دەخایێنێ و وەک گوتمان، لە هەموو شارانی ئەوڕێگایەدا تێکۆشیوە مامۆستایان و هەڵکەوتوانیان ببینێ و لێیان شت فێر ببێ. لە چەند شاری ئێران، بە تایبەت مەشهەددا، دوای ئەوەی ناسیویانە و بە ڕادەی زانست و ئاگاداری و وریاییان زانیوە، کۆشیویانە لەو سەفەرە پەشیمانی بکەنەوە. بەڵام ئەو وەرامی داوەتەوە: ئەمن هێشتا نەگەیشتوومەتە بەرەوە، پیت و بەرەکەتی مەعنەوی ئەو سەفەرەم هەست پێ‌کردووە و چیتر چوون و بەرەو یار بوونم، لە دەسەڵاتی مندا نییە.

پەتێکی خستۆتە ملم ئەو یارە   بۆ کوێم دەبا و چم لێ دەکا، موختارە

بەڵێ کە دەگاتە بەرەوە و لە «دارُالارشاد»ی «جهان‌آباد»، نیشتنگەی شاعەبدوڵڵای دیهلەوی، نزیک دەبێتەوە، دوو قەسیدەی عەرەبی و فارسی دەهۆنێتەوە کە سەرەتای عەرەبییەکە ئاوایە:

كَمُلَت مَسافةُ كَعْبَةِ الامال   حَمْداً لِمَنْ قَدْ مَنَّ بالإكْمال

ئەمەش چەند بەیتێک لە فارسییەکەی:

دهید از من خبر آن شاه خوبان را به پنهانی   که عالم زنده شد بار دگر از ابر نیسانی
صَف نَظارگان در انتظارش چشم بر راهند   پریرویان همه جَمعَند و مُطرب در غَزل‌خوانی
خَرامان و چَمان با صدهزاران عشوه و دستان   کند تشریف را یکدم به صَحن گُلشن ارزانی
گُذارد از کف پا لاله را مرهم به داغ دل   نَهَد داغ غلامی لاله‌رویان را به پیشانی
بَرَد آب از لَطافت تازه گُلهای بهاری را   دهد تاب از خجالت نونهالان گُلستانی
کُند آکنده از رشک رُخَش گُل را به خون دل   کُند شرمنده طاووس چَمَن را از خرامانی
شود روشن به دیدارشریفش دیده‌ی نرگس   رَهَد از پایبوسش سنبل تَر از پریشانی

تا دەگاتە پەسنی مورشیدەکەی و دەڵێ:

هزاران گُل شُکُفته از نسیم صبح در یک دم   چو دلهای مریدان از نگاه قُطب رَبّانی
چراغ آفرینش مهر بُرج دانش و بینش   کلید گنج حکمت، مَخزن اسرار سُبحانی
مهین رهنمایان شمع جمع اولیای دین   دلیل پیشوایان، قبله‌ی اَعیان روحانی
عُبیدالله شاه دهلوی، کَز التفات او   دهد سنگ سیه خاصیت لعل بدخشانی
امام اَولیا سَیّاح بیدای خدابینی   ندیم کبریا، سَبّاح دریای خدادانی
یَمَن شد گوییا هندوستان از یُمن انفاسش   دمادم می‌دهَد زُو نَفحَه‌ی اَنفاس رَحمانی

بەم شێوەش شوێنی قسەکەی دەگرێ و پاشان کۆتایی پێ دێنێ:

اگرچه کافرستان است باشد از وجود او   بهشت و این سخن نبود خلاف نصّ قرآنی
مرا نادیده باشد با سر کُویش سروکاری   پس از دیدن عراقی را نَبُد با پیر ملتانی
بسی توبیخ کردند اهل توران و خُراسانم   به دارُالکُفر رفتن چون پسندی گر مسلمانی

به دهلی ظُلمت و کُفر است گفتند و بـه دل گفـتم
به ظُلمت رَو، اگر در جستجوی آب حیـوانی
نَشد با طول صُحبت ز اولیای یثرب و بَطحا
مُیَسَّر آنچـه از وی شـد مـرا نادیـده ارزانـی
به جان شو بنده‌اش ای آنکه می‌خواهی شدن آزاد
ز تَسْویلات نفسانیّ و تَلبیسات شـیطانی
لئیمی گفت: من نزدیکم و نشناسمش، گفتم
مگـر نقـل اَبوجهـل و پیمبـر را نمـی‌دانـی؟
تَمنّـای قبـولش دارم و دانـم کـه نـااهلم
مـدَد یـا روح شـاه نقشبند و غـوث گیلانـی
به خود کُن آشنا، چون کَردیَم از خویش بیگانه
عَطای اَحمدی فرما، چو ما کـردیم سَلمانی
ز جام فیض خود کن «خالد» درمانده را سیراب
که او لَب‌تشنه‌ی تیه است و تو دریـای احسانی

مەولانا بەیانی ٢٦ی زیحەجەی ساڵی ١٢٢٤ ک. م. گەیشتۆتە خانـەقای شاعەبدوڵـلا و دوای نیـوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژە چاوی بە مورشیدی خۆی کەوتووە. شاعەبدوڵلا هەر لە یەکەم چاوپێکەوتنندا ـ بە چـاوی دڵ ـ مولانا لە هەموو بارێکەوە شیاو و ئامادەی وەرگرتنی تەریقەتی نەقشبەندی دەبینێ و ئەیخاتە ژێر چاوەدێری تایبەتی خۆیەوە و فێری چۆناوچۆنی زیکر و فیکر و داب و دەستووری ئەو تەریقەتەی دەکـا و فـەرمان دەدا وەکوو سایری ڕێڕەوانی خانەقا، زیاد لە سەیر وسولووک و بەشـداری لـە کـۆڕی خـەتم و ئـەرکی مریـدی، ئەنجامی بەشێک لە کاروباری خانەقاش بگرێتە ئەستۆ. مـەولانا بـە داخـوازی خـۆی ئاوکێـشان بـۆ خانـەقا هەڵدەبژێرێ و ماوەی پێنج مانگ، لە بەرەبەیانەوە تا درنگانی شەو، چەن جاران سەتڵ و مەشکە و هـەرچی بووە هەڵیگرتووە و تا دوورێک چووە و گەیشتۆتە سەر کانییەک، لەوێوە ئاوی هێناوە بـۆ خانـەقا و هـەر لـەم کارە بۆتەوە، سەری کردۆتە کاری خۆی و لەبەر پێداگری لەسەر ڕیازەت کێشان و هەڵکردن لەگـەڵ هـەموو جۆرە سەختڵەتی و دژواری، لە پەنا موراقیبە و ڕابیتە و بەجێ‌هێنـانی ڕێوڕەسمـی تەریقـەت، پـاش پێـنج مانگ ئەگاتە ڕادەی بەرچاو کرانەوە (حُضور و مُشاهده) و سەرەنجام دوای سـاڵ و نیوێـک، لـە پلـەی فـەنا و بەقای تەواویش سەردەکەوێ و دەرەجەی کەماڵی دەس‌دەکەوێ و ئەوجار شاعەبدوڵلاوە ئیجازەی پێ دەدا و بە دەستی خۆی خەڵاتی کەڵپۆسی دەروێشانەی لەبەر دەکا. ئەوا دەقی ئەو ئیجازەنامە:

«بِسمِ اللهِ الرّحمنِ الرّحیم بعدَ الحمد وَ الصَّلوة فقیر عبدالله نقشبندی مُجَدَّدی عُفی عَنْهُ، گزارش مـی‌نمایـد کـه سرامد علمای دین و گُزیده‌ی طالبان راه حق‌الیقین، حضرت مولانا خالد سَلَّمهُ‌الله تعالی، بـرای کـسب طریقـه‌ی نقشبندیه از ملک کردستان نزد ایـن فقیـر رسـید و روزگـاری در خَلـوت بـه اَذکـار و اَفکـار و سـیر و سـلوک پرداختند. الحَمدُ لله به عنایت الهی سُبحانه و مَدَد اَنفاس پیران کِبار رَحْمَةالله علـیهم، بـه مـدارج طریقـه، تَرَقّیّـات یافتند و به حضور و یادداشت و تهذیب لَطایف عالَم اَمر و فنا و بَقا و بی‌خُودیها فایض شدند و اَنوار سِرّ لطـایف عالم خَلق و کَیفیات و حالاتی که بر هیأتِ وجدانی سالک در طریقه‌ی حـضرت مُجـدّد رحمـةالله‌علیـه فـایض می‌شوند، باطن ایشان را مُنَوَّر ساختند و از کمال طریقه به تکمیل آن رسیدند. پس ایشان را به اجـازه و خلافـت و تربیت طالبان ممتاز نمودیم و در طُرُق قادریّـه و چِشتیه و سـهروردیه و کُبرویـه نیـز مُجـاز و مـأذون سـاختیم.

چنانکه معمول این طریقه است، دست او دست من است و ایشان نایب و خَلَفُالصِّدق پیران مَنند. رضای ایشان رضای من و خلاف ایشان خلاف من. به دوام ذکر و توجه و مُراقبات و اِتباع سُنَّتِ سَنیَّه و اجتناب از بدعت رَدیَّه و صبر و توکل و تسلیم و رضا و شغل علوم تفسیر و حدیث و نصایح صوفیه و هدایت طالبان مشغول باشند. اللّهُمَّ اجْعَلْهُ لِلمُتَّقینَ اماماً و صَلَّیالله عَلی سیّدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلی آلِهِ و صَحبِهِ و سَلَّم اجمعین و آخِرُ دَعوانا اَنِ الحمدُ لله رَبِّ العالمین».

مەولانا دوای وەرگرتنی ئیجازە، ڕوونیای گەڕانەوە دەبێ. کۆمەڵی خەلیفە و مرید و مەنسووبی خانەقا، تا دووریێک بەڕێی دەکەن. شاعەبدوڵلا بۆخۆی تا دەرەوەی خانەقا ڕەگەڵی دەکەوێ و ڕەوانەی دەکا.

مەولانا خالید کە گەیشتەوە کوردستان، سەرەتا چەند ڕۆژێک لە شاری سنە لایدا و لە حوجرەیەکی مزگەوتی قەڵابەگیدا چەند کەسێکی لەگەڵ تەریقەتی نەقشبەندی ئاشنا کرد و پاشان گەڕاوە بۆ سلێمانی (ساڵی ١٢٢٦ ک. م.). هەر کە هەواڵی گەڕانەوەی مەولانا داکەوت، خەڵکێکی زۆر، لە هەموو تیرە و تاقمێک، چوونە پێشوازییەوە و بە شادمانییەوە هێنایانەوە ناو شار.

مەولانا دوای چەند ڕۆژ مانەوە لە سلێمانی و چاوپێکەوتنی خزم و کەس، چوو بۆ بەغدا و لە پاش زیارەتی گڵکۆە پیرۆزەکان، ماوەی پێنج مانگ لە کونجێکی مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (غەوس)دا، بە ریازەتکێشان و سەیر و سولووکەوە، لانشینی کرد و لە ڕۆحی پاکی ئەو پیاوە پیرۆزە، یارمەتی خواست. ئەمجار گەڕاوە سلێمانی و کاری ناساندنی نەقشبەندییە و بانگهێشتن و ئیرشادی خەڵکی دەسپێکرد و وردە- وردە خەڵکێکێ زۆر لە هەموو چینێک، دەسیان لە نێو دەستی نا و سەریان پێ سپارد و وای لێ هات کە تاقمێ لە مەشایخی قادری، هەستیان بە خەتەر کرد و بەرهەڵستی بوون و تەنانەت کەوتنە ئازارپێگەیاندن و زەحمەتدانی.

مەولانا بۆ ئەوەی ئاژاوەیەک سەرهەڵنەدا و ئەو دەنگ و قاڵە دامرکێ، سلێمانی بەجێهێشت و چووە بەغدا و لە مەدرەسەی ئیحسائییەدا ـکە دواجار ناوی بوو بە خالیدییەـ دابەزی و لەوێدا دەرسگوتنەوە و ئیرشادی، پێکەوە دەسپێکرد. وردە ـوردە خەڵکێکی زۆر و هەرکەسێک بە داخوازێکەوە، ڕوویان لێ هاورد. بەیانییان، قوتابییان و خوازیارانی زانست، لەو سەرچاوە زەلاڵەی تێگەیشتوویی و زانستە بەشدار دەبوون و ئێواران، ئەویندارانی سەیر و سولووک لەو خەزێنە پاک و خاوێنەی ئاگایی و عیرفانە بەهرەیان دەبرد؛ تا ڕادەیەک کە زۆرێ لە مامۆستایانی گەورەی بەغداش چوونە ناو ڕیزی مریدان و مەنسووبانییەوە.

نەیارانی سلێمانی، لە بەغداش دەسیان لێ هەڵنەگرت و هەموو جۆرە تۆمەتێکیان لێ دا. بۆ وێنە یەک لە ناسراوانی سلێمانی، نامیلکەیەکی سەرانسەر بوختیان و درۆی لە بارەیەوە نووسی و تەنانەت کفر و زەندیقیشی دایە پاڵی و ڕوونووسێکی بۆ سەعیدپاشا، والی بەغدا نارد. والی کە بۆخۆی ئیرادەتێکی تایبەتی بە مەولانا هەبوو، نامیلکەی فڕێ دا و لە وەرامیدا نووسی: «جا ئەگەر مەولانا موسوڵمان نەبێ، کێ

موسوڵمانە؟»

زانایەکی ناوداری ئەو سەردەمە بە ناوی شێخ موحەممەد ئەمین عابدین، موفتی شام، کتێبێکی لە جوابی ئەو نامیلکەیەدا، بە ناوی «**سَلُّ‌الحُسام الهِندی لِنُصْرَةِ خَضْرَةِ مَولانا الشَّیخ خالِد النَّقشبندی**» نووسی و زۆرێک لە زانایانی ئەو سەردەمەی بەغدا و سلێمانی و چەند شاری شام، پەسندیان لەسەر دانا.

مەولانا خالید ساڵی ١٢٣٠ ک. م. جارێکی‌تر و ئەمجار بە داخوازی مەحمووپاشای بابان، حاکمی سلێمانی، دەگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی و پاشا مزگەوت و خانەقایەک لەو شارە، بۆ خۆی و مریدانی دەکاتەوە و هەموو خەرجێکی خانەقاش ئەگرێتە ئەستۆ. مەولانا دیسان لە سلێمانی ئیرشاد دەسپێدەکاتەوە و خەڵکی هەموو پارچەکانی کوردستان ڕوو دەکەنە خانەقاکەیەوە و بە تامەزرۆییەوە سەری پێ دەسپێرن. زانای بەناوبانگ، شێخ مەعرووفی بەرزنجی نۆدێیی ـکە تا ئەودەم لە نەیاران بووەـ لەگەڵ زۆرێکی تردا، پاشگەز دەبنەوە و بە داوای لێبووردنەوە، نامەی بۆ دەنووسن. جوابەکانی مەولانا بۆ ئەو تاقمە نووسراوانە، هەموو نیشانەی جوامێری و خاکەساری و تێگەیشتوویی نووسەرەکەیە؛ کە لێرەدا جێی بۆ هێنانیان نییە.

ساڵی ١٢٣٦ ک. م. مەولانا بۆ سێهەم جار دەچێتە بەغدا و خەلیفەیەکی خۆی بە ناوی شێخ عەبدوڵلا هیرەوی لە خانەقای سلێمانی دادەنێ. ئەم جارە سێ مانگ لە بەغدا دەمێنێتەوە و لەم ماوەدا تاقمێک لە خەلیفەکانی خۆی بۆ شارە گەورەکانی دوور و نزیک بەڕێ دەکا کە ئیرشاد بکەن و تەریقەتی نەقشبەندی بە خوازیاران بناسێنن. یەک لەوانە عارفی وێژەوان و شاعیری زانا، شێخ ئەحمەدی خەتیبی هەولێری بووە کە بۆ دمشقی ناردووە و لەوێ ئیرشادی کردووە. شێخ ئەحمەد لە ماوەیەکی کەمدا خێڵێکی زۆر ئاشنای مەکتەبی مەولانا دەکا و لەو شارە و دەوروبەریدا ئاهەنگ و هەوایەکی سەیر بەدی دێنێ؛ تا ئەو ڕادە کە خەڵکەکە بە تامەزرۆییەوە داوای دیداری مەولانا دەکەن و لە شێخ دەخوازن نامەیەکی بۆ بنووسێ و هەرچۆنێک دەزانێ و دەتوانێ، بۆ سەردانێکی دمشق، دڵی نەرم بکا؛ با هەموو چینێک بتوانن لە نزیکەوە چاویان پێ بکەوێ. شێخ ناعیلاج نامەیک بۆ مورشیدەکەی دەنووسێ و تێدا چۆن هاتووە و چۆنین چووە، ڕایدەگەیەنێ و لە کۆتاییدا داوا دەکا ئەگەر بکرێ دڵی ئەو خەڵکە بەجێ‌بێنێ، پێ سەربەرز دەبێ. مەولانا داخوازەکەی لێ وەردەگرێ و ساڵی ١٣٢٨ ک. م. لەگەڵ کۆمەڵێکی گەورە لە عارفان و زانایان و هاوڕێیانی، لە بەغداوە بەرەو دمشق وەڕێ‌دەکەوێ. هێشتا زۆرێکی ئەمێنێ بگەنە بەرەوە، خەڵکێکی زۆر دەردەکەون کە بە تاسە و چاوەڕوانییەکی یەکجارەوە هاتوونەتە پێشوازی و کە چاویان بە کاروانی مەولانا دەکەوێ، دەورەی دەدەن و دەنێو خۆی دەگرن و لەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستیدا دەیبەنە نێو شارەوە.

وێژەوانان و شاعیرانی ناوداری دمشق وەکوو: شێخ شاهینی عەتتار، شێخ موحەممەدی خانی و شێخ موحەممەدی جوملەی خەڵوەتی دمشقی و کەسانی‌تر، قەسیدەی بەقەوەت و شاراندی زۆریان بۆ شاباشی ئەم سەفەرە داناوە. ئەوا چەند بەیتێک لە قەسیدەکەی شێخ موحەممەدی جوملە:

أضْحَتْ دمَشْقُ بِبَهجةٍ و مَسَرَّةٍ — وَ النُّورُ وَ الاشْراقُ مِنْها صاعدُ
و الطَّيْرُ غَنّى وَ الغُصُونُ رَواقصٌ — تَهْتَزُّ مِنْ طَرَب وَ هُنَّ مَوائدُ
وَ الوقتُ طابَ وَ هَيْمَنَتْ اَهْلُ الصَّفا — و الزَّهْرُ يَحْدَقُ وَ العَنا مُتباعدُ
مُذْحَلَّ بالشّام الشَّريفَةِ سَيدٌ — وَ علَيه مِنْ حَلْى الكَمال فَرائدُ
فَسَأَلْتُ عَنْهُ بَيْنَ أرْباب الهُدى — قالُوا: «ضياءالدّين هذا خالدُ»
وَ هُوَ المُجَدّدُ بَلْ هُوَ الدّاعى إلى — سُبُل الرَّشاد فَنعمَ ذاك الماجدُ
فَلَقيتُهُ فَوَجَدْتُهُ كاللَّيْث في — سَطَواته وَ هُوالإمامُ الواحدُ

مەولانا لە دمشقدا مایەوە و دەستی دایە ئیرشاد و ڕێنوێنی خەڵکەکەوە و بەو حاڵەش کات و ساتێکی تایبەتیشی بۆ وتوویژ دەگەڵ زانایان و مامۆستایانی ئەوێ و خوێندنەوە و تۆژینەوە لە مەر قسە و باسی زانستی و ئایینی تەرخان کرد.

لە دمشقەوە سەفەرێکی چەن ڕۆژەی بۆ قودس کرد و پاش زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان، گەڕاوە دمشق و ساڵی ١٢٤١ ک. م. بۆ دووهەم جار ڕووی‌کردە حیجاز. زانایان و هەڵکەوتوانی شارە ممبارەکەکانی ئەو وڵاتە، کە باسی کەسایەتی بەرزی ئەم میوانەیان بیستبوو، زۆریان ڕێز لێ نا و تەنانەت هێندێکیش لە خزمەتیدا تۆبەیان کرد.

ساڵێک دوای ئەم سەفەرە، مەولانا، بەبێ هۆیەکی بەرچاو، وەسیەت‌نامەی نووسی و کتێبخانەکەی وەقفی مامۆستایانی دمشق کرد و زانای پارسا شێخ ئیسماعیلی ئەنارانی وەکوو جێگری خۆی ناساند و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خەبەر لە مردنی خۆی دا و ڕایسپارد لە سەر کێلەکەی بێژگە ئەم ڕستە، چیتر نەنووسن: «هذا قَبرُالغَریب الخالد».

هێندەی پێ نەچوو لە دمشق تاعوونێک داکەوت و زۆرێک تووشی بوون؛ دووکوڕی مەولاناش هەر بەو نەخۆشییەوە لە دنیا چوون. مەولانا بۆخۆشی شەوی ١٢ی زیقەعدەی ساڵی ١٢٤٢ ک. م. تووشیاری هات و دوو شەو لەودوا، شەوی جومعەی ١٤ی ئەومانگە، نێوان نوێژی مەغریب و عیشا، ڕۆحی گەورەی بەرەو دنیای باڵا هەڵفڕی. لە بەیانی ئەو شەوەدا، بە ئامادەبوونی مەردمێکی زۆر و زەبەند لە خەڵکی دمشق، تەرمەکەی بەڕێ کرا و لەسەر گردی «قاسیون» نێژرا؛ قَدَّسَ‌اللّهُ تَعالی اسرارَهُ العَلَیّه.

مەولانا خالید زاتێکی پڕپیت و پیرۆز بووە، خاوەنی هەموو تایبەتمەندییەکی ڕازاوە و ئاکاری هێژا، بە باڵایەکی بەرز و ڕێک، ناوچاوی ڕۆشن و دەم بە پێکەنین، جوامێر و دەس‌کراوە. سەیدی زۆر خۆش دەویست و بۆ فەقێ و قوتابی ڕێزێکی تایبەتی دادەنا. هەمیشە بەرگی پاک و خاوێنی لەبەر دەکرد و پاک و خاوێنی لای زۆر گرینگ بوو. زۆرتر تەیلەسانێکی لەبەر دەکرد و گۆچانێکی بە دەستەوە دەگرت.

زانای گەورەی بەغدا، ئەبووسەناء مەحموودی ئالووسی‌زادە، خاوەنی تەفسیری «*روح‌المَعانی*» لە کتێبێکیدا بە ناوی «*الفیضُ‌الوارد عَلی روضة مَولانا خالد*»، ئاوای لە بارەی مەولاناوە نووسیوە:

«انَّ هذا البَدْرَ المُنير، وَ العالِمَ النِّحرير، أزالَ ظُلمَةَ الشَّكِّ بأسْرِه و مَحا غَياهِبَهُ بأنوار سرِّه، فَكَم مِنْ مُشكلٍ حَلَّـهُ و مُجْمَلٍ فَصَّلَهُ و شُبْهَةٍ أذْهَبَها و مَباحِثَ هَذَّبَها و مَسائِلَ حَرَّرَها و مطالِبَ قَرَّرَها، معَ عـذُوبَـةِ بيـانٍ وَ حـلاوَةِ تِبْيـانٍ و لَطافَةِ مَعانٍ و رَصافَةِ مَبانٍ...»

هەر ئەم نووسەرە لـە نووسـراوەیەکی تریـدا بـە نـاوی: «*غَرائِبُ الاقتِراب*»، پێـڕای باسـی مامۆسـتایان و مورشیدانی خۆی، سەبارەت بە مەولانا دەڵێ:

«وَ قرأتُ مَسْألةَ الصِّفات مِنْ كتابِ خيالي، عَلى حضرةِ مَنْ لا يصلُ الى حَقيقَةِ فضائله خيالي، مولانا ضـياءالدّين الشَّيخ خالد النّقشبندي؛ وَ هُوَ صـاحِبُ الأحـوال البـاهرة، و الكرامـات الظّـاهرة و الأنفـاس الطـاهرَة، الَّـذي تَـواتَرَ حَديثُ جَلالَته وَ أجْمع المُنصفُونَ عَلى ولايَته، و عَمَّتْ بركاتهُ الحاضِر و البادي و انْتَشرَ صيتُهُ فـي كُـلِّ وادٍ و نـادٍ، امْتَدَّتْ في المَقامات و الأحوال باعُهُ وَ عَمُرَتْ بالفضلِ وَ الافْضال رباعُهُ، كانَ حريصاً علـى سلُوك طريـقِ اهـلِ السُّنَّة وَ الجماعة، لا يَصْرِفُ مِنْ أوْقاته ساعَة، في غَير حَلِّ دَقيقَة عِلْمٍ اَوْ طاعَة، حَسَنَ السَّمت وَ السِّيرة، نَيِّرَ القَلْـبِ و السَّريرَةِ انْ تَوجَّهَ إلى قَلْبِ مُريدٍ مَلأهُ نُوراً، أوْ رَبَطَ عَلى إكْرام مُعْدمٍ أفْعَمَ واديه بأيدي أياديه مَسْرُورا...»

وێژەوانان و شاعیرانێکی زۆر بەم بۆنەوە شیعریان گوتووە و شـینگێڕییان کـردووە؛ یـەکیان قەسـیدەیەکە عەللامە شێخ موحەممەد ئەمینی عابدینی موفتی دایناوە کە وا دەس‌پێدەکا:

| | |
|---|---|
| أيُّ رُكْـنٍ مِـنَ الـشَّريعَـة مـالا | فَرَأيْنـاهُ قَـدْ أمـالَ الْجبـالا |
| مُـذْرُزْئنا بأوْحَـد العـصر علْمـاً | وَ بَهـاءً وَ بَهجَـةً و كَمـالا |
| وَ اجْتهـاداً و طـاعـةً وَ صـفاءً | و سَـخاءً و عفَّـةً وَ نَـوالا |
| هُـوَ بَحْـرُ العُلُـوم شَـرْقاً و غَرْباً | و يَمينـاً و قبْلَـةً و شـمالا |
| هُوَ قُطبٌ عَلَيْه دارتْ رَحَىَ العر | فـان و هَوالفَريـدُ قـالاً و حـالا |
| و لعُثْمانَ ذي الحَيـاء و ذيالنُّو | رَيْـنِ صـحَّ انتـسابُهُ اجْـلالا |
| وَ بـه ازدانَ دينُنـا و طَريـقُ الـ | نَقْـشبنديْ زادَ منْـهُ جَمـالا |

یەکێکی‌تر لە کۆتاییدا بۆ مێژووی لە دنیا چوونی گوتوویانە:

ما يَقُولُ العَبْدُ: أرِّخْ «خالِدُ قُطبُ تُوفّي»[1]

**لە کتێبەکانی**:

مەولانا بەو هەموو کار و سەرجەنجاڵییەوە، توانیویە ژمارێکی بـەرچاو کتێبـیش بنووسـێ کـە بەشـێکیان بریتین لە:

١. *العِقدُالجَوهَري في الفَرق بينَ كَسبي الما تريدي و الاشعَري*

---

١. بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە: ١٢٤٢ (ک. م.).

٢. *جالیه الاکدار فی تَقَلُّبات الامصار*

٣. شەرحی «*اطباقِ الذَّهب*» نووسراوەی جارولا زەمەخشەری، بە زبانی فارسی

٤. شەرحێک بۆ «*مقامات حَریری*»

٥. شەرحێکی فارسی بۆ «*حدیث ایمان و اسلام و احسان*»

٦. پەراوێز لەسەر «*جمع الفوائد*» لە حەدیسدا

٧. پەراوێز بۆ «*نهایه*»ی شێخێ ڕەمەلی لە فیقهدا

٨. نامیلکەی «*جواز رابطه*»

٩. *رساله فی الجبرِ و الاختیار*

١٠. نامیلکەیەک لەمەڕ داب و دەستووری مورید و مورشیدەوە

١١. «*تَتِمّه*»، هێندێک پێوەست لە مەنتیقدا

١٢. شەرحی «*عَقاید عَضُدی*»

١٣. *جَلاءُ الاکدار و السّیفُ البَّتار بِالصَّلوه عَلی النَّبیّ المُختار*

١٤. دیوانی شیعر

١٥. نووسراوەگەلی فارسی و عەرەبی، کە بەشی عەرەبییەکەی، شێخ ئەسعەدی ساحیب بە ناوی «*بُغیه الواجِد فی مَکتوبات مَولانا خالِد*» کۆی کردۆتەوە و چاپ کراوە.

**منداڵانی**:

مەولانا خالید چوار کوڕ و کچێک بە ناوی: بەهائەدین موحەممەد، شەمسەدین عەبدورڕەحمان، شەهابەدین و نەجمەدین و فاتمەی هەبووە. دوو کوڕی یەکەم و دووهەمی چەند ڕۆژ پێش خۆی تاعوون بردوونی و سێهەمیانیش چەند ڕۆژ پاش خۆی. نەجمەدین یەک ساڵان بووە کە بابی فەوتی کردووە. دوایی کە پێگەیشتووە و خوێندنی تەواو کردووە، لای مامی(شێخ موحەممەدی ساحیب) تەریقەتیشی وەرگرتووە و سەرەنجام ساڵی ١٢٧٠ ک. م. لە دنیا چووە. فاتمە خاتوونیش ساڵی ١٢٤١ هاتۆتە دنیا و بە هۆی بیری قووڵ و زیرەکی زۆر و وازی لە خوێندن، کە پێگەیشتووە، ڕێگەی فێربوون و تێگەیشتنی گرتووە و تا دوامین پلەی ئامانجی سەرکەوتووە.

**مرید و مەنسووبانی**:

شوێنگرانی مەکتەبی مەولانا دەبنە سێ دەستەوە:

١. کەسانی وا کە هەر بۆ مبارەکی تەریقەتیان وەرگرتووە و سەیر و سولووکیان نەکردووە.

٢. ئەوانەی ماوەیەکی زۆر لە خانەقا ژیاون و ئەوی بۆیان بڕیار دراوە بەجێیان هێناوە و لە لایەن مەولاناوە ئیجازەیان پێ دراوە و بە زاراوەی سۆفیان «خەلیفە»یان پێ دەڵێن.



٣. ئەوانەی کە چوونەتە پێشەوە؛ بەڵام بۆیان نەلواوە تا ئاخر بچن.

لێرەدا ناوی هێندێک لە کەسانی دەستەی یەکەم و دووهەم:

**دەستەی یەکەم، مەنسووبەکان:**[١]

١ـ علامه ملا یحیی مُزُوری عمادی، ناسراو بە سلطان العلما ٢ـ شیخ‌الاسلام مکی‌زاده مصطفی عاصم افندی استانبولی ٣ـ سید محمد اسعد، مفتی حِلَّه ٤ـ سید محمود شهاب‌الدّین آلوسی زاده بغدادی، خاوەن تفسیر *روح‌المعانی* ٥ ـ سید محمد اسعد صدرالدّین حیدری، موفتی حَنَفیه بەغدا ٦ـ سید ابراهیم فصیح حیدری ٧ـ سید عثمان سندی نَجدی ٨ـ سید خلیل سمین نەقیبی، لە ئەشراف و ساداتی ترابلوس ٩ـ سید محمد طاهر افندی حسینی، موفتی قودس ١٠ـ شیخ ابوالخیر دیاربکری ١١ـ شیخ عمر مجتهد دمشقی ١٢ـ شیخ محمد بن سلیمان، نووسەری *الحدیقةالنَّدیَّه* ١٣ـ سید محمد امین ابن‌العابدین، موفتی دمشق ١٤ـ عمر افندی غَزّی، موفتی شافیعیەی شام ١٥ـ علامه شیخ عبدالرحمن روزبهانی (ڕۆژبەیانی) ١٦ـ سید عبدالعزیز افندی گیلانی، نەقیبی ئەشراف لە بەغدا ١٧ـ سید عبدالله داغستانی ١٨ـ عبدالله پاشا، حاکمی عەکا ١٩ـ نجیب پاشا، والی شام ٢٠ـ داود پاشا، والی بەغدا ٢١ـ محمد افندی، موفتی مَعَرَّةالنّعمان ٢٢ـ سید عبدالله حیدری ماورانی، مامۆستا لە بەغدا ٢٣ـ شیخ شامل داغستانی ٢٤ـ سیدعلی برزنجی، قاضی سلێمانی ٢٥ـ رسول زکی، مُدرّس ٢٦ـ سید محمد امین سویدی، مامۆستا لە حلّە ٢٧ـ شیخ ملاطاهر جزیری ٢٨ـ ملا اَسعد افندی جلی کویی ٢٩ـ سید عبدالقادر جزایری ٣٠ـ ملا محمد اربلی ٣٢ـ ملا عبدالله آمدی.

**دەستەی دووهەم، خەلیفەکان:**

١ـ شیخ اسمعیل آنارانی، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە دمشق و جێگری لەوێ ٢ـ شیخ عثمان سراج‌الدّین، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە کوردستان ٣ـ حاج ملا عبدالله جَلی کویی ٤ـ شیخ محمد فراقی ٥ـ شیخ عبدالقادر شمذینی ٦ـ شیخ اسمعیل شروانی ٧ـ شیخ محمود صاحب، برای مەولانا ٨ـ شیخ احمد خطیب اربیلی ٩ـ شیخ محمدخانی شامی ١٠ـ شیخ محمد صادق، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە میسر ١١ـ شیخ عبدالله فَردی، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە قودس ١٢ـ عبیدالله افندی حیدری ماورانی، موفتی حَنَفیّەی بەغدا ١٣ـ شیخ‌الشّیوخ عبدالغفور کاشتری ١٤ـ ملا احمد کۆڵەسارەیی، مەشهوور بە «مەولانا» لە بنەماڵەی کەمانگەر ١٥ـ سید جواد سیاپوش، وێژەوان و شاعیری بەغدایی ١٦ـ سید طە نَهری ١٧ـ شیخ ملا محمد مجذوب عمادی ١٨ـ شیخ اسمعیل بَصری ١٩ـ شیخ احمد قَسطمونی ٢٠ـ شیخ ملا هدایت‌الله اربلی ٢١ـ شیخ محمد عقرەای، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە جزیر و بۆتان ٢٢ـ تاج العُلماء شیخ خالد جزیری، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە دیاربەکر ٢٣ـ شیخ عبدالفتاح عقرەای ٢٤ـ شیخ محمد ناصح، افصح‌العُلما ٢٥ـ شیخ محمد جدیدی بغدادی ٢٦ـ شیخ عبدالله

---

١. بۆ هاسانتر خوێنرانەوە، ئەم ناوە عەرەبییانەمان هەر بە ڕێنووسە عەرەبییەکەی نووسی.

ارزنجانی مَکّی، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە مەککە ٢٧ـ شیخ خالد کرد، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە مەدینە ٢٨ـ شیخ احمد غربوزی، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە ئیزمیر ٢٩ـ شیخ عبدالغفور کردی کرکوکی، بەرنوێژ و سەرپەرشتی کاروباری خانەقای بەغدا ٣٠ـ شیخ حسین خطاط قوزانی ٣١ـ شیخ محمد بغدادی، بەرنوێژی هەمیشەی خانەقای مەولانا ٣٢ـ سید عبدالله افغانی هراتی ٣٣ـ شیخ محمد هراتی ٣٤ـ سید احمد سردار سەرگڵووی کەرکووکی ٣٥ـ شیخ احمد ضیاءالدّین گومشخانی ٣٦ـ سید عبدالغفور مشاهدی بغدادی ٣٧ـ شیخ محمود بن عمر، ڕاسپێراوی ئیرشاد لە ئامێدی.

**شیعری مەولانا:**

مەولانا خالید لە شیعر و شاعیریشدا دەستێکی باڵای هەبووە و بە سێ زبانی کوردی و فارسی و عەرەبی، لەوپەڕی جوانی و قەوەتدا شیعری گوتووە. بۆ مەولانایەکی کورد زمانی دوور لە فارسی کە قەت کاری بەو زمانە نەبووە و بە دەور و بەریدا قسە و نووسین یان بە کوردی بووە یان عەرەبی، شیعری فارسی گوتن، ئەویش ئاوا ڕەوان و ڕازاوە و بەبێ گرێ‌وگۆڵ، زیاتر لە کەرامەت دەچێ!

شیاوی باسە مەولانا پاش سەفەری هیندووستان، چیتر دەرفەتی شیعر هۆنینەوەی نەبووە و ئەوی لێ بەجێماوە، هۆنراوەی ئەو سەردەمەیە کە هێشتا ئیرشادی دەسپێنەکردووە. چەند نموونەی شیعریمان لە لاپەڕەکانی پێشوودا هێنا؛ ئەمەش چەند شیعری تری:

خون شد دلم نَسیم سَحَر غمگسار شو
بر دشت شهرزور دمی رهگذار شو
رفت آنکه ما به عَیش درآن بوم بگذریم
زنهار تو وکیل من دلفگار شو
می‌بوس خاك آن چمن و بعد از آن روان
نزديك بارگاه بُت پردەدرا شو
واکُن به صدهزار اَدَب بَند بُرْقَعش
حَیران نقش خامەی پروردگار شو
بُگشا چو غنچه بند گریبان کُرتەاش
مَحو صفای سینەی آن گُلعذار شو
تاری ز چین طُرّەاش از لُطف بازکُن
گو: سر چنار را که تو رشك تَتار شو
بیکاری است کار جهان و جهانیان
بگریز «خالد» از همه و مرد کار شو

* * *

الا ای جامەی صبر از رُخت چاك
تَرحَّمْ قَدْدَنی لِلْموت مَرضاكْ
تو رفتی لشکر جانهات در پَی
فَیا طُوبی لِروح کانَ یَلْقاك
به فَرقم پای استغنا نهادی
بلندم ساختی، الله أعْلاك
ز خاك ار لالەسان فردا برآیم
تَرانی هکَذا حَیْرانَ سیماك
به سوگند و عُهُودت دل نبندم
فَانَّ الرَّبَّ بالاخْلاف رَبّاك
به فردوسم مخوان زاهد، که بی او
لَدی اَهْل النُّهی ماطابَ طُوباك

به مژگان می‌دَرَد «خالد» پس از مرگ    تُجاهَ اللَّحْد حَتّى نالَ مَثْواك

**سکالا بە کوردی:**

یا فەرد ئەعزەم! یا فەرد ئەعزەم!    یا حەی، یا قەییووم! یا فەرد ئەعزەم!
یا شنەوەندەی ناڵەی سووبحدەم!    پەنای بەندیان، بەندیخانەی غەم
یا فەرازندەی چەرخ موعەللەق!    یا نیگارندەی نۆ تاق ئەزرەق!
بێزاد و نەمر بێخاب و بێخوەر!    نە عەرەز، نە جیسم، نە ڕۆح، نە جەوهەر!
بینای بێدیدە، شنەوای بێگۆش!    جە ئەسرار غەیب واقیف و خامۆش!
بێهەمتا و بێمیسل، بێشەریک، بێباک!    جە عەیب موبەڕڕا، جە ئالایش پاک!
نەقشبەند لەوح سەحیفەی هەستی!    نەشئەبەخش جام بادەی سەرمەستی!
نیزامدەهەندەی ئەرواح نە ئەجسام!    تەرکیب‌کونندەی ئەعزا نە ئەندام!
تەئلیفدەهندەی چار عونسور بە هەم!    زاهیرکونندەی وجوود نە عەدەم!
فرۆزندەی بەرق نەسینەی سەحاب!    ئولفەت دەهندەی ئاتەش چەنی ئاب!
شوعلەبەخش نار، پورتەو ئەفزای نوور!    ڕۆزی دەهندەی مەل و مار و موور!
فەرمان‌دەهندەی موڵک و مەلەکووت!    شەهەنشای ئیقلیم لاهووت و ناسووت!
نەققاش نوقووش هەیوولا و سوورەر!    ڕەزامەند جە خەیر، باخەبەر جە شەڕ!
ڕهانندەی نۆح نە تۆف و تۆفان!    خەلاس‌کونندەی یووسف نە زیندان!
ڕۆی ڕەوشەن بە شەو، شەو بە ڕۆ ئاوەر!    گەدایان بە شا، شا بە گەدا کەر!
جە شەڕڕ فیرعەون مووسا نەجات‌دەر!    ئاتەش پەی خەلیل وە گوڵستان کەر!
موونس یوونس نە گێجاو غەم!    نە کۆی سەرەندیب ڕەهنومای ئادەم!
هەمڕاز یووسف نە چاه کەنعان!    ئەنیس یەعقووب نە بەیتولئەحزان!
ڕەهبەر مووسا بە نار شەجەر!    بە دەم عیسا مەردە زیندەکەر!
میفتاح ئەبواب خەزانەی غەیبی!    میشکات زیای بەزم لاڕەیبی!
خالقُ الأَرْواح! فالِقُ الاصباح!    مِصباحُ النَّجاح! مِفْتاحُ الفَلاح!
کەوکەبەی فیرعەون غەرق دەریاکەر!    وە پەشەی زەعیف نەمروود فەنادەر!
مەششاتەی توغرای زوڵف دێز لەیل!    ڕەهنومای مەجنوون نە هەردەی دوجەیل!
ڕەنگڕێز کالای گوڵناریی گوڵان!    نەغمەی نەوای دەنگ ناڵەی بوڵبوڵان!
تەڕڕاز بالای گوڵ نە چەمەنان!    عەنبەربێز زۆڵف مشکین کەمەنان!
میسکینان نەواز، غەریبان یادکەر!    بەندیان جە بەند میحنەت ئازادکەر!

قیبلەی عاشقان جە کەعبە و جە دەیر!    گەردش‌دەهەندەی چەرخ سەبوکسەیر!
هەم جە مەساجید، هەم جە بوتخانان    مووئمین و کافر سەنات مەوانان
پەرێ بێ‌کەسان تۆنی فەریادڕەس    بالادەس تۆنی نیەن دەس‌کەس
یارەب بە حاجەت زولجەلالی ویت    بە زات و سیفات لایەزالی ویت
بە موقەڕڕەبان بارگای عیززەت    بە پەردەداران سەریر وەحدەت
بە عەرش و کورسی، بە لەوح و قەڵەم    بە مەلاییکان خاسەی موحتەرەم
بە سۆز ئادەم، بە دیدەی نمین    ئەو ڕۆ جە بەهەشت کەفت نە ڕووی زەمین
بە خەلاسی نۆح جە تۆف تۆفان    بە شادی خەلیل ڕۆی عەید قوربان
بە سیدق هاروون بە قورب مووسا    بە پاکی مەریەم بە تەقوای عیسا
بە ڕاستی هوود و بە دۆستی ئیدریس    بە نەغمەی داوود، بە ناڵەی جرجیس
بە ویرد یوونس، بە سەبر ئەییووب    بە حوسن یووسف، بە زاری یەعقووب
بە ئیخلاس پاک سەیید موختار    بە زۆر بازووی حەیدەر کەڕڕار
بە ڕاستی و سیدق سیددیق ئەکرەم    بە دین و دۆستی فارووق ئەعزەم
بە نیکنامی و مەزڵوومیی عوسمان    بە شەهیدیی ئەو شاهیدەن قورئان
بە عیلم و عەمەل حەیدەر کەڕڕار    بە باقی ئال و ئەسحاب کیبار
بە بیت‌المعمُور، بە مەسجیدئەقسا    بە یەسربزەمین، بە ئەرز بەتحا
بە ئەسحاب کەهف خوابئالوودەی غار    ئەمین بین جە شەڕ شەرارەی کوففار
بە شێخ بەسری، بە شێخ بایەزید    بە سوڵتان جونەید، شێخ ئەبووسەعید
بە شەوبێداران عیبادەت‌خانە    بە حەق ئاشنا، جە خەڵق بێگانە
بە خاکنشینان بادیەی پەستی    بە جورعەنۆشان بەزم سەرمەستی
بە قەدەح‌نۆشان جورعەی سەبووحی    بە تەوبەکاران تەوبەی نەسووحی
بە یاهوو یاهووی ئەودالان بەر    بە ناڵەی پیران وادەی سوب سەحەر
بە قەلەندەران مەست مەیخانە    مکێشان نەدڵ نەعرەی مەستانە
بە دوردی‌کەشان بەزم ئیرادەت    بە گۆشەگیران کونج قەناعەت
بە بانگ حەججاج، بە ئاب زەمزەم    بە لەحن ئینجیل، بە تەوف حەرەم
بە سەحەرخێزی ساکنان دەیر    بە دوعای پیران عاقیبەت‌بەخەیر
بە سەفای سینەی سۆفیان ساف    بە زیکر شێخان «جامعُ‌الأوصاف»
بە سەرگەشتەگان وادی حەیرانی    مکەران نەرای حەق جانفشانی

بە سەرگەردانی کەڵپوس وە پێلان — نە بادیەی عیشق ویڵ ـ ویڵ مەگیلان
بە کۆنەپۆشان کونج خەرابات — جە نیمەشەوان مەوانان حاجات
بە ڕەقس و سەماع وەجد ئەهل حاڵ — مەوینان وەچەم جەمین ویساڵ
بە وەفای لەیلیٚ، بە عیشق مەجنوون — بە ناڵەی کۆکەن نە پای بێستوون
بە زیکر مورغان، بە یاهوو یاهوو — موانان «یامَنْ لَیْس اِلّا هُو»
یاشا! جە دەرگات ئێدمەن ڕەجا — ببەخشی گونای بەندەی ڕووسیا
من کە سەرحەلقەی گوناکارانم — سەرتۆق جەرگەی شەرمەسارانم
سەرتاپا غەریق لوججەی عیسیانم — سفتەی نائیرەی نار حیرمانم
شەرت ئەمر تۆم وەجا ناوەردەن — جە تەقسیراتم تەقسیر نەکەردەن
هەر چێوەم کەردەن جە نافەرمانی — نادانیم بیەن، تۆ وێت مەزانی
ئەر مسووچنیم، ئەر بەخشیم گوناه — اَسْتَغفِرُ الله، اَسْتَغْفِرُ الله
جورمم بیٚحەدەن، گونام بیٚشومار — رَبّ نجِنّی مِنْ عَذابِ النّار
نەکەری مەحرووم بەندەی ڕووسیاه — وَ لا تَقْنطُوا مَنْ رَحمَةالله
بار عیسیانم کۆکۆ بیەن جەم — یا غافِرالذَّنب فاغفِرْ لی وَارْحَم
نیازم ئیدەن یاحەی، یاقەیووم — «خالد» جە دەرگات نەکەری مەحرووم

* * *

قیبلەم! فیراقت، قیبلەم! فیراقت — ئارامم سەندەن سەودای فیراقت
دڵ قەقنەس ئاسان جە ئیشتیاقت — تاقەت تاق بیەن پەی ئەبرۆی تاقت
دوور جە قامەتت قیامەتخێزان — هیجرت شەرارەی جەهەنم بێزان
کاریٚ پێم کەردەن مەحروومی ڕازت — نەکەردەن وە دڵ نیمنگای نازت
قەدر عافیەت وەسڵت نەزانام — شوکرانەی شەکەر ڕازت نەوانام
ساغەم کۆی شادیم باد وەباد شانۆ — تەمام ئینتقام وەسڵت جیم سانۆ
خاس ـ خاس جە شیددەت نایرەی دووری — وە کۆی نوورە کەرد سەرتاپای «نووری»[1]

*ریاض العارفین*، ل٤٤٧. *مجمَع الفُصحا*، ب٢، ل١١١. *ریاضُ المُشتاقین*، مەلا حامید بێسارانی، دەسنووس. *الأعلام*، زرکلی، ب٨ ل٣٣٤. *یادی مەردان*. *بغیه الواجد فی مکتوبات مولانا خالد*. *سلّ الحُسام الهندی لنصره مولانا خالد النقشبندی*.

١. نازناوی مەولانا خالید، سەرەتا «نووری» بووە.

*هدیةالعارفین*، ب ١، ل ٣٤٤. *غرائب الاغتراب الفیض الوارد علی روضه مولانا خالد*.

## شێخ ئیسماعیلی هەنارانی

مامۆستایەکی زانا و عارفێکی پارسا لە خەلیفە گەورەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە کە هەر لە سەرەتای گەڕانەوەی مەولانا لە هیندووستان، چۆتە خزمەتی و ساڵانێکی زۆری بە سەیر و سولووکەوە تێپەڕاندووە و سەرپەرشتی خانەقا و ڕاهێنانی خوازیارانی لە ئەستۆ گرتووە.

شێخ ئیسمایل لە کۆچی مەولانا بۆ دمشقدا، لەگەڵی بووە لە مزگەوتی «عِداس»ی ئەوشارەدا ئیمامەت و ئیرشادی کردووە. کە تاعوونەکەش داکەوتووە و مەولانا تووشیار بووە، شێخ ئیسمایل دەکاتە جێگری خۆی و تەنانەت بنەماڵەکەشی پێ دەسپێرێ؛ بەڵام ئەمیش بەشوێن مورشیدەکەیدا پێوە دەبێ و ٢٤ ڕۆژ دوای ئەو لە دنیا دەچێ (ساڵی ١٢٤٢ ک. م.) و لە سەر گردی «قایسون» لە پەنایدا دەنێژرێ.

*یادی مەردان*، ل ٩١.

## ئەسعەد ئەفەندی حەیدەری

عەللامە سەدرەدین موحەممەد ئەسعەد ئەفەندی، کوڕی عەبدوڵڵا ئەفەندی، کوڕی سیبغەتولا ئەفەندی حەیدەری حوسەینابادی ماوەرانی، یەکێکی تر لە کەڵەپیاوانی زانست و ئاگایی بنەماڵەی حەیدەرییە کە لە مامۆستایانی گەورەی بەغدا و موفتی حەنەفی ئەوێ بووە و لە هەموو لقەکانی مەعقوول و مەنقوولدا، وەکوو تاقانەی ڕۆژگاری خۆی ناویان لێبردووە.

ئەسعەد ئەفەندی تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالید وەرگرتووە و لە هەڵکەوتوان و نزیکانی ئەو بووە؛ بەڵام زۆر کەیفی بە ئیرشاد نەهاتووە و تا دوایی ژیان، بە دەرس گوتنەوە و ئیفتاوە خەریک بووە و ساڵی ١٢٤٢ ک. م. چەند مانگ دوای مەولانا، کۆچی دوایی کردووە.

**لە نووسراوەکانی**، دانانی پەراوێزە بۆ ئەم کتێبانە: «*تحفه*»، «*تعلیقات خیالی*» لە عەقایددا، «*سَعْدینی*» لە سەرفدا، «*قَرَباغی*» لە مەنتیقدا و «*الدُّرُّالمُختار*» لە فیقهی حەنەفیدا.

*بُغیەالواجد*، ل ١٨٠. *یادی مەردان*، ل ٣٧٧.

## داوەریی سنەیی

مستەفا بەگ، کوڕی فەتەلی بەگی وەکیل، نازناو «داوەری»، پیاوێکی زانا، ئاگا، وریا و جێبڕوای هەموان بووە کە شیعرێکی زۆری لە فارسی و عەرەبی، لەبەر کردووە و لە قسە و باسیدا بەهرەی لێیان وەرگرتووە. وەک نووسەری «*حدیقەی امان‌اللهی*» دەڵێ، دیوانێکی بریتی لە پێنج‌هەزار بەیتی داناوە و سەرەنجام ساڵی ١٢٤٤ ک. م. لەبەر تێچاندنی نەیارانی کوژراوە.

**چەند شیعری داوەری:**

ماه را گُو مفکن را ه به کاشانەی ما / کە ز نور تو منوَّر نشود خانەی ما
ای فلك شمع مَه و مهر میارای چنین / که به این شمع نسوزد پَر پروانەی ما

* * *

امشب به راستی شبم از روز خوشتر است / کایینەای چو روی نگارم برابر است
از محنت فراق رسیدم به کام دل / آری که آب خضر به تاریکی اندراست

*حدیقەی امان‌اللهی*، ل٣٤٧.

## شەیدای سنەیی

میرزا عەبدولباقی، نازناو «شەیدا»، کوڕی میرزا حوسەین، کوڕی میرزا عەبدوڵلا، لە بنەماڵەی بەناوبانگی وەزیری سنە و پوورزای ڕەونەق، خاوەنی «*حدیقەی امان‌اللهی*»، پیاوێکی وێژەوان و شاعیر بووە و دەوری دووهەزار بەیت شیعری گوتووە.

شەیدا ساڵی ١٢٤٤ ک. م. لە تەمەنی زورهانیدا، کۆچی دوایی کردووە و ڕەونەق بۆ مێژووی بە حیسابی ئەبجەد، ئەم بەیتەی داناوە:

زد رقم خامەی رونق پی سال فوتش / «گشته ایوان جنان منزل عبدالباقی»[1]

**چەند شیعری شەیدا:**

سحر گاهان صبا از کوی دلبر با شتاب آید / وَزو بویی چو بوی عنبر و مُشك و گُلاب آید
مَرا هرگز نباشد خواب و دارم آرزو گاهی / که خواب آید به چشمم، بلکه جانانم به خواب آید
به مال و جاه و اسباب جهان ما را تَعَلّق نیست / خوشم از دیدن یار و می و بانگ رُباب آید
به هنگام وداع دوست از سرچشمەی چشمم / به سان بحر خونین بی‌مُدارا اشك و آب آید
نباشد فکر «شیدا» غیر تحصیل رضای دوست / ولی خوشتر از آن مدحِ خدیو جم رقاب آید

* * *

عشقی که بود خام به افسون رود از دل / چون پخته شد و گشت جُنون چون رود از دل

چەند بەیتی هەڵبژاردە لە قەسیدەیەک:

شمال مشکبو بیزان به گُلشن عنبر سارا / سَحاب قیرگون ریزان به صحرا لُؤلُؤ لالا
دم باد برین مر روح‌بخشا چون دم عیسی / کف ایام فَردین، با زیا همچون کف موسی

---

١. بەرامبەرە بە ١٢٤٤.

درخشان برگ سبز و سرخ گُل بر گُلبن و گلشن
چو دَر دُرْج مَلک گوهر، چو دَرْ برج فلک بیضا
بـه رنـگ زرد روی یـاس دارد طلعـت وامـق
به لَـون سُـرخ چهـر لالـه دارد عـارض عَـذرا
به تخت بوستان بگزیده قُمری جای خُسرو وش
بر اورنگ گلستان سرو دارد پای، شـیرین سـا
ز سر آراسته شمشاد، قَد چون قامت غلمـان
دگر پیراسته بالا صنوبر، چون قـد حـورا
تو گویی خازن قدرت گُسسته رشته‌ی پروین
و یا افکنده در گلشن ز سوسن گوهر رخشا
زمین از باد فردین غیرت خُلد برین آمـد
چو عهد خُسرو ذیجـود دارای جهـان‌آرا

*حدیقـه‌ی امـان‌اللهـی*، ل٣٨٦. *لغتنامـه‌ی دهخـدا*، پیتی ش، ل١٦١. *مجمع الفـصحاء*، ب٢، ل٢٤٦.

## ئەحمەدی کەمانگەر

مەولانا ئەحمەد، کوڕی مەلا عەبدولقادر، کوڕی مـەلا سـەلیم، کـوڕی مـەلا عەبدولغـەفوور، لـە بنەماڵـەی بەناوبانگی کەمانگەری کوردستانە کە پشتیان دەگاتەوە بە پیرمیکاییل، باپیرەگەورەی مەولانا خالید.

ئەم پیرە پارێزکارە پیاوێکی زانایش بووە و ساڵانێکی زۆر لە سلێمانی و بەغدا، هاوڕێیی مـەولانا خالیـدی کردووە و تەریقەتی نەقشبەندی لێ وەرگرتووە و دوای ماوەیەکی درێژخایەن سەیر و سولووک، لە مورشیدە پایەبەرزەکەی ئیجازەی ئیرشادی وەرگرتووە و پاشان گەڕاوەتەوە زێدی خۆی (گونـدی «کۆڵەسـارە»ی لای کامیاران) و تا کۆتایی ژیان، خەڵکێکی زۆری لەگەڵ تەریقەتی نەقشبەندیدا ئاشنا کردووە.

مەولانا ئەحمەد باوای شێخانی ئاوایی «ماسان»ە کە مەولانایی کەمانگەریان پێ ئێژن.

مەولانا لە ناوەڕاستەکانی چەرخی سێزدە، لە دێیەکی ناوچەی بێڵەوار بە ناوی «کەلاتێ» وەفاتی کردووە و زیارەتەکەی هەر لەوێیە.

*یادی مەردان*، ل٩٩. یاداشتەکانی نووسەر.

## موحەممەد جەوادی سیاپۆش

وێژەوانێکی زانا و شاعیرێکی توانا و دەمپاراو، نیشتەجێ شاری بەغدا بووە کـە ساڵـی ١٢٤٦ ک. م. لـە دنیـا دەرچووە.

ئەم شاعیرە لە بواری قسەزانی، بەتایبەت پەسن و هەتک و هەڵگوتن و لۆمەکردندا، دەسەڵاتێکی بێدادی هەبووە و ئەگەرچی کاری تەریقـەتی نـەکردووە، بـەڵام لـە حانـدی عـارفی گـەورە مـەولانا خالیـد، ڕێـز و خۆشەویستییەکی تایبەتی نیشانداوە و لە شینیدا قەسیدەیەکی گەورە و پاراوی داناوە کە ئاوا دەسپێدەکا:

خَدینَ الهوى! خَفَّ الخليطُ المُعاضِدُ
وَأَطْلالُ أحبابٍ هَـوَيْـتَ هَـوامِـدُ

ئەم قەسیدە دەوری حەفتا بەیتە کە ئەوا تەڵچنێکی:

زَمانٌ به زَهْرُ اللَّطائف ذابلُ — و دَهْرٌ به سُوقُ المعارف كاسدُ
نَظَرْتُ بآل الله سُوءَ صَنيعه — و عايَنْتُ منْ أهْواله مانُكابدُ
تَهَدَّمَ بيْتُ الدّين بَعْدَ عماده — و مادَتْ بنا أركانُهُ و القواعدُ
أمنْ بَعْده يَحْلُو الوصالُ لعاشق — بحَضْرَة قُدْس و هوَ للشَّيخ فاقدُ
اَلا مَنْ مُغيثُ السّالكينَ اذا كَبَتْ — و زَلَّتْ بهمْ اَقْدامُهُمْ تَتمايَدُ
اَلا مَنْ لتَدريس التَّصَوف بَعْدَهُ — يُفيدُمَتى تَخْفَى هُناكَ الفَوائدُ
ألا مَنْ لتَلْقين الأوامر بعْدَهُ — يُلَقِّنُ لَوْ يَسْهُو عَن الذّكر حافدُ
و مَنْ قُدْوَةُ التَّعريف و الكشْف بَعْدَهُ — و مَنْ لأباليس المَخائل طاردُ
رَأيْنا عَظيمَ الهوْل فى خطبه كَما — رأتْ بُشْرَها فى الخلْد منْهُ الخَرائدُ
عَلَيْه رَحَى العرْفان دارَتْ لأنَّهُ — هُو القُطْبُ وَ الابْدالُ فيها فَراقدُ
فَيا كَهْفَ أبْناء الطَّريقَة و الَّذى — تَكَفَّلَ فى ارْشادها و هوَ والدُ
سَرِيْتَ منَ الناسُوت حَزْماً و همَّةً — الى مَلَكُوت عنْدَهُ المُلْكُ خالدُ
أخَذْتَ طريقَ النَّقْشْبَنديَّة الَّتى — بدقَّتها تَعْيَى الفُحُولُ الاساودُ
بنَفْسى سيّاحُ الأقاليم طالباً — لمَرضاة مَوْلاهُ بحَق يجاهدُ
وَ ما عامَ فى بَحر السُّلُوك مُوَحّدٌ — كَما عُمْتَ فيه و اعترَتْك الشَّدائدُ
و خُضْتَ بأصْناف العُلُوم مُكَمّلاً — نُهاكَ وَ لَم يَردَعْكَ عَنْ ذاكَ حائدُ
قَدابْتَهَرَت آراؤُنا فيك مثْلما — بكَ انتَشرَتْ بَيْنَ الأنام المَحامدُ
دَعَوْتَ إلى ذكْر الخَفيّ وَ انَّهُ — لأفْضَلُ ذكْرالله فيه المقاصدُ
لسَيِّدنا عُثْمانَ أصْلُكَ يَنْتَمى — فأكْرمْ به أصْلاً نَمَتْهُ الأماجدُ
هُوَ الحَسَبُ الوَضّاحُ و الشَّرَفُ الَّذى — فضائل ذىالنُّورَيْن فيه شَواهدُ
لباذخ هذا الفَضْل لَقَّبَكَ الوَرى — بحَقّ «ضياءالدّين» وَ الاسْمُ «خالدُ»
و منْ أجْل ذا كُنّيتَ ثُمَّ «أبوالبَها» — بهذا صَفَتْ للسّالكينَ المَواردُ
أجادَ يَراعى فى الرَّثاء و انَّنى الـ — «جَواد» و لا يَرْقى لما انّا واجدُ
بَكاكَ بعَيْن الرّفْق كُلُّ مُوَحّد — لأنَّكَ فَرْدٌ فى الكَرامَة واحدُ
وَ لَمّا هَوَيْتَ الحَقَّ قُلْتُ مُورِّخاً — «هَوى للقاء الحق فى القُدس خالدُ»[1]

---

١. بەرامبەرە بە ساڵی ١٢٤٢ ک. م.

*الانوارُالقُدسیّه فی مَناقبِ النَقشبندیّه*، ل٢٥٢. *الأعلام*، زرکلی، ب٦، ل٣٠٢.

## نازیری بستی

شێخ زەینولعابدین، نازناو «ناظِر»، خەڵکی گوندی «بست»، سەر بە ناوچەی خورخورەی لای دیواندەرە، شاعیرێکی زانا و عارفێکی پارسا، هاو چەرخی ئەمانوڵاخانی والی گەورەی ئەردەڵان (١٢١٤–١٢٤٠ ک. م.) بووە و شیعری زۆری گوتووە و کەمیان ماوەتەوە. ئەوا چەند نموونەی:

شکست سنگ هوا شیشەی سلامت ما — کمال خانەخرابی است استقامت ما
چنین کە جذبەی عشق است سالك رە عشق — بود بە پشت هوا منزل اقامت ما
ز فیض نایرەی آتش محبت او — بە مغز سنگ بود کارگر، کرامت ما
بە کار سهل فلاطون ز رە مَرو «ناظر» — کە نیست وسعت خُم ظرف‌جوش حکمت ما

* * *

نسیم گرچە ز گُلبرگ ما شکفتەدل است — زمانە در پَی اَسباب ناشکُفتن ماست
بە بزم بادە ز بیم جفای شحنەی شهر — وبال دست طلب چون سَبُو بە گردن ماست
طلسم گوهر معنی است کلك ما «ناظر» — کە را تصرُف دست تَلَف بە مخزَن ماست

* * *

گر آن مَە را گُذر بَر گوشەی زندان مَن گردد — فلك خشت اساس خانەی ویران من گردد
شود نَفی وجود من بە رفعت رهنمون آخر — فَنای هستی من کُنْگُر اَیوان من گردد
کَشد زور کمند همت من کوە آهن را — بە کسب جَذبە آخر کهربا مهمان من گردد
سر زلفش بە معراجِ رُخش راهی است بس روشن — بلی زُنّار من سررشتەی ایمان من گردد
تراوشهای آب دیدەی من میل آن دارد — کە طوفان فنای عالم امکان من گردد
بود از آب پیکان جوش مغز استخوان من — اگر تیر تو از من بگذرد نقصان من گردد

*حدیقەی امان‌اللهی*، ل٤١٣. *مجمع الفصحاء*، ب٢، ل٥٢٤.

## مەلا قاسمی پایگلان

پارسای ئاشنا و عەللامەی هێژا، حاجی مەلاقاسم، کوڕی عەبدولحەق، کوڕی عەبدوڕڕەحیم، خەڵکی گوندی پایگلانی ناوچەی ژاوەرۆ، یەک لە زانایانی پایەبەرز و ئەولیای گەورەی دەورانی خۆی بووە کە کەشف و کەرامەتی زۆریان لێ گێڕاوەتەوە.

مەلا قاسم خەتی نەسخی جوان نووسیوە و کتێب و نامیلکەی زانستی زۆری نووسیوەتەوە. لە شیعرگوتنیشدا دەستێکی باڵای هەبووە و چەند دەقی نووسراوەی وەک: «*تهذیب المنطق*» و



«*تهذیب الکلام*»ی عەللامەی تەفتازانی، کردۆتە شیعر.

ساڵی زا و مەرگی مامۆستا نازانین؛ بەڵام بەپێی ئەو مێژوویانەی لە دوایی چەند کتێبی دەسنووسی خۆی نووسیونی، شک لەوەدا نامێنێ کە لە ناودارانی ناوەڕاست تا دواییەکانی چەرخی سێزدە بووە. بۆ وێنە: لە دوا لاپەڕەی بەرگێکی «*أحادیث صحیح بخاری*»دا ـکە بە خەتی جوانی خۆی نووسیویەتەوە و هێندێک پەراوێزیشی بۆ داناوە و ئێستا لە کتێبخانەی سەید موحەممەدی شێخولیسلامی سنەییدایەـ ساڵی دوایی هاتنی ١٢٥٠ ک. م. نووسیوە. هەروەها نوسخەیەک «*جمع الجوامع*»یشی بە خەتی خۆی نووسیوە و بەم چەند ڕستە کۆتایی پێ هێناوە: «و کُنْتُ فی اَیّامِ التَّسْوید عَلی قَدَمِ التَّغَرُّبِ راجیاً مِنْهُ تَعالی التَّقَرُّبَ اِلَی عَمیمِ أَلْطافه وَ الأمانَ مِنْ سَخطه بأسْعافه، وَ أَنَا المُتلوّثُ بِأکْدارِ الأمانی قاسِمُ الپایگلانی و صلی‌الله‌تعالی‌وسلَّمَ، عَلَی الفَخْرِ الاتَمّ، فی تاریخ ١٢٤٦».

نموونەیەکی تر: لە ئاخری نووسراوەیەکی‌تری، کە نامیلکەیەکی چکۆلەیە لە سەرفد، دەڵێ: «کَتَبَهُ القاسِمُ بِمدادٍ لا یَجری وَ قَلَمٍ لا یَسری سنه ١٢١٥ من الهجره».

شیاوی باسە شێوەی نووسین و جنسی کاغەز و مرەکەفی ئەو نامیلکە وا دەر دەخا مەولانا لەو کاتەدا قوتابی بووە و تەمەنی دەبێ دەوری ١٥ تا ٢٠ ساڵ بووبێ.

باسێک لە ئوسوولدا هەیە؛ دەڵێ: «دارُالحَربِ لَیْسَتْ بِدارِ ضمانٍ». مەولانا قاسم لە کتێبێکی ئوسوولدا کە بۆخۆی نووسیویەتەوە، لە پەنا ئەو ڕستە، ئەم سێ بەیتەی کردۆتە پەراوێز:

إذا ما تَجَلَّتْ بِصُبح الجَبین وَ لَیْلِ العِذار، مُصاباً أرانی
فَقُلْتُ: الضَمانُ عَلَیْكِ لما أنْ تُحارِبَ اَرْواحَ أهْلِ الأمانی
فقالَتْ: مُحَیّایَ دارُ الحُروب وَ ما دارُ حَرْبٍ بِدار ضَمان

مەولانا قاسم شیعری کوردی و فارسیشی گوتووە، کە بەداخەوە دەستم نەکەوت؛ بەڵام لە دیوانەکەی مەولەوی تاوەگۆزیدا، دوو بەیت بە ناوی مەلا قاسم ناوێکەوە نووسراوە کە مەولەویش بە دوو بەیتی هەر بەو مانایە چۆتە پێشوازیەوە. ببێ و نەبێ ئەو مەلا قاسمە هەر مەلا قاسمی پایگێلانییە و ئەمەش ئەو دوو بەیتەی:

هەرگا من پێکیای پەیکانی لەیل وام جە بێ‌مەیلی لەیل وەتەن دوجەیل وام
چ باک بەدی بەدکارانمەن؟ چ پەروای تانەی ئەغیارانمەن؟

مەولەویش دەڵێ:

من کە دڵ دایم نە واوەیلمەن غەرق موتالای خاڵ لەیلمەن
چ باک تانەی تەوەن تاومەن؟ شەوق موتالای ڕووی کتاومەن؟

جونگێکی دەسنووس. *فضلای قرن سیزدهم*.

## مەلا موحەممەدی خەتێ

«خەتیٚ»، کە بە هەڵە «خَطّی» نووسراوە، گوندێکی لای ڕەواندزە و عەللامە موحەممەد ئەفەندی، کە لە مامۆستایانی شارەزا و موفتیانی ناودار بووە، لەوێوە هاتووە.

جێی سەرنجە کە زۆربەی زنجیرە ئیجازەکانی ئەم دواییانەی کوردستان دەگاتەوە بەم مامۆستایە و زانایانێکی زۆر لە کۆڕی دەرسیدا بەهرەیان بردووە و ئیجازەیان وەرگرتووە. کەسانی وەک: شێخ جەسیمی مەردۆخی، حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشی (حاجی مامۆسا)، عەللامە عومەر ئەفەندی خیلانی ڕواندزی، مەلا عەولای پیرەباب و مەولانا عەلی قزلجی تورجانی و ...

مەلا موحەممەد بۆخۆی موجازی مەلاوڕەحمانی ڕۆژبەیانی بووە.

مەلای خەتیٚ لە دەورانی دەسەڵاتی میر موحەممەدی سۆران، مەشهوور بە «میرەگەورە»دا ژیاوە و ساڵی ١٢٤٤ ک. م. ناوبژیوانی نێوان ئەو و دەوڵەتی عوسمانی کردووە.[1] ئەورۆکە زاروزێچی ئەو مامۆستایە لە ڕەواندز و شارەکانی تری ناوچەی سۆراندا دەژین و تێیاندا زانای زۆر هەڵکەوتووە.

*میرانی سۆران*، حوسەین حوزنی موکوریانی.

## مەلا فەتحوڵای ئامیدی

کوڕی شێخ عومەری زەکی، کوڕی موحەممەدی ئامیدی ماردینی، مامۆستایەک لە شەرعزانانی شافیعی و موفتییانی ئامید (دیاربەکر) بووە کە تا ساڵی ١٢١١ک. م. لەو شارەدا ژیاوە و دوایی بۆ مەدینەی پیرۆز چووە و تا دواکاتی ژیان (نیوەی چەرخی سێزدە) لەویٚ ماوەتەوە.

**لە بەرهەمەکانی**: شەرحێکە بۆ «*دلا یل الخیرات*»ی نووسیوە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٨١٥.

## حەسرەتی سنەیی

موحەممەد تەقی، نازناو «حەسرەت»، شاعیرێکی خەڵکی سنەیە کە وەک ڕەونەق ئێژیٚ، بابی لە چینی کەمدەس بووە و خۆیشی ئەگەرچی خوێندوویە و پێگەیشتووە، بەو حاڵەش عومری بە دەروێشی و هەژاری ڕابردووە؛ زۆری سەفەر کردووە و جارێکیان لە گەڕانەوە لە سەفەرێکیدا، دەوری ساڵی ١٢٥٠ ک. م. لە شاری تفلیس لە دنیا چووە.

حەسرەت دەوری دەهەزار بەیت شیعری داناوە کە تەنیا بەشێکی کەمی لیٚ بەجیٚ ماوە.

**ئەوا چەند نموونەی**:

---

١. لە دواییشدا کە میری سۆران تاقەتی فرۆفیشاڵ و ناحەقیکاری و زۆربێژی عوسمانییەکانی نەماوە و دژیان ڕاپەڕیوە، بە فتوایەکی مەلای خەتیٚ، خوێنی حەلاڵ کراوە! و.

گرنــه از بهــر نثــار ره یــار اســت مــرا | جان شیرین به کف از بهر چه کار است مرا
از جفــا دوش نیامــد بــه ســر بــالینم | امشب از روی وفا شمع مـزار اسـت مـرا

* * *

ســاقی قــدحی بــده کــه دلــشاد شــوم | از دســـت دل و غـــم دل آزاد شـــوم
خــواهی غَمَــم ار تمــام بــر بــاد دهــی | چنــدان بــدهم بــاده کــه بربــاد شــوم

* * *

ندیــدم جُــز غَمَــت کــس مَحــرم دل | از آن رو شـــادمانم بـــا غـــم دل

* * *

ای نـــام تـــو ورد هـــر زبـــانی | وَی از تـــو بـــه هـــر زبـــان بیـــانی
بـــی‌نـــام و نـــشانی و ولـــیکن | هـــر ذرّه دهـــد ز تـــو نـــشانی
تـــو مـــردم دیـــده‌ی یقینـــی | کـــز دیـــده‌ی مردمـــان نهـــانی

* * *

یــا رب ز کَــرَم مــرا تــو مُــشکل بگــشا | ایـــن قُفـــل گـــرانم از در دل بگـــشا
کامل کُـنم از کمـال بخشایش خـویش | چــشمم بــه رخ حــضرت کامــل بگــشا

*حدیقه‌ی امان‌اللهی*، ل٢٦٨.

## ئیبنوڕەسوولی سابڵاغی

مەلا موحەممەد، مەشهوور بە «ابن‌الرّسـول»، کوڕی مەلا ڕەسـوولی دووەم و لـە تۆرەمـەی مـەلا ڕەسـوولی زەکی ئەفەندی[١]، ساڵــی ١١٨١ ک. م. لـە گونـدی «چوارتـا»ی سـلێمانی هاتـە دنیـا و لـە قوتابخانـەکانی کوردستاندا خوێندی و پاشان لە مزگەوتی سووری سابڵاغ (مـەهاباد) دەرسـی گوتـەوە و ماوەیـەک لـەودوا گەیشتە بەغدا و لەسەر داوای داود پاشای والی، ماوەیەکیش لەوێ خزمەتی کرد؛ بەڵام سـەرەنجام گـەڕاوە سابڵاغ و تا کۆتایی ژیان (١٢٤٦ ک. م.) لەو شارە ئەرکی زانستی و دینی خۆی بەڕێوە برد.

ئیبنوڕەسووڵ لە زانایانی گەورە و بەناوبانگی دەورانی خۆی بووە و مامۆسـتایانێکی پایەبـەرزی بارهێنـاوە؛ یەکیان مەلا موحەممەدی فەیز ناسراو بە «موفتی زەهـاوی»، زانـای بەناوبانگـە کـە لەمـەڕ مامۆسـتاکەیەوە دەڵێ: «اِنالعلومَ الرّیاضیّة کانَت کُرَةً بِیَدِ اُستاذِنا ابن‌الرَّسولِ یُقَلّبُها کَیفَ یَشاءُ».

لەم مامۆستای ڕیازییە هێندێک کتێب و نووسراوەی بایەخدار بەجێ‌ماوە؛ وەکوو: دانانی پـەراوێز بـۆ ئـەم

١. لاپەڕەی ١٩٧.

کتێبانه: «*شرح چغمینی*»، «*بیرجندی*»، «*خلاصه‌الحساب*» و «*اَشکال التَّأسیس*» له هیندسه‌دا، «*عبدالحکیم خیالی*» له مه‌نتیقدا، «*خیالی*» له که‌لامدا؛ که به‌شێکی له ئه‌سته‌مبووڵ چاپ کراوه و هه‌روه‌ها نامیلکه‌یه‌ک له جه‌بر و موقابیله‌دا.

کڵکۆی ئیبنوڕه‌سووڵ له شاری مه‌هاباده.

*تاریخ سُلیمانیّه*، ل ٢٨١. *مُفتی زَهاوی*، ل ١٤. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل ١٥٣.

## مه‌فتوونی بانه‌یی

مه‌لا عه‌بدولعه‌زیز، کوڕی مه‌لا موحه‌مه‌د باقر، نازناو «مه‌فتوون»، له‌دایک بووی شاری بانه، شاعیرێکی زانا و قسه‌زان و ئاکارجوان بووه که ده‌وری سێ‌هه‌زار به‌یت شیعری ـ زۆرتر غه‌زه‌ل ـ گوتووه.

مه‌فتوون ساڵی ١٢٤٧ ک. م. تاعوونی تووش بووه و به‌و نه‌خۆشییه‌وه له دنیا چووه.

**چه‌ند شیعری مه‌فتوون**:

بوسه‌ی لعل لبت با ناز و استغنا خوش است — دست در زلف درازت در شب یلدا خوش است
بهر تفریح دماغ خاطر مجنون ما — گاه کوی لیلی و گه دامن صحرا خوش است
از غرور حسن گرچه گُل ندارد آگهی — عندلیبان چمن را آه و وایلا خوش است
اعتدال سرو را چندان نباشد اعتبار — دست در آغوش آن سرو سهی‌بالا خوش است
صحبت روشن‌ضمیران جان همی‌بخشد از آن — بر دل «مفتون» شیدا صحبت مینا خوش است

* * *

تا به کی سوزم من غمدیده در هجران تو — روز محشر جان من، دست من و دامان تو
خاك و باد و آب و آتش جمله مخلوق توانَد — هَر یکی زایشان به نوعی واله و حیران تو

* * *

با رقیبت سر لُطف است و به من انکار است — من نگویم تو بگو جان عزیز این کار است؟
قصه‌ی عشق من و غایت بی‌مهری تو — داستانی است که در چارسُو بازار است

*حدیقه‌ی امان‌اللّهی*، ل ٤١١.

## مه‌لا عه‌وڵای جه‌لی کۆیی

حاجی مه‌لا عه‌وڵا، کوڕی حاجی مه‌لا ڕه‌حمانی جه‌لی کۆیی[1]، له زانایان و مامۆستایانی عارف و پارسای خه‌ڵکی

١. لاپه‌ڕه‌ی ٢٨٢.

کۆیە کە خوێندنی لای بابیەوە تەواو کردووە و ساڵی ١٢١٧ ک. م. دوای لـەدنیا چـوونی ئـەو، لـە قوتابخانـەی ئەورەحمان پاشای بابان لە کۆیە دەرسی گوتۆتەوە و ساڵی ١٢٣٢ ک. م. خزمەتی مورشیدی پایەبەرز، مـەولانـا خالیدی نەقشبەندی گەیوە و پـاش وەرگـرتنی تەریقـە و شـەش مانـگ سـەیر و سـولووک، ئیجـازەی دراوە و گەڕاوەتەوە کۆیە و پێڕای دەرس‌گوتن، بە ئەمری مەولانا، جاروبارەش ئیرشادی تەریقەتی نەقشبەندی کردووە.

مەلا عەبدوڵلا لە زانایانی گەورە و عارفانی بەناوبانگ بووە و وەک نووسیویانە، تا پلەی ویلایەتیش سەکەوتووە.

**لە کتێبـەکانی**: هۆنراوەیەک پەسنی پێغەمبەری ئیسلام (د) بە نـاوی «*وَسـیلةالوصـول الـی سـاحة عنایـة الرَّسول*»، پەراویز بۆ «*قَسطلانی*»، شەرحی «*صحیح بخاری*» پەراوێز لەسەر «*اِنسان العُیون*» و «*جامع الاصول*» و نامیلکەیەک باسی بێ بایەخ بوونی سەدەقەی کەسێ کە قەرزێکی لە ڕادەی ماڵ و سامانیدا لەسەر بێ.

ساڵی کۆچی دوایی مامۆستا ١٢٤٦ یان ١٢٤٧ ک. م. بووە.

*پەراوێزی بُغیە الواجد*، ل١٢٦ . *یادی مەردان*، ل٩٣. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٤٨٩.

## سەعدوڵا ئەفەندی سۆرانی

سەعدولا، کوڕی سەعید، کوڕی ئیسماعیلی مـاویلی سـۆرانی، زانایـەک لـە کـوردانی دیاربـەکرە کـە دوای خوێندن، ماوەیەک لـە ئەسـتەمبووڵ کـاری بەدەسـتەوە بـووە و پاشـان بـۆ میـسر چـووە و سەرپەرشـتی هەڵەبژارانی چاپخانەی بوولاقی لە شاری قاهیرە، وەئەستۆ گرتووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الرِّسالة الفتحیّة المحمودیّة فی بیان المراتب الجلیلة العلیة*» و «*رسالة فی اثبات الواجب*».

سەعدولا ئەفەندی ساڵی ١٢٤٧ ک. م. لە قاهیرە وەفاتی کردووە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٨٦.

## پەرتەوی سنەیی

موحەممەد کازم، کوڕی موحەممەد، نازناو «پەرتەو»، شاعیرێکی خەڵکی شاری سنەیە، کە سـەرەتا شـوێنی باوکی گرتووە و خزمەتی میرانی ئەردەڵانی کردووە؛ بەڵام دوایی بیریان لێ گـۆڕاوە و لـە کـار وەلا نـراوە و یانەنشین کراوە. دوای ئەوە، بەو بۆنەوە کە لە هونەری نیگارکێشیدا دەستێکی بووە، چاوە کارگەیەکی دانـاوە و لە بەرهەمی کاری خۆی ژیاوە و لە کاتی بێکاریدا کونجێکی گرتووە و عیبادەتی خوای خۆی کردووە.

ئاغە کازم شاعیرێکی باش بووە و بێجگە لە دوو مەسنەوی، یـەکیان لەمـەڕ عـارفی بـەناوبانگ ئیبراهیمـی ئەدهەم و ئەوی‌تریان داستانی یۆسف و زولەیخا، دیوانێک غەزەلیشی هۆنیوەتـەوە کـە بـەداخـەوە زۆربـەی فەوتاوە. ئەوا چەند نموونە لەو کەمە:

گمان مبر کـه بـه یکـرنگیم رسـد تغییـر اگر کنند به صد ظَرفم امتحان چون آب



هر آن دلی که رضا شُد به قسمت ازَلی — کَی از بلندی و پستی کند فغان چون آب
نشد ز باغ وصال تو حاصلم ثمری — اگر چه اشك من از هجر شد روان چون آب

* * *

ز من آن آتشین رو می گُریزد — سپَند غم مَنَم، او می گریزد
چُنان از من گریزان است آن شوخ — که از اعجاز، جادو می گریزد
پَری زانسان گریزان نیست زانسان — که از مَن آن پریرو می گریزد
نهاده آشیان، عشقم به شاخی — که باز آنجا ز تَیهو می گریزد
اگر دانه دهندش جای در سنگ — کُجا شیرین ز مُشْکُو می گریزد؟
چنان شد شعلەور «پرتو» از آن رو — که از گرمیش هندو می گُریزد

* * *

به سنگ کوهکن از بس که نقش جانان کَنْد — تَسَلّی دل زارش نشُد، دل از جان کَنْد
هزار رَخنه به دل کرد کوه را، ز یکی — ندید کام دل از کوه، بیستون زان کَند
چنان درخت وفا سر نزد ز آب و گلَم — که دست و تیشەی جورش ز ریشه بتوان کَند

*حدیقەی امان‌اللهی*، ل١٣٩.

## موشتاق

مستەفا ئەفەندی، نازناو «موشتاق»، لە زانایان و پارێزکاران و شێخانی تەریقەتی شاری بدلیسە کە لە ناڤسالیدا بۆ ئەستەمبووڵ چووە و ساڵی ١٢٤٧ ک. م. لەوێ شەهید بووە.

موشتاق شاعیرێکی باشە و دیوانی شیعری عەرەبی و فارسی لێ بەجێماوە. بەرهەمی تری، هۆنراوەیەکی فارسییە بە ناوی «*بهارنامه*».

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٤٥٦. *ذیل کشف‌الظّنون*، ب١، ل١.

## شێخ مەحموودی کاشتەری

کوڕی شێخ موعینەدین، کوڕی شێخ مەجدەدین، لە بنەماڵەی زانایان و شێخانی کاشتەر، سەر بە ناوچەی بێڵەوار بووە کە ساڵی ١١٧٣ هاتۆتە دنیا و ١٢٤٨ ک. م. لە دنیا چووە.

شێخ مەحموود زیاد لە پلە و پایەی زانستی، پیاوێکی سۆفی مەشرەب و زۆر پارێزکار بووە. ئەم شیعرە برای پایەبەرزی شێخ عەبدولغەفوور، نازناو «مُذنب»، ناسراو بە «شیخ‌الشّیوخ»، لە کۆچی دوایییەکەیدا دایناوە:

خُجسته بندەی درگاه معبود — نکوخُو، پاك‌طینت شیخ محمود

کـه بـود از مَجمـع زُهّـاد محـسوب — چُنـان کَـز اهـل دانـش بـود معـدود
ز دنیـــای دَنـــی بـــار ســفر بــست — بـــه دار آخـــرت کاشـــانه بگـــشود
بـــه شـــعبانالمعظّـــم عـــصر شـــنبه — حیـــات دنیـــوی را گفـــت بـــدرود
فـــــراق آن بـــــرادر ناگهـــــانی — بـسی غـم بـر دل «مُـذنب» بیفـزود
خــرد گفتــا: بــه تــاریخ وفــاتش — «جنانش گشت جا از جای محمـود»[١]

*تاریخچەی خاندان مَردوخ.*

## نەزیفی ئامیدی

سلێمان، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی سلێمانی دیاربەکری، نازنـاو «نظیـف»، لـە زانایـان و پیاوماقوولانی شـاری دیاربەکر بووە کە زا و مەرگی ساڵانی ١٢٠٢ و ١٢٤٩ ک. م. ڕوویداوە و دیوانێکیشی لێ بەجێماوە.

نەزیف بابی سەعیدپاشا، مێژووزانی ئامیدییە کە لە بەشی دووهەمی ئەم کتێبەدا باسی دەکەین.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٤٠٧.

## مەلا عەبدوڵڵای ڕەش

مەلا عەولا لە مامۆستایان و زانایانی شارەزای شاری سلێمانی بووە کە لە ناوەڕاستەکانی چـەرخی سـێزدەدا ژیاوە و هەندێک کتێب و نووسراوەشی لێ بەجێماوە.

مەلا عەبدوڵڵا پیاوێکی ڕەشتاڵە بووە و بەو بۆنەوە «ڕەش»یان پێ گوتووە و لە «مەلا عەبدوڵڵای ڕەشک»ی بدلیسی کە لە چەرخی یازدەدا ژیاوە، جیاوازە.

*تاریخ سلیمانیه*، ل٢٧١.

## مەلا ئیبراهیمی بیارێ

لە زانایان و مامۆستایانی گەورەی چەرخی دوازدە و سێزدەیە کە لە گوندی بیارێ لە هـەورامان نیـشتەجێ بووە و عومری بە خوێندنـەوە و دەرس‌گوتنـەوە و تۆژینـەوە ڕابـواردووە و کەسـانی وەک مـەولانا خالیـدی نەقشبەندی شارەزووری، لە کۆڕی دەرسی ئەودا بەهرەیان بـردووە و پـاش عـومرێکی دوور و درێـژ، ساڵـی ١٢٥٠ ک. م. لە دنیا چووە.

*یادی مەردان*، ل١٧.

---

١. بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ١٢٤٨.

## مەلا نووشای گوڵباخی

مەلا نووشا خەڵکی گوندی نووشا لە هۆزی زەنگەنەیە کە شاعیرێکی پڕشۆر بووە و تا ناوەڕاستەکانی چەرخی سێزدە ژیاوە. لە شیعرەکانی پارچەهەڵبەستێکە بە ناوی «دارجەنگەڵ» کە لەگەڵ پیرەدارێکی لێرەواردا ئاخافتووە:

هامسەران وەختێ، هامسەران وەختێ
جە ڕۆیان ڕۆیێ، جە وەختان وەختێ
چوون قەیس پۆشابیم جە کەوڵپۆس ڕەختێ
ڕاگەم کەفت وە پای عالی درەختێ
سەر جە کەشکەڵان فەڵەک بەردە بی
پا مەحکەم جە قەعر زەمین کەردەبی
تەخت بی سەرشاخەی بە وێنای سەریر
پەری نیشینگای ئەمیر و وەزیر
هەروەخت سەیر مەکەرد تەیرێ جە تەیران
مەنیشت جە شاخەش پەی عەزم سەیران
ئامام و تەکدام مەن وەدارەوە
وەو دار مەنەی ڕۆزگارەوە
سینەی پڕفەراخ هەوای موعتەدڵ
درەختان جە بیم بوڵەندیش خەجڵ
جە ڕووی سینەش دیم زام تیر گاز بی
نشیانەی کامین خەدەنگ ناز بی
پەرسام هەی درەخت بەرز بەهرەمەن
کەس نەزان تاریخ سەنەی ساڵ چەن
ئەی زامە چێشەن نە دەروونتەن
کام سەرهەنگ داخواز دینی خوونتەن؟
عومرت چەن ساڵەن چەنپشت و پەردەن
کێ تۆش دەس نێژای دیارە کەردەن
هەوای فەرەحبەخش عەجیب پایەتەن
جای میر و بیگلەر جە سای سایەتەن
دیم دەنگێ ئاما جە تۆی دارەوە
جەو دار مەنەی ڕۆزگارەوە
نەمام بیم جە دەور کەیوومەرس کەی
ڕۆژ لە ڕۆژ ئامام کەفتم وەی بەوەی

* * *

بەڵێ چوونکە تۆ مەیلت ئەحواڵەن
ئارەزووت حیساب ویەردەی ساڵەن
چەن تیپ، چەن سپای شاهانم دیەن
چەن بیگلەربەگی بەیانم دیەن
چەن بەگ، چەن بیگلەر، چەن میرم دیەن
چەن شیخ، چەن مەلا، چەن پیرم دیەن
سەیر سەر و تاج پەروێزم کەردەن
تەماشای شیرین، شەودێزم کەردەن
فەریدوون لە بیخ بنیادم دیەن
ئالاکەی کاوەی حەددادم دیەن
شا ئەفراسیاو غەزەب خۆم دیەن
پیران و هومان جەنگجۆم دیەن

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ٥، ل٨٤.

## شێخ موحەممەدی ئەسکەندەری

شێخ موحەممەد، کوڕی حاجی شێخ ئیسمایلی هەزارمێردی بەرزنجی، پیاوێکی پارێزکار، جوامێر، میوانخۆشەویست و جێ متمانە و بڕوای خەڵک بووە کە دوای کۆچی دوایی باوکی، گوندی «ژنێن»ی بەجێهێشتووە و لە شوێنێک کە ئێستا «مەزرای ئەسکەندەر»ی پێ ئێژن و وا لە ڕۆژاوای گوندی کاشتەر لە ناوچەی بێڵەواردا، بۆ خۆی و کەس و کاری، چەند چاوەخانوویەکی کردۆتەوە و پێڕای ئیرشاد و ڕێنوێنی خەڵک، ژیانی دەروێشانەی خۆی کردووە. پاش ماوەیەک ئەمانوڵاخانی والی ئەردەڵان ـکە ئیرادەتێکی زۆری پێ بووەـ گوندی «لۆن» لە چوار فرسەقی ڕۆژهەڵاتی باشووریدا کڕیوە و وەکوو دیاری پێ بەخشیوە؛ کە خۆی و خزمانی شوێنێکی شیاویان بۆ ژیان هەبێ.

لۆن لەو کاتەدا دێیەکی چکۆلەی نیوەکاول بووە کە شێخ موحەممەد و برایانی ئاوەدانیان کردۆتەوە و ئێستاکە «لۆن سادات»ی پێ دەڵێن؛ دێیەکی گەورەیە و دانیشتوانی زۆرتر سەیدەکانی زاروزێچی حاجی شێخ ئیسمایلی ژنێنی و لقێک لە ساداتی بەرزنجەن[١].

شێخ موحەممەد لە نێوانی چەرخی سێزدەدا کۆچی یەکجاری کردووە و گڵکۆی، ئێستاش زیارەتگەی خەڵکی ئەو ناوچەیە.

*تاریخ سلسلەی سادات لۆن.*

## شێخ عەبدوڵای دێوانە

شێخ عەوڵا مرۆیەکی هەستیاری دەروێشئاسا، خولیای زیکر و فیکر و لە مریدانی مەولانا خالید بووە. کاتێ کە مەولانا بۆ دمشق کۆچی کردووە، زۆر بەئاوات بووە ئەویش لەگەڵ خۆی ببا؛ بەڵام مەولانا نەیبردووە و بەم بۆنەوە لەوپەڕی کزی و پەرۆشیدا ئەم دوو بەیتەی گوتووە:

داد من جە دەس گردنای گەردوون     خواجە وست وەشام، غولام وست وەتوون

سککەم سفید کەرد جە داخ «خالید»     نەنیشتم جە سای بەیداخ «خالید»

شێخ عەوڵا تا ناوەندی چەرخی سێزدە ژیاوە.

---

١. **زنجیرە باوانی ساداتی لۆن**: شێخ موحەممەدی ئەسکەندەری، کوڕی حاجی شێخ ئیسمایلی هەزارمێردی، کوڕی شێخ ئیسمایل، کوڕی شێخ مستەفا، کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی سەید داود، کوڕی سەید کاک ئەحمەدی سوور، کوڕی سەید حەسەن، کوڕی سەید ڕەسوول، کوڕی سەید قەلەندەر، کوڕی سەید بایەزید، کوڕی سەید عەبدولکەریم، کوڕی شێخ عیسا بەرزنجی، کوڕی سەید باباعەلی هەمەدانی، کوڕی شێخ یۆسف، کوڕی شێخ مەنسوور، کوڕی شێخ عەبدولعەزیز، کوڕی ئیسماعیلی موحەددیسی قوتب، کوڕی ئیمام مووسا کازم.

گوڤاری *کوردستان*، چاپی تاران.

## پەرتەو بەگی هەکاری

مرۆیەکی زانا و شاعیرێکی توانا بووە کە بە کوردی کرمانجی (باکوور) شیعری گوتووە و تا ساڵی ١٢٢١ ک. م. ژیاوە.

*خلاصةالکُرد و الکُردستان*، ل٣٥٦، بە گێڕانەوە لە *دائرةالمعارف اسلامی*.

## شێخ ئەحمەدی خەتیب

لە خەلیفە پێشینەکانی مەولانا خالید و خەڵکی هەولێرە کە مەولانا پێش چوونی خۆی بۆ دمشق، ئەوی بۆ ئیرشادی خەڵکی ئەو شارە ناردووە.

شێخ ئەحمەد مرۆیەکی زانا، عارف، قسەزان، شاعیر و مورشیدێکی تەواو بووە؛ خاوەن کەرامات و ئاکار و خۆ و خدەی هێژا. کە بۆ دمشق چووە، لە ماوەیەکی کەمدا، وای لە خەڵکەکە کردووە بە ئاوات و تامەزرۆییەکی زۆرەوە داوای لێ بکەن مورشیدەکەی بانگ بکا بۆ ئەوێ، با لە نزیکەوە ببینن و لە ودمی هەناسەی پیرۆزی بێ بەش نەبن.

شێخ ئەحمەد لە دایکەوە باپیری شێخ یاسین، کوڕی ئیبراهیمی سەنهووتی، خاوەن کتێبی «*الانوار القُدسیّه*»یە.

**لە کتێبەکانی خۆیشی**: «*نورالهُدی*»، «*آداب الشّیخ و المُرید*»یان ناو بردووە.

کۆچی دوایی شێخ ئەحمەدی خەتیب، ساڵی ١٢٥٠ ک. م. ڕوویداوە.

*بُغیةُ الواجِد*، ل٢٦٦. *یادی مەردان*، ل٩٤ و ٩٥. *الانوارالقُدسیّه*، ب١، ل٢٤٢ و ٢٦١.

## شاکی سنەیی

مەلا ئیسمایل، نازناو «شاکی»، لە زانیارانی شاری سنەیە کە بۆ هەیئەت و ئەستێرەناسی پیتۆڵی سەردەمی خۆی بووە و لە زانستەکانی تریشدا سەری‌دەرچووە و جاروبارەش شیعری گوتووە. ئەوا چەند نموونە:

بسی شرمنده گردد از بهشت و از قُصور خویش  اگر رضوان جَنّت یک زمان بیند سر کُویش
ز وضع و گردش اَفلاک «شاکی» شاکیم؛ زیرا  که هم سنگند لعل و سنگ خاره در ترازویش

* * *

از جفای دلبر و جَور رَقیب و سیر چرخ  خاک بر سَر، داغ بر دل، آتش افشانم چو شمع

**مەتەڵ**:



لعبتــی دیــدم انــدر ایــن کُهــسار | بُـــوَدَش نـــام چـــار انـــدر چـــار
چـار حـرف اسـت نـام او، چـو از او | چـــار اگـــر بفگنـــی بمانـــد چـــار
جُملـــه عـــالم بـــه ســوی او مایـــل | لیــک میلــی بــه چــار هــم ناچــار
چـــارمیخش کــشیدەانــد بــه خــاک | سر کــــشیده بـــــه چـــــارمین دَوّار
همچـــو قُطـــب فَلَـــکْ بُـــوَد ســاکن | همچـــو مـــاه سَـــما بُـــوَد سَـــیّار

شاکی تا نیوەکانی چەرخی سێزدە ژیاوە.

*حدیقەی اَمان‌اللهی*، ل٣٨٤.

## ئەبووبەکر ئەفەندی (یەکەم)

زانا و شەرعزانی ناودار، عەللامە ئەبووبەکر ئەفەندی هەولێری، گەورەی خێـڵی زانیـارانی ئەفەنـدی هـەولێر، مرۆیەکی پایەبەرز و پیرۆزبووە کە زۆرێک لە مامۆستایانی ئەم دواییەی کورد، لە خزمـەتی ئـەو و منداڵانیـدا خوێندوویانە و ئیجازەیان وەرگرتووە.

مامۆستا لە شاری هەولێر ژیاوە و لە مزگەوتی قەڵای هەولێر دەرسی داوە و تا دەوری ساڵانی ١٢٥٠ ک. م. زیندوو بووە.

*عُلَماونا فی خدمَة العلم و الدّین*.

## مەلا عیسا جوانڕۆیی

مامۆستایەکی زانا و قسەزان و شاعیرێکی دەم پاراو و گفتڕەوان بووە کە لە نیوەی چەرخی سێزدەدا لە دنیا چووە. مەولەوی تاوەگۆزی، شاعیری بەناوبانگی کورد، ماوەیـەک بەلایـەوە خوێندوویـە و دوایـیش پێکـەوە ئاموشۆ و شیعر گۆڕینەوەیان هەبووە.

لەم شیعرانەی خوارەوەدا، مەلا عیسا داوای لە مەولەوی کردووە لەمەڕ بنەماڵە و کەسایەتی ژنێکـەوە ـکـە ویستوویە بچێتە خوازبێنییەوە ـ پرس‌وجۆیەکی بۆ بکا:

ڕۆڵـــــە بزانـــــە، ڕۆڵـــــە بزانـــــە | ئـــــەحواڵ یـــــارۆ پـــــەرێم بزانـــــە
هەم جە خوێشانش، هـەم جـە بێگانـە | پرســـە بزانـــە، ئـــەو جـــە کامانـــە
خاسیش، خەرابیش، ئەتوارش، کـاڵاش | پەسـتی قامـەتش، بوڵـەندی بـاڵاش
ئەحواڵــش تــەحقیق پــەرێم بکیانــە | مەکـــــەرە درۆ، مـــــاوەر ویانـــــە
خاس جە لات خاس بۆ، خەراب خەراب بۆ | تـا واتـەت مـەقبوول «اُولُوالاَلْبـاب» بـۆ
بــا کــەس نــەزانۆ بــە گوفتگوومــان | نەشـۆ بـە عەبـەس گـشت ئابـڕوومان
هەرکەس عاقـڵەن ئیـشارەش وەسـەن | چـــەنی جـــاهیلان واتـــەی عەبەســـن

ئەگـــەر عاقـــڵی ئایـــەت ببینـــە «الطَّیِّبـــــــــاتُ لِلطیِّـــــــــبینَ»

**ئەمەش جوابی مەولەوی**:

چوون بەندە بەو بەند ئیخلاسی بەندەن هەر پاسە بەندەن تـا حـەیات مەنـدەن
تـــەمامی مەتلـــەب ئەشـــعارم وانـــان خاســـی و خـــەرابی یـــارۆیچم زانـــان
عەفیفەن، بێعەیب، خاڵیەن جە شەین ئوجاغزادەی خاس نـەجیب تەرەفـەین
ئادابش زەریف، خولقش چـوون حـوورەن بـــالاش میانـــەی «خَیْرُالامـــور»ـــەن
بـــڵێ واتـــەی مـــن پـــووچ و عەبەســـن گـــردین درۆ بـــۆ ســـپیدیش وەســـەن
وَالحـــاصـــل واتـــەم بی درۆ ڕاســـەن یارۆ پـەی یـار و پـەی یـاری خاسـەن

دیوانی دەسنووسی مەولەوی تاوەگۆزی.

## سەید ئەحمەدی کوردستانی

هەر لە سەرەتای لاوی و هەرزەکارییەوە، ژیانی دەروێشی هەڵـبژاردووە و زۆرتـر لـە کونجێکـدا عیبـادەتی کردووە؛ تا خزمەتی مەولانا خالید گەیشتووە و سەری پێ سـپاردووە و پـاش ماوەیـەک کەوتۆتـە گـەڕان و سەرەنجام گەیشتۆتە دیهلی و لە جەهانئاباد ماوەیەک لە خانەقای شاعەبدوڵـلای دیهلـەوی گۆشـەنـشین بووە و کە تەواو پێگەیشتووە، کەڵپۆسی خەلافەتی لەبەر کردووە و گەڕاوەتـەوە زێـدی خـۆی؛ بـەڵام تـا دوا کاتی ژیان، باری خۆی نەگۆڕاوە و هەر لە سووچێک و بێدەنگێک خەریک عیبادەت و سکاڵای خۆی بووە و سەرەنجام ساڵی ١٢٥٠ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

*مناقب احمدیّه*، ل٧٣. *الانوارُ القُدسیّه*، ل٢٢٣.

## غوڵامڕەزا خانی ئەرکەوازی

ڕاوێژیاری حەسەنخان[١]، والی پشتکۆی لوڕستان بووە خـان و زۆری خـۆشویـستووە؛ بـەڵام دوایـی لەبـەر کارەساتێک، قینی لێ هەڵگرتووە و لە زیندانی خستووە.

غوڵامڕەزاخان شاعیر بووە و دیوانێک شیعری نووسیوە؛ کە بەداخەوە ئێستا هێنـدێکی بـە پـرژ و بـڵاوی لـێ ماوەتەوە و لای خەڵکە. وەک ئێژن، لە ماوەی زیندانیدا شیعری زۆری هۆنیوەتەوە؛ یەکیان سکاڵایەکە بریتی لە حەوت بەش کە وا دەسپێدەکا: «موشکڵ گوشایی! موشکڵ گوشایی!». ئەمەش سێ بەیت لەو هەڵبەستە:

بینـــای لامـــەکان! بینـــای لامـــەکان! قـــادر قـــودرەت! بینـــای لامـــەکان!

---

١. حەسەن خان ساڵی ١٢١٦ ک. م. والی پشتکۆ بووە.

ئیلتجـام بـە تـۆن یـا زات سـوبحان! نـەجاتم بـدەی لـەی بەنـد زنـدان
پەنام هـەر تـۆنی یـەکتای بـێ هـەمتا! وەی بەنـد زنـدان مـن ببـووم ڕەهـا

غولامڕەزاخان تا ناوەڕاستی چەرخی سێزدە ژیاوە.

*جُغرافیای تاریخی و تاریخ کُرستان*، علی‌محمد ساکی، خرم‌آباد، ١٣٤٣ ک. هـ. ل ٦٧.

## شێخ حەسەنی سنەیی

کوڕی شێخ عەبدولموئمینی دووەمی مەردۆخی سنەیی، زانایەکی شـارەزا لـە هەیئـەت و ئەستێرەناسـی و ڕیازی و ئۆستادی خۆشنووسی بە خەتی نەسـخ و نەسـتەعلیق و سـولس بـووە کـە کەتیبـەی مزگـەوت و مەدرەسەی «دارُالاِحسان» و «دارُالحُکومه» ـباشگای ئێستا ـ خەتی ئەوە.

شێخ حەسەن لە وێنەکێشی و کەنەکاری و دروست‌کردنی ئوستورلابدا زۆر لێهـاتوو بـووە و سـەرەنجام لـە نیوەی چەرخی سێزدەدا لە دنیا چووە.

*تاریخ مردوخ*.

## حاجی موحەممەد سدیقی سنەیی

یەکەم کەسێکە دوای گەڕانەوەی مەولانا خالید لە هیندووستان و لادانی چەند ڕۆژەی لە سـنەدا، دەسـتی لەگەڵ داوە و سەری پێ سپاردووە و تەریقەی نەقشبەندی لێ وەرگرتووە.

حاجی حەمە سدیق پێشتریش مرۆیـەکی پارێزکـار و بـەئاکار بـووە و دڵـی بـەرەو تەریقـەت و سـەیر و سولووک هانی‌داوە و لە ماوەی هاودەنگی مـەولانادا، سـاتێکیش لـە زیکـر و فیکـر و بـەجێ‌هێنـانی داب و دەستووری ئەو ڕێگایە نەبۆتەوە و لە ماوەیەکی کەمدا هێژایی وەرگرتنی ئیجازەی دەس‌کەوتووە.

باوانی حاجی موحەممەد سدیق خەڵکی بوخارا بووگن و باپیرەگەورەی کۆچی کردووە بۆ سـنە و لـەوێ ژنی خواستووە و دامەزراوە. ئەم بنەماڵە دواجار ناوی «ئایەتوننەبی»یان بە خۆوە ناوە.

حاجی موحەممەد سدیق ساڵی ١٢٥١ ک. م. لە سنەدا کۆچی دوایی کردووە.

کتێبی دەسنووسی *گُلشَن مَعرفت*.

## شێخ عەبدولقادیری شەمزینی

عارفێکی پایەبەرز لە بنەماڵەی سەیدەکانی شەمزینانە[١] کە ساڵی ١٢٢٩ ک. م. کاتێ کە مەولانا خالیـد لـە

---

١. لە بارەی ئەم بنەماڵەوە، لە بەشی دووهەم (ماڵەمیران)دا باس دەکەین.

بەغدا بووە، خزمەتی گەیشتووە و پاش وەرگـرتنی تەریقـەتی نەقـشبەندی و سـەیر و سـولووک، تـا پلـەی ئیرشادیش سەرکەوتووە و مـەولانا ئیجـازەی خەلافـەتی پـێ داوە. ئـەمجار گەڕاوەتـەوە کوردسـتان و لـە هەکاریدا ڕێنوێنی و ئیرشادی خەڵکی دەسپێکردووە.

شێخ عەبدولقادیر جیا لە پلە و پایەی شێخیەتی، لە زانستە مەعقوول و مەنقوولەکانیشدا سەری دەرچووە.

*یادی مەردان*، ل٩٨. *الانوارُ القُدسیّه*، ل ٢٦٠.

## شێخ عەبدوڵای خەرپانی

کوڕی سەید ئیسماعیل، کوڕی سەید موحەممەدی مەشهوور بە «شێخ موحەممەدی کۆسـە»، لـە سـاداتی قەرەداغی سلێمانی و لە زانایان و مامۆستایانی پایەبەرزی چەرخی سێزدەیە کـە ماوەیـەک لـە خـەرپانی و سەرەتێک لە هەڵەبجە دەرسی گوتۆتەوە و یەک لە فەقێیەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە.

مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ لە پەراوێزی لاپەڕەی ١٠ی کتێبی «*مُفتی زَهاوی*»دا، سالانی زا و مـەرگی شێخ عەبدوڵلای ١١٩٠ و ١٢١٥ ک. م. نووسیوە؛ بەڵام دەشڵێ: «موفتی زەهاوی یەک لـە شـاگردانی ئـەو بووە». جا بەو پێیە وێدەچێ ئەو دوو ژمارەی سالانە، هیچیان ڕاست نەبن؛ لەبەر ئەوەی:

١. بەو حیسابە دەبێ شێخ عەبدوڵلا ٢٥ ساڵی عومر کردبێ؛ کەچی دەزانین لە زانایانی بەناوبانگە کـە زۆرێ لە مامۆستایانی گەورە لە کۆڕی دەرسی ئەودا خوێندوویانە و ئیجازەیان وەرگرتووە؛ دیـارە کەسـی وا دەبـێ تەمەنێکی زۆری بووبێ؛ هەر وەک مەشهوورە دەڵێن سێ پشت (باپیر و باب و کوڕ) لایەوە خوێندوویانە.

٢. ئەگەر شێخ عەبدوڵلاساڵی ١٢١٥ لە دنیا چووبێ ــ وەک مامۆسـتا خـاڵ دەفـەرموێ ــ ئـەو دەم مـوفتی زەهاوی منداڵێکی ٧ سالان بووە. هەر ساڵێکیشی لای مامۆستا خوێندبێ، کوا منداڵی ٦ سالان دەتوانێ لـە کۆڕی وادا دانیشێ و بەهرەی دەسکەوێ.

٣. مەولانا خالیدیش کە ساڵی ١١٩٢ ک. م. هاتۆتە دنیا، شـاگردی شـێخ عەبدوڵـلا بـووە. جـا ئەگـەر بـە گوتەی مامۆستا خاڵ، شێخ عەبدوڵلا ساڵی ١١٩٠ لە دایـک بووبـێ، تـەنیا دوو سـاڵـیان نێـوان بـووە و بـەو حیسابە دەبێ هاوقوتابی بووبێتن، نەک مامۆستا و فەقێ.

دوور نییە ئەو دوو ژمارە بە هەڵەی پیتچن وایان لێ هاتبێ و ڕاستەکەی ١١٧٠ و ١٢٥١ بووبێ؛ هەرچەنـد مامۆستای مەزن مەلا کەریم لە کتـێبی «*عُلَماونـا فـی خـدمـة العلـم و الـدّین*»دا سالـی زا و مـەرگی شـێخ عەبدوڵلای ١١٥٩ و ١٢٥٤ ک. م. نوسیوە.

*یادی مەردان*، ل١٢. *مُفتی زَهاوی*، ل ١٠. *عُلَماونا فی خدمة العلم و الدّین*.

## میرزا شەفیعی جامەڕێزی

میرزا لە هۆزی دلوو، خەڵکی ئاوایی «جامەڕیزی» لای کەرکووکە؛ لە نیوەکانی چەرخی سێزدەدا ژیاوە و هێندێک شیعری گۆرانی لێ بەجێ ماوە. ئەوا دوو لە شیعرانە:

هامسەران جارێ، هامسەران جارێ
ڕام کەفت و گوزەر درەختێک جارێ
درەخت چی درەخت! قامەت چنارێ
بەرز بەهرەمەند، ساوای وەنداریێ
سەر جە کەشکەلان هەفتەمین ویەرد
ڕیشەی پا نە تەخت زەمین مەحکەم کەرد
واتم پیرەدار مەنەی هەزارساڵ!
شەرحێک جەی دەوران باوەر وەخەیاڵ
خەیلێ زەمانت جەویر ئاوەردەن
شادیت وە زەمان کام شاهان بەردەن؟
دیم دەنگێک ئاما جەی نگارەوە
جەی مینای شکست هەزارپارەوە
کە هیچ ڕاویارێ لەی ڕاو و هەردە
سوئال ئەی جەواب جە من نەکردە
پەی چێش مەپەرسای دەور ئەییامم
هەم لە نۆی بەدتەر کولانی زامم
ئەوسا نەمام بیم تووڵ یەکساڵان
خزمەتمم مەکەرد خواجە و غولامان
چوونکە خوداوەند واستەش بی، جاران
دەسەی کناچان، ڕۆیلەی ڕەندان
شاهان، سەرداران، میر و بیگلەران
مەهاتنە سەهنم وە دەوران دەوران
ئیستە من پیر بیم چرۆم گشت ڕێزیا
جوانان جە سای سەهنم بێزیا
پیری هاتییەن وە پیریمەوە
هیچ نییەن وتەنگ دڵگیریمەوە
جوانیم لۆا پیریم وەجا مەند
پیری ڕیشەی من جە بیخ هۆرکەند
تاف جوانییەکەم بەی وە دواوە
گلەیی پیری مەکەم وە لاوە
ئەو ساڵە من تاف جوانیم نۆ بی
وسمان قوجاغ[1] پادشای کۆ بی
تەرسم هەن نەفام وە نەم بۆ ئاهیر
سفتەم با بەرۆ باهێر وە باهێر
هەر بایەک بەیۆ لایێکم بەرۆ
هەر کرمێک بەیۆ وەڵگێکم وەرۆ

* * *

زلێخام چوون حوور، زلێخام چوون حوور
سەرتاپای باڵاش خاس ڕەشتەن چوون حوور
لە فەرق تا «رِجْلَین» نەدارۆ قوسوور
«تَبارکَ‌الله، نورٌ عَلی نُور»
عەکس پێشانێش بەرق وەهارەن
ئەگریجان عەقرەب گیسووش زوننارەن
ئەبرووان چوون سەیف دوو باڵ کەمانەن
لا تەشبێهـ چوون قەوس پای ئاسمانەن
برژنگان خەدەنگ شەرجۆ شەڕفرۆش
عەین، عەین جێران خەواڵوو خاو خۆش

١. مەبەست لە «**ووسمان قۆچاغ پاشا**» عوسمان پاشای کۆیە کە «**قۆچ پاشا**»یان پێ گوتووە و لە دەورانی نادرشاوە تا ڕۆژگاری کەریمخانی زەند، لە هەولێر و کۆیە حاکم بووە.

گۆنـای شەکەرسـێو، نـادری خوونـسار قرمز هەم سـفید یانـێ چـوون گوڵـنار
نـەقش‌کـەش سـونع ئوسـتاد قـودرەت نەفەس بـۆی ئـەنفاس مەسیحاسـفەت
دەم دورج سەدەف دەریـای عوممـانی دەندان چـوون سـەدەف ئـاو نەیـسانی
زنەخ زەرد وەرەق خاڵ فیرووزەی ساف چوون پرشەی پەروین مەنمانا شەففاف
گــەردەن چــوون بلــۆر ســفید ســادە ســافیش وە مینــا ســەد خەفـەت دادە
سینەش سیم‌ساف، سـافتەرن نـە عـاج خەزێنەی خەیاڵ دڵ کـەردەن تـاراج
جفتێ شەمامەی بـن‌بەسـتی نـەوڕەس هێمای خەریدش نەکەردەن پەی کەس
کــەف حەنابەنــدە، پەنجــە قەڵــەمکار ســەرپەنجە نــە تــەرز یــاقووت ئــاودار
کەمەربەند باریک شکەم سـاف و نـەرم بەستەن وە دەسماڵ پەی حـوزوور شـەرم
ناف، ناف ئـاهوو، موشـک جـێش ڕێـزۆ جــە یانــەی دەروون غــەوغا مــەخێزۆ
ڕوکبە و ڕیجل و ساق سەرپەنجەی خوش‌خەت مەنیا وە زەمـین پـا وە سـەد میننـەت
دارا و ئەسـکندەر پـەرێش دەعواشـان خـــودا مـــەزانۆ وەکـــێ ڕەواشـــان
ئەسپەردەی بارگەی «وەیس» سالار بـۆ مەحفووز جە عەزاب دیدەی بەدکار بـۆ
گۆڕش جـە ئـاهیر جەهـەننم دوور بـۆ یە «شەفیع» واتەن قـەبرش پـڕنوور بـۆ

زا و مەرگی میرزا شەفیع ساڵی ١١٩٠ و ١٢٥٢ ک. م. ڕوویداوە.

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ٨، ل ١٥٥.

## ڕاویی گەڕووسی

موحەممەد فازیل‌خانی گەڕووسی، نازناو «ڕاوی»، لە ڕیزی شاعیرە باشەکانی چەرخی سێزدەیە کە نووسەر و وێژەوانیش بووە و کتێبی «*تذکرەی انجمن خاقان*» بەرهەمی ئەوە.

فازیل‌خان ساڵی ١١٩٨ لە دایک بووە و ١٢٥٢ ک. م. لە دنیا چووە.

**چەند شیعری ڕاوی**:

دل دیوانــه کجــا پنــد پــذیرد مگــرش شــکن زلــف بُتــی نــام کُــنم زنــدان را
گر نه از آتش دل خُشک شدی دیـدەی تـر خلـق را گفتـی آمـاده شـدن طوفـان را
شـاید ار دیـدەی گریـان مـرا عُـذر نَهَـد هر کـه بینـد نظـری آن دهـن خنـدان را

* * *

دارای جهـــان کـــه داورش یـــاور بـــاد تـــا دَور بـــود بـــه داوران داور بـــاد
تا هر چه ز کَف دهد به بخشش زر بـاد تـا هـر چـه سـتاند ز شـهان کـشور بـاد

*مجمع الفصحاء*، ب٢، ل١٤٢. گۆڤاری *یادگار*، س٣، ژ٨، پەراوێزی ل٣٢. *بهترین اشعار*، ل١.

## حەیرانی دونبوڵی[1]

خاتوو حەیران لە زنجیرەی ئەمیرزادەکانی دونبوڵی و کچی کەریم خانی دونبوڵییە کە لە نەخجەوان هاتۆتە دنیا؛ ماوەیەک لە ورمێ ژیاوە و پاشان نیشتەجێ تەورێز بووە.

خانم حەیران شیعری چاکی گوتووە و خاوەنی دیوانێک بریتی لە پێنجهەزار بەیتی فارسی و کوردی و ترکییە و نازناوی «حەیران»ی بۆ خۆی داناوە.

ساڵی زا و مەرگی خاتوون ڕۆشن نییە؛ ئەوەندە هەیە بەم سێ بەیتەدا دیارە لە وەباکەی ساڵی١٢٤٧ی ک. م. زیندو بووە:

ای خدا! مسلمین هلاک شدند     نوجوانان به زیر خاک شدند
مادران دل‌شکسته و نالان     مُرده شویند بهر فرزندان
ای خدا! این بلا شدید شده     فَرَج از خَلق ناپدید شده

خاتوو حەیران دەوری هەشتا ساڵ ژیاوە و لە زۆربەی شیعرەکانیدا پەسنی عەباس‌میرزای کوڕی فەتەلی‌شا و دایک و خۆشکی داوە.

ای حُسن تو ربوده ز کف اختیار دل     پژمرده شد ز هجر رُخت لاله‌زار دل
گشته خراب ازغم تو شهربند جان     از دست شد ز فرقت رویت قرار دل
چون گلشنی که باد سُمومی بر آن وَزَد     از سوزش فراق، خزان شد بهار دل
ای من فدات، روز و شبم بی‌جمال تو     جُز آه و ناله نیست کنون کار و بار دل
از زلف دام ساخته، از خال دانه‌ای     نیرنگها بریخت ز بهر شکار دل
تیری که از کمان وی از روی ناز جَست     هم در زمان نشست ببین در کنار دل
یک بار خود نگفتی کای مُبتلای مَن     بی‌روی من چه سان گذرد روزگار دل
نالید دل چنانکه فَلَک گوش خود گرفت     تا نشنود فغان من و آه زار دل
«حیران» نه یک دل از تو ربوده است آن جوان     در کُوی وی فتاده چون تو صدهزار دل

* * *

میان جمله مهرویان تویی سردفتر خوبان     رخت چون گُوی خور باشد بود زلف کَجَت چوگان

---

١. لە بەشی خوونکاران و ماڵەمیراندا باسی ئەم بنەماڵەش دەکەین.

جمال تو بود گلشن چـه گلـشن، گُلـشن خـوبی چه خوبی، خوبی یوسف چه یوسف، یوسف کنعان
دو چشم مَست تو ظالم، چـه ظالم، ظالم کـافر چه کافر، کافر رهزن، چـه رهـزن، رهـزن ایمـان
بود «حیران» تو را عاشق، چه عاشق، عاشق بیـدل چه بیـدل، بیـدل والـه، چـه والـه، والـه‌ی حیـران

*دانـشمندان آذربایجـان*، تـاران، ل١٢٦. *بهتـرین اشـعار*، ل٨١٣. گۆڤـــاری *ارمغـــان*، س٩، ژ٥ و ٦. *مـــشاهیرالکرد*، ب٢، ل٢٣٣.

## ساحیبەسوڵتانی دونبوڵی

ساحیبەسوڵتان خاتوون، کچی کەریمخانی دونبوڵی و ژنی ئەبولفـەتحخـانی کـوڕی مورتـەزا قـولیخـانی دووەمی دونبوڵی، ژنێکی زانا بووە کە لە ئەستێرەناسیدا برێ نووسـراوەی هەیـە؛ شـیعری جـوان گوتـووە و نازناوی «شەهباز»ی هەڵبژاردووە. هەروەها نووسەری چاکیش بووە و خەتیشی خۆش نووسیوە و لە زۆرێـک جوانکاری دەستیشدا لێهاتووییەکی تەواوی هەبووە.

ئەم چوارینە هی شەهبازە کە پەسنی حەسەنعەلیخانی کوڕی فەتەلیشای قاجاڕی داوە:

شهزاده حَسَن دلیـر و لـشکرشکن اسـت شَهزاده‌ی با کمال و شیرین‌سـخن اسـت
در باغ شَهنـشهی خرامـان سـروی اسـت در گُلـشن خُـسروی گُـل یاسـمن اسـت

ساحیبەسوڵتان لە نیوەی چەرخی سێزدەدا ژیاوە.

*آثارُالشیعه*، ب٤، ل٢١٢. *خَیراتٌ* حِسان، ل١١٧.

## فەتحی سنەیی

میرزا فەتحوڵا، نازناو«فەتحی»، شاعیرێکی قسەزان، میهرەبان و بەشەرم و حەیا بووە کە لە نیـوەی چـەرخی سێزدەدا ژیاوە. ئەم دوو شیعرە هی ئەون:

مَن کە باشم کە بە سوی تو نهم گـامی چنـد یا فرستم بـه سـر کـوی تـو پیغـامی چنـد
جان برون کردم و مهر تو بـه دل بنهـادم خلوت خاس نه لایق بـود از عـامی چنـد
بر سر کوی تو جان‌باخْتَنَم خوش طوری است زانکه از گردن ادا می‌شـودم وامـی چنـد
دی شنیدم سُخنی پُخته که پیـری مـی گفـت می‌نزیبد سُخن عـشق ز هـر خـامی چنـد
شاد از آن است رقیبم کـه کُـشی «فَتحـی» را می‌نداند که ندارم به جُز این کامی چنـد

* * *

کُجا رفتی ز هجر خویش کُـشتی نـاتوانی را به جان انداختی آتش چو من بی‌خانمانی را
مَرا بگسیختن ازتو چنان سـخت اسـت بـر خـاطر تو بر خاطر که بنوازی ز رحمـت خَـسته‌جانی را

مَسیح ار بخشدش هر لحظه جان تازه‌ای «فَتحی» به جان تو نخواهد بی‌حضورت نیم‌جانی را

*حدیقەی ئامان‌اللهی*، ل٤٠٣.

## میرزا شەفیعی پاوەیی

شاعیرێکی توانای خەڵکی پاوەی ناوەندی هەورامانە کە بە زبانی کوردی گۆرانی و فارسی شیعری گوتووە و زا و مەرگی سالآنی ١٢٠٠ و ١٢٥٢ ک. م. بووە. ئەم سکالآیە هی ئەوە:

قەدیم موتلەق! قەدیم موتلەق! یا قایم بە زات! قەدیم موتلەق!
حەیی بێ‌زەواڵ! قەییووم بەرحەق! نگارندەی نەقش نۆ تاق ئەزرەق!
لامەوت! بێ‌شەریک! بینای بێ‌مانەند! یەکتای بێ‌نەزیر! بێ خوێش و پەیوەند!
«واجِبُ الوجُود! لا اُحصی ثَنا» مونەززەه نەعەیب، عاری جە خەتا
مونشی ڕەقەم‌سەنج ئینشای شادی و شەوق بێ‌پەروا جە تەعن گورۆی تەحت و فەوق
بەخشندەی موراد، بێباک جەتانە نازکێش زومرەی خوێش و بێگانە
بەو بەشق زاتت، بێ‌حەد سیفاتەن باعیس ئیجاد کول مومکیناتەن
حاجەت دەروون شەوزندەداران بە تاعەت پاک تاعەت گوزاران
بەندەی کەمتەرین مەعسیەت‌بارەن فریفتەی شەیتان شووم بەدکارەن
با لوتف و فەزڵت بۆ وە دەسگیرم بویەر نە گونام ساحیب تەقسیرم
تا «یَوْمُ‌الممات» نگهداریم کەر عەلاج زامان شەرمەساریم کەر
مەگەر هەم بە لوتف چوون تۆ ڕەحیمێ «عمیمُ الاحسان»، ئیحسان عەمیمێ
نازۆ بدرێۆ نە عالەم پەردەش بۆیەرۆ نە کارکەردەی ناکەردەش
وەرنە بە زاتت جەلای زات تۆ مەکەرۆن ڕۆی حەشر من شکات تۆ

* * *

یاحەی کەس چوون تۆ پەری کەس نییەن چوون تۆ نە عالەم فریادرەس نییەن
لوتفت بی‌شومار، عەفوت عەزیمەن ڕەحمەتت بێشۆ عەتات عەمیمەن
بێ‌میسل و شەریک، تاک‌تەنیانی نگارندەی نەقش دار و دونیانی
ڕەحمەت و بەخشش خەتمەن بە نامت سەرسامەن شاهان عالەم جە سامت
قاهیران دەور جە قەهرت ماتەن بەڵێ ڕاس ماچان جە کێ پەرواتەن
عەفوت جای ئومید بیگانە و خویشەن لوتفت دڵنەواز گەدا و دەرویشەن
ئیستدعام ئێدەن لاشەریک پاک بەشق شای ئەورەنگ «و ما اَرْسَلناک»

جه عەرسەی مەحشەر مەکەر تەریقم | بە لوتف مەحزت بەدەر تەوفیقم
هەر تا کە زندەم، خەللاق موتلەق | قەییووم قایم، قەدیم بەرحەق
زەبانم بە زیکر تۆ نەبۆ خامۆش | نامت با جەلام نەبۆ فەرامۆش
یارەب ئامانەن بۆیەر جە گونام | غەیر جە تۆ نییەن مەلجەء و پەنام
چوون من گوناکار خیلافکرداریٚ | چوون تۆ بەخشندە و هەم ڕەحمداریٚ
چوون من خەجلەتبار شەرع و تەریقەت | چوون تۆساحیبڕەحم بانی حەقیقەت
چوون من نافەرمان ئالوودەی هەوەس | چوون تۆ پادشای فەرد و فەریادڕەس
ببەخشە گونام بەخشندەی داوەر | بۆ هەر دوو دونیا فریادڕەسیم کەر
وەرنە بە زاتت جە لای زات تۆ | مەکەرۆن ڕۆی حەشر من شکات تۆ

**مووی سپی و سەرەتای پیری:**

نگای جامم کەرد، نگای جامم کەرد | یەک ڕۆ جە تەقدیر نگای جامم کەرد
سفید جە سیا شناسامەوە | هەناسەم سەردا تەواسامەوە
وەنەوشەی مشکین سیای دەیجووری | ئیسە دیم چوون شەمع چەرمەی کافووری
دڵ یەند جۆش ئاوەرد، ویٚم جۆشامەوە | قرچەی زووخ زام ویٚم نۆشامەوە
نەدڵ هۆر کیٚشام هەناسان سەرد | موو چوون مارانگاز نە کەللەم باد بەرد
پەرسام لیٚش ئەی تار بیٚوادە ڕەشتە | تەڵخی سەردوگەرم ڕۆزگار چەشتە
پەی چیٚش ماتەمت، منت کەرد دڵسەرد | یە پەی چیٚش سککەی سیات سفید کەرد
خۆ ئیسە ساڵت وەسی نەیاوان | هیٚمای های نە جەمع دیدەسیاوان
هامسەران تۆ هەرکام نەمەردەن | تازە وە نەوشەش نمایان کەردەن
من دوود جەرگم بلێسەش کەرد بەرز | من لەرزام جە داغ جەو لەرزیای لەرز
من بار ناچار مەینەتان کیٚشام | من ژار قاتیل غەریبی نۆشام
تۆ پەی چیٚش ڕەنگت بەو ڕەنگ نەمەندەن | پەی چیٚش مشکت دان کافوورت سەندەن
وات: ئەی ئەحواڵپرس سککەی سفیدم | عەزیز هامراز باڵای ڕەشیدم
من منم، تۆ نیم مەپرسە ڕەنگم | تۆ دانەی گەنجی من سیاسەنگم
ئەوسا تۆ مەجاڵ شادی و زەوقت بی | ڕۆ بە ڕۆ مانا فیشتەر شەوقت بی
قوللەی قەڵای دڵ نەگرتەبی تەم | ڕەوشەن بیم چوون جام جەهاننمای جەم
تەن خەستە و بیمار بار دەرد نەبی | ڕەنگت چوون خەزان باخان زەرد نەبی
سەرخوەش مەگیٚلای وە ئەی جەهاندا | هیچ نەشناسای شاه و خاناندا



ئیسە داد جە دەس زەمانەی ناهاڵ / فتنەی زوان خوەش بیخزوان تاڵ
دڵ ئاهوو گرتەن مەگریۆ چوون شەم / سککەم کەرد سفید چوون سفیدی چەم
وەر نە من جە کۆ سفیدی جە کۆ / مەعلوومەن وادەی کۆچەن پەی گڵکۆ
«شەفیع» مووی سفید ڕوو سفیدیتەن / هەرچەند نیشانەی نائومێدیتەن

**لە غەزەلێکی فارسی**:

به غفلت مگذران ای دل تو اَیّام جوانی را / که هرگز کس نمی‌یابد دوباره زندگانی را
برای حاصل دنیا پریشانی مکن ای دل / که حاصل هیچ می‌بینم من این دنیای فانی را
دو روز عُمر خود را صرف ذکر حضرت حق کن / که از ذکر خدا یابی حیات جاودانی را
«شفیعا» عُمر بگذشت و ندانستی تو قدر او / بلی کس قدر نشناسد مَتاع رایگانی را

کتێبی *پیرشالیار*، ل ٥٤. ڕۆژنامەی *کوردستان*، تاران.

## شێخ عەبدولغەفاری مەردۆخی

شێخ عەبدولغەفار پیاوێکی زانا و هەستیار و خۆش‌خەت بووە کە تا ناوەڕاستەکانی چەرخی سێزدە ژیاوە و دیوانی شیعری بە فارسی و کوردی داناوە؛ کە دەسم نەکەوت. چەند پارچە شیعری بریتی لە لاواندنەوە و پەسن و ساڵی ئەبجەدی، لە جونگێکی دەسنووسدا هەبوو کە بەڵگەی قسەزانی و دەم‌پاراوی شاعیر و جوانی و ڕەوانی شیعرەکانی بوون؛ بۆ وێنە ئەم پارچە هەڵبەستە کە بۆ کردنەوەی مزگەوتێکی گوتووە، سەید عەبدوڕڕەحمانی پەنجە کردوویەتەوە:

نَسْل اَصحاب شَرف، زبدەی اولاد رسول / سید پاک نسب حضرت عبدالرّحمن
مسجدی ساخت بَسی طُرفه و عالی‌بُنیان / بهر زُهّاد که طاعت بگذارند در آن
عقل تاریخ وَیَم گفت که: «این معبد نیک / شد بنا از همَم عالی عبدالرَّحمن»[1]

ئەم شیعرەشی بۆ دۆستێکی میرزا فەرەج ناوی نووسیوە:

ای که در خاطر تو عزم سفر گشته مُقیم / همرهت باد عنایات خداوند کریم
توسن بخت در این طُرفه سَفر رامت باد / شاهد عافیت و سعد تو را باد ندیم
به سلامت روی و کامروا بازآیی / ایمن از محنت ایام و مشقّات اَلیم
گرچه دور است تورا مقصد و ره پُرخطر است / حزر بازوست تو را نیت خیر از غم و بیم
تا زمین را بود آرام و فلک را جنبش / باد در دهر وجود تو ز آفات، سلیم

١. بە حیسابی ئەبجەد ئەکاتە ١٢٢٣، ساڵی کردنەوەی مزگەوتەکە.

فَرَجَت همدم و رنج و حَرَجت باد بەدور یـاورت مرحمـت ایـزد یکتـای رحـیم

له جونگێکی دەسنووس.

## شێخ ئیسماعیلی بەرزنجی

شێخ ئیسمایل له سەیدەکانی بەرزنجه و لەدایکبووی گوندی «کونەکـۆتر»، زانـا و عـارفێکی بەناوبانگـه کـه خوێندنی به لای مەولانا خالیدەوه تەواو کردووه و ماوەیـەکی زۆر لـه خزمـەتی بـووه و زیـاد لـه بـەهرەی عیرفانی، فیقهـ و زبان و وێژەی عەرەبیشی لا خوێندووه و تەنانەت قورئانی پیرۆز و «*مقامات حریری*» لەبـەر کردووه. جوانی نووسیوه و به خەتی خۆی چەند کتێبی بۆ مەولانا خالید نووسیوەتەوه.

شێخ ئیسمایل ئەگەرچی له لایەن مەولاناوه ئیجازەی ئیرشادی هەبووه، بەڵام خۆی لەو کـاره بـواردووه و تەنیا به پاکردنەوەی نەفسی خۆوه خەریک بووه. چەند جار بۆ حەرەمـه پیرۆزەکـان چـووه و دوای کـۆچی دوایی مەولانا (١٢٤٢ ک.م.)، له بەغدا مەنزڵی کردووه و هەر لەوێ له دنیا چووه. یـەک لـه شـاگردانی بـه ناوی ئیبراهیمی فەسیحی حەیدەری، لەمەڕ مامۆستایەوه نووسـیویه: شـێخ ئیـسماعیل شیعریـشی جـوان هۆنیوەتەوه و بەسەر کتێبی «*روح‌المعانی*»، تەفسیری بـەناوبانگی ئالووسـیزادەی بەغدادییـەوه پەسـندێکی نووسیوه که شاندەری ئەوپەڕی زانیاری و وێژەوانییەتی.

*یادی مەردان*. پێشەکی *تفسیر روح‌المَعانی*.

## ئیبنوئادەم

موحەممەد، کوڕی ئادەم، کوڕی عەبدوڵلا، ناسراو به «ئیبنوئادەم»، ساڵی ١١٦٠ ک. م. له گوندی «دوست» لـه ناوچەی باڵەکایەتی هاته دنیا و لای بابی ـکه پیاوێکی زانا بووەـ خوێنـدی و پاشـان چـووه کـۆڕی دەرسـی عەللامه عەبدوڵلای بایزیدی و له خزمەتیدا ئیجازەی وەرگـرت. ساڵـی ١١٩٢ چـوو بـۆ سـابلاغ (مـەهاباد) و ماوەیەک مایەوه و فێری فارسی بوو. ئەمجار گەیشته ڕواندز و میری ڕوانـدز (موحـەممـەد پاشـا) زۆری ڕێـز لێ‌گرت و لەوێ دامەزرا و دەرس‌گوتنەوه و نووسینی دەسپێکرد؛ بەڵام دوایی بـەبۆنەیەکـەوه چـووه گونـدی دێلێژه و هەر لەوێ، ساڵی ١٢٥٢ ک. م. له دنیا چوو.[١]

عەللامه ئیبنوئادەم گەوره و هەڵکەوتووی زانایانی ڕۆژگاری خۆی بـووه و لـه بـواری کێـشه و وتوویـژی زانستیدا کەس تۆزی نەشکاندووه و پیتۆڵانی وەک مەولانا خالید و عەللامه موحـەممـەدی خـەتێ و مـەلا عەلی وسانی، له کۆڕی دەرسیدا بارهێناوه. زۆرێک کتێب و نووسراوەی هەیه؛ هێندێکیان بریتین له:

١. «*مرائ‌ّالمامول*»، له مەنتیقدا

---

١. له کتێبی «*عُلماونا فی خدمه العلم و الدّین*»دا ساڵی زا و مەرگی ئیبنوئادەم، ١١٦٤ و ١٢٦٠ ک. م. نووسراوه.

٢. شەرحی «*مراةالمامول*»

٣. «*مشكاةالمَنقول*»، لە سەرف و نەحو و عەرووز و مەنتیقدا، ساڵی ١٢٠٥ ک. م. نووسراوە

٤. «*مصباحُ‌الخافية*»، لە شەرحی «*نظم‌الكافية*» لە نەحودا

٥. پەراوێز لەسەر «*البهجةالمرضيه*»

٦. پەراوێز بۆ «*الفوائدالضّيائيّة*»

٧. کەنارە بەسەر «*شرح شافيه*» لە سەرفدا

٨. «*تحريرالبلاغه*»

٩. «*شرح تحريرالبلاغه*»

١٠. پەراوێز لەسەر «*مطوّل*» تەفتازانی

١١. «*ميقات‌المَعقول*»

١٢. شەرحی «*رساله الحساب*»، عەللامەی عامیلی

١٣. شەرحی «*اشكال التاسيس*»، لە هیندیسەدا

١٤. «*مفتاح المغيب فى‌العمل بالرّبع المجيب*»

١٥. «*مراة المعقول*»، بریتی لە مەنتیق، هیندیسە، حیساب، هەیئەت، حیکمەتی سروشتی، خواناسی و کەلام

١٦. «*تذكرة الاحباب فى العمل بالاسطرلاب*»

١٧. شەرحی «*ريج*»ی ئولوغبەگ

١٨. «*التّقويم*»

١٩. «*مفتاحُ‌التّنجيم فى شرح التّقويم*»

٢٠. «*تَشريحُ السَّيارات فى الفَلَك*»

٢١. «*شرحُ فرائض المنهج*»، لە فیقهدا

٢٢. «*مَجالسُ‌النّواميس*»، لە وتاربێژیدا

٢٣. پەراوێز بۆ «*چَغمینی*» قازی‌زادە، لە ئەستێرەناسیدا

٢٤. کتێبێک لەمەڕ زانستی وەزع و بەیان و ئادابدا

٢٥. «*سلسلةُ الذَّهَب*»، کە بریەتییە لە بەشێکی ژین‌نامەی خۆی و ساڵی ١٢٣٤ ک. م. نووسیویە.

ئیبنوئادەم شیعریشی گوتووە و نازناوی«واجم» بووە.

پەراوێزی *شيخ معروف النّودهى*، شيخ مُحمَّد خال. *یادی مەردان*، ل١٧ و ٢٢.

## مەلا ئەبووبەکری پیرڕوستەمی

مامۆستایەک لە عەشیرەتی «پیرڕوستەم»، خەڵکی گوندی «ساردکە»ی سەر بە ڕواندزە کە لە دەورانی دەسەڵاتی موحەممەد پاشای میری ڕواندزدا ژیاوە و لە زانایان و مامۆستایانی خاوەن وەج بووە و دەرسی بە کەسانی وەک عەللامە موحەممەدی خەتێ و مەلا ئەحمەدی گلاڵی گوتووە.

مەلا ئەبووبەکر تا شێستەکانی چەرخی سێزدەی کۆچی ژیاوە و پە پیری و زورهانی لە دنیا چووە.

لە کتێبێ «*علماونا فی خدمة العلم و الدین*»دا، بەجێ «پیرڕوستەم»، «میرڕوستەم» و لە دنیا چوونیشی ئاخرەکانی نیوەی یەکەمی چەرخی سێزدە نووسیوە و دەڵێ: میرڕوستەم گوندێکی نزیک بە شەقڵاوای سەر بە هەولێرە.

کتێب و نووسراوەی مەلا ئەبووبەکر زۆرن و لەوانە، دو کتێب یەکیان لە بەیان و ئەوی‌تر لە وەزعدا تا ئەم دواییانە، کتێبی دەرسی قوتابییانی ئایینی بووە.

جونگێکی دەسنووس. *عُلَماونا فی خدمَة العلم و الدّین*، ل٣٣ و ٣٤.

## شێخ مەعرووفی نۆدێیی

زانای ڕەببانی شێخ مەعرووف، کوڕی شێخ مستەفا، کوڕی سەید ئەحمەد، کوڕی سەیدموحەممەد، مەشهوور بە «کبریت اَحْمَر»، لە سەیدەکانی بەرزنجەیە کە ساڵی ١١٦٦ ک. م. لە گوندی «نۆدێ»، سەر بە ناوچەی «شارباژێڕ»، لە چوار فرسەقی سلێمانی هاتۆتە دنیا و لە «قەڵاچوالانی» لای سلێمانی خوێندنی دەسپێکردووە و بۆ درێژەپێدانی چۆتە گوندی هەزار مێرد و لە کۆڕی دەرسی عەللامەی بەناوبانگ، ئیبنولحاج، فیقهـ و ئوسوول و کەلامی خوێندووە.

لەو ماوەدا کە شێخ مەعرووف لە هەزارمێرد ئەیخوێند، زانا و وێژەوانی پایەبەرز، مەلا عەبدوڵڵای بەیتووشی، بۆ چاوپێکەوتنی ئیبنولحاج چۆتە ئەوێ و شێخ مەعرووف کە تا ئەو کاتە نەیبینیوە، بەڵام بەدڵ تامەزرۆی دیداری بووە، هەلی بە دەرفەت زانیوە و بە لایەوە زبان و وێژەی عەرەب و هێندێک دیوانی شاعیرانی عەرەب و کتێبی وێژەیی خوێندووە و زۆر بەهرەی لێ بردووە.

شێخ مەعرووف پاش تەواوکردنی دەرس و دەور، دەچێتە سلێمانی و لەو شارە خوێندنەوە و تۆژینەوە و نووسین و دەرس‌گوتنەوە دەسپێدەکا و هەر لەو ماوەدا لای یەک لە شێخانی گەورەی قادری بەناوی شێخ عەلی بەرزنجی ـکە خزمیشی بووە و لە گوندی «دۆڵپەموو» دانیشتووەـ تەریقەت وەردەگرێ و هێندێک بە سەیر و سولووکەوە تێپەڕ دەکا و سەرەنجام تا دوامین پلە سەردەکەوێ.

کۆچی دوایی ئەم مامۆستا پایەبەرزە، ساڵی ١٢٥٤ ک. م. لە سلێمانی ڕوویداوە.

خوالێخۆشبوو شێخ مەعرووف لە مەعانی، بەیان، بەلاغە و بەگشتی لە زبان و وێژەی عەرەبدا، ئوستادی ڕۆژگاری خۆی و لە تەفسیر و حەدیس و ئەخبار و تەجوید و قەرائەتیشدا شارەزاییەکی تەواو بووە. خەتی

نەسخی جوان نووسیوە و بە سێ زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی، کتێبی زۆری، بە شیعر و پەخشان، داناوە. لە پارێزکاری و عیبادەت و بەجێهێنانی سوننەتی پێغەمبەردا(د)، تا قۆناغی ویلایەت گەیشتووە.

**لە کتێبەکانی**:

١ـ *الفرايد فى نظم العَقائد*

٢ـ *الفَريدَة فى العَقيدة*

٣ـ *قَطْرُ العارِض فى عِلْمِ الفَرائض*

٤ـ *زادُ المَعاد فى مَسائل الاعْتقاد*

٥ ـ *سُلَّمُ الوُصول فى عِلْمِ الأُصُول*

٦ـ *عِقْدُ الدُّرَر فى مُصْطَلحِ اهل الأثَر*

٧ـ *تَرْصيفُ المَبانى فى نظمِ تصريف الزَّنجانى*

٨ ـ *الشّامِل فى نَظْمِ العوامل*

٩ـ *الاعْراب نظمُ قَواعد الاعْراب*

١٠ـ *كِفايَةُ الطّالِب نظمُ كافَية ابن الحاجب*

١١ـ *اَلْقُطُوفُ الدَوانى فى حُرُوف المعانى*

١٢ـ *فَتْحُ المُوَفق فى عِلْمِ المنطق*

١٣ـ *تنقيح العبارات فى توضيح الاستعارات*

١٤ـ *نظمُ الرِّسالة العَضُدِيَّة فى عِلْمِ الوضع*

١٥ـ *نظم آداب البَحث*

١٦ـ *عَمَل الصّياغَة فى عِلْمِ البَلاغَه*

١٧ـ *فَتحُ الرَّحمن فى عِلْمَى المعانى و البيان*

١٨ـ *غيث الرَّبيع فى عِلْمِ البَديع*

١٩ـ *الجوهَرُ النَّضيد فى قَواعد التَّجْويد*

٢٠ـ *فتحُ المجيد فى علمِ التجويد* به فارسی

٢١ـ *تنويرُ البصائر فى التحذير عَن الكَبائر*

٢٢ـ *رَوْضُ الزَّهر فى مَناقب آل سَيَّد البَشَر*

٢٣ـ *عِقْدُ الجوهَر فى الصَّلوة و السَّلام عَلى سَيّد البَشَر (صلّى الله عليه وَسَلّم)*

٢٤ـ *نَظْمِ العَرُوض*

٢٥ـ *تخميسُ البُرْدَة لِلبُوصيرى*

٢٦ـ *تَخْمیسُ بانَت سُعاده*

٢٧ـ *تخمیسُ لامیَّة العَجَم للطُّغرائی*

٢٨ـ *تخمیسُ الهمزیَّة للبوصیری*

٢٩ـ *تنویرُ القُلوب فی مدیح حَبیب عَلامِ الغُیوب*

٣٠ـ *التَّعریف بابوابِ التّصریف*

٣١ـ *کَشْفُ الغامض شرحُ منظومة قطرِ العارض در فرائض*

٣٢ـ *کَشْفُ البأساء بِأذکارِ الصَّباحِ وَ المسّاء*

٣٣. «*أحمَدیّه*»، وەرگێڕاوەی وشەی عەرەبی بە کوردی؛ وەکوو: «*نصاب صبیان*»

لە شیعرە فارسییەکانی شێخ مەعرووف، پارچە هەڵبەستێکە بە شێوەی «ترکیب‌بند» لە پەسنی پێغەمبەر(د)دا و دەست گرتن بەو هەودا جێ‌بڕوایەوە؛ کە لە هەر بەندێکیدا، پیتی سەرەتا و دواپیتی هەموو بەیتەکان، یەکن. مامۆستا ئەم شێعرەی ساڵی ١٢١١ ک. م. داناوە و ساڵی ١٣٥٥ ک. م. لە چاپ دراوە.

**دوو بەندی ئەو شیعرە:**

رقص کُنان نزد تو آمد شَجَر — حَنَّ لَکَ الجِذْعُ وَ شُقَّ القَمَر
روی مَه‌آسای تو خَیْرُالصُّوَر — سیرت زیبای تو خَیْرُالسِّیَر
راز نهان تو نداند کسی — کس ز مقام تو ندارد خَبَر
رَبُّکَ أسْری بِکَ لَیْلا الی — حَیْثُ تَجَلّی لَکَ رَبُّ البَشَر
روحُ الامین با تو به سدْره رسید — مانده پس پرده تو کردی گذر
روز قیامت تو مرا دستگیر — بر سر پُل تا که رَهَم از سَقَر
روح شود شاد و دل از غم تهی
گر تو به «معروف» کُنی یک نَظَر

هیچ کسی را چو تو نزد الَه — نیست مقام و شرف و عزّ و جاه
همدم و همراز تو روح‌الامین — راه نمایندەی گُم کرده راه
هرکه تو را دید شد از غَم خلاص — مَحو شد از دفتر او هر گناه
همّت تو گر شودم کارساز — هیچ مرا کار نگردد تباه
هادی پیشین و پَسینان توی — دست مرا گیر، نُیُفتم به چاه
هدیەی «معروف» همین است و بَس — حَمد و تحیّات و سلام و صلاه
شافع «معروف» شود پادشاه
هَوْل قیامت چو شود آشکار

ئەم شیعرەی بۆ کۆتاییهاتنی کاری کردنەوەی مزگەوت و مەدرەسەی دارولئیحسانی سنە داناوە و بە نەسخێکی جوان، بە زێوارەی هەیوانی لای ڕۆژهەڵاتی ئەومزگەوتەوە نووسراوە:

تَعالَوْا وَانْظُروا يا قَوْم هذَا الجامع العالی	بـه لِلْبـال تَفْـريحٌ و تَفْـريجٌ لِبُلْبـال
مَقـام طَيِّـبٌ ذُونـزهـة يَزْهُـو بتـزيين	و إحْكـام وَ ترصيص عَلی الاف أمثال
فَصَلّوا فيـه وَ اتلُـو فيـه قُرانـاً و أذكـاراً	جَماعـات وَ أفْـذاذاً بأبْكـار وَ آصـال
بَناهُ الخانُ عالی الجاه قَرْمٌ ضيْغمُ الهَيْجا	«أمـانُ الله» وَهّـابُ العَطايـا بـاذل المـال
مُحبٌ السّادة الاشْراف و الاحبار مُوليهم	منَ الخَيْرات ما فيه لَهُمْ أصْلاحُ اَحْوال
اَلا فـادعُوا لـهُ طُـرّاً باقْبـال وَ اجْـلال	وَافْـلاح وَ اصْـلاح وَ انْجـاح وَ آمـال

*مُقەدَّمەی تخمیس بُردە*، شیخ معروف، چاپی بەغدا.

*الأعلام*، ب٧، ل٣٢٦. *ذیل کشف الظّنون*، ب١، ل٣٧.

## یەحیا عیمادی موزووری

مەولانا یەحیا موزووری ئامێدی، کوڕی خالید ئاغا و برازای علی ئاغای باڵتی[1]، سەرەتا وەکوو فەقێی تری کوردەواری، بۆ خوێندن و فێربوون کەوتۆتە گەڕان و قوتابخانەیەکی زۆری بینیوە؛ بەڵام زۆرتر لای عاسمی حەیدەری (مامی سیبغەتوڵا ئەفەندی، گەورەی حەیدەرییان) ماوەتەوە و ماوەیەکیش لە خزمەتی ساڵەحی حەیدەری، مامۆستایەکی تری بنەماڵەی حەیدەرییان خوێندوویە و ئیجازەی وەرگرتووە.

مەلا یەحیا لە هەموو زانستە ئیسلامییەکاندا پلەیەکی بەرزی بووە بە هێندێک سەرناوی وەکوو «شیخالکُل فی الکُل»، «سُلطانُالعُلَماء»، «کَعبَةُالاخبار» ناوی دەرکردووە؛ یەک لە شاگردە هەڵکەوتووەکانی (شەهابەدینی ئالووسیزادەی بەغدادی)، لەمەڕ خواناسی و ئاکاربەرزی مامۆستاوە زۆری نووسیوە و مەولانا یەحیای شیاوی ئەم دوو بەیتە زانیوە کە بۆ ئیمام شافیعییان گوتووە:

عَلَـيَّ ثيـابٌ لـو يبـاعُ جَميعُهـا	بفَلس لَكـانَ الفَلْسُ منهُنَّ اَكْثَـرا
و فـيهنَّ نَفْـس لَـوْ تُبـاعُ بمثْلها	نُفُوسُ الوَرَى كانَتْ، أعَزَّ وَ أكْبَرا

**واتا**: هەموو بەرگی بەرم ڕەنگە بە قەرەپوولێکی بفرۆشی و ئەوەندەش نەهێنێ؛ بەڵام لە نێو ئەوبەرگەدا ڕۆحی کەسێکە ئەگەر هەموو ڕۆحی خەڵکی لەگەڵ بگۆڕیەوە، هێشتا کەمە.

موحەممەد ئەمین ئەبولفەوزی سویدی، لە مامۆستایان و زانایانی جێبڕوای بەغدا، لە کتێبەکەیدا بەناوی: «*السَّهمُالصائب*»، لە بارەی مەلا یەحیاوە دەڵێ: «هُوَ المُحَقّقُ فی المعْقُول، و المُدَقّقُ فی المنقُول، ذوالعُلُومِ الّتی

١. سەرۆکی عەشیرەتی قووش، لە عەشایری ئامێدییە کە ساڵی ١٢٤٧ک. م. میرانی ئێزدی کوشتوویانە.

ناهَزَبها النَّحاریرُ منَ المُتَقَدّمینَ، و تَأمّلَ فیها المَشاهیرُ منَ المتَأخرین، حَتّی غدا لا یَعُدُّ الخَلیلَ منْ أخلّائه، وَ لا سیْبویه منْ زُمَلائه، وَ لا یَرْضی عبدالقاهر وَ انْ جاءَ بدَلیلِ إعْجازه، و لا ابنَ الحاجب و انْ جادَ باخْتصاره و ایجازه، وَ لا العَضُدَ وَ انْ صَبَرَ لفُرْسانِ العُلوم مَواقفاً... صاحبُ التَّألیفِ الجسیمَة، الّتی لا تُعادَلُ لَنفاسَتها بقَیمة...»

مەلا یەحیایان لە حەدیسدا، جێگری ئیمام یەحیا نواوی و لە فیقهـ و ئۆسوولدا، هاوپلەی شێخ ئیبنوحەجەری هەیتەمی مەککی زانیوە و لە ڕاستیدا بۆ فیقهـ گەیشتبووە ڕادەی «تەرجیح» و لە باقی زانستە ئیسلامییەکاندا بەحرێکی بێ بن بووە و زنجیرە ئیجازەی زۆرێک لە زانایانی ئەم دواییەی کوردستانی پێ دەگاتەوە و لەویشەوە دەچێتەوە بۆ زانایانی حەیدەری.

مەولانا یەحیا پیاوێکی یەکجار پارێزکار و لەمەڕ داب و دەستووری دینییەوە زۆر شێلگیر بووە؛ کاتی ئامۆژگاری و ڕاسپاردن بۆ چاکە و پرینگاندنەوە لە خراپە، لە کەس کۆی نەکردۆتەوە و قسەی ڕاست و حەقی بە ڕاشکاوی ڕاگەیاندووە. ئەگەرچی نەچۆتەوە ناو هیچ تەریقەتێکەوە، بەلام ڕێز و حورمەتێکی زۆری بۆ مەولانا خالید گرتووە و مەولانایش ئەوی یەکجار خۆش‌ویستووە.

مەلا یەحیا ماوەیەک لە مووسڵدا دەرسی گوتووە و پاشان سەفەرێکی حیجاز و دەوڵەتە عەرەبییەکانی کردووە و ئەوجار گەڕاوەتەوە مووسڵ و دوای هێندێک بۆ ئامێدی ڕۆیوە و لەو شارە دەرسی گوتۆتەوە؛ بەلام بەبۆنەی دووبەرەکێ نێوان گەورەعەشایرەی ئەوێوە، گەڕاوەتەوە نێو عەشیرەتی موزووری و دوای ماوەیەک چۆتەوە مووسڵ و سەرەنجام لە بەغدا نیشتەجێ بووە و لەو شارە تا دوایی ژیان، دەرسی‌گوتووە.

ساڵی هاتنە دنیای مەولانا یەحیا نازانین؛ بەلام بۆ لەدنیا چوونی، سێ ساڵیان نووسیوە: ١٢٥٠، ١٢٥٤ و ١٢٥٥ و هەروەها نووسیویشیانە دەوری سەت ساڵ ژیاوە. گڵکۆی مەلا یەحیا، لە پەنا بارەگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی، لە «بابالشّیخ»ی بەغدایە.

*یادی مەردان*، ل١١٦. *الآداب العربیّە فی القرن التاسع عشر و الرّبع الاول من القرن العشرین*، اب لویس شیخویسوعی. *بغیەالواجد فی مکتوبات مولانا خالد*، محمد اسعد صاحب‌زادە خالدی، دمشق ١٣٤٤ ک. م. ل١٢٦. میرانی سۆران، ل١٢٤. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٢٢٢.

## ئەسیمی سنەیی

فەزلولا بەگ، جێگری ئەحمەد بەگی کاتیب، نازناو «اثیم»، زانایەکی قسەزان و شاعیرێکی گفتڕەوانی شاری سنە بووە کە ساڵی ١٢٥٤ ک. م. لە دنیا چووە.

ئەسیم لەسەر داخوازی ئەمانولا خانی دووەم، والی کوردستان، «*کشکول*»ی شێخ بەهائەدینی عامیلی، لە عەرەبییەوە کردۆتە فارسی.

**لە شیعرەکانی:**

به مستی عهد با واعظ شکستم تا چه پیش آید | به پای ساغر و مینا نشستم تا چه پیش آید
دلم را کج کُلاهی بُرد و از دیگر پریرویان | گذشتم، پا کشیدم، دیده بستم، تا چه پیش آید
فَلك با من اگر بی‌مهر بود از کینه و من هم | به ناوکهای آهش سینه خَستم تا چه پیش آید
به راه عشق‌بازی پاکبازی همچو من نبود | به هر طوری که بودم، باز هستم تا چه پیش آید
«اثیم» از بس ندیدم بهره‌ای از طاعت و تقوی | از این پس گردن مینا و دستم تا چه پیش آید

* * *

تو را آن روز تا جان آفریدند | به مُلك حُسن سلطان آفریدند
گر آدم را ز آب و گِل سرشتند | تو را از شیره‌ی جان آفریدند

* * *

آوازه‌ی حسن تو که افتاد به عالم | از عشق من بی‌سروپا شد، چه به جا شد
کاکُل چو نمودار شد از طرف کُلاهت | نقد دل و دین از کف ما شد، چه به جا شد
با قامت خم گشته «اَثیم» از ستم یار | چون ماه نو انگشت‌نما شد، چه به جا شد

*حدیقەی ئامان‌اللهی*، ل ١٣١.

## شێخ جەمالەدینی مەردۆخی (دووەم)

حاجی شێخ جەمالەدینی دووەم، کوڕی شێخ عەبدولموئمینی دووەم، پیاوێکی هێژا و پارسا و ئاکار جوان، لە فیقهـ و ئوسوول و وێژەی عەرەبدا شارەزا و لە هەموو بارێکەوە پێگەیشتوویەکی تێگەیشتوو بووە کە تا دوا ماوەی ژیان، بەرنوێژی و وتاربێژی نوێژی هەینی شاری سنەی لە ئەستۆ گرتووە.

مامۆستا ساڵی ١١٨٢ ک. م. هاتۆتە دنیا و ١٢٥٦ بەجێی‌هێشتووە.

*تاریخ مردوخ*.

## مەجیدی سنەیی

میرزا عەبدولمەجید، نازناو «مەجید»، کوڕی میرزا شوکرولا، جێگری میرزا عەبدوللای وەزیر، لاوێکی ژێهاتی و ئاکارجوان، لە شیعر و شاعیریدا خاوەن زەوق و لە هاوڕێیانی تایبەتی خوسرەو خانی ناکامی ئەردەڵان بووە کە ساڵی ١٢٥٧ ک. م. شەهید کراوە و حوسەینعەلی‌خانی حاوی، بۆ مێژووی ئەم کارەساتە گوتوویە:

سال این مرگ نمایان، وقت این نقش شگرف | زد رقم حاوی «شهید دوست شد عبدالمجید»[1]

---

١. بەرامبەرە بە ١٢٥٧.

**لە شیعرەکانی مەجید**:

دو صد رَه جانفشانی بایدم هر پاسبانی را		کە تا یک ره بە کام دل ببوسم آستانی را
ز غَوغای رقیبان بر سر کویش مَنال ای دل		بە یک بلبل مُسَلَّم نیست هرگز گلستانی را
خوشم با حَسرت کنج قفس زین نالەی جانکاە		همی ترسم بە مهر آرد ز بختم باغبانی را
شب وصل است هان ای دل دمی از نالە دم درکش		کە تا از روز هجرش عرضە دارم داستانی را

«مَجید» از جذب آە با اثر نبود عَجَب زین‌سان
کە کردی مهربان آخر دل نامهربانی را

سازی قرین مهر چو زُلف سیاە را		آری کَلَف بە چهرەی تابندە ماە را
صبحی اگر جمال نمایی ز طرف غرب		قومی یقین کنند دگر اشتباە را
روز حساب چون تو درآیی، خدای حشر		از پلّەی ثواب در آرد گناە را
پیش چنان مثال بە جُز صورت‌آفرین		مُشکل کسی کە ضبط تواند نگاە را

در عشق مُشکلم همە از نالەای گشود
بهتر از این اَثَر نبود هرگز آە را

* * *

مرا با نالە و اَفغان قرین کردی نکوکردی		بە درد داغ هجران همنشین کردی نکوکردی
وفا گفتم مَکُن با غیر و ترک جور کُن با من		نە با غیر من آن، نە با من این کردی، نکو کردی

*حدیقەی اَمان‌اللهی*، ل٤٠٧.

## شێخ خەلیلی ئەسعەردی

شێخ خەلیل، کوڕی مەلا حوسەینی ئەسعەردی عومەری شافیعی، پیاوێکی هێژا بووە کە ژیانی بە خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە تێپەڕ کردووە.

**لە کتێبەکانی**: «*الغُصُون من مَقولات أرباب‌الفُنون*»، «*تأسیس قَواعدِالعقائد*»، «*تبصرة القُلوب مِن کلامِ عَلّامِ الغُیوب*»، «*اُصولُ الحَدیث*»، «*شرحُ الشّاطبیّە*» و «*شرحُ الهَمزیّة*».

*الأعلام*، ب٢، ل٣٦٦. *هدیةالعارفین*، ب١، ل٣٥٧.

## میرزا شوکروڵای دیناروەند

میرزا شوکروڵای دیناروەند لە کوردانی فەیلی نیشتەجێی «پشتکۆ»ی لوڕستانە کە ساڵی ١١٦٤ هاتۆتە



دنیاوە و ١٢٥٩ ک. م. لە دنیا چووە؛ لە شیعر و شاعیریدا دەستێکی باڵای هەبووە و هێنـدێک شـیعری لـێ بەجێماوە؛ یەکیان «پیری» ناوە:

دڵا! هـا گوزەشـت، دڵا! هـا گوزەشـت
خۆشی و شادی و زەوق ساڵان ها گوزەشت
ماجەرای پیری، دیت چەرنگی ڕەشت؟
کاڵام بی وە بەرگ خەزان کـەردە نەشـت
سـپیدپۆش بیـەن سـەرتاپای بـاڵام
ناپەسـەند بیـەن قومـاش ئـاڵام
ئەلف قامەتم چوون دال وەردەن خـەم
دیدەی دووربینم پۆشاش پەردەی تـەم
عەقڵ و هۆش و فام لە لام بیـەن کـەم
کەللەم چوون کەشتی ها لە حـاڵ تـەم
هانـا جـوانی بـۆوە دمـاوە
تـا گلـەی پیریـت بکـەم وە لاوە
پـیری هاتینـە وە پیریمـەوە
تـەکدای وە بـان گـشت دڵـگیریمەوە
پیری بی وەتەوق کەفت نـە گـەردەنم
لـەویر نمـەچۆ حاشـا کـەردەنم
ئـەگـەر بواچـووم قـسە وە بـێ تـۆ
وەنـەم مـەواچن لیـوە و خـەرەفگـۆ
دەی نەمـەن تاقـەت، توانـای پـیریم
بەڵـکەم خوداوەنـد بـدەی سـەبیریم
هـەتا جـوانیم مـاوەرووم ئـەوویر
ژە وینەی خـوونچیر مـەپێکوم وە تـیر
سەییاد تـەردەست، چـابوک تـونڕەو
بەرق چەخماخم چوون شـەهاب شـەو
سـەدای مـاردەمم وە کاوانـەوە
کـووان گـشت وەک هـەور مەلاوانـەوە
باریک بیم چوون مار ساف چوون شۆڵەی خـوەر
دینانـەوە سـەر کێـشیام ئـەووەر
خرەی خاک پـای وێم نامـام وەگـۆش
وەحـشیان کـۆ مەکـەردم خـامۆش
لـە سـەیر و سـەیران کـۆان کەفتـەنم
نزیکـە سـەفەر یـەکجار ڕەفتـەنم
ئیـسا خاڵخاسـان لـێم مـەدەن تانـە
بیمـەوە تەمـەڵ قـاپی دەرگانـە
خاسـە نـازاران ئەوسـا منـەتبار
ئیـسا لـە ڕوخـسار پـیریم بـین بێـزار
هەرکام کـە دارۆن نیـشانەی ژە لـەیل
ئاهێ مەکێشن مەکەن حەیف و مـەیل
هەرکام عەقڵ و هوش لە لاشان دویـرە
لـەو خەنـدە مەکـەن «شـوکروڵا» پـیرە

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، س٣، ژ٥، ل٧٤.

## عەبدوسسەلامی ماردینی

کوڕی سـەید عومـەر، کـوڕی سـەید موحـەممـەدی مـاردینی، دوای فێربـوونی وانـە سـەرەتاییەکان، بـۆ ئەستەمبووڵ چووە و ماوەیەک لە خزمەتی مامۆستایانی پایەبەرزدا خوێندوویە و پـاش وەرگـرتنی ئیجـازە، گەڕاوەتەوە ماردین.

عەبدوسسەلامی ماردینی حەنەفی، پیاوێکی هێژای خەڵکی ماردینە کـە بێجگـە دەرس‌گوتنـەوە، پلـەی فتوادانیشی لە ئەستۆ گرتووە و تا کۆتایی ژیان موفتی ئەوشارە بووە.

**لە کتێبەکانی**: «*اُمُّ‌العَبر*» لە مێژوودا، «*رجالُ‌الحَدیث*»، «*شرحُ فاتحةُ‌الکتاب*» بـە پـیتی بـێ خـاڵ، «*خُـلاصـةُ المَنطق*»، «*الشّافی فی علمی العَروض وَ القَوافی*» و «*کتابٌ فی علمِ البیان*».

زا و مەرگی ئەم مامۆستایە ١٢٠٠ و ١٢٥٩ ک. م. ڕووی‌داوە.

*هَدیةالعارفین*، ب١، ل٥٧٢.

## عوسمان ئەسعەد ئەفەندی

موفتی سوورک لە پارێزگای ئورفە (ڕەها) لە باکووری کوردستان، کوڕی حاجی ئەیووب ئەفەندی، سـەر بـە هۆزی دونبوڵی، لە زانایانی هێژای دەورانی خۆی بووە کـە شیعریـشی گوتـووە و هۆنراوەیـەک بـە کـوردی زازایی لەمەڕ هاتنە دنیای پێغەمبەرەوە (د) داناوە و جەلادەت عالی بەدر خـان، خـاوەنی گۆڤـاری کـوردی *هاوار*، ساڵی ١٣٥٣ ک. م. لە چاپی داوە.

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٥٥.

## شێخ ئیمامی مەردۆخی

شێخ ئیمامەدین، کوڕی شێخ موحەممەد، کوڕی شێخ موحەممەد جەسیم، کـوڕی شـێخ مـەحمود، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامەی تەختی و بابی شێخ موحـەممـەدی «فَخرُالعُلمـا»، مرۆیـەکی زانـا و شاعیرێکی توانا بووە کە لە ئاواییەکی ڕۆژاوای سنە بە ناوی «دەژن»، لە نێـوان دوو ناوچـەی بێـڵەوار و ژاوەڕۆدا ژیاوە و هەر لەوێ، دەوری ساڵی ١٢٦٠ ک. م. لە تەمەنی پیریدا ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

شێخ ئیمام و شێخ غەفووری کاشتەری، زیاد لە خزمایەتی، دۆستایەتیشیان بووە و زۆریان ڕێز لە یەکتر گرتووە؛ تا ئەو ڕادە کە شێخ غەفوور ـکە بە تەمەن بچووک‌تر بووە ـ لە نووسراوەکانیدا، بە «بابی گـەورە» و «مامۆستای خۆشەویست» ناوی لێ بردووە و شێخ ئیمامیش «ئاغەم» و «گەورەم»ی بەو گوتووە.

جارێک شێخ عەبدولغەفوور بە دڵ‌ئێشاوی، کاشتەر بەجێ‌دێڵێ و ئەچێتە گوندی هـەجیج لـە هـەورامان. شێخ ئیمام ئەم شیعرەی بۆ دەنێرێ و تێدا ڕادەگەیەنێ کە چەند لەو کارەساتە خەمبارە:

| | |
|---|---|
| عەرزە داشت بەندەی مەحزوون مـەهجوور | وە خزمەت مەخدووم کاکە شـێخ غـەفوور |
| «اَحَـبُّ الاحْبـاب» خوێـشان و ئـەقوام | مورشـد ئـەنام، خـەواس و عـەوام |
| ڕەفێـق شـەفێق ئـی بەنـدەی حـەزین | بـە گـەزاف مەشـهورو بـە «اِمـامُالـدّین» |
| مـونهی ڕای مـونیر مەخـدووم مـەدارۆ | ئـەر پرسـی ئـەحوال موخلـسیت ئـارۆ |

جـەو دمـای سـەفـەر مـەعهوود مـەعلووم
بـاز وە شـار ئامـام وە ئـی مـەرز و بـووم
شـــنەفتم چۆڵـــەن تەکیـــەی کاشـــتەر
هـەردەم وە جگـەر مـەدۆم سـەد نـشتەر
ئەیوانچـەی یانـەت جـای مـەکر و ڕێـوەن
حـەوز و موسـەللات مـەملوو جـە دێـوەن
نـە سـەدای ئـەزان، نـە قـەد قامەتـەن
چـێش واچـوون یـا شـێخ یـە قیامەتـەن
بـە مـەرگت قەسـەم دەرد کـاری وێم
پەی ئـی بـازاڕە گـشت جـە دڵ بەرشـیم
ئیـسە ئیـستیدعام جـە گـردین خاسـان
پـیران پـردین، ڕاگـەی حـەق‌ناسـان
خوسووس ئەو بوزورگ[١] پەنات پێ بەردەن
هیمـەتش حـازر ئـەر سـەد کـە مـەردەن
خوداونـد بـە خـەیر ڕەحمـێ بکـەرۆ
تەفرەقـەی یـاران گـشت جـەم بـدەرۆ
بەڵـکەم ئـی مـەحزوون مـەرگ نـازاران
دڵـش شـاد بـۆوە بـە دیـن یـاران
وەرنـە ڕۆبـەڕۆ خـەمان لـێش کـۆوەن
نیدای شـادی و زەوق پـەی ئـەو ڕۆڕۆوەن

لە جونگێکی دەسنووس.

## ڕابیتی بستی

«رابط»، خەڵکی گوندی بست لە پای کێوی «چل‌چەمە» و سەر بە خوڕخوڕەی دیوانـدەرە، پیـاوێکی هێـژا و شاعیرێکی ئاگایە کە لەگەڵ شێخ زەینولعابدینی نازیردا، نێزیکی و خزمایەتی هەبووە و زورتـر لـە خزمـەتی ئەودا خوێندوویە. هەروەها لە تەریقەتیشدا کۆشیویە و بە سەیر و سولووک و شۆر و جەزبەوە خەریک بووە و تا پەنجاکانی چەرخی سێزدە ژیاوە.

**شیعری ئەوە**:

دلیران را پس از مردن دلیـری بیـشتر گـردد
که چرم گرگ بعد از خود به پیل‌افکن سپر گردد
ز تیغ راست باشد تیزی شمشیر کـج افـزون
شود هر چند ظالم تیزتر، بی‌رحـم‌تـر گـردد
ز حرف سخت ناصح ظُلم ظالم می‌شود افـزون
دَم شمشیر چون بر سنگ ساید تیزتر گـردد
میان خلق از یک حرف بیجا فتنـه‌هـا خیـزد
بلی سرمایه‌ی صدخرمن آتش یک شَرَر گردد
ز بس ترسیده چَشمم اَز دم شمشیر اَبـرویش
نگاه از دیده آید تا سوی مژگان و بر گـردد
کسی را بخت چون برگشت کار از سعی نگشاید
کمان هرچند بر خود زور آرد، حلقه‌تـر گـردد
ز جور تیره‌بختی شکوه‌ی بیجا مکن «رابـط»
که شب هرچند بی‌پایان بود آخر سَحَر گـردد

*حدیقه‌ی امان‌اللهی*، ل ٣٧٢.

---

١. مەبەست لە «ئەو بوزورگ» سوڵتان عوبەیدیللا، مەشهوور بە «کۆسەی هەجیج»ە کە مەرقـەدی لـە ئابـادی هەجیجە و خەڵکەکە بۆ زیارەتی دەچن؛ دەڵێن کوڕی ئیمام ڕەزا بووە.

## میرزا نەسیبی کرماشانی

میرزا موحەممەد خانی نەسیبی، کوڕی مووسا بەگ، لە کوردانی لای کرماشان، شاعیرێکی هێژا بووە و لە دەرباری فەتەلی شای قاجاردا ژیاوە و لە لایەن شاوە نازناوی «فَخرُالشُّعَرا»ی پێ دراوە. دوایی بۆ هیندووستان چووە و لە شاری «لکنهو» دانیشتووە و هەر لەوێ ساڵی ١٢٦٠ یان ١٢٦١ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

**لە شیعرەکانی ئەوە**:

نمی‌باشد مرا در دل به جُز این غم، غَمی دیگر — که گردد بَعد من آن همدم من، همدم دیگر
اگر جانان ز اَحوال من ای پیک سحر پرسید — بگو: می‌میرد از هجر تو این دم یا دمی دیگر
شدم از یک خم زلفت پریشان‌حال و می‌ترسم — که اندازی بر آن زلف خم‌اندرخم، خمی دیگر

*لُغت‌نامەی دهخدا*، چاپی ١٣٢٥، پیتی ن، ل٥٦٢.
*فرهنگ سُخنوران*. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل١٤٩.

## مەلا موحەممەدی بانەیی

کوڕی باقر، کوڕی مەحموود، لەدایکبووی شاری بانە، ساڵی ١١٩٦ ک. م. لە زانایانی گەورە و مامۆستایانی ناوداری ڕۆژگاری خۆی بووە، کە پاش خوێندن، ماوەیەک لە بانە دەرسی گوتووە و ساڵی ١٢٤٦ ک. م. کە عەللامە مەلا موحەممەد، مەشهوور بە «ئیبنو ڕەسوول»، مامۆستای مزگەوتی سووری سابڵاخ (مەهابادی ئێستا) دنیای بەجێهێشتووە، مەلا موحەممەد بۆ ئەوێ کۆچی کردووە و لە جێ عەللامە دانیشتووە؛ بەڵام دوایی دڵی لە عەبدوڵڵا خانی میری موکری ئێشاوە و بۆ سلێمانی چووە. لەوێ حاکمی بابان زۆری بەخێر هێناوە و هەموو پێداویستییەکی بۆ ئامادە کردووە. زۆری پێ نەچووە عەبدوڵڵا خانی موکری بە سووچی خۆی زانیوە و لە هەڵەی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە و لەدووی ناردووە. مەلا موحەممەد ئەگەرچی لە سلێمانی زۆری ڕێز و ئاسایش بووە، خۆی پێ نەگیراوە و گەڕاوەتەوە سابڵاغ و تا کاتی مەرگ (١٢٦٠ ک. م.) لەو شارە خەریکی کاری خۆی بووە.

**لە کتێبەکانی**: شەرحێکە بۆ کتێبی «*تشریحُ‌الافلاک*»ی بەهائەدینی عامیلی.

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل١٤١. گۆڤاری *کۆڕی زانیاری کورد*، س ١٩٧٣ز. بەغدا.

## ڕاسم دیاربەکری

موحەممەد، کوڕی قاسمی خالیدی ئامیدی، نازناو «ڕاسم»، لە نووسەرانی وێژەوان و شاعیرانی ناوداری شاری دیاربەکر بووە و دیوانێکی لێ بەجێماوە.

زا و مەرگی ڕاسم ساڵانی ١١٩٥ و ١٢٦٠ ک. م. ڕوویداوە.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل ٣٧١.

## مەلا سلێمانی خدری

لە مامۆستایانی هێژای کەرکووک بووە کە ساڵی ١٢٦٠ ک. م. لە دنیا چووە و کە خەبەری مەرگی بە موفتی زەهاوی (مەلا موحەممەدی فەیز) گەیشتووە، قەسیدەیەکی ڕازاوەی بە زبانی عەرەبی داناوە و لە بەغداوە بۆ مەلا عەبدوڵلای کوڕی ناردووە، کە مامۆستای قوتابخانەی «قوریە»ی کەرکووک بووە. ئەم قەسیدە ٣٣ بەیتە کە ئاوا دەسپێدەکا:

ألا إنَّما الدُّنْيا سَجِيَّتُها الغَدْرُ  فَلَيْسَ لِمَغْرُورٍ بزُخْرُفِها عُذْرُ
فَظاهِرُها وُدٌّ وَ باطِنُها قِلىً  و إدْبارُها خَيْرٌ و إقْبالُها شَرٌّ
و رغْبَتُها غَيٌّ و رهْبَتُها هُدىً  و طالِبُها عَبْدٌ و هارِبُها حُرٌّ
و عِزَّتُها ذُلٌّ و فَرْحَتُها أسىً  و صِحَّتُها سُقْمٌ و ثَرْوَتُها فَقْرُ

تا دەگاتە ئەوەی ئێژێ:

فَأسْعدْ بِمَنْ عَنْها تَرَحَّلَ سالماً  مِنَ الباقياتِ الصّالحاتِ لَها ذُخْرُ
وَ بَدَّلَ بالفاني المُخَلَّدَ باقِياً  لَهُ آجِلاً أجرٌ و فِي العاجِلِ الذِّكْرُ
كَما ارتَحَلَ المولى «سُليمانُ» ذلكَ الـ  ـتَّقيُّ النَّقيُّ الزّاهِدُ العابِدُ البَرُّ
بطُولِ بَقاءٍ لَمْ يُقَصِّرْ مِنَ التُّقى  تَقُومُ لَيالِيه، تَصُومُ لَهُ النَّهْرُ
وَ يَشْتاقُ أن لا تغرُبَ الشَّمسُ صائماً  و يَكرهُ في الاحياءِ اَنْ يَطْلَعَ الفَجْرُ

بەم شیعرەدا دیارە مەلا سولەیمان عومرێکی زۆری کردووە و زۆریش خەریکی ڕۆژوو گرتن و شەونوێژ خوێندن بووە.

*مُفتی زَهاوی*، شیخ محمَّد خال، بەغدا، ١٣٧٣ ک. م. ل٧٩ تا ٨٤.

## ئەفسەری سنەیی

میرزا مورتەزاقولی، نازناو «ئەفسەر»[١]، کوڕی میرزا ئەولکەریم، کوڕی میرزا یۆسفی وەزیری، ڕاوێژکاری خوسرەوخانی ناکام، والی ئەردەڵان، پیاوێکی هێژا و شاعیرێکی توانا و ئاگا و تا ئەو ڕادە جێ سەرنجی والی بووە کە «میرزای ڕەفیق»ی پێ گوتووە و زۆر جاران پێکەوە شیعریان گۆڕیوەتەوە.

ئەفسەر ساڵی ١٢٦٢ ک. م. هەر بە لاوی، دنیای بێ بەقای بەجێهێشتووە و بۆ دیاری هەرمان چووە.

١. مەستوورە لە «تاريخ اردلان»دا، نازناوی «مخلص»ی بۆ نووسیوە.

**چەند شیعری ئەفسەر:**

عشق می‌ورزم نهانی با تو و دانم که دانی
آری آری عشق‌ورزیدن خوش است اما نهانی
هجر جانان تا نبینی، زهر حرمان تا ننوشی
ای شکرلب تلخی شبهای هجران را چه دانی؟
برفشانم آستین از جان و دل وز دین و دنیا
بر مراد دل اگر روزی تو دستی برفشانی
غیرت خُلد برینی، حیرت خوبان چینی
رَهزن دنیا و دینی، فتنه‌ی آخر زمانی
کامرانی چیست؟ کام از وصل جانان برگرفتن
تا مُیَسَّر می‌شود دریاب و می کُن کامرانی
غایت جهل است اگر نسبت دَهَم رخسار و قَدَّت
آن به ماه آسمانی، وین به سرو بوستانی
جان ستان! شوخ نَوآیین ستمکارا! بنازم
دستبُرد غمزه‌ی شوخ تو را در جانستانی
راز دل سربسته بهتر، سوز عشق آهسته خوشتر
«اَفسر» از این درد کمتر ناله کن تا می‌توانی

* * *

رفتیم و دل به درگه تو جا گذاشتیم
او را به تو، تو را به خدا واگذاشتیم
از شور حُسن طلعت لیلی‌وشان شهر
مجنون شدیم و روی به صحرا گذاشتیم
در دلبری اَساس جفا تو نهاده‌ای
در عاشقی بنای وفا ما گذاشتیم
در زیر تیغ جور تو ما سر نهاده‌ایم
بر آتش جفای تو ما پا گذاشتیم

**شیعرێکە ئەفسەر بۆ خوسرەوخانی نووسیوە:**

خُسروا! ای آن که روز بَدْو عالم
ملک از جان و دل آمد خواستارت
ای قضا همواره بادا پایمردت
وی قَدَر پیوسته بادا دستیارت
کار عالم جمله مُهْمَل، گر قضا را
بار ندهد در حَریمت، پَرده‌دارت
خنجر اقبال و دولت در یمینت
شاهد اجلال و عشرت در یسارت
بنده‌ی دیرینه میرزای رَفیقت
کو بُود از بندگان جان‌سپارت
می‌شمردی پیش از این او را هماره
بر در خود از سگان داغدارت
این زمان چون شد که بی‌جُرم و جنایت
در تَفَقُّد کردن از وَی هست عارت؟
روزها شد می‌ندانی مُرده یا خود
رخت بربسته است از شهر و دیارت
با رفیقان در صفا این است شُغلت؟
با حریفان در وفا این است کارت؟

**ئەمەش جوابی خوسرەوخان:**

آرام دل و انیس جانم
میرزای رفیق نُکته‌دانم
گفتی که من از ره تغافل
در بزم وفات می‌نخوانم
سوگند به حیّ لایَزالم
اَیمان به خدای آسمانم

تــا بــا غــم روی تــو قــرینم / بــا یــاد تــو تــا کــه همقــرانم
نــه شــاد گهــی زآن و ایــنم / نــه یــاد دمــی ز ایــن و آنــم
خود گـر تـو دمی بـه محفـل آیـی / ای راحــت جــان نــاتوانم،
پایــت بــه کجــا؟ میــان دیــده / جایــت بــه کجــا؟ درون جــانم

*حدیقەی امان‌اللهی*، ب٢، ل١١١. *مجمَع‌الفُصحا*، ب٢، ل٧١.

## ئەسیری سنەیی[١]

ئەسەدوڵا بەگ، کوڕی نەجەفقولی‌خان و برازای حەسەنعەلی‌خان، والی ئەردەڵان، نازناو «ئەسیر»، مرۆیەکی ئاکار جوان و ڕووخۆش و میهرەبان و شاعیرێکی وردبین و قسەزان، خاوەنی لێهاتوویی و هێژایی سرشتی بووە کە ساڵی ١٢٦٢ ک. م. لە تافی لاویدا کۆچی دوایی کردووە.

ڕەونەق بۆ مێژووی مەرگی گوتوویە:

به تاریخ وفاتش هاتفی گفت: / «اسیر آسوده در گلزار جنَّت»[٢]

**چەند نموونە شیعری ئەسیر**:

گر بینمش به عُمـر شبی در کنـار خـود / نـازم بـه روز خویـشتن و روزگـار خـود
در پـای یـار کـردەام ایثـار نقـد جـان / شـرمندەام ز یـار و خَجـل از نثـار خـود
زاهد تو و بهشت و می و سلسلبیل و حور / ما و کنـار جـوی و مـی و گلعـذار خـود
از روز محشرم پس از این نیست بیم از آنک / دیدم به شـام هجـر تـو روز شـمار خـود
جَوری که هر دم از تو جفاجوی دیدەام / یاری ندیدەاست بـه عُمـری ز یـار خـود
گفـتم مگـر بـه جـای جفـایم، وفـا کنـی / زان دادمــت عنــان دل و اختیــار خــود
زشت است اگرچه پیش کسان شکوه از تو، لیک / چون ساختی جفا و ستم را شعار خـود
ایمن مَشو، که از ستمت شکوه می‌بَرَم / بــر آســتان خــسرو جــم‌اقتــدار خــود
فخرالـولات والـی عهـد آن کـه پـرورد / هر دم به جود حـاتمی انـدر جـوار خـود
تیغش به روز رزم هر آن کس که دید گفت / شیرخداش داده به کـف ذُوالفقـار خـود

* * *

نــه دل در بَــر، نــه دلبــر در بــر امــشب / چــه ســانم بگــذرد بــی‌دلبــر امــشب

---

١. *لُغتنامەی دهخُدا*، ل٢٣٧، بە گێڕانەوە لە *مجمَع‌الفُصحا*، بەجێی «اسیر سنەای»، «امیر سنەای» نووسیوە؛ کە بێ‌شک هەڵەی پیتچنە. بڕوانە: *مجمع‌الفُصحا*، ل٨٣.
٢. بەرامبەرە بە ١٢٦٢ ک. م.

ز آه و نالـــه‌ام کـــس را خبـــر نیـــست — مگـــر برخاســـت روز محـــشر امـــشب
بـــــزن بـــــر آتـــــشم آبـــــی مبـــــادا — کـــه بـــر بـــادم رود خاکـــستر امـــشب
بـــه تـــاراج دل و دیـــــنم ز مژگـــــان — دو چشمت صف‌کشیده لشکر امشب
«اَسـیر» از انتظـارت تـا سـحر داشـت — دو دیـــده حلقـــه‌آســـا بـــر در امـــشب

* * *

صد شُکر که از من به کس آزاری نیست — بـا نیـک و بـد هـیچ‌کسم کـاری نیـست
بـاری کـه چـو زاهـد و بـرهمن ز ریـا — بـر گـردن مـن سُـبْحه و زُنّـاری نیـست

* * *

ای کریمـــی کـــه عیـــب پوشـــی را — دســـت لُطفـــت مُـــدام کوشـــیده
بنـده‌ات را سـر کَلـی اسـت کـه نیـست — هـــیچ زخمـــی در آن نجوشـــیده
بـه کُلاهـی اگـر کُنـی چـه شـود؟ — کـــه کُنـــی عیـــب بنـــده پوشـــیده

ئەسیر دەوری سێ‌هەزار بەیت شیعری گوتووە، کە زۆربەیان غەزەلن.

*حدیقه‌ی امان‌اللهی*، ب٢، ل٨٣.

## لوتفی ئەفەندی

لە پیاوانی هێژا و ناوداری دیاربەکر بووە کە ساڵانێکی زۆر دەرس‌گوتنەوە و فتـوا دان و چـاوەدێری ئـەوقافی ئەو شارەی لە ئەستۆ بووە و ساڵی ١٢٦٣ ک. م. لە دنیا چووە.

لوتفی جارو بارە شیعریشی گوتووە و دیوانێکی لێ بەجێ‌ماوە.

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل١٢٣.

## موحیب مستەفا ئەفەندی

لە زانایـانی دیاربـەکر بـووە کـە ساڵـی ١٢٥٧ ک. م. بـۆ ئەسـتەمبووڵ چـووە و بـە هـۆی لێهـاتوویی لـە ڕادەبەدەریەوە توانیویە لە ماوەیەکی کەمدا بچێتە نێو کۆڕی زانایانیانەوە و لە قوتابخانە باڵاکانی ئـەو شـارەدا دەرس بێژێتەوە.

موحیب مستەفا شاعیریش بووە و بە ترکی و عەرەبی و فارسی شیعری گوتووە.

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل١٢٦.

## حاوی سنەیی

## شێخ ئیسماعیلی شیروانی

شێخ ئیسماعیل لە گەورەپیاوانی تەریقەت و مامۆستایانی فیقهـ و ئوسووله کە پێش ئەوەی مەولانا خالیدی شارەزووری بۆ هیندووستان بڕوا، لە فەقێیانی کۆڕی دەرسی بووە و ماوەیەکی زۆر لە خزمەتیدا خوێندوویە. کە مەولانا لە هیندەوە گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، دیسانەکە گەیشتۆتە خزمەتی و ئەمجار تەریقەتی لێ وەرگرتووە و بە سەیر و سولووکەوە خەریک بووە و سەرەنجام لە لایەن مورشیدەکەیەوە ئیجازە دراوە و لە سەر کورسی ئیرشاد دانیشتووە و مریدانی لە بادەی بێخەوشی عیرفانی سەرخۆش کردووە.

*یادی مەردان*، مەلاکەریم، ل٩٦.

## کورد خواجە

عەبدوڕڕەحمان ئەفەندی، کوردی خەرپووت، لە زانایانی هێژا و بەناوبانگی چەرخی سێزدەیە کە ساڵی ١٢٧٠ ک. م. پاش تەمەنێکی زۆر، لە شاری ئەستەمبوول لە دنیا چووە.

مامۆستا کورد خواجە بێجگە دەرس‌بێژی و کورسی ئیفتا، سەرۆکی کۆڕی مامۆستایانیش بووە.

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٧.

## عەللامە مەلا عەبدوڵڵای تایی[1]

کاتێ کە خەریکی خوێندن بووم، ڕۆژێک بابم ـخوای لێ خۆش بێـ بەیتێک لە کتێبێکی، کە بە دەستیەوە بوو، بۆم خوێندەوە، «تجزیە و ترکیب»ی بکەم. ئەڵبەت پێشتر بۆ ماناکەی یارمەتی دام. منیش ئەوی دەمزانی، گوتم.

ئەو کتێبە دیوانێکی دەسنووسی شیعری عەرەبی بوو، کە بە وردی خەتکێشی کرابوو، شیعرەکان بەشێوەیەکی ڕازاوە، لە دەق و پەراوێزی لاپەڕەکاندا نووسرابوونەوە. ئەگەرچی خەتەکەی زۆر هونەری نەبوو، بەڵام هێند ڕێک‌وپێک لەسەر جێی خۆیان دانرابوون و جزوبەندی کرابوون و کتێبەکە باش بەرگ گیرابوو، جوانییەکی تایبەتی هەبوو.

لەمەڕ کتێبەکەوە پرسیم؛ فەرمووی: ئەمە دیوانی «أبوالطَّیِّب مُتَنَبّی»، شاعیری بەناوبانگی عارەبە بە خەتی یەک لە گەورەزانایان و وێژەوانانی پایەبەرزی ئەم دواییانە، «مەلا عەبدوڵڵای تایی» نووسراوەتەوە و کورتەیەک لە پلەی بەرزی زانستی ئەو مامۆستایەشی بۆ باس کردم.

---

١. «**تای**» گوندێکی ناوچەی ژاوەرۆ، نزیک لە «**دۆڵاو**»، لە ٣٦ کیلۆمیتری ڕۆژاوای باشووری شاری سنەوە.

ئەوە یەکەم جار بوو ناوی ئەو پیاوە گەورەیەم دەبیست. بە ئیجازەی باوکم کتێبەکەم گرتە دەستەوەوە و بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە کەوتمە تەماشای. مامۆستا لە کۆتایی کتێبەکە و چەند شوێن، پاش پەراوێزەکانی، خۆی ئاوا ناساندبوو: عەبدوڵڵا، کوڕی مەلا عیسا، کوڕی مەلا ئەحمەد، کوڕی مەلا عیسا، کوڕی مەلا موحەممەدی مەعازی تایی ژاوەرۆیی.

بابم کتێبەکەی لێ ساندمەوە و فەرمووی:

لە مامۆستام، شێخ مەحموودی کاکۆزەکەریایی لۆنی ـنوور بە قەبریدا بباریٚـ بیستم دەیگێڕاوە: «جارێک لەسەر مانای سێ بەیتی عەرەبی، کێشە کەوتبووە نێوان عەرەبیزانانی سنەوە. بڕیار درا کەسێک بنێرنە تای، خزمەتی ویژەوانی تاقانە، مەلا عەبدوڵڵای تایی و مانای ڕاستەقینەی شیعرەکانی لێ داوا بکەن. لە نێو فەقێیاندا منیان هەڵبژارد؛ کە بە ڕێگاکەم باشتر دەزانی. پرسیارنامەم هەڵگرت و ڕێکەوتم. کە گەیشتم، لە کونجی حوجرەیەکدا بینیم، نوقمی خوێندنەوە، دانیشتبوو. سەلامم کرد؛ بەوپەڕی میهرەبانییەوە سەندیەوە و ئیجازەی دا بچمە ژووریٚ و دانیشم. نامەکەم لە باخەڵ دەرهێنا و بە ئەدەبێکەوە لەبەردەمیم دانا. دوای خوێندنەوە، فەرمووی: مانای ئەم سێ بەیتە بەسراوەتە بەیتەکانی پێشوویەوە و هەروەها ڕووداوێکی ناو عەرەبی جاهیلییەوە. ئەم شیعرانە لە قەسیدەیەکی بوختوری، شاعیری عەرەبە. ئەمجار هەموو قەسیدەکەی لەبەر خوێندەوە! ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی، بە جوابێکی ڕەسا و پەساوە گەڕامەوە بۆ سنە.»

لەوساوە، ئەگەرچی تەمەنێکی وام نەبوو، بەڵام خۆشەویستی ئەو مامۆستا پایەبەرزە، نیشتە دڵمەوە و زۆرم حەول دا لە چۆناوچۆنی ژیانی زانیارییەکی زیاتر پەیدا بکەم. بەداخەوە هەرچی زیاترم کۆشا، کەمترم دەسکەوت.

ڕەحمەتی مەلا عەبدوڵڵا، دیوانی موتەنەبی نووسیوەتەوە و کورتەی پەراوێزەکانی عەلی، کوڕی ئەحمەدی واحیدی لێ زیاد کردووە و مێژووی تەواو کردنی کارەکەی ساڵی ۱۲۵۸ ک. م. داناوە. لە شوێنی پەراوێزەکانیشدا، زۆر جاران ئەم ساڵانە دووپات بۆتەوە: ۱۲۵۷، ۱۲۵۸، ۱۲۵۹؛ کە نوێنەری ساڵی دوایی هاتنی نووسینەکەیە.

ئەم کتێبە لە کتێبخانەی خوالێخۆشبوو مەلا لوتفوڵای شێخولیسلامی سنەییدا بووە کە لە میراتبەرانی بێسەوادی مەلا عەبدوڵڵای سەندووە و ئەم چەند دێڕە عەرەبییەی بە قەڵەمێکی ڕەوان و خەتێکی جوان، لە پەراوێزێکدا نووسیوە: «هذَا الدّیوانُ خَطُّ أُسْتاذی المرحوم المُلا عبدالله الطّائی، و کانَ کثیرَ التَّتَبع و التَّدرُّب فی الأشعار و اللُّغات وَ الأمثال و نحوها، و کُنْتُ مُتَعَلِّماً عِنْدَهُ قُرْبَ ثلث سنینَ وَ أکْثَرَ وَ بعدَ وَفاته، لَمْ یَقُمْ مَقامَهُ واحدٌ مِنْ بَنیه کَما هُوَ الغالبُ فی الآبَاء وَ الابناء، فَعَرضَهُ واحدٌ مِنْهُم للْبیع، فَاشْتَریْتُهُ مِنْهُ بأکْثَرَ ممّا یُؤمِّلهُ فَهُوَ یَأخُذُ الثَّمَنَ کَأنَّهُ اللُّقَطَةُ، وَ أنَا أضبْطُ الثَّمَنَ کَأنَّهُ اللَّقیطُ، وَ للنّاسِ فیما یَعشقونَ مَذاهِبُ».

دواجار هێندێک کتێب و نامیلکەی ترم بە خەتی ئەو مامۆستایە دەسکەوت؛ وەکوو: «*مقامات حریری*»،

«*شرح هدایه*»ی قازی مەیبودی و «*خلاصةالحساب*»ی شێخی عامیلی کە مەلا عەبدوڵلا بۆخۆی بۆیان پەراوێزی داناوە و مێژووەکانیشی نووسیوە و دوایین ساڵی ١٢٦٣ ک. م. بووە.

مەلا عەبدوڵڵا جاروبارە شیعریشی گوتووە و لە پەنا هێندێک لاپەڕەکانی ئەو کتێبانە، بەپێی مەبەست و مانای نووسراوەکە، شیعریکی هۆنیوەتەوە؛ بۆ وێنە:

ز غمهایت دلم شد تنگ و ترسم — به دشواری در این جای تو باشد
دریغم آید ار بینم، نشیند — کسی آنجا که مأوای تو باشد
و یا بیگانه‌ای همسایه گردد — که زان، اسباب ایذای تو باشد

* * *

با کسی گفتم که تسعین یا که عشرین بایدت — گفت اول هست در ضمن دوم بی‌ارتیاب
گفتمش برعکس گفتی، گفت: آری، لیک دان — کانچه گفتم هست در ظاهر خطا، اما صواب

ئەمجار خۆی ئەم دوو بەیتەی ئاوا شرۆڤە کردووە:

مقصود از تسْعین و عِشرین عُقُود اَنامِل است که برای عشرین طرف عقد زیرین سبابه را بر پشت ناخن ابهام باید نهاد؛ چنانکه شکل حلقه‌ی مدور به هم رسد. و از برای تسعین سر ناخُن سبابه را بر مفصل عقد دوم ابهام باید چسباند؛ چنانکه شکلی پیدا کند کوچکتر و تنگتر از حلقه‌ای که از عشرین به هم رسیده بود. و اعراب گویند: «اضیقُ مِنْ حَلقة التّسعین» چه تسعین اضیق اعداد است و به همین جهت از حلقه‌ی دُبُر را نیز اراده کنند.

عەللامە مەلا عەبدوڵڵای تایی ساڵی ١٢٩٠ ک. م. هەر لەو دێیەدا لە دنیا دەرچووە.

لە کتێبی: *خاطرات و یادداشت‌های من.*

## بایەزیدی خانەگایی

حاجی سەید بایەزید، کوڕی سەید موحەممەد، لە سەیدەکانی گوندی خانەگای باشووری پاوە، مرۆیەکی هێژا و عارفێکی خاوەن کەرامەت و لە مریدانی موجازی شێخی تەریقەت، شێخ عوسمان سیراجەدینی تەوێڵێ بووە کە دەوری ساڵی ١٢٧٠ ک. م. لە دنیا چووە.

*یادی مەردان.*

## سەید عەلی خانەگایی

سەید عەلی یەکێکی تر لە ساداتی زانا و ئاگای خاوەن تەریقەتی مرید و موجازی شێخ عوسمان سیراجەدینە کە لە خانەگای لای پاوەدا ژیاوە و وەکوو ئەولیایەکی ئەو ڕۆژگارە ناوی لێ براوە و بە هۆی فراوانی پیت و کەراماتەوە، «سەید عەلی قوتب»ی پێ گوتراوە و لە دواییەکانی چەرخی سێزدەدا ئەمری

خوای بەجێ‌هێناوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## ڕەزا ئامیدی

عەلی، کوڕی ئەحمەدی ئامیدی (دیاربەکری)، نازناو «ڕەزا»، زانایەکی سۆفی مەشرەب وحەنەفی مەزهەب بووە کە بە منداڵی لەگەڵ بابیدا بۆ شاری «ئیکی» چووە و هەر لەوێ خوێندنی تەواو کردووە و لە ماوەیەکی کەمدا، لەبەر زەوق و لێهاتوویی سرشتی، لە شیعر و وێژەوانیدا، دەسەڵاتێکی باشی دەسکەوتووە و ساڵی ١٢٧١ ک. م. پاش ٩٥ ساڵ دنیای بەجێ هێشتووە.

ڕەزا ئامیدی دیوانێکی گەورەی دەوری بیستهەزار بەیتی بووە.

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٧٧٦.

## مەلا مستەفا چەمیاڵەیی

مەلا مستەفا لە گەورەپیاوانی زانست و عیرفانی ڕۆژگاری خۆیە کە ساڵانێکی زۆر لە قوتابخانەی کاشتەر، کاتی ژیانی شێخ غەفوور (؟-١٢٧٠ ک. م.)، دەرسی گوتووە و جێ ڕێز و متمانەی هەموو خەڵکی ئەو ناوچە بووە و هەروەها بە فەرمانی شێخ، ئەرکی بەڕێوەبردنی مزگەوت و خانەقای مەدرەسەی کاشتەری لە ئەستۆ گرتووە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## نالی

شاعیری بەناوبانگ، مەلا خدر، نازناو «نالی»، کوڕی ئەحمەد شاوەیسی ئاڵی (عەلی) بەگی میکاییلی، ساڵی ١٢١٥ ک. م. لە گوندی «خاکوخۆڵ»ی ناوچەی شارەزوور هاتە دنیا و کە پێ‌گەییشت، چووە قەرەداغ و ماوەیەک لە خزمەتی مەلا موحەممەد، کوڕی خەیات خوێندی دوای ئەوە لە سلێمانی لای مەلا عەبدوڵلای ڕەش درێژەی بە خوێندن دا و پاشان هێندێک لە سابلاغ (مەهابادی ئێستا) و سەرەتێک لە سنە فەقێتی کرد و پاش ساڵێک گەڕایەوە سلێمانی و ئیجازەی وەرگرت. ئەمجار چووە نێو ڕیزی مریدانی مەولانا خالیدەوە و سەردەمێک بە سەیر و سولووکی تەریقەتی نەقشبەندیوە خەریک بوو. ساڵی ١٢٥٠ ک. م. کەوتە گەڕان بە وڵاتە عەرەبییەکاندا و دوای بەجێ‌هێنانی حەج، ساڵی ١٢٥٥ گەیشتە ئەستەمبووڵ و بوو بە ئاودەنگی ئەحمەد پاشای بابان.

ئەحمەد پاشا، کە خۆی وێژەوان بووە و لە شیعر و شاعیریش سەری دەرچووە، هەلی ئاشنایەتی لەگەڵ

نالیدا بە پیرۆز زانیوە و زۆری ڕێز لێ ناوە و لەگەڵ دۆستانی زانا و ویژەوانی خۆیدا ئاشنای کردووە.

نالی سەرەنجام ساڵی ١٢٧٣ ک. م. لە ئەستەمبووڵ ئەمری خوای بەجێهێناوە و لە زیارەتانی ئەبووئەییووبی ئەنساری نێژراوە.

نالی لە ڕیزی بەرزترین شاعیرانی میژووی ئەدەبی کوردە کە سێ زبانی عەرەبی و فارسی و ترکیشی زانیوە و زیاد لە کوردی، بەو سێ زمانەش شیعری گوتووە. شیعرە کوردییەکانی نالی هەموو سۆرانین و لەوپەری ڕێکی و ڕەوانی و جوانیدا، سەرانسەر بە وردەکاری توێکڵی و کاکڵی (لەبز و مانا)، ڕازاونەتەوە.

نالی کاتی گەڕانەوەی لە سەفەری حیجاز، ماوەیەک لە شام لادەدا و هەر لەوێوە نامەیەک ڕەگەڵ قەسیدەیەکی کوردی بریتی لە ٣٣ بەیت، بۆ دۆستانی لە سلێمانی بەڕێ دەکا و لە بارودۆخی زێد و نیشتمانەکەی دەپرسێ و دەپرسێ ئاخۆ ئەوان چی بۆ بە ڕجوا دەزانن؟ بگەڕێتەوە، یان تا هەتایە هەڵوەدای وڵاتی بیانی بێ و چاو کەوتن بە نیشتمان و ئازیزان، لەبیر بچێتەوە؟ چەند بەیت لەو قەسیدە:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خوەش مورور وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور
ئایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە؟ یا مەسلەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی سوور؟
حاڵی بکە بە خوفیە کە ئەی یاری سەنگدڵ «نالی» لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور

لەو سەردەمە ئاوڕەحمان بەگی سالم لە سلێمانی بووە. نامە و شیعری نالی دەبینێ و لە وەرامیدا قەسیدەیەکی دوور و درێژ دەڵێ و برێک لە ناحەقیکاری و دەسدرێژی کارگێڕانی دەوڵەتی عوسمانی لە کوردستانی بۆ دەگێڕێتەوە و لە گەڕانەوە پەشیمانی دەکاتەوە.

ئەمەش چەند بەیت لە قەسیدەکەی سالم:

جانم فدایی سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر وەی پەیکی موستەعیدی هەموو ڕاهی پورخەتەر
ئەی میروەحەی جەماڵی مەهاسایی دڵبەران وەی شانەزەن بە کاکوڵی تورکانی سیمبەر
بۆ موڵکی شامە نامەیی مەن سووی نالییە هەر حەرفی ئەو لە وەزعی وڵایەت دەدا خەبەر
پرسیویە زاهیرەن لە ڕەفێقانی یەکجیهەت ئەحواڵی ئەهلی شار و ڕەفێقانی، سەربەسەر
لەو ساڵەوە کە حاکمی بابان بەدەرکران نەیدیوە کەس لە چهرەیی کەس جەوهەری هونەر
تا بوو بە جای مەتلەعی خورشیدی بەختی ڕۆم سووتا گیاه و تەشنە وخوشکیدە بوو سەمەر

تا دەگاتە ئەوێ ئێژێ:

تۆ خودا بڵێ بە حەزرەتی نالی دەخیلی بم بەم نەوعە قەت نەکا بە سلەیمانیا گوزەر
«سالم» سیفەت لە بێکەسیا با نەبێ هیلاک من کردم ئەو نەکا لە غەما خوێنی خوەی هەدەر

نالی لە دەورانی فەقێتی لە قەرەداغدا، ئەوینی ئاورینی کچەکوردێک بە ناوی «حەبیبە» ، دڵ و دەروونی دادەگرێ و هەست و نەستی بەرەو دنیای دڵبزوێنی خۆشەویستی ڕادەکێشێ و لەگەڵ خەم و تەمی دووری، ڕایدێنێ و شۆر

و شەوقی چاوپێکەوتنی پێ دەنوێنێ و وای لە کوورەی بەتین و تاوی عەشقی دڵداردا جار لە دووی جار دەیسووتێنێ و دیسان دەیحاوێنێتەوە، زەوقی سرشتی دەبزوێ و مانای جوان و ناسک لە دەروونیدا دەخولقێ و لە شیعر وەکوو زمانێک بۆ دەربڕینی ئەو کەش و هەوا تاوـتاوییەی دەروونی کەڵک وەردەگرێ و ڕازاوەترین بەرگی وشەی لەبەر مانا و کاکڵی هەستی دەروونی خۆی دەکا و شیعری وا دەهۆنێتەوە، سەری تێدا سوور بمێنێ.

سەرەنجامی ئەو ئەوینە پاک وخاوێنە دوو لایەنە، پێک گەیشتن و بە یەکتر شاد و شوکور بوون بووە. تاقمێک وایان گێڕاوەتەوە کە هێندەی پێ نەچووە حەبیبە کۆچی دوایی کردووە و نالی تا ماوە، ژنی تری نەخواستووە و لە هەندەران، بە داخی ئەو هاوسەرە جوانەمەرگەی تلاوەتەوە. ئەم سێ بەیتە، تا ڕادەیەک ئەو قسە دەسەلمێنێ:

هەتا تۆم ئاشنا بووی ئاشنا بوون ئەمێستا موو بە موو ئەغیارە بێ تۆ
لە لای من با وجوودی ناس و ئەجناس کەسی تێدا نییە ئەم شارە بێ تۆ
هەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەمساڵ تەمەنای مردنی پێرارە بێ تۆ

هێندێکیش دەڵێن ئەو دوو دڵدارە ئەویندارە ئەگەرچی زۆر پێکەوە ژیاون، بەڵام نالی بە هەموو گیانییەوە حەبیبەی خۆش ویستووە و پێ وەفادار بووە. زۆر جار دۆستانی بە تانەوە، پێیان گوتووە: سەیرە پیر بوون و هێشتا لەیەک تێر نەبوون!

نالی جوابی داوەتەوە: حەبیبە هێز و وازی منە بۆ شیعر گوتن و هاندەرمە بۆ شاعیر بوون؛ چۆن دەتوانم لە بیری بکەم؟

**ئەمەش چەند چەپکە ، لە گوڵزاری شیعری نالی**:

زوڵفت بە قەدتدا کە پەریشان و بڵاوە ئەمڕۆ لە منی شیفتە ئاڵۆز و بەداوە
بۆچی نەگریم سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی مەی بۆ نەڕژێ، شووشە لە سەدلاوە شکاوە
هەرچەند کە ڕووتم بە خودا مایلی ڕووتم بێبەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە
هەر جۆگە و جۆبارێ کەوا سوور و سوێر بێ جێ جۆششی گریانی منە، خوێنە ڕژاوە
بێفایدەیە مەنعی من ئێستاکە لە گریان بۆ عاشقی بێچارە زوو ئەم ئاوە ڕژاوە
سۆزی دڵمە باعیسی تاوی کوڵی گریان مەعلوومە کە ئاور سەبەبی جۆششی ئاوە
مانی نییەتی قووەتی تەسویری بڕۆی تۆ ئەم قەوسە بە دەستی موتەنەفیس نەکشاوە
«نالی» وەکوو زوڵفت کە موتیعی بەری پێتە تێکی مەشکێنە و بە جەفا مەیخەرە لاوە

* * *

عاشقی بێدڵ دەناڵێ مەیلی گریانی هەیە
بێشکە هەورەترشقە، تاوی بارانی هەیە
چاوی من دەمدەم دەڕێژێ ئاوی ساف و خوێنی گەش

تا بـڵێن دەریـایی عوممـان دوڕ و مـەرجانی هەیـە
لەحزەیەک و لەمحەیـەک چـاوم بـە چـاوی ناکـەوێ
کێ دەڵێ وەحشی غەزاڵـە مـەیلی ئینـسانی هەیـە
ئاسمانی حوسنی مـەحبووبم لـە ئـەبرۆ زولـف و ڕوو
دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابـانی هەیـە
هەر لەبت یا سینەشت هـەر دوو بەدەرخـە تـا بـڵێن
لەعلی ڕوممانی هەیە یا لەعل و ڕوممـانی هەیـە
دڵ موشەببەک بوو لەبەر ئێـشانی نێـشانی مـوژەت
حەیفە قوربان ئاخر ئـەم نیـشانەیـە شـانی هەیـە
پەرچـــەمی ڕوو دادەپۆشـــێ، پێچـــی زولفـــی پێچەیـــە
تا بە ڕۆژیش پـێ بـڵێن شـەمعی شەبـستانی هەیـە
تۆ ئەگەر هەستی لە جێ ڕاوەستی، دەهری و کافریش
دێن ئەڵێن بێشەک قیامەت ڕاسـتە هەسـتانی هەیـە
فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بە دەفتـەر گرتـووە
«نالی» ئەمڕۆ حاکمی سێموڵـکە، دیـوانی هەیـە

* * *

ئـــەی تازەجـــەوان! پـــیرم و ئوفتـــادە و کـــەوتووم — تـا مـاوە حـەیاتم
دەستێ بـدەرە دەسـتی شکەسـتەم کـە لـە دەس چـووم — قوربـانی وەفـاتم
تـــۆ یۆســـفی نەوحوســـنی لـــەســـەر میـــسری جـــەنانی — مـن پـیرم و فـانی
لـــەم کولبـــەیی ئەحزانـــە، نـــە زینـــدووم و نـــە مـــردووم — هـەروا بـە تـەماتم
فـــەرقێکی نـــەکرد نـــەفـــسی نـــەفیـــسم بـــە عنایـــەت — وەحشی لە ویلایەت
لـــەم گۆشـــەیی ویرانەیـــە هـــەر مامـــەوە وەک بـــووم — وەیـشوومی وەلاتم
ئـــەی قوببـــەیی تەیبـــە کـــە دەڵـــێی حوققـــەیی تـــیبی — مـەئوایی حـەبیبی
مـــــسکینم و بـــــەو خاکـــــە عەترناکـــــەوە هـــــاتووم — بـەو بۆنـەوە هـاتم
موددەیکـــە کـــە هـــەمگەردشـــی دەورانی ســـپیهرم — موغبەر بووە میهرم
ئاوێنـــــەیی دڵ شـــــاهیدە هەرچەنـــــد ســـــیەهڕووم — میرئـاتی جـەلاتم
هەرچەنـــد کـــە مـــن عەبـــدم و ڕووزەردم و عاســـیم — مەئموولە خەلاسیم
قوبـــــانی بـــــیلالم کـــــە بیلالانـــــە هـــــەلاتووم — هەر عەفوە خەلاتم

ئـــەی مەســـجد و میرابگـــەهت قیبلـــەیی حاجـــات بۆ ئەهلی موناجـات
مــەحجووبی هــەوام و ئەمەتــە مــەشــهەدی مــەعلووم بــۆ ڕاهــی نــەجاتم
ئـــەی مەتلـــەعی ئـــەنواری هـــەموو قاســـی و دانی شەمسی سەمەدانی
وەک زەڕڕەیـی بـێجیلـوە نـە مـەوجوود و نـە مەعـدووم جوویـــایی بـــەراتم
لـــەم خـــاکی دەری ڕەحمـــەتی بـــێزەحمەتـــە «نـــالی» فیردەوسە مـەئالی
حاشـــا کـــە لـــە مێـــدا ببمـــە ســـائیلی مـــەحرووم هەرچەن لە عوساتم

* * *

خەتات فەرموو کە خۆشە چین و مـاچین کە ناچین لەیرە، خۆشـەچینی مـاچین
بڕۆت هەر چین و پەرچەم چین لەسەر چین ئەمەندە چینە قوربان، پێم بڵێ چـین؟
لەسەر بەرگی گوڵێکی بـاغی حوسـنت هەزار گوڵچینی بێبەرگ و نـەوا چـین
ئـەتو میهریـی و مەهـڕوویان سـتارەن لە خدمەت شەوقی تۆدا، شەوچرا چین
بڵێ «نـالی» بـە ئـەربابی وەفـا و بـەین هەموو موحتاجی خاک و بێڵ و پاچین

* * *

هەرچەند کە عومری خدر و جامیجەمت بوو چونکە ئەمەلت زۆرە چ عـومرێکی کـەمت بـوو
ئەی جامعی دونیا و قیامەت بـە خـەیاڵات ئەو ڕۆژە کە مردی نە ئەوت بوو، نە ئـەمت بـوو
بێزارە لە تو ئێستە، هەماغووشـی عەدووتـە دونیا کە دوێنـێ حـەرەمی موحتـەرەمت بـوو
عومرت نەفەسێکی لە هەموو عالەمی دێنـا بمرە لە غەمیدا، کە هەموو سەرفی غەمت بـوو
«نالی» چییە وا میسلی جوعەل غەرقی شـیاکەی؟ خۆ تۆ بە حیسابی وەکوو پەروانـە شـەمت بـوو

**غەزەلێکی فارسی**:

اَبـــروان تـــو طبیبـــان دل‌افگارانـــند هـر دو پیوسـته از آن بـر سـر بیمارانـند[1]
گنج رُخسار تـو دیـدن نبـود زهـره مـرا که ز زُلف تـو بـر آن خُفتـه سیه‌مارانـند
ما هزاران ز غَمَـت خسته و ناکـام، ولـی کامیاب از گُل روی تو خَس و خارانـند
بر سر کُوی خود از گریه مکن منع مَـرا زانکــه گلهــای چمــن مُنتظــر یارانـــند
نرگسان تو که خواب همـه عـالم بـستند خُفتگانــــد ولـــی رهـــزن بیدارانـــند
نه تو تهنـا بـه غـم عـشق دچـاری «نـالی» هرکجـا مـی‌نگـری، جمـع گرفتارانـند

*دیوانی نالی*، چاپی بەغدا، ١٩٧٦ ز. *مێژووی ئەدەبی کوردی*، ل ٢١٤.

---

١. لە ژیننامەی «*روز روشن*»دا، ئەم غەزەلە بە هی «رموزی سَبزواری» ناوی لێ براوە.

## میرزا موحەممەدی ڕازنووس

میرزا موحەممەدی ڕواندزی، ناسراو بە ڕازنووس، ئینشابەندی تایبەتی میر موحەممەدی ڕواندز (میرەگەورە، ١١٩٨-١٢٧٢ ک. م.)، مرۆیەکی زانا و شاعیرێکی توانا بووە کە زیاد لە کوردی، فارسی و ترکی و عەرەبیشی زانیوە و تا دواییەکانی چەرخی سێزدەی کۆچی ژیاوە.

میرزا موحەممەد کتێبێکی لەمەڕ ڕووداوانی هەر لە سەرەتای دەورانی میرایەتی میرەگەورەوە تا ئاخری دەورانی ڕەسووڵ پاشای ڕواندزی، واتا لە ساڵی ١٢٢٩ تا ١٢٥٢ ک. م. بە زبانی فارسی هۆنیوەتەوە و «*مەلیخا*»ی ناو ناوە. زانای بەناوبانگی کورد، حوسەین حوزنی موکوریانی، بۆ نووسینی کتێبی «*مێژووی میرانی سۆران*»، لەو کتێبە بەهرەی بردووە.

*مێژووی میرانی سۆران.*

## شێخ موحەممەد وەسیمی مەردۆخی (دووەم)

کوڕی حاجی شێخ موحەممەد سەعید، کوڕی شێخ ئەحمەدی دووەمی مەردۆخی، ساڵی ١٢١٩ ک. م. لە سنە هاتۆتە دنیا و ١٢٧٥ هەر لەو شارە لە دنیا چووە.

شێخ موحەممەد وەسیم زانایەک بووە شارەزای حیکمەت و کەلام و فەلسەفە کە ژیانی بە تۆژینەوە و دەرس‌گوتنەوە تێپەڕ کردووە و لەوپەڕی پارێزکاری و بەرزەخۆیی و دڵکامیدا ژیاوە.

بەرهەمەکانی: زۆرێک نامیلکەی لە سەلماندنی «واجب» و «نبوت خاصه» و «مَعاد» نووسیوە و هێندێک پەراوێزی بۆ «*شرح تذهیب الکلام*»ی شێخ موهاجیری برای داناوە؛ کە پێکەوە لە قاهیرە چاپ کراون. کتێبێکی بە ناوی «*الحکمه الجدیده الادریسّیه*» کە ساڵی ١٢٦٠ ک. م. نووسیوە و تێدا شیعری فارسی و عەرەبی خۆی هێناوە. ئەم سێ بەیتە، لەو کتێبەن:

گرنبودی خلق محبوس زمان 		ور نبودی حلقها بسته زبان
بی‌زبان و حلق و بی‌صوت چنین 		نالەای سر کردمی، حَقُّ الیقین
تا از آن سرّ زمان گشتی عیان 		کان نگنجد در زمین و آسمان

لە شیعرە عەرەبییەکانی شێخ وەسیم، ئەم دوو بەیتە بە خەتی خۆی لە پەراوێزی دەسنووسێکی«*شرح عُقُود الجُمان*»ی شێخی سیوتیدا نووسراوە و پێشەکی ئەم ڕستەیە گوتووە:

وَ قَد قُلْتُ فی قَومٍ جابرینَ أصابَهُمُ الدَّهرُ:

رَأیْتُ قَوْماً عَلَوْا فی‌الارض مُفسَدَةً 		و کانَ قَدْ بُدِّلَتْ سوأً محاسنُهُم
و یَظْلمُونَ بَغَیْرِ الحَقّ، قَد ظُلمُوا 		«فَأصبَحُوا لا یُری الا مساکنُهُم»

*تاریخچەی خاندان مَردوخ.*

## عومەر ئەفەندی خێلانی

حاجی عومەر ئەفەندی، کوڕی ئەحمەد، سەر بە هۆزی خێلانی، لە زانایان و مامۆستایانی گەورەی کوردستانە کە لە ڕواندز دانیشتووە و ژیانی بە دەرس‌گوتنەوە و بەهرە گەیاندن ڕابواردووە و دەوری ساڵی ١٢٧٥ ک. م. لە دنیا چووە.

عومەر ئەفەندی قوتابی ئەبووبەکر ئەفەندی یەکەمی هەولێری (دەوری ١٢٥٠ ک. م.) و مامۆستای عومەر ئەفەندی هەولێری (١٣٠٩ ک. م.) بووە.

*عُلَماونا فی خدمة العلم و الدّین*، ل٤٠٩. یاداشتەکانی نووسەر.

## شێخ مەحموودی نەقیب

شێخ مەحموودی «نَقیبُ‌الاشراف»، کوڕی سەید موحەممەد، لە سەیدەکانی گڵەزەردەی بەرزنجەیە کە ساڵی ١٢٠٠ ک. م. لە سلێمانی هاتۆتە دنیا و ١٢٧٥ لە دنیا دەچووە.

شێخ مەحموود لای عەللامە شێخ مەعرووفی نۆدێی خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە و ئەوجار لە شاری سلێمانی، ئیرشاد و ڕێنوێنی خەڵک و سەرپەرشتی سەیدەکانی لە ئەستۆ گرتووە و لە پیاوانی بەڕێز و لێهاتووی ڕۆژگاری خۆی، بۆ جێبەجێ کردنی گیر و گرفتی مەردم بووە.

*عُلَماونا فی خدمة العلم و الدّین*، ل٥٥٤.

## حەیدەری سنەیی

مەلا حەیدەری نازناو «حەیدەر»، پارسایەکی هێژا و گۆشەگیر، لە شیعر و وێژەوانیدا سەردەرچووە، عومری بە عیبادەت و پارێزکاری بردۆتە سەر و ڕێگای ئامۆژگاری و ڕێنوێنی خەڵکی گرتۆتە بەر.

ڕەونەق لە ژینامەکەیدا زۆری پەسن داوە و وەک ئەو دەڵێ، دیوانێکی داناوە لە هەمووشێوە شیعرێک، لە غەزەل و چوارینە و قەسیدە و لە سەرینەی ئەوەش کتێبێکی بە شێوازی مەسنەوی مەولانای ڕۆمی، هۆنیوەتەوە بریتی لە باسی دینی و ئاکاری و عیرفانی، کە ئەوا چەند بەیتی:

ذکر، آن نبود به تقریر و بیان　　یادگیری از فلان بن فلان
ذکر، آن باشد که عشق ذوالجلال　　با تو گوید بی‌زبان و قیل و قال
ذکر بیچون همچو او بیچون بود　　وز حروف و صوت ما بیرون بود

* * *

جُمله بُتها را شکسته چون خلیل　　رَسته از قید قیاسات و دلیل



ذات جویــــــد از ورا ثُــــــمالــــــورا
وحـــدت انـــدر کثـــرتش نبـــود روا

مطلـب آن باشـد کـه ایمـانی بـه غَیـب
حاصـل آیـد خـالی از تقلیـد و ریـب

عـــشق پیغـــام خـــدا را ســـوی جـــان
بُـــرد تـــا شـــد جانـــب قالـــب روان

مُمکنـی، کـی سـوی واجـب پَـی بـری
مَـــر بـــه بـــال عـــشق او آنچـــا پـــری

عـشق را راهـی اسـت پُـر خـوف وخطـر
کـس نـدارد غیـر عـشق آنجـا گـذر

عـــشق، احمـــد بُـــرد انـــدر لامکـــان
تـــا بـــه اَوْ اَدنـــی رســـانیدش نـــشان

عـشق بتوانـد کـه در پـردەی صـفات
بگـــذرد تـــا بارگـــاه خـــاص ذات

چـون خـدا انـدر ملـك عـشقی ندیـد
آمـــــد و از غیـــــرت آدم آفریـــــد

مظهـر جملـەی صـفات خـویش کـرد
عاشـق محـرم بـه ذات خـویش کـرد

جلـوه‌گـر شـد در دل او عـشق ذات
مَحـو شـد سـر تـا قـدم انـدر صـفات

چـون حـضورت دائـم و کامـل شـود
وصـــف بیچـــونی از او حاصـــل شـــود

ذکـر بیچـون را کُنـد بـی‌کیـف و کـم
بـی‌حـروف و صـوت و بـی‌نقـش قلـم

ذکـــر بیچـــون غیـــر بیچـــون ای فتـــا
چـــون توانـــد آورد آن را بـــه جـــا

چـون شـدی محـرم بـه اَسـرار خـدا
بـــشنوی مـــر ذکـــر بیچـــون را صـــدا

نـــه بـــود آن داخـــل و نـــه مُنْفَـــصل
نـــه بـــود آن خـــارج و نـــه متّـــصل

آن صـــدا چـــه بـــوَد تَجَلـــیُّ الکـــلام
گفتمـــت رَمـــزی و بـــاقی وَالـــسَّلام

*حدیقەی امان‌اللهی*، ل٢٦٦.

## غەریبی دونبولی

عەلی، کوڕی موحەممەد، کوڕی عەبدوڕڕەززاقی دونبولی، یـەک لـە زانایـانی کۆتـایی چـەرخی سـێزدەی کۆچییە، لە کوردانی بنەماڵەی دونبولی خۆی و ماکۆ کە خوێندنی لە دارولفونوونی تاران تەواو کرد و پاشان چووە مەدرەسەی نیزام و ساڵی ١٢٧٥ ک. م. لە ڕیزی قوتابیانی ئێرانی کە بە سەرپەرشتی ئـەمیر نیزامـی گەڕووسی بۆ فەڕانسەیان ناردن، گەیشتە پاریس و پاش وەرگرتنی پـسپۆڕی، گەڕایـەوە ئێـران و خزمـەتی کرد.

**کتێبەکانی**: یەک، لەمەڕ چۆناوچۆنی بارودۆخ و پێشرەوتی وڵاتە ئورووپاییەکانـەوە و دوو، وەرگێـڕانی کتێبێک فەڕانسی لە بارەی شەڕی بریتانیا و فەڕانسە لەگەڵ چیندا، بە فارسی.

عەلی دونبولی شیعریشی گوتووە و نازناوی «غەریب» بووە؛ بەڵام شیعرەکانی هـەموو ڕەق و بـێ‌ڕۆحـن. ئـەوا نموونەیەکی:

بـه طریقـی کـه بکنـدی تـو مـرا بنیـادم          تـا دم وحـشت محـشر نـرود از یـادم
مُـرغ دل در هـوس دام تـو دائـم گویـد          ای بسا حیف که بی‌دوست چنین آزادم
از غمت ناله‌ی دلسوز چنـان سـر بـدهم          کاسـمان لـرزه کنـد از اثـر فریـادم
پـیش آه مـن غمدیـده نبایـد گویـد          عاشق خسته‌ی شیرین که من آن فرهادم

*دانشمندان آذربایجان*، تاران، ل٢٨٥.

## خالسی تاڵەبانی

عارفی ڕەببانی، حاجی شێخ ئەوڕەحمانی تاڵەبانی، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی مەلا مەحموودی زەنگەنـە، لە شێخانی ناوداری تەریقەتی قادرییە کە لە شاری کەرکووکدا ژیاوە و تەکیە و خانەقای بووە و ساڵی ١٢٧٥ ک. م. لە دنیا چووە.

مەولەوی تاوەگۆزی بۆ مێژووی مەرگی دەڵێ:

دڵ پەی تاریخ وات بە دەم دەردەوە          «ای وای وێ دنیاش تاریک کَردَوە»[١]

حاجی شێخ عەبدوڕڕەحمان، لە سەرینەی تەریقەت، پیاوێکی زانا و وێـژەوانیش بـووە و چەنـد کتێـب و نامیلکەی لێ بەجێماوە؛ بۆ وێنە: «*بهجة الاسرار*»، کە شەرحێکە بە شیعری فارسـی لەسـەر هـەژدە بـەیتی سەرەتای مەسنەوی مەولانای ڕۆمی، کە ساڵی ١٣٤٩ ک. هـ. )١٩٧٠ ز.) لە تەورێز چاپ کراوە. ئەم هۆنراوە پێـشەکییەکی بـە پەخـشانی بـۆ نووسـراوە و پاشـان شـەرحی بەیتـەکانی هـەر لەسـەر کێـشی خۆیـان دەسپێکردووە.

نازناوی شێخ «خالس» بووە و دیوانێکی بە فارسی و عەرەبی و ترکی لێ بەجێماوە.

ئەم غەزەلە فارسییە هی ئەوە:

باز شـیدا شـدم از عـشق رخ لـب سـمنی          فتنه‌ای، عشوه گری، نازک سیمین بـدنی
نوجوان سروقدی، ماهرُخی کبکِ خـرام          آفتـی، عربـده‌جـویی،دل عـالم شـکنی
چـشم آهـو نگهـی، زُلـف شَـبَه مانـندی          شـمع هـر مُجتمعـی، شـاهد هـر انجمنـی
گفتمش چیست بهای لبت ای جـان جهـان          گفت: جز دادن جـان هـیچ نـدارد ثَمَنـی
«خالـصا» وصـل چنـین شـاهد زیبـا نبـود          با چنین عشق، سزاوار کسی همچـو منـی

ئەم شیعرە عەرەبییەشی ساڵی ١٢٧٠ ک. م. بـۆ مـەرگی عەللامـە سـەید مـەحموودی ئالووسـی‌زادەی بەغدایی، خاوەن تەفسیری «*روح‌المعانی*» نووسیوە:

١. لەبەر دەرهاتنی بە حیسابی ئەبجەد، دەبێ وا بنووسرێ کە دەکاتە: ١٢٧٥.

یــا قبــر محمــود لا جازَتْــكَ غــادیَــةٌ تَــسْقی ثــراكَ بــصَوْب غَیْرمحــدود
لَقَــد فَقَــدْتُ بــكَ المعــروفَ أجْمَعَــهُ یــا خیــر مَــنْ راحَ مَفقُــوداً لموْجُــود
أبْكیــكَ و الحَــقُّ أنْ أبكــی عَلیــكَ دَمــاً بمَــدْمَع فَــوْقَ خَــدّ ذات أُخْــدُود
فَلَــیْسَ بَعْــدَك عَــیْشٌ مــا أسَــرُّ بــه مــا العــیشُ مــنْ بَعــد محمــود بمحمــود
أیّــامُكُمُ كانــت الاعیــاد تُــذْكرُنا فَلَــمْ تَــرُقُ بَعْــدَكُمْ لــی طَلْعَــةُ العیــد

*هدیةالعارفین*، ب١، ل٥٥٨. *دیوان خالص*. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل١٢.

## جەودەت

دوکتور عەبدوڵا جەودەت، زانایەکی ئاگا و بژیشکێکی توانا بووە کە لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی (١٧٢٥-١٧٨٩ ز.) لە ئەستەمبووڵدا ژیاوە و لەو شارە مەحکەمەی داناوە و نەخۆشانی دەرمان کردووە.

دوکتور جەودەت بە هاوقۆڵی تاقمێک لە ڕۆشنبیرانی کورد و ترک ـکە لە زڵم و زۆری بابی عالی، گەیشتبووە گیانیان ـ بە نیازی هەڵپێچاندنەوەی دام دەزگای سوڵتانی و ڕزگار کردنی خەڵک، کەوتنە شەونامە بڵاو کردنەوە و کۆڕگرتنی نهێنی و خەریک بوو کاریان زیاتر پەرە بستێنێ کە پێیانیان زانی و لێیان وەخۆ کەوتن، بڕێکیان لێ گرتن و تاقمێکیشیان بۆ دوورەدەست تەرە کردن و دوکتور جەودەت خرایە ترابلوس.

پاش ماوەیەک جەودت هەڵات و خۆی گەیاندە میسر و لە قاهیرە مەتەبێکی دانا و دوای ماوەیەک لەگەڵ ئازادیخوازانی عەرەبدا دیسانەکە دژی ترکان خەباتێکی تازەی دەسپێکرد.

جەودەت تا ساڵی ١٢٧٢ ک. م. لە قاهیرە مایەوە و هەروەها تا داوابیەکانی چەرخی سێزدە ژیا.

**لە نووسراوەکانی**: وەرگێڕاوەی «*مەکبێس*» بە عەرەبی، «*شایلون*» بە ترکی، «حکومت و ادبیّات»، «*حفظ صحت دماغ و ملکات عقلّیە*»، «*استبداد*»، «*ژوولیوس سیزار*»، «*روحُ‌الاقدام*» بە عەرەبی، سەرجەمی شیعرەکانی و ...

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٤٦.

## کەلهوڕی کرماشانی

موحەممەد حوسەینی کەلوڕی کرماشانی، شاعیرێکی خۆش زەوق و گفتڕەوان و هەروەها زۆر پارێزکار و بێمبالات بە دنیا بووە و بۆ گەیشتن بە ڕەزای حەق، زۆری عیبادەت کردووە و ڕیازەت کێشاوە و زۆربەی ڕۆژان، ڕۆژووی گرتووە.

ساڵی زا و مەرگی کەلهوڕ نازانین؛ بەڵام دەزانین هاوچەرخی ڕەزاقولی خانی هیدایەتە (؟-١٢٨٨ ک. م.)

کە وابوو، لە نیوەی دووهەمی چەرخی سێزدەدا ژیاوە و پاش بەجێهێشتنی کرماشان، چۆتـە تـاران و هـەر لەوێ کۆچی یەکجاری کردووە.

ئەمەش بەشێک لە قەسیدەیەکی کەلهوڕ:

وزیـد بـاد بهـاری و شـد خـزان بـر بـاد — ز فـیض نامیـه شـد سـاحت جهـان آبـاد
عَرَق‌فشان شد همچون جبین مَـریم، ابـر — روانفـزا شـد همچـون دم مـسیحا، بـاد
رسید موسم آن کـز وصـال گـُل، هـردم — ز بلـبلان چَمَـن بـر فَلَـک رسـد فریـاد
بهـار آمـد و از طـرح انبـساط و نـشاط — بـسیط روی زمـین را بـساطها بنهـاد
به نالەی نی مُطرب، به بانگ دف بـا هـم — خـوریم بـادەی گُلرنـگ هرچـه بادابـاد
خَطاست گر ننشینی به طرف بُستان خـوش — رواست گر بخرامی سوی گلـستان شـاد
سحاب اشک‌فشان شد چو عاشقان به چمن — چنانکه غُنچه هم از گریه لب به خنده گشاد
ز نفخـەی دم روح‌الامـین بـاد صـبا — ببین کـه گُلبن مـریم ز گُـل مـسیحا زاد
ز بس که جوی روانی چو اشک وامق دید — ز بس کـه بـاغ نـشان از عُـذار عـذار داد
دمیـد لالـه بـه آیـین چهـرەی شـیرین — چکیـد ژالـه بـهماننـد گریـەی فرهـاد
چو گُل نموده گریبان غُصه هردم چاک — چو سـرو گـشته جهـانی ز قیـد غـم آزاد

تا لە کۆتاییدا بە جێپەسنەکەی خۆی دەڵێ:

ثنـای او نتـوانی خمـوش شـو «کلهـر» — بـر آر دسـت دعـا سـوی کردگـار عبـاد
بساط تاک شود تـا کـه از خـزان ویـران — بـسیط خـاک شـود تـا کـه از بهـار آبـاد
مُخالف تو چـو اوراق آن ز محنـت زرد — مَؤالف تو چون اَطباق آن ز عشرت شـاد

*تذکرەی شُعرای کرمانشاه*، ل٩٦ و ٩٧.

## خەستەی خانەگایی

شێخ عەبدولکەریم لـە سـەیدەکانی خانـەگای باشـووری پاوەیـە؛ شـاعیرێکی هێـژا و ئاگـا بـووە، زۆربـەی شیعرەکانی بە کوردی هەورامی گوتووە و نازناوی «خەستە»ی هەڵبژاردووە.

خەستە تا ئاخر و ئۆخری چەرخی سێزدەی کۆچی ژیاوە.

**چەند شیعری خەستە:**

چراخ! ڕیش نـەبۆ، چـراخ! ڕیـش نـەبۆ — هەر سەرێ وەدەرد سەودات ڕێش نەبۆ
خـاترێ وە نـێش تـۆ پـڕ ئـێش نـەبـۆ — وە ڕووی دونیـاوە ڕاحـەت پـێش نـەبۆ
دیـدەی نـەڕژیۆ وە سـورمەی پـالآت — نەکـەرۆ سـەیران نـەوتوول بـالآت

| | |
|---|---|
| تێش نیشۆ مەودای پەیکان ژاراو | لێش حەرام بۆ خاو، جێش تکیۆ زووخاو |
| سیابۆ چوون سەنگ ماندەی هەواران | خەستە بۆ وەدەرد پەی دووری یاران |
| دەستێ نەگێلۆ نە سینەی سافت | چنگ نەدۆ نە چین مشکین کلافت، |
| وە تیغ پڕ زام پارەـپارە بۆ | ئاوێزان وە چنگ پای قەنارە بۆ |
| ڕێزەـڕێزە بۆ تواناش کەم بۆ | دوساخ پاوەند زەنجیر خەم بۆ |
| ساکە دووری تۆ ئاهر وست نە دڵ | دەست هۆرگرت نە «خەستەی» خار وچڵ |

* * *

| | |
|---|---|
| چراخم! ناشاد، چراخم! ناشاد | تاوە موژدەی مەرگ دڵ نەبۆ ناشاد، |
| تا کە هیجرانت نەکێشۆ جەورم | تا یاسین وانان نەگیران دەورم |
| تا دیدە نەشۆ چەنێ باڵا سەر | نە گێلۆ پەی من زایڵەی چەمەر |
| تا یاران پەرێم نەکیشان فەریاد | شەرت بۆ مەیل تۆ نەدەروون وەباد |
| تا پێم نەوانان ئایەی وادەی مەرگ | تا بەر ناوەران نەتۆی جامە و بەرگ |
| تا کە مەردەشۆر، نەشۆرۆم بەدەن | نەپێچامەوە وە تۆتۆی کەفەن |
| نە نیام وە تابووت وە هەیداد هەیداد | شەرت بۆ مەیل تۆ نەدەروون وە باد |
| تا کە دڵسۆزان تەرمم نەوەران | وە سەرای گڵکوم داخڵ نەکەران |
| تا کە نەنیانیم نە تۆی یانەی تۆ | دڵ پڕ ئاخ و داخ دووری دیدەی تۆ |
| نەپۆشان وەسەنگ، بەرکەرام جە یاد | شەرت بۆ مەیل تو نەدەروون وەباد |
| تا کە نەڕێزان وسەر قەبرم خاک | تا نەوەزانیم یانەی تەنگ و تاک |
| تا خەستەی دەردت قاڵبش یەکسەر | نەدریۆ جە یۆ، نەو یانەی خەتەر |
| تا کە گۆشت و پۆس، مەغز و ئیستخوان | چەنی خاک و خۆڵ ئامێتە نەوان |
| تا «خەستە»ت سفتەی نار و نوور نەبۆ | شەرت بۆ مەیل تۆ جەلام دوور نەبۆ |
| تا مووران نەوان وەزیزم دڵشاد | شەرت بۆ مەیل تۆ نەدەروون وەباد |

* * *

| | |
|---|---|
| چراخم! دیدەت، چراخم! دیدەت | سەوگەند وە سورمەی دەوران دیدەت |
| وە ئەبرۆی وێنەی باڵام خەمیدەت | یاخۆ چوون هیلال حەق ئافەریدەت |
| وە زوڵف سیای پڕچین و لوولت | وە باڵاچوون سەوڵ ڕەند نەوتوولت |
| وە گۆنای چوون شمم شەوانئەفرۆزت | وە کرشمە و ناز عاشقان سۆزت |
| وە پەنجەی نازک حەنایی ڕەنگت | وە دیدەی مەخموور سیای سێوەنگت |

وە نگـــای ناگـــای وادەکـــەی جـــاران
وە جیلــوەی بــالآت لــە دەر و بانــان

ئەر «خەســتە» بــێ تــۆ شـادی بوریـارۆ
خوداوەنــد بــالآش وە گــڵ بــسپارۆ

* * *

ڕوخسارش ڕەونەق ڕوبع مەسـکوون دا
جێران حەیران مەند، شـی وەهاموونـدا

وەنەوشە سوجدەی خاڵش فەرز کـەردەن
جەو بۆنە مودام کەچکەردەن، گـەردەن

**غەزەلێکی فارسی لە خەستە**:

از درد چـه شـبها کـه بخوانـدیم خـدا را
دردا که در این عهـد اثـر نیـست دُعـا را

یــک ذَرِّه ندادنــد بــه خورشــیدعذاران
آن روز کـــه تقـــسیم نمودنـــد، وفـــا را

پـیش از تـو بـسی بـود جفاکـار ولـیکن
کس چون تو درآفاق نزد کُوس جفـا را

زنجیر سر زُلف تو پیوسـته بـه هـر مـوی
صـد سلـسله در پـای نهـد بـاد صـبا را

شد رانده ز خاک در تو «خسته»ی مـسکین
شـــاهان ز در خـــویش نراننـــد گـــدا را

چەند بەیاز و جونگی دەسنووس.

## داخی

شێخ عەبدوڵلا، نازناو «داخی»، خەڵکی گوندی «قەلاتەبێزان»، مرۆیەکی زانا و شاعیرێکی توانای هاو چـەرخی مەولەوی تاوەگۆزی بووە و زۆر جاران شیعریان پێکەوە گۆڕیوەتەوە. ئەم پارچە شیعرە، داخـی بـۆ مەولـەوی ناردووە و تێدا ئەوی لەگەڵ تاقمێک لە شاعیرانی تر ـکە ناویان دەباــ هەڵـسەنگاندووە و ئـەمی لـە سـەرتر داناوە و بۆ سەلماندنی قسەکەی، چەند بەیتێکی مەولەوی هێناوەتەوە:

دڵــە! بــا وەس بــۆ، دڵــە! بــا وەس بــۆ
هوشیار بە! وادەی مەسـتیت بـا وەس بـۆ

زەمامـت بـا وەس وەدەس هـەوەس بـۆ
وەس فامت نە فیکر کەردەی عەبەس بـۆ

بـــا وەس خەیاڵـــت خـــەیاڵ خـــاڵ بـــۆ
وەس حاڵت پەی زوڵف سـیاوان تـاڵ بـۆ

وەس وە تەمای وەسـڵ نـازک نـەوهاڵان
ســـەرمایەی عـــومرت بـــدەر وە تـــاڵان

بدیە هامفەردان! هامدەردان! هامەشـق!
نازکخەیـاڵان! دەروون دەریـای عەشـق

هـــەریـــەک وە تـــەمای نەوهاڵـــێکەوە
وە پـــەژارەی خـــاڵ لای لاڵـــێکەوە

گــردین بــەو خــەیاڵ نــازک کــەردەوە
بـــەو بـــار فـــیراق ئەنـــدووە وەردەوە

مەزەی بـادەی نـاب حـەقیقی چەشـتەن
نەی وارگـەی پڕشـۆر وە ناکـام وەشـتەن

خاڵــی بــێیاگــەی نــازکخــەیاڵان
بێمەدداح مەندەی نـەو نوختـەی خـاڵان

مەیخانــە خاڵــی، مــەیخوازان بــێشــەوق
بادەکــەش ماتــەم، بــادەنۆش بــێزەوق

زیـــاد جـــه گـــردین شـــای سینەســـافان
مەخدومی «مەعـدووم»، مەولـەوی جافـان
جـــــادار ڕەویــــەی «بێـــسارانی» بـــێ
ســاحیب تەریکــەی «هــادی ژانی» بــێ
ئەشـــعار «یۆســـف» ئـــەبیات «خانـــا»
جـه خـەیاڵ خاسـیش وە هـیچ مـەنمانا
فەردوەش مـەزموون «مەڵاکـەی گـۆران»
ئـــەبیات «تورکـــە»ی مـــەدداح بـــۆران
وادەی موناجـــات «قاضـــیٴالحاجـــات»
وە کزەی دەرووی سیدق دڵ هـەر سـات
ئەی دانەی نەفیس شەففافتـەر جـە لاڵ
مەسفت وە قەڵـەم سـەر نـووک خـەیاڵ
«یـا جـە گونـای مـن کـەرەم ئاوانتـەر
ڕەحمـت جــە تـاوان مـن فەراوانتـەر»
«هـــەر تـــۆنی وە تـــاق، دانـــا و تـــەوانا
تـۆم هـەنی، هـەنێ وە کـێم بـۆ هانـا»
نـە فەسـڵ فـیراق وە سـەد زاری و دەرد
ئـەی لاڵـە نـە گـەنج خـاتر بـەرماوەرد
«مـن شـەوی ناڵـەم جـۆش ئـاوەردە بـۆ
سـەگ ئاسـانەکەت بێـدار کـەردە بـۆ»
«یاناسـتە بـۆ سـەیل دیـدەم نـەفەسـی
نـەسـیم گـەرد ڕات بـەرۆ پـەی کەسـی»
«جـــەمینت زەحمـــەت نگـــام کێـــشابۆ
کـــەف پـــات وەخـــار مـــوژەم ئێـــشابۆ»
بدیـــە مەولـــەوی، وەی خەیاڵـــەوە
وەی گـشت جـەواهیر دانـەی لاڵـەوە
ئینـسافەن وەسـەن هـەرزەی بـێمایـە
وەس عـومرت وەی تـەور بـدەر وە زایـە
بێبەدەڵن عـومر خاسـەش هـەر پاسـەن
باختش پەی مەعشووق بێبەدەڵ خاسەن

ئەمەش شیعرێکی تر کە لە جوابی مەولەویدا هۆنیویەتەوە:

تەسکینبەخش دەرد «داخی»، داخ نـەدڵ
دامان وە هووناو ڕیشەی دڵ گوڵ‌گـوڵ
یەک ڕۆ چەم نە چەم گرەو بـەردە بـێ
سـەیل خـەم یانـەم وێـران کـەردەبـێ
نیشتەبیم چوون تەیر دوور وامەندەی گوڵ
پەشێوحاڵ، خەمناک، چوون سازەدەی دڵ
ناگـــا دەوایـــدەرد دەروون پـــڕخاران
نۆشـدارووی زامـان زامـەت ئـەوگاران
یانـێ نامەکـەی خامـەی خـەم ڕەقـەم
مەنزوومەی «مەعدووم» چەنی خەم هەمـدەم
یـــاوا وەســـەردار دەروون پـــڕداخان
پەروانـەی بـای شـەم سـەلار ئوتاخـان
ئـەر سـەد شـەرارەی نـاییرەی دووری
تـاو دابی وەتـاو کـوورەی مـەهجووری
گـــەرمی تـــەوەنتـــاو دەرد تـــەنیاییم
بـەردەبی یـەکسـەر سـۆمای بینـاییم
سـانام جـە قاسـید سـاکن بی دەردم
وەدیـدەی بـێنـوور موتـاڵاش کـەردم
نمەز چەرخچەپ چەواشەی چەپگـەرد
پەی کام دەردیسەر نیگـاداریم کـەرد؟
وەرنە مـەویا وەخـت وانـای نامەکـەت
گیان کەردام فیدای ڕەشحەی خامەکەت
ڕووی ئەجەڵ چوون بەخت سیام، سیا بـۆ
نامـا گیـان جـەو دەم جـە تـەن جیـا بـۆ

دیوانی مەولەوی مەعدوومی، چاپی بەغدا، ١٣٨٠ ک. م. یاداشتەکانی نووسەر.

## مەخزەنی کرماشانی

میرزا عەبدولموحەممەد، نازناو «مەخزەن»، لە پیاوماقووڵانی کرماشان، وێژەوانێکی هێژا بووە و خەتی جوان نووسیوە و بە ڕاهێنانی منداڵە دەوڵەمەندان ژیاوە.

مەخزەن ساڵی ١٢٤٦ ک. م. لە دایک بووە و ساڵی ١٢٧٦ (٣٠ ساڵان)، تووشی تاعوون هاتووە و لە دنیا چووە.

ئەم تاقەبەیتە، نووسەری «*تذکرەی شُعرای کرمانشاه*» لەوی گێڕاوەتەوە:

در پیرهــن لطیــف، ای ســرو!   سرو چمن است یا کـه قامـت؟!

*تذکرەی شُعرای کرمانشاه*، ل١٢٨.

## خواجەی سنەیی

ئاغا موحەممەد، ناسراو بە «خواجە»، خەڵکی شاری سنە، لە کۆتایی چەرخی سـێزدەدا، ژیـانی کۆتـایی پـێ هاتووە. باوکی (حاجی میرزا) پیاوێکی بازاڕی خاوەن ماڵ و سامانێکی باش بووە؛ بەڵام خواجە دوای مـردنی ئەو، دەستی لە دنیا بەرداوە و تەکی داوە بە لای خواوە و ژیانی دەروێشی و دوورەپەرێزی هەڵبژاردووە و بـۆ کۆڕی مامۆستایانی پارێزکار چووە و جار و بارەش شیعرێکی گوتووە:

سَر و سامان عـشق تـرک سـر اسـت   سـر و سـامان عاشـقان دگـر اسـت
آن که در راه دوسـت یـک سـر مـو   خبر از خویش داشت، بیخبـر اسـت
ره ظُلمــــات چنـــــد پیمـــــایی   چشمەی آب خضر، چشم تـر اسـت
رفعـــت کـــاخ عـــشق را نـــازم   کش فَلَک حلقەای به پُشت در است
طــایر اوج عــشق، بیــضەصــفت   نُـه فَلَـک را گرفتـه زیـر پـر اسـت
در بیابــان عــشق هفــتمحــیط   چون نگه می‌کنیم یـک شَـمَر اسـت
آفتــاب ســـپهر عـــالم جـــان   عکـسی از ظـلّ پیـر راهبـر اسـت
رُخ بــه خــاک درش بمــال ای دل   مس به اکسیر چون رسید، زر است
بـیسـر و پـا گـدای درگـه عـشق   شـهریار و خـدیو بحـر و بـر اسـت

* * *

انــــدرین رَزم، رســـتم دســـتان   طفلکـــی نـــیســـوار مـــیبیـــنم
بُختـــی عقـــل انـــدر ایـــن وادی   بـــر دو بینـــی مهـــار مـــیبیـــنم

| | |
|---|---|
| اژدر نفـــس را در ایـــن صـــحرا | کمتـــر از سوســـمار مـــی‌بیـــنم |
| صَـد چـو مَنـصور انـدر ایـن صـحرا | سَـــر فکنـــده بـــه دار مـــی‌بیـــنم |

* * *

| | |
|---|---|
| در راه سلوك میل و فرسنگی نیست | در مَستی عـشق بـاده و بنگـی نیـست |
| چندان که نشستیم به خمخانه‌ی عشق | جُز بی‌رنگی در خُم آن رنگی نیست |

*حدیقه‌ی امان‌اللهی*، ل٣٤٥.

## شێخ عەبدولکەریمی وەلیانی

شێخ عەبدولکەریم، کوڕی شێخ ئیسمایلی وەلیانی، زانایەک لە سەیدەکانی بەرزنجەیە کە ساڵی ١٢٨٠ ک. م. لە شاری کەرکووک کۆچی دوایی کردووە.

شێخ عەبدولکەریم پیاوێکی دیندار و پارێزکار و لە مەشایخی جێبڕوای تەریقەتی قادری بووە.

*عُلَماونا فی خدمَة العلم و الدّین*، ل ٣٢٠.

## سەید موحەممەد سەعیدی حوسەینی

سەیدی پایەبەرز، موحەممەد سەعید، کوڕی سەید مەهدی، کوڕی سەید ڕەحمەت، کوڕی سەید سەعدی، لە تۆرەمەی شێخ ئەحمەدی باینچۆ و لە پشتی سەید موحەممەد زاهید، مەشهوور بە پیرخدری شاهۆ، لە ساداتی حوسەینی، لە گوندی «کوچکچەرمگ»ی لای باینچۆ، دەوری ٤٥ کیلۆمیتری ڕۆژاوای سنە، هاتۆتە دنیاوە و هەر لەوێ ژیاوە.

ساڵی لە دایکبوونی سەید موحەممەد سەعید ڕوون نییە، بەڵام بەپێی نووسراوەی مامۆستای هێژا، سەید ئیبراهیمی ستوودە ـ کوڕەزازای سەیدـ لە نێوان ساڵانی ١٢٢٧ و ١٢٣٩ ک. م. بووە و ساڵی لە دنیا چوونی بێ شک ١٢٨٠ ڕوویداوە. جا بەو بۆنەوە کە لە ناو بنەماڵەیاندا مەشهوورە دەڵێن سەید حەمە سەعید ٤٦ ساڵی عومر کردووە، دەبێ ساڵی لە دایک بوونی ١٢٣٤ بووبێ.

سەید موحەممەد سەعید پیاوێکی خۆش سەروسیما، باڵابەرز، بەهێز، شارەزای کەژوانی و ڕاو و ئەسپ و تفەنگ، بە دڵێکی نەرم و میهرەبان و دەستێکی کراوە و ئاکاری پەسند، هەروەها شاعیر و وێژەوان و ئاشنای کتێب و باسی ئایینی بووە و بەو بۆنەوە زۆر لە ناو خەڵک و گەورەی عەشایردا قسەی ڕۆیوە و والی کوردستان سەرپەرشتی دوو ناوچەی حوسەین‌ئاباد و ساڕاڵی کوردستانی پێ سپاردووە. سێ جار بۆ تاران چووە و ماوەیەکی زۆر لەو شارە لەگەڵ هونەرمەندان دانیشتوە و بەتایبەت خەریکی خۆشنووسی بووە.

سەید شیعری گۆرانی زۆر جوان و ڕەوان گوتووە و لە بەرهەمەکانی، یەکیان هۆنراوەی «*یۆسف و زولەیخا*»یە

کە لەم دواییانەدا مامۆستا سوتوودە، بە شوێنگری و تێکۆشانێکی زۆر، چەند ڕوونووسی هەموو ناتەواو و پەرژ و بڵاوی لێ دۆزییەوە و بۆخۆی ـکە شاعیرێکی چاکەـ ٧٠٠ بەیتی بۆ سەرەتا و پاشکۆ، لێ زیاد کرد و بە تەواوی و بێ کەم و کووڕی، لە پەخشانگای سرووش لە تاران لەچاپیدا.

لە کارە گەورە و بەرچاوەکانی سەید حەمە سەعید، دامەزراندن و بەڕێوەبردنی قوتابخانەیەکی دینی لەسەر حیسابی خۆی لە گوندی گچکەی کوچکچەرمگ بووە کە پاش خۆشی، کوڕە هێژاکەی، سەید سەعدەدین (ئەمینوسادات)[1]، ئەم خزمەتە بایەخدارەی درێژە پێدا.

سەید لە کاتێکدا کە لە تاران بووە، بە یاد و تاسەی زێدەکەی خۆی و کەش و هەوای دڵبزوێنیەوە، ئاوای ناڵاندووە:

سەد کە شمێران خاکش هەن دڵگیر — چ فایدە سەخناخ[2] نمەشۆم جە ویر
من و دەماوەند عەهدێومان کەردەن — ئەو تەم و من خەم تا وەڕۆی مەردەن

ئەو خوا لێ خۆشبووە زۆر جوانی نووسیوە و بەرگێک «*انوار قفه*»ی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە کە ئێستاش لە کتێبخانەی بنەماڵەی ستوودەدا ماوە.

ئەمەش نموونەیەک لە *یۆسف و زولەیخا*[3] کەی سەید، لەو جێگەدا کە زولەیخا، یۆسف لە بازاڕی کۆیلەفرۆشاندا دەبینێ و بە تایەنەکەی ئێژێ: ئەم کۆیلە هەر ئەو کوڕەیە کە لە خەونمدا دیومە:

ساقی! بۆ وەبەزم فدای جامت بام — دڵبەر! بۆ وە لام فدای نامت بام
موترب! بدەر تاب وە ئەو تار عوود — موغەننی! وەسۆز ئاهەنگ داوود،
نەغمەی خوەش‌ئاهەنگ پەرێم بوانە — پێم بدەر جامێ و گیانم بسانە
تا مەستی نە بەند کەللەم بخێزۆ — شۆرش وە دەوران جەهان برێزۆ
خامەی شەکەرڕێز، ڕێزەی شەکەرچین — پاسە ڕێزنان ئی ڕاز شیرین
چون یووسف پەی میسر ئاما جەڕاوە — مەشهوور بی وە سەمع سەرکار شاوە
زولەیخا ئەژنیش سەنای زەریفش — تەعریف شۆڵەی شیوەی شەریفش
بی‌تاو بی پەی دین دیدەی ئەو غولام — تاقەتش تاق بی شەیدا بی جە فام
پەی عەزم سەیران ئاوەرد بەهانە — ڕوو کەرد وەسارا جەمەینەتخانە
خەیلێ نەسارا گێلا چەنی غەم — مەڕێزنا سەیلاو هون دڵ نەچەم
ئاخر گێلاوە جە سەیر سارا — ڕۆ کەرد وە پای قەسر سوڵتان دارا
دیش غولغولەی سەخت غەوغا دیارەن — مەواچی ئەورۆ یەومولقەرارەن

---

١. لە داهاتوودا باسی ئەویش دەکەین.

٢. **سەخناخ** ناوی شاخێکی بەرز و بەناوبانگە لە باشووری گوندی **کوچکچەرمگ**.

٣. ئەو هەڵبەستە، مامۆستا سەید ئیبراهیمی ستوودە «*ئایین وەفەوین*»ی ناو ناوە.



پەرسـا چ غـەوغا بیـەن ئاشـکار؟ مـاچی ڕەسـتخێز خێزیـا نـە شـار
واتـن شەخـسێوەن تـازە غولامـەن شۆڵەی شەم ئەفرۆز فەرخوندە نامـەن
زولەیخا دامان هـەودەج گوشـا کـەرد تەماشای خوەرشید جەهانئـارا کـەرد

هۆنراوەی *ئایین و ئەوین*. یاداشتەکانی نووسەر.

## سەید تاهای نەهری

عارفێکی زانا و بێمبالات بە دنیا، لە ساداتی بنەماڵەی بەناوبانگی شەمزینان[1] و خەلیفە گـەورەکانی مـەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە کە کەشف و کەرامەتی زۆریان لێ گێڕاوەتەوە.

موحەممەدشای قاجاڕ (١٢٤٦–١٢٥٠) کە یەک لە ژنانی لەم بنەماڵە بووە، ڕێز و حورمـەتێکی یـەکجاری گرتووە و بۆ ئاسایشی خۆی و مریدانی، هەموو جۆرێ حەولیداوە. هەروەها عەباسمیرزاش مریـدی بـووە و لە هەموو کارێکیدا پرسی پێ کردووە و یارمەتی لێ خواستووە.

سەید تاها لە نیوەی دووهەمی چەرخی سێزدە، لە تاراندا ئەمری خوای بەجێهێناوە و هەر لەو شارە نێژراوە.

*یـادی مـەردان*، ل٩٨. *بغیـةالواجـد فـی مکتوبـات مولانـا خالـد*، محمـد اسـعد صـاحبزاده خالـدی، دمـشق ١٣٤٤ ک. م. ل٢٦٥. *الانوار القُدسیّە*، ل٢٦٢. گۆڤاری *یادگار*، س٥، ژ ١و ٢.

## شێخ ئەحمەدی بەخش

عارفێکی پارسا و گۆشەگیر و لـە مریـدانی شـاە ئەحمـەدی سـەعیدی (١٢١٧–١٢٧٧ ک. م.) مورشـیدی تەریقەتی نەقشبەندی لە مەدینەی پیرۆز بووە.

شێخ ئەحمەد ئەگەرچی لـە لایـەن مورشـیدەکەیەوە ئیجـازەی پـێ دراوە ئیرشـاد بکـا، بـەڵام بۆخـۆی دوورەپەرێزی هەڵبژاردووە و لە تێکەڵ بوون لەگەڵ خەڵـک و تەنانـەت ئیرشادیـشیان خـۆی پاراسـتووە و سەرەنجام ساڵی ١٢٨٠ ک. م. دنیای بەجێهێشتووە.

*مناقب احمدّیە*، ل٣٢١.

---

١. باپیرەگەورەی ئەم بنەماڵە «شەمسەدین»ی ناو بووە و لە بـاکووری کوردسـتان شـوێنێکی بـۆ تۆبـەدادان و ئیرشادی خەڵک ئاوەدان کردۆتەوە و «**شەمزین**»ی ناو ناوە؛ کە هەر لێکەوتووی ناوی خۆیە. شـەمزینان ئێـستا ناوچەیەکە لە باکووری کوردستان و «**نەهری**» گوندێکی ئەوێیە.
بۆ زانینێکی زۆرتر لەمەڕ ئەو بنەماڵەوە، بڕوانە بۆ بەشی دووهەم، بەرگی تایبەت بە خوونکاران و ماڵەمیران.

## سەید موحەممەد سادقی سەفاخانە

لە ساداتی سەفاخانەیە، کە ساڵی ١٢١٢ ک. م. هاتۆتە دنیا و پاش دوایی هێنانی خوێندن، لە مەدرەسەی باوانییان لە سەفاخانەدا دەرسی گوتووە؛ مرۆیەکی هێژا و میوان‌دۆست و بەخشندە و شاعیرێکی خۆش‌زەوق و خاوەن هەست بووە.

سەید حەمە سادق پێش ئەوەی ژن بخوازێ، کچێکی چاوپێ‌دەکەوێ، بە ناوی جەهان‌ئارا، دڵی‌لێ‌دەچێ و دوای ماوەیەک سەرگەردانی و کوێرەوەری و لابردنی هەموو کۆسپێک لە سەرڕێ، خوازبێنێ لێ دەکا و مارەبڕانێکی قورس وەرێ دەخا؛ بەڵام پێش گواستنەوە، مەرگی ناکاو جەهان‌ئارای لێ دەستێنێ و سەیدی ناهمێ ماوەیەک سەری خۆی هەڵدەگرێ و وەکوو مەجنوون، سەر ئەنێتە کێو و دەشت. خزم و کەسی سەیدی دڵ‌سووتاو، پاش ڕاوێژێکی زۆر، دێنە سەر ئەوە هەڵی‌بگرن و بیبەنە خزمەتی شێخ سیراجەدینی تەوێڵێ؛ بەشکوو هەناسەی ئەو پیرە دڵ‌ئاگایە کارێکی بۆ بکا؛ بێ ئاگا لەوە چەرخی چەپگەرد، پیلانێکی تری بۆ لە ژێرسەردایە و داوێکی تازەی بۆ ناوەتەوە. بەڵێ هێشتا نەگەیشتوونەتە بەرەوە، چاوی بە کچێک بە ناوی سوراحی دەکەوێ کە زۆر لە جەهان‌ئارا دەچێ. ئەم ڕووداوە، زامی کۆنی دەکولێنێتەوە و ئاورێکی تازەی تێ بەردەدا.

هەرچۆنێک بووە، دەیبەنە تەوێڵێ و شێخ پاش بیستنی بەسەرهاتەکەی، لەدووی بابی سوراحی دەنێرێ و داوای کچەکەی بۆ سەیدی شەیدا دەکا و هەموو پێداویستییەکی بۆ زەماوەنیان پێک‌دێنێ؛ بەڵام دیسانەکە ئەجەلی بێ وادە، دەستێکی تری لێ دەوەشێنی و سوراحیشی لێ دەستێنێ.

سەیدی سووتاو ئەمجار ئیتر تەواو تێک‌دەچێ و بە حاڵێکی شڕەوە هەڵوەدای دەشت و سارا دەبێ و ئەبێتە هاونشین و ئاودەنگ و زمانی جڕ و جانەوەران. لەم سەردەمەدا هێندێک شیعری دڵگر و بەسۆزی گوتووە و جار‌ـجار ناوی گراوییەکانیشی بردووە؛ وەک دەڵێ:

ئەعزای شکستەی پڕ جەڕاحە خوەم  بێ جەهان‌ئارا و بێ سوراحە خوەم

بەڵام سەرەنجام ودمی نەفەسی شێخ، هێوری دەکاتەوە و بەرەو خانەقای ڕادەکێشێ و وردە‌ـوردە سەری بۆ وەرگرتنی تەریقەت دێنێتە ڕێ و کە بە خۆی دەزانی، دەبینێ ئەوینێ ڕواڵەتی جێ خۆی داوەتە خۆشەویستی ڕاستەقینە و ئەو گراوییە شێت و شەیدا و سەرلێ شێواوە شڵەژاوە، چۆتە ڕیزی عارفانی پایەبەرزەوە.

سەید موحەممەد سادق پیاوێکی خۆش سەر و سیما و دەنگ‌خۆش بووە و دەگێڕنەوە لە کاتی ئەویندارەی و تووشیارییەکەیدا‌ـکە وێڵی کێو و بیاوان بووە‌ـ هەرکاتێ بە سۆزی دڵ دەنگی هەڵداوە و شیعرەکانی خوێندووە، پەلەوەر و جڕ و جانەوەر، بە دەوریدا ئاڵقەیان بەستووە و گوێیان بۆ گرتووە.

شیعرێکی سەید حەمە سادق:

خەم! کۆتاییت بۆ، خەم! کۆتاییت بۆ  ئەی خەم! سا وەسەن با کۆتاییت بۆ

خەفــەت! بــۆ وەســەر بادماییــت بــۆ
مەینەت! وەس بسات بەزم ئاراییت بـۆ

هیجــران! شــەوگارت نــەدارۆ پایــان
فـیراق! سـوبح تـۆ کـەی بـۆ نمایـان؟

خەیاڵ! خامۆش بەر هەر سات جە لایی
وەسواسە وەس‌کەر هەرسات سـەودایێ

هەناسە! سەرد بای، وەس بکەر دوودی
ناڵە وەس کێـشە، ناڵـەی بـێ‌سـوودی

تاقــەت! وە تــاق بــای، بگێــرە تاقــەت
سادەخیل، ئەی لەیل! بـازەم فیراقـەت

ئەی دڵ! وەس کوڵیە با پڕ بیت جە هوون
وەس بگرە چوون گڕ شەرارەی سەبوون

چەم! بیناییت شی وەس کەر ئـەنگێزە
ئەسرین! بیت وە هوون سا وەس برێـزە

شادی! وەکوو شیت هیچ نەداری شۆن
ئاخ دەماخ! جە کۆی یە نەبیـەنی تـۆن

بنمــانی جــارێ سەرگۆشــەی کــڵاو
ئـەی سـیا جـە دەور مـن کـەری وڵاو

«سادق» دەماخــت لێــت بــێ‌دەماخــەن
کەیفت بێ‌کەیفەن، شـادیت ناچاخـەن

ســەیدموحەممــەد ســادق هــاودەورە و دۆســتی خــوا لــێ خۆشــبوو ســەید موحــەممــەد ســەعیدی کوچک‌چەرمگی بووە و ئەم دووە زۆر جار نامەیان بۆ یەکتر نووسیوە و شـیعریان گۆڕیوەتـەوە و جاروبـارەش پێکەوە کەژوانی و ڕاوەبازیان کردووە. لەم دوو بەیتەدا سەید موحەممەد سادق لە کاتێکا شـاهینێکی ڕەدوو ناوە، بە یادی دڵدارەکەی گوتوویە:

دیم شـاهین بـە چـێ نەسا پـەروەردە
هێمــا نــەتۆی لان پــەرواز نەکــەردە

بــەو زەرب مــەهمێز قـولاوەی نـاهوون
پێکاش مورغ‌دڵ، کـەردش سـەرنگوون

سەید ساڵی ١٢٨٠ لە دنیا چووە و گڵکۆی لە گوندی «تیلەکۆ»یە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## مەلا مەحموودی دشە

کوڕی مەلا موحەممەد، کە باپیرەگەورەیان مزەفەر بەگی نەڕانی[١]، لە خانـە گـەورەکان بـووە، ساڵـی ١٢٢٧ ک. م. لە گوندی «دشە»ی لای پاوە هاتۆتە دنیا. بە منداڵی بابی مـردووە و دایکـی ـکـە لـە گەورەماڵـێکی دشە بووە ـ باری‌هێناوە و کە پێگەیشتووە، بۆ خوێندن ناردوویەتە پاوە.

مەحموود پاش ئەوەی لە پاوە زیرەکی خۆی نیشان داوە، بۆ شوێن‌گرتنی دەرس و دەور، چۆتە سنە و لـە قوتابخانەی مزگەوتی ئەمین، لای مەلا فەتحوڵای دوێسەیی، خوێندوویە. ماوەیەکیش بۆ کاشـتەر ڕۆیـوە و لە مەدرەسەی ئەوێ، لە خزمەتی ئیبنولحاج بەهرەی بـردووە و سـەرەنجام گەڕاوەتـەوە سـنە و لای مـەلا

١. **نەڕان**: گوندێکی گەورە لە باشووری شاری سنەیە.

فەتحولا ئیجازەی وەرگرتووە و چۆتەوە دشە.

مەلا مەحموود عارفێکی ئازادە بووە و بە باخەوانی و کشتوکاڵ ژیانی خۆی و خەیزانی بەڕێوە بردووە و کاتی پشوودان، خەریکی خوێندن و دەرس‌گوتن و نووسین و عیبادەت بووە. خەتی نەسخی باش نووسیوە و لە ماوەی ژیانیدا هەژدە بەرگ قورئانی پیرۆزی، بەو خەتە جوانەی نووسیوەتەوە. سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی و لە مریدان و خەلیفەکانی شێخ سیراجەدینی تەوێڵێ بووە؛ بەڵام خانەقا و باقی داب و دەستووری خەلیفەکانی تری دانەناوە و دەستی لە تۆژینەوە و دەرس‌گوتنەوە نەکێشاوە.

مەلا مەحموود ٥٤ ساڵ ژیاوە و ساڵی ١٢٨١ ک. م. ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە.

یاداشتەکانی نووسەر.

## ڕەونەق

میرزا عەبدوڵلا، نازناو ڕەونەق،کوڕی موحەممەدئاغا، لە تایفەی قادری، ساڵی ١٢١٨ لە شاری سنە هاتۆتە دنیا و نۆ ساڵان بووە بابی مردووە و لە ژێر چاوەدێری والی سنەدا گەورە بووە و خوێندوویە؛ ئەمجار چۆتە ڕیزی نزیکان و ڕاوێژکارانی دەزگای والییەوە و ناو و ڕێز و حورمەتێکی پەیدا کردووە.

وەک خۆی دەڵێ: باپیرانی سەد ساڵ پێش لەدایک‌بوونی ئەو، واتا ساڵی١١٢٠ ک. م. لە هەمەدانەوە کۆچیان کردووە و لە سنە جێگر بوون و لای والیانی ئەردەڵانەوە پلە و پایەیەکیان دەسکەوتووە.

ڕەونەق شاعیرێکی خۆش زەوق و توانا[1] و مونشی‌باشی ئامانوڵاخانی دووەمی ئەردەڵان، والی کوردستان بووە و دیوانی شیعریشی داناوە؛ کە ئێستا دەس ناکەوێ.

لە بەرهەمەکانی ڕەونەق، کتێبێکە لەمەڕ ژین‌نامەی شاعیرانی سنە و شارەکانی دەوروبەری؛ کە بە لاوی بنیاتی ناوە؛ بەڵام لەبەر ئەوەی ساڵی ١٢٦٥ ک. م. سەردەمی حوکمەتی ئامانوڵاخان کۆتایی هاتووە، «*حدیقەی امان‌اللهی*» ناو ناوە.[2] هەروەها پاشکۆی بۆ مێژووەکەی خاتوو مەستوورە (*تاریخ اردلان*) داناوە و تا ساڵی ١٢٦٧ پێوە چووە و چواردە ساڵ لەودوا، واتا ساڵی ١٢٨١ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

ڕەونەق شاعیرێکی قەسیدەبێژە بە شێوازی شاعیرە پێشووەکان و کارتێکەری شاعیرانی وەک ئەنوەری و خاقانی، لە شیعرەکانیدا بەرچاوە. شیعری ڕەونەق لەگەڵ جوانی و ڕەوانیدا، قورس و پتەوە.

**بەشێک لەو قەسیدە کە بە سنەیدا گوتووە**:

---

١. چەند کەس لە خزمانی ڕەونەق، شاعیر و وێژەوان بوون: کوڕەکەی، میرزا عەلی‌ئەکبەر «صادق‌الممالک»، نازناو «**ئەفسەر**»، خاتوو مەستوورەی ئەردەڵان، برازای، حوسەین‌قولی خانی ئەردەڵان، نازناو «**حاوی**»، خۆشکەزای و میرزا عەبدولباقی، نازناو «**شەیدا**»، پوورزای؛ کە لەم کتێبەدا باسی یەک‌بەیەکیان کراوە.

٢. ئەم ژینامە، لە ساڵی ١٣٤٤ ک. هـ. لە تەورێز بە کۆششی خوالێ‌خۆشبوو خەیامپوور چاپ کرا.

در آن بگذری خود همه جود بی‌حد ... بر آن بنگری خود همه لطف بی‌مر
همه خار بینی در آنجا چو لاله ... همه خاك بینی در آنجا چو عنبر
در ارکانْشْ انعام خلاق پیدا ... ز بنیانْشْ اکرام رزّاق ظاهر
سوادش ز بس روح‌پرور تو گویی ... فیوضات فیض خدا راست مظهر
درونش ز لُطف صفا رشك جنت ... برونش ز فرط ضیا غیرت خور
ز شرم عروسان طنّاز آنجا ... بود چهر خوبان خلخ مُجَدَّر
ز رشك قد شاهدان جمیلش ... بود پا به گل از حَیا، سرو کشمر
قُصُوری در آن شهر بینی که هر یك ... به رفعت بود برتر از چرخ اخضر
همه از صفا رشك ار تنگ مانی ... همه از ضیا غیرت نقش آذر
روان اندر آن قصرها، جوی بینی ... بدانسان که در صَحن فردوس، کوثر

**تەڵبژێرێک لە قەسیدەی دەستەوداوێنی پێغەمبەری ئیسلام** (د):

مَرا رسید شبانگه ز عالم بالا ... ز فیض هاتف غیبی به گوش هوش ندا
که ای خُلاصه‌ی موجود و زُبده‌ی آدم ... که ای نقاوه‌ی مقصود و قُدوه‌ی اشیا
تو مرغ گلشن خُلدی و اندر این عالم ... چه بسته‌ای ز هوس پای خود به دام هوا؟
مده به دست اَمَل دل که هیچ درخور نیست ... برای مروْحَه‌ی دیو، طُرّه‌ی حورا
فریب آز مخور زانکه بهر پوشش پیل ... کجا رواست بُریدن ز کسوت بطحا
برای توست فضای سپهر و عرصه‌ی قدس ... تو خاکبیز در این تنگنای، اینْتْ خطا
نه کودکی، نه بهایم، به چشم هوش نگر ... چو خاکیانت، چه آلودگی به خاك و گیا
به سوی منزل إلاّتْ ره نخواهد بود ... ز جهد تانشوی رەنَوَرد وادی لا
طریق معرفت اینك چو نور شمس پدید ... تو در بوادی خذلان ودیده نابینا
چرا چو نور موحد نیی به مَعشر اُنس ... چرا چو روح مُجَرَّد نیی به صَفِّ صفا
دمید صُور قیامت تو بر اریکه‌ی خواب ... رسید سُور شفاعت تو در لباس عَزا
به خوان عشق درآ، تا ز شاه کشور ذات ... تُو را بَشیر «قد افلح» زند ز فیض، صَلا
از این مَضیق فنا خیز و مردسان بگریز ... درآ به کشور لا تَقْنَطوا، به مُلك بَقا
ز سالکان حقیقت طریق عرفان گیر ... که عُمر در ره جَهلت هبا شده است، هَبا
گرت هَوی است که گنج اَبَد به کَف آری ... بزن به دامن احمد ز صدق دست رَجا
حبیب حضرت عزّت، امین وحی که هست ... طُفیل هستی او، هرچه هست غیرخدا
بهینه مقصد کُلّی ز خلقت آدم ... مهینه مطلب اصلی ز فطرت حوّا

به خلقت ارچه بشر لیک ساکنان درش بـه رُتبـه برتـر از افلاکیـان عَـرش لـوا
دلـش خزینـەی اسـرار اول و آخـر دَمَـش مُجـاهر اَرواح آدم و عیـسی
غَرَض وجود تو بود این چنین جهان‌آراست بـه قـدرت ازلـی ایـزد جهـان‌آرا
مُؤالـف تـو بـود هر کـه از وَفـا، امـروز مُخـالف تـو بـود هر کـه از جفـا، فـردا
کند مکان به ریـاض نَعیم، اگـر فرعـون کنـد مقـام بـه نـار جَحیم، اگـر موسـی
به گرد بارگهت کز شرف ز عرش بر است پـی طـواف برآینـد هـر صـباح و مـسا
ز شوق روح‌الامین همچو زایران به نیـاز ز مهر روح قُدُس همچو عاکفان به رجـا

پێشەکی و پاشکۆی *حدیقەی امان‌اللهی*، ڕەونەق، چـاپی تـەورێز. *مجمع الفـصحاء*، ب٢، ل١٠٥.

## ئیبنولخەیاتی قەرەداغی

شێخ مەلا موحەممەدی قەرەداغی، مەشهوور بە «ابنُ‌الخیّاط»، ساڵی ١٢١٣ ک. م. لە گوندی قـەرەداغی لای سلێمانی هاتە دنیا و کە بای‌باڵی‌دا، لە مەکتەبخانە، وانە سەرەتاییەکانی وەرگرت و ئەوجار چووە نـاو کـۆڕی فەقێیان و لە مەدرەسەی مەلا غەفووری مۆرتکەیی و شێخ لەتیفی بەرزنجی ماوەیەک خوێندی و پاشان لـە هەڵەبجە حیکمەت و کەلام و بەلاغەی لای عەللامە شێخ عەبدولـڵای خـەرپانی خوێنـد و ئیجـازەی لـێ وەرگرت و بە شوێنیدا گەیشتە خزمەتی مەولانا خالیـدی نەقـشبەندی و چـووە ڕیـزی مریدانیـەوە و پـاش ماوەیەک سەیر و سولووک، شانازی وەرگـرتنی ئیجـازەی ئیرشادیـشی دەسـکەوت. پـاش ئەمانـە گـەڕاوە قەرەداغ و باقی ژیانی بە خزمەتی شەریعەت، لە سونگەی دەرس‌گوتنـەوە و ئیرشـادی خەڵـک و نووسـین ڕابوارد و سەرەنجام ساڵی ١٢٨١ ک. م. لە قەرەداغ، گیانی پاکی بە خاوەنی گیانان ئەسپارد.

**لە کتێبەکانی:**

١.«*شرح الاعراب*»، لە نەحودا
٢. «*شرحُ رسالة الادَب*»
٣. پەراوێز بو کتێبە بەلاغییەکان
٤. چەند نامیلکە لە مەنتیقدا
٥. پەراوێز بۆ «*تفسیر بیضاوی*»
٦. پەراوێز بۆ «*تحفه*»ی شێخ ئیبنوحەجەر، لە فیقهدا
٧. کتێبێک لەمەڕ حیساب و هیندسە و چەند نامیلکە و پەراوێزی تر.

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل١٥٩.

## شێخ موحەممەدی فیراقی

شێخ موحەممەد لە تیرەی کوردانی ئەییووبی و لە شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی و لە گەورە خەلیفەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزووری بووە و سەرەتا لەگەڵ مەولانادا بۆ بەغدا چووە و لەوێشەوە بۆ دمشق لەگەڵی بووە و لە چوون و بووندا، هاودەنگی و هاوڕێیی ئەوی پێش هەموو شتێ خستووە و لەم ڕێگەدا زۆری مەینەت کێشاوە تا سەرەنجام گەیشتۆتە پلەی ئیرشادی تەواو و لە لایەن مورشیدیەوە بۆ ئیرشادی دیاربەکر ڕاسپێراوە و لەو شارە، خێڵێکی گەورەی ڕاهێناوە.

فیراقی پیاوێکی هێژا بووە و شیعریشی گوتووە و بەشێک لە شیعرەکانی مەولانای تەخمیس کردووە.

ساڵی مەرگی شێخیان ١٢٨٢ ک. م. و گڵکۆیان لە دمشق، نێزیک لە بارەگای مەولانا خالید نووسیوە.

*بغیەالواجد فی مکتوبات مولانا خالد*، دمشق ١٣٤٤ ک. م. ل١٩٣ و ١٩٤ و ١٩٥. *یادی مەردان*، ل٩٩.

## شێخ مەحموودی ساحیب

برای حەق‌ودای مەولانا خالیدە کە ساڵی ١١٩٧ ک. م. لە قەرەداغ لە دایک بووە و پێش ئەوەی خۆی بناسێ، بابی عەمری خوای کردووە و مەولانا گەورە کردن و بارهێنانی وەئەستۆ گرتووە و پێی خوێندووە و پێی‌گەیاندووە.

دوای ئەوە مەولانا ئیرشادی دەسپێکردووە، شێخ مەحموودیش چۆتە ڕیزی مریدانییەوە و پاش سەیر و سولووکی پێویست و ڕیازەت کێشانی زۆر، ئیجازەی خەلیفە بوونی پێ دراوە و ئیرشادی تاقمی مریدانی تازەکاری پێ سپێراوە. کە مەولانا بۆ بەغدا کۆچی کردووە، شێخ مەحموودی لە خانەقای سلێمانی، لەجێ خۆی، داناوە و ئەویش درێژەی بە کاری کاکی داوە و ساڵی ١٢٣٩ ک. م. سەفەرێکی حەج چووە.

دوای کۆچی دوایی مەولانا لە شامدا (١٢٤٢)، ماوەی پێنج ساڵان شێخ مەحموود لە سلێمانی مایەوە؛ پاشان ئەویش چوو بۆ دمشق و لە مزگەوتی عەدداس ئیرشادی دەسپێکردەوە. ماوەیەک دوای ئەوە دیسانەکە چوو بۆ حیجاز و ئەمجار حەوت ساڵی ڕەبەق بە لانشینی کەعبەی پیرۆز، سەری نایە خاکی عیبادەت و لەشی خستە ژێر باری ڕیازەت، بەشکوو بە تەواوی هەوای لووتبەرزی لەسەری دەرچێ و بەلای خۆپەرستی لە گیانی بار کا. ئەنجا گەڕایەوە شام و دەستیکرد بە ڕێنوێنی و ئیرشادی خەڵک و مەردمێکی زۆر لە هەناسەی گەرم و بەودمی بەهرەیان برد.

ساڵی ١٢٥٩ ک. م. سوڵتانی عوسمانی سەرپەرشتی خانەقای مەولانای پێ ئەسپارد و لەو کاتەوە تا دوا ساتی ژیانی (١٢٨٣ ک. م.) بەردەوام خەریکی دەرس‌گوتنەوە و ئیرشاد بوو.

شێخ مەحموود بەو بۆنەوە «صاحب»یان پێ گوتووە کە هەمیشە و لە هەموو حاڵێکدا یار و هاوڕێ برای گەورە و پایەبەرزی بووە.

*یادی مەردان*، ل٨٩.

## شێخ فەتاحی ئاکرەیی

پیاوێکی عارف و زانایەکی ئەهلی تەریقەت و لە مریدان و خەلیفە هەڵکەوتووەکانی قوتبی تەریقەت، مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە کە ماوەیەک (تا ساڵی ١٢٥٩)لە دمشق و دواجار لە تەکیەی خالدییەی بەغدا ئیرشادی کردووە.

شێخ فەتاح سەرەنجام ساڵی ١٢٨٣ ک. م. لە ئەستەمبووڵ دنیای بەجێهێشتووە؛ کە بە حیسابی ئەبجەد ئاوا دێتەوە: «طاب في الفردوسِ في شهر رجب».

*یادی مەردان*، ل٥٦.

## شێخ عوسمان «سیراجەدین»

عارفی دڵ ئاگا و پیری پارسا، شێخ عوسمان سیراجەدینی نەقشبەندی، کوڕی خالید بەگ، کوڕی عەبدوڵلا بەگ، کوڕی موحەممەد بەگ، ساڵی ١١٩٥ ک. م. لە گوندی تەوێڵێ لای هەڵەبجە هاتۆتە دنیا و دەستی چارەنووس هەر لە سەردەمی میرمنداڵییەوە ڕێنوێنی دەکا کە هەنگاو بە ڕێگای پاکی و پارێزکاریدا هەڵگرێ و بە شوێن زانست و ئاگاییدا بڕوا. بەم جۆرە، پاش خوێندنی سەرەتایی لە زێدی خۆی، بۆ خورماڵ و خەرپانی و سلێمانی دەڕوا و بە تێکۆشانێکی زۆر، شوێنی ئاواتەکەی دەگرێ و پاشان دەگاتە بەغدا و لە تەکیەی شێخ عەبدولقادیر، پێڕای خوێندنەکەی، سات و کاتێکیش بە عیبادەت و زیکر و فیکرەوە تێپەڕ دەکا.

یەکەم جار کە مەولانا خالیدی شارەزووری دەڕواتە بەغدا، شێخ عوسمان لەوێ دەبێ و دەچێتە خزمەتی و سەری پێ دەسپێرێ و بە حەز و وازێکی زۆرەوە سەیر و سولووک دەسپێدەکا و دوای گەیشتن بە ڕادەی باڵا و ناسین و تێپەڕ کردنی هەموو قۆناغە پێویستەکانی تەریقەت، ئیجازەی خەلافەتی لێ وەردەگرێ.

تا مەولانا لە بەغدا دانیشتووە، شێخ عوسمان لەگەڵی بووە؛ کە ئەو بۆ شام چووە، بە فەرمانی مورشید، دەگەڕێتەوە کوردستان و ئیرشادێکی هەموانی لە کوردەواریدا دەسپێدەکا و تا دوا کاتی ژیان (١٢٨٣ ک. م.)، ساتێکیش دەست لە ئامانجەکەی بەرنادا و زۆرێک لە سێبەریدا بەهرەمەند دەبن بە پلە و پایەی بەرز دەگەن؛ لەو کەسانە هێندێکیان بریتین لە: ١. قوتبی ئیرشاد، شێخ موحەممەد «بەهائەدین»، کوڕی گەورە و جێگری شێخ عوسمان «سیراجەدین» ٢.حاجی شێخ ئاوڕەحمان (ئەبولوەفا)، کوڕی دووهەمی شێخ ٣.شێخ ئەحمەد، کوڕی سێهەمی ٤.شێخ عومەر «زیائەدین»، کوڕی چوارەمی ٥. مەلا حامیدی بێسارانی، مەشهوور بە «کاتبُالاسرار»، ئینشابەند و هاودەنگی تایبەتی شێخ ٦. مەولانا ئەحمەدی نۆدشی ٧. حاجی

شـێخ شـوکروڵای شـابازی سـنەیی ٨. حـاجی شـێخ حەمـە بـاقری غەیاسـی سـنەیی ٩. حـاجی شـێخ موحەممەدی سمێرانی، نازناو «حافی» ١٠. حاجی شێخ بایەزیدی خانەقایی ١١. مەلا مەحموودی دشـەیی ١٢. سەید شەهابەدینی تاڵشی ١٣. حاجی عەوەزی پاوەیی ١٤. حاجی شێخ حەمەڕەزای حوسەینی لۆنی ١٥. شاعیری بەناوبانگی کورد، مەلا عەبدوڕڕەحیمی مەولەوی تـاوەگۆزی ١٦. شـێخ موحـەممـەد سـادقی مازیبـنی ١٧. شـێخ موحـەممـەدی قـەرەداغی ١٨. شـێخ موحـەممـەد سـادقی سـەوڵاوایی ١٩. مـەلا موحەممەدی بانەیی ٢٠. مەلا مستەفا چەمیاڵەیی.

هێندێک نووسراوە، بریتی لە ئامۆژگاری و ڕاسپێری لە شێخ عوسمان سیراجەدینەوە ماوەتەوە؛ ئەوا چەنـد ڕسـتەی لێرەدا:

«معلوم مُریدان باد که بنای هر طریقی از طُرُق مُوصله، عموماً بر اِتّباع سنّت سنیّه و اجتناب از بِدَع سَیّئەی غیـر مرضیّه است. خصوصاً این طریقەی علیّه ـ که ما خُدّام آنیم و فیالواقع اقرب و ادقّ و اَحسن سایِر طُـرُق اسـت ـ سراسر اِتّباع شریعت و اختیار سُنت است. حضرت امام ربّانی مُجَدد الف ثانی، که امامالطریقه است مـیفرمایـد: که طریقت و حقیقت خادمان شریعتند؛ زیرا که غرض از سلوک طریقه آن است که سالک را اخلاص کامـل واعتقاد صحیح درایمانیات و معاملات پیدا شود که: «ألا لهُ الدّینُ الخالص»، تـا حقیقـت شـریعت ـ کـه متخلـق شدن به اَخلاق حسنه است ـ صورت بندد وایمان از تقلید و تردید پاک و اَعمال از شوب ریـا و عُجـب صـاف گردد. پس طالبان طریق، اول باید که ارکان و شرایط ایمان و اسلام خود را درست کنند؛ پس از آن بـه اذکـار و اَوراد معمولەی طریقه مشغول گردند؛ که بدون اسلام و ایمان هر عملی کرده شود، غیرمقبول اسـت و دور از معاملەی ارباب وصول. از اَبوعبدالله خفیف شیرازی پرسیدند که تصوف چیست؟ گفـت: کـه هـر چـه در سـر داری بنَهی و هر چه در دست داری بدهی و هرچه بـر سـرت آیـد نَجَهـی، حـضرت مولانـای مـا قُـدس سِـرُّهُ مجذوبان را از الفاظ نامشروع گفتن به تأکید منع میفرمود؛ بلکه زَجر و تنبیه می کرد؛ زیرا که غالباً آن اطـوار از میل نفسانی و وسوسەی شیطانی پاک نیست و نیز خُو گرفتن به آن باعث سَدّ عروج لطیفەی قلب می گردد...»

وەک حاجی شێخ موحەممەدی سمێرانی ـ کە خۆی یەک لە خەلیفە گەورەکانی شێخ سیراجەدینە ـ لە کتێبی «بارقاتُالسُّرور»دا دەڵێ، ئەم عارفە پایەبەرزە، کەشف و کەرامەتی زۆری هـەبووە و هێنـدێکیانی لـە کتێبەکەیدا گێڕاوەتەوە.

شێخ عوسمان سیراجەدین پاش ٨٨ ساڵ ژیان، شەوی سێشەمبە، ١٣ی شـەوالی سالـی ١٢٨٣ ک. م. کۆچی دوایی کردووە. مەلا حامیدی بێسارانی، لە قەسیدەیەکدا کە بۆ شێنگێڕی مورشیدەکەی دایناوە، ئاوا دەسپێدەکا:

امشب که جهان یکسر پُر نالـه و فریـاد اسـت گویی که قیامَت شُد، تا بـاز چـه اُفتـادهسـت

لە کۆتاییشدا دوو بەیتی هەیە، مێژووی لەدایکبوون و لە دنیا چوونی شێخی گوتووە:

در فکر شدم کایا تاریخ چه بنویسم ناگاه خرد گفتا: «قُطب ره ارشاد است»[1]

تاریخ ظهورش نیز چون «مظهر کُل»[2] باشد پس سن شریف او هشت از پس هشتاد است

*یادی مەردان*، ل٨٧. *ریاض المُشتاقین*، مەلا حامید بێسارانی.

*معدن النور* و *بارقات السّرور*، شێخ موحەممەدی سمرِانی.

## سەرییەی دیاربەکری

خاتوونێکی زانای خەڵکی دیاربەکرە کە ساڵی ١٢٣٠ ک. م. هاتۆتە دنیا و ماوەیەکی زۆر لە ئەستەمبووڵ و بەغدا خوێندوویە و سەرەنجام ساڵی ١٢٨٣ ک. م. لە دنیا چووە.

سەرییە نووسەر و شاعیرێکی توانا بووە و بە کوردی و ترکی شیعری گوتووە.

*مشاهیر الکرد*، ب٢، ل٢٣٧.

## پیرئەلیاسی دەرسیمی

مرۆیەکی هێژا و شاعیرێکی خۆش‌زەوق بووە و بە زمانی کوردی و ترکی شیعری گوتووە و دیوانێک شیعریشی لێ بەجێ‌ماوە.

پیرئەلیاس ئاخروئۆخری چەرخی سێزدە کۆچی یەکجاری کردووە و لە زیارەتانی ئاماسییەدا نێژراوە.

گۆڤاری *گەلاوێژ*، چاپی بەغدا.

## شێخ ئەبولوەفا نەقشبەندی

حاجی شێخ عەبدورڕەحمان، کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدینی نەقشبەندی تەوێڵەیی، لەدایکبووی ساڵی ١٢٥٣ ک. م. عارفێکی هێژا و پارسایەکی دڵئاگا بووە کە لە بەردەستی بابی پایەبەرزیدا بارهاتووە و لەگەڵ تەریقەتی نەقشبەندی و داب و دەستووریدا ئاشنا بووە ماوەیەکی زۆر سەیر و سولووکی کردووە.

ئەبولوەفا لە ساڵانی دوایی ژیانیدا، بۆتە لانشینی تەکیەی شێخ عەبدولقادر لە بەغدا و ساڵی ١٢٨٤ ک. م. هەر لەوێ ئەمری خوای بەجێ هێناوە و لە حەوشەی باشووری بارەگادا نێژراوە.

شێخ عەبدورڕەحمان بیرێکی ناسک و شاعیرانەی هەبووە و جار‌ـجار هەستی عارفانەی خۆی لە بەرگی

---

١. بە ئەبجەد دەکاتە ١٢٨٣.

٢. بە ئەبجەد ئەکاتە ١١٩٥.

شیعردا دەربڕیوە و وەکوو غەزەلێک بە نازناوی «ابوالوفا» یان «وفا»وە لەسەر پەڕەی کاغەزی داڕشتووە.

**دوو نموونە لە شیعرەکانی**:

گفتم: که چیست مونس جان حزین من؟ گفتا: خیال چهرەی گل آتشین من
گفتم: به ساغر طَرَبم، زهر غم که ریخت؟ گفتا: هوای لعل لب شکّرین من
گفتم: که از کجا به کف آرم سراغ دل؟ گفتا: ز چین زُلف سیه عنبرین من
گفتم: که فیض چاك گریبان صبح چیست؟ گفتا: فروغ طلعت مهر جبین من
گفتم: که گشت کامروا در حَریم عشق؟ گفت: آن که کرد بخت سعیدش قرین من
گفتم: که نیست بی تو سر زیستن مرا گفتا: که شد فدای سر نازنین من
گفتم: جفای چرخ فزون یا «وفا»ی ما گفتا: که فوج دل ز یسار و یمین من

* * *

ز فراق تو چنان دیدەی خونبار گریست که دل سنگ به حال دل من زار گریست
اشك سُرخ شفَق از دامن گردون بچکید بر سیەروزی من بس که شب تار گریست
شب هجران توام اشك به بالین آمد تا سَحر بهر من خستەی بیمار گریست
بر سر مَزْرَع بختم چو گذر کرد سَحاب خُشك لب دید و دلش خون شد و بسیار گریست
«بُوالوفا» دید رُخت روزی و از بهر نثار دیدەی او همه شب گوهر شهوار بریخت

*دیوان ابولوفا*، دەسنووس. *عُلَماونا فی خدمَة العلم و الدّین*، ل٢٧٥.

## مەجزووبی نەقشبەندی

شێخ موحەممەد مەجزووبی ئامیدی، ناسراو بە «شەیدا»، زانایەکی شارەزا و عارفێکی هێژا، سەرسپاردەی تەریقەتی نەقشبەندی و لە خەلیفەکانی مەولانا خالیدی شارەزووری بووە کە لە کۆتایی چەرخی سێزدەی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

شێخ موحەممەد ـکە خوێندنی بە لای زانای بەناوبانگ، مەلا یەحیای موزوورییەوە تەواو کردووە ـ بە هۆی نوقم بوون لە موراقیبەدا ـ بە ئەستەم توانیویە دەرس بێژێتەوە یان ئیرشاد بکا و بەم بۆنەوە «مەجزووب» و «شەیدا»یان پێ گوتووە.

*یادی مەردان*، ل٩٨. *الانوارُالقُدسیّە*.

## ڕەئفەت ئەفەندی

موحەممەد ڕەئفەت ئەفەندی، خەڵکی سلێمانی بووە کە پاش دەرس و دەور، بو ئەستەمبوول چووە و لەوێ

نیشتەجێ بووە و هەر لەو شارە ساڵی ١٢٨٤ ک. م. کۆچی یەکجاری کردووە.

ڕەئفەت شاعیر و نووسەرێکی باش بووە؛ زبانی فارسی و ترکیشی زانیوە و شیعری فارسی زۆری گوتووە.

*تاریخ سُلیمانیە*، ل ٢٨٠.

## شێخ نوورەدینی بریفکانی[١]

کوڕی شێخ عەبدولجەبار، کوڕی شێخ نووری، کوڕی شێخ ئەبووبەکر، کوڕی شێخ زەینولعابدین، کوڕی شێخ شەمسەدینی قوتب، لە زانایانی دڵ وشیار و عارفانی ناودارە کە ساڵی ١٢٠٤ ک. م. لە بریفکان هاتۆتە دنیا. باپیرەگەورەشی شێخ شەمسەدینی قوتب، پیاوێکی زانا و هێژا بووە کە لە خەلاتی باکووری کوردستانەوە کۆچی کردووە بۆ بریفکان و هەر لەوێ لە دنیا چووە.

شێخ نوورەدین قوتابخانەی زۆر گەڕاوە و بۆ خوێندن زۆری کۆشاوە و لای عەللامە مەلا یەحیای موزووری ئیجازەی وەرگرتووە؛ ئەوجار لە خزمەتی یەک لە شێخانی قادری، ئەو تەریقەتەی وەرگرتووە و ماوەیەک بە زیکر و داب و دەستووریانەوە خەریک بووە. پاشان لای پیرێکی نەقشبەندی سەری سپاردووە و لەگەڵ ئەو تەریقەتەش ئاشناییەکی تەواوی پەیدا کردووە و بەبۆنەی پێداگری زۆر لە ڕیازەت و زیکر و فیکردا، بە ڕادەی کەشف و شوهوود گەیشتووە و سەرەنجام ساڵی ١٢٦٧ ک. م. لە بریفکان دنیای بەجێ‌هێشتووە.

شێخ نوورەدین ئەگەرچی زیاتر بەری بە لای ئیرشاد و تەریقەتەوە بووە و بە خەڵکێکی زۆر بەهرەی گەیاندووە، بەڵام لە فێر کردن و ڕاهێنانی فەقێیانیش بێ ئاگا نەبووە و هەمیشە بەشێک لە کاتی خۆی بۆ خوێندنەوە و دەرس‌گوتنەوە تەرخان کردووە و جارو بارەش شیعری هۆنیوەتەوە.

**لە کتێبەکانی**: «*اَلْبَدْر*» و «*اَلْمُکاتبات*»یان نووسیوە.

*عُلَماونا فی خدمَة العلم و الدّین*، ل٦٠٤ تا ٦٠٦.

## سالم

ئاوڕەحمان بەگ، نازناو «سالم»، کوڕی مەحموود بەگی قەرەجەهەننەم، کوڕی ئەحمەد بەگی ساحیبقەران و پوورزای مستەفا بەگی کوردی، ساڵی ١٢٢٠ لە سلێمانی هاتە دنیاوە و ١٢٨٦ ک. م. هەر لەو شارە سەری یەکجاری ناوە.

سالم لە شاعیرانی گەورەی کوردە کە بە شێوەی سۆرانی شیعری گوتووە و نازناوی ماوەیەک «ڕەنجوور» بووە و پاشان لەبەر ئەوەی بۆ خۆی نەقڕاندبێ، کردوویەتە «سالم».

شیعری سالم جوان و ڕەوان و دڵگرە، تژی لە بیری ورد و خەیاڵی ناسک و شبهاندن و نواندنی نوێ و

---

١. **بریفکان**: گوندێکی کوردی سەر بە مووسڵە.

بەجێ. بەڵام لە شیعرە کوردییەکاندا، وشەی غەوارە ـ لە عەرەبی و فارسی و ترکی ـ زۆرن.

سالم دوای شێوانی حوکمەتی بابان، سلێمانی بەجێهێشتووە و ماوەیەک نیشتەجێی سنە بووە. لە سنەشەوە سەفەرێکی تارانی کردووە و کە ماوەیەک ماوەتەوە، بێتاقەت و ماندوو بووە؛ وەک خۆی دەڵێ:

لەگەڵ دڵ شەرتە «سالم» گەر نەجاتم بوو لە تارانا  بەھەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی، بە ئێرانا گوزەر ناکەم

یان لە غەزەلێکی تردا ئێژێ:

خۆزگە ئەمزانی لە تارانا نەجاتم کەی ئەبێ  کووی یارم مەشھەدە یا مەنزڵم هەر ڕەی دەبێ

بەڵام سەرەنجام دەگەڕێتەوە سلێمانی و وەک گوتمان، لەو شارەدا دنیا بەجێدێڵێ.

**چەند غەزەلی سالم**:

هەموو شەو چاوەڕێم، بەڵکوو بە مەخفی یاری گیانی بێ
لە تاریکی شەوا شوعلەی چرا موشکڵ نەهانی بێ
لە سەحرای مەحشەریشا دڵبەرم تەرکی جەفا ناکا
فدای ئەو شۆخە بێڕەحمەم کە جەوری دووجەهانی بێ
لەقا خواهش دەکەم دایم کە بنوێنێ وەلێ ناچار
ڕەزام حەرفێ جەوابت بشنەوم با «لَن تَرانی» بێ
بەجوز مانی موسەویر تاقی ئەبرۆی تۆی نەکێشاوە
کە «مانی» نەقشی کێشابێ ئەبێ هەروا کەمانی بێ
ڕەوانی کووهکەن با تازە کا تەقریری شیرینت
بە شیرینی دەمت ناگا شەکەر، با ئەسفەهانی بێ
برینی باتینم کوشتمی خەمۆشی تا بەکەی «سالم»
نیهانی بەسیەتی خوێنم خەنەی پەنجەی فولانی بێ

* * *

سەر و کاری خەیاڵت ئیبتدا وەختێ لەگەڵ دڵ بوو  نە بەحسی سەرکەشی گوڵ بوو نە وەقتی شۆری بولبول بوو
هەتا نەکرا لە تورڕەی زوڵفی تۆ مەشقی پەریشانی  نە پێچ و تابی سونبوڵ بوو نە حەڵقەی چینی کاکوڵ بوو
لە سیرڕی مەتڵەبی نابیخرەدی من کەس نەبووو واقف  نیگاهی چاوی مەستت وا لە حالاتی تەغافوڵ بوو

* * *

هەموو ئەشعاری دووشینم لە وەسفی لێوی نووشین بوو
دەچەسپا لێو بە سەر یەکدا حیکایەت هێندە شیرین بوو
عوبووری دڵ بە چینی زوڵفتە بۆ ماچی ڕوخسارت

قەڵەندەر ڕاستە بۆ چین دەچوو مەیلی بە ماچین بوو
لە کوڵمت هەرچی خارج بێ سەری ئەگریجە قەیچی کە
بڵێن با سەربڕینی خارجی بۆ ڕەونەقی دین بوو
بە ئیمای دیدەیی مەعشۆقە عاشق کێو لە بن دێنێ
لە لای «سالم» کەندەی بێستوون موژگانی شیرین بوو

* * *

شۆرەزاری خاکی ڕەی ئەم جارە دامەنگیرمە
ڕوو لە هەر وادی دەکەم خاری وەکوو زەنجیرمە
ئبتیدا بۆ ڕەی کە هاتم فیکری عەقڵم لێ نەکرد
حەبسی تارانم گوناهی کاری بێتەدبیرمە
وا لە ناو سینەی قەفەسما مورغی دەستئامووزی یار
بەم غەمە موستەوجیبم سەیدی حەرەم نەخجیرمە
کەی بە سەیحەی من دەگا جەزبەی موریدی خانەقا
پیری ئەو شێخێ موسینن‌ە و من جوانێ پیرمە
سادقی بۆ ئەهلی ئەم ئەییامە «سالم» سوودی کوا
سەر نەچوو کارم لە سیدقا نەوبەتی تەزویرمە

**تێهەڵکێشی غەزەلێکی حافیز:**

ئەگەر ئوممێدی دڵ بێرێتە جێ ماهی جەهانئارا
«بە خال هندویش بخشم سمرقند و بخارا را»
لە بن خاری موغەیلان وەسڵ ئەگەر بێ ئارزوو ناکەم،
«کِنار آب رُکناباد و گلگشتِ مصلّی را»
نەسێحەت بگرە گوێ جانا لە لایان زۆر بە تەعزیمە،
«جوانان سعادتمند، پند پیر دانا را»
دوسەد جار گەر بە گوێ خومم حەرفی ساردت بشنەوم شادم
«جوابِ تلخ میزیبد لبِ لعل شِکرخارا»
ئەگەر حووری لە کەوسەر شوستوشۆی خۆیدا بە تۆ
«بە آب و رنگ و خال و خط چە حاجت روی زیبا را»
لە ئیدراکی شکەنجی حەڵقەیی زوڵفی پەریشانم

«که کس نگشود ونگشاید بـه حکمـت ایـن معمـا را»

که شوعلەی تەلعەتی یۆسف تولـووعی کـرد چـیم زانی؟

«که عـشق از پـردەی عـصمت بـرون آرد زُلیخـا را»

کەلامت «حافظا» دڵسەنجە بـۆ «سـالم» وەهـا چاکـە

«کــە بــر نظــم تــو افــشاند فَلَــک عقــد ثریــا را»

* * *

لەبەر تەعمیری ئەم وێرانە جەننەت موڵـکی ئـادەم بـوو

حەقیقەت پادشاهی کرد، لیکن مـوددەتی کـەمبـوو

خوەشا ئەییامی گریانم لە خـاکی کەعبــەیی مەقـسوود

هەموو قەترەی سروشکم بۆ شەرەف وەک ئاوی زەمزەم بـوو

خەمیری خاکی من ئەووەڵ بە بارانی فـەرەح نـەکرا

جوانی و پیری و تفڵیم سەراسـەر جوملـەگی غـەم بـوو

لەسەر سەبزەی چەمەن یاری سوهیقـەددم کـە جیلـوەی

لە سوجدەی خاڵی لای لێوی، بەنەوشە گەردەنی خەم بـوو

بە قوربی خەڵوەتی دڵبەر نەنازی ئەی سـەبا زینـهار

لە جێ تو پێشتر «سالم» دەمێ هامڕازی مـەحرەم بـوو

* * *

ساقی لە پەردە دەرهات جامی شـەرابی هێنـا

دڵ خیرە ما لە حیرەت مـەهــ ئافتـابی هێنـا

یەک زەڕڕە عەکسی پەرتەو دەرکەوت و تووری سووتاند

ئاوینە سەختڕوو بوو لەو عەکسە تـابی هێنـا

تیماری چاکی سینەم ڕاجع بە چـاوی مەسـتە

بەختیش موافیقی عشق، بۆ من خراپـی هێنـا

یارم لە ئەندەروون هات دەسـتی ڕەقیـب لـە دەسـتا

غەمناک و شادمانم، ڕەحمـەت عـەزابی هێنـا

بۆ تەوبە سووی مەسجد هـاتم بچـم، لـە ڕێـدا

بۆ کووی مـەیفروشـان عـەزمم شـتابی هێنـا

ڕوو هەر لەمن ئەپۆشێ وا حاڵـیە کـە جبریـل

هەر خاسە بۆ من و ئەو ئایەی حیجـابی هێنـا

وەی وەی چە مەجلیسێ بوو! دوێنـێ لـە دیـدە و دڵ

دڵـبەر شـەرابی گێـڕا «سـالم» کـەبابی هێنـا

*دیوان سالم*، بەغدا، ١٣٥٢ ک. م. *تـاریخ سُـلیمانّیه*، ل٢٦٣.

*مێژووی ئەدەبی کـوردی*، بەغـدا ١٣٧١ ک. م. ل ٢٢٨.

کچی مەولانا خالیدی شارەزوورییە کە ساڵی ١٢٤١ ک. م. هاتۆتە دنیا و لە زیرەکی و زەین‌تیژیدا بلیمەتی ڕۆژگار بووە؛ زبان و ویژەی فارسی و عەرەبی و کوردی زانیوە و لە شیعر و پەخشاندا قەڵەمێکی بەقەوەتی هەبووە و لە فیقها سەری‌دەرچووە و تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە و زۆرێک لە ژنانی دمشق لە خزمەتیدا ـ چ لە باری شەریعەت و چ لە بواری تەریقەتەوەـ بەهرەیان بردووە.

خاتوو فاتمە ساڵی ١٢٨٠ ک. م. شووی بە یەکێک لە ناودارانی دمشق کردووە، کە لە مریدانی بابی پایەبەرزی بووە و لە ١٢٨٦دا بۆ حیجاز چووە و لە مینادا بە مەرگی مفاجا، دنیای بەجێ‌هێشتووە. تەرمەکەیان بۆ مەککەی پیرۆز بردووە و لە موعەللاتدا ناشتوویانە.

*الانوارُالقُدسیّة*. *یادی مەردان*. *بغیةُالواجد*.

## مەلا ئەحمەدی چاومار

مەلا ئەحمەدی موفتی، کوڕی مەلا مەحموودی پیرحوسەینی، مەشهوور بە «چاومار»، خوێندنی بە لای باوکی و شێخ مەعرووفی نۆدێیی و مەلا عەولای ڕەشەوە تەواو کردووە و لە شێخ مەعرووف ئیجازەی وەرگرتووە. ئەم مامۆستایە ساڵانێکی ئازگار، لە مزگەوتێ کە بۆخۆی لە سلێمانی بنیاتی ناوە، دەرسی گوتۆتەوە و زانایانێکی وەکوو: مەلاوڕەحمانی پێنجوێنی و موفتی زەهاوی و شێخ ئەحمەدی فائیزی بەرزنجی بە لایەوە خوێندوویانە.

مەلا ئەحمەد ساڵی ١٢٥٥ ک. م. سەپەرشتی کۆڕی مامۆستایانی سلێمانی پێ درا و ساڵی ١٢٧٩ بوو بە موفتی ئەوشارە و سەرەنجام ساڵی ١٢٨٨ ک. م. لە سەفەری حیجازدا، سەفەری یەکجاری کرد.

پێشەکی *دیوانی بێخود*.

## یومنی ئەفەندی

سولەیمانی یومنی ئەفەندی، لەدایک‌بووی ساڵی ١٢١٧ ک. م. شاری سلێمانی، شاعیرێکی زانا و نووسەرێکی توانا بووە کە هەر پێگەیشتووە ئینشابەندیی میری بابانی کردووە. دواجار هاوڕێ لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابانـدا بۆ ئەستەمبووڵ چووە و هەر لەوێ ماوەتەوە و سەرەنجام لە دەورانی پاشایەتی عەبدولعەزیزخانی عوسمانی (١٨٦١-١٨٦٧ ز.)، ساڵی ١٢٨٨ ک. م. لە دنیا چووە.

یومنی ئەفەندی دیوانی شیعر و هێندێک نووسراوەشی هەبووە کە بەشێکیان چاپ کراوە.

*مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٢٢٣. *تاریخ سُلیمانیّه*، ل٢٥٧.

## ئولفەتی سنەیی

مەلا ئەحمەد، نازناو «اُلفَت»، کوڕی مەلا موحەممەد مەهدی یەکەمی شێخولیسلام، دوای کۆچی دوایی بابی لە ساڵی ١٢٤٠ ک. م. بوو بە شێخولیسلام و لە قازییان و زانایانی هەڵکەوتووی سنە بوو. ڕەونەق لە ژینامەکەیدا وای لە بارەوە دەنووسێ:

«جوانی است الیف و مهربان و شیرین‌زبان؛ ظریف و سخندان؛ بە فطانت فطری آراستە و بە رَزانت رأی پیراستە؛ لَبیبی کامل و ادیبی عاقل؛ حَسَب را بە حُسن وفا پیرایەبند و نسب را بە لطف صفا سلسلە پیوند. در کسوت بَشر، مَلَک فطرت است و در صفوت گُهر فَلَک رُتبت. خَلَف ملامهدی شیخ‌الاسلام است و آباء سَلَف را از او زندەنام و خود نیز ولایت را شیخ‌الاسلام. مُتجاوز از سیصدسال است، در این ولایت اَباً عن جَدٍّ بە مناصب بلند و مراتب ارجمند شیخ‌الاسلامی و قَضا بهرەمند بودەاند. غَرَض ذات ستودە آیاتش بە جمیع کمالات صُوَری و معنوی قرین و شخص وجودش از تمام رذایل ظاهری و باطنی گوشەنشین. در مراتب سخنوری، طبعش بە نظم غَزَل مایل و شایق است و در این فن بر همگنان فایق...»

**واتا**: لاوێکی دڵاوا و میهرەبان و شیرن زمان و وردبین و قسەزانە کە بە زیرەکی سرشتی و ژیری ڕازاوەتەوە. مژیوەرێکی تەواو و وێژەوانێکی ژیرە. لە باری بابانەوە، بە ئەمەگداری و جوامێری ناسراوە. لە بەرگی مرۆڤایەتیدا، دەڵێی پەرییانە و لە بێخەوشی گەوهەریدا، جێگای تەشقی ئاسمانە. جێگری بەجێگەی مەلا مەهدی شێخولیسلامە. پێشوانی بە هۆی ئەمەوە ناویان نەکوژاوەتەوە و پتر لە سێسەد ساڵە لەم وڵاتەدا پشت بە پشت، پلە و پایەی بەرزی شێخولیسلامی و دادوەرییان هەبووە. بەکورتی هەموو چاکەیەکی تێدا جوورە و لەوەی خراپەیە دوورە. لە باری قسەزانیوە، زۆرتر وازی لە غەزەلە و لەم بارەوە لە هەموو هاودەنگانی سەرە ...

زا و مەرگی ئولفەت ساڵانی ١٢٢٤ و ١٢٨٩ ک. م. ڕووی‌داوە.

**چەند نموونە لە شیعرەکانی**:

نشستە زیر اَبرو خستە چشم یار، می‌ترسم — نشستی کردە است این طاق و زین بیمار می‌ترسم
بە راە عشقبازی صد هزاران فتنە پیش آید — مکن منعم گر از پیش آمد این کار می‌ترسم
میان آب، از آتش کی اندیشد کسی جُز من — کە در موج سرشکم زاە آتشبار می‌ترسم
خَطَش سَر زد دلم می‌لَرزد «الفت» روز و شب آری — من بدبخت زین روز سیە بسیار می‌ترسم

* * *

دیگر امشب دل سودازدە غوغا دارد — با خیال سر زلفت سر سودا دارد
نتوان قطع نظر کردن از آن عارض و خط — سبزەزار است و بهار است و تماشا دارد
زان خط و زلف سیە بر همە خوبان جهان — نازنین من اگر ناز کند جا دارد

* * *

یکڤ دَمی سَرت گردم، کاکُلی پریشان کُن | بَزم مَی‌پرستان را رشکِ سُنبلستان کُن
کُشتنم هوس بودش لیکڤ از آن پشیمان شد | گر توانی ای طالع زین رَهَش پشیمان کُن
بستگان زلفت را یا خلاص یا کُشتن | هرچه مصلحت بینی، چارەی اسیران کُن
تا چند در شمار کم و بیش بوسەای | با طفل دل، که هیچ نَفَهمد حساب را
مطبوع و دلپذیر از آن پای تا سری | سرو قدت ز چشمەی دل خورده آب را

*حدیقەی امان‌اللهی*، ل٥٤. کەشکۆڵی دەسنووسی مەلا لوتفوڵای شێخولیسلامی سنەیی. *مجمع الفصحاء*، ب٢، ل١٠٥. *بهترین اشعار*، ل٢٩. *لُغت‌نامەی دهخدا*، پیتی الف، ل٥٢.

## موحەممەد فەهمی

کوڕی مستەفا عومری، خەڵکی مووسڵ، زانایەکی شاعیر و وێژەوانە کە ماوەیەک لە بەغدا سەرپەرشتی دیوانی ئینشا و چەند مەقامی تری بووە و لەودوا لە لایەن حوکمەتەوە، بە شابەندەری بۆ کرماشان ناردراوە و کە لە ئێران گەڕاوەتەوە، پارێزگاری پارێزگای سلێمانی پێ دراوە و هەر لەوێ بەشی لە دنیا بڕاوە و بەرامبەر بە وەسیەتی خۆی، تەرمەکەی براوەتەوە مووسڵ و لەوێ نێژراوە.

فەهمی بێژگە کوردی و عەرەبی، زبانی ترکی و فارسی و فەڕانسیشی زانیوە و هێندێک نووسراوەی لێ بەجێ‌ماوە. جاروبار شیعریشی گوتووە و دیوانێکی شیعری هەیە.

زا و مەرگی فەهمی ١٢٤٥ و ١٢٩٠ ک. م. ڕوویداوە.

*الأعلام*، زرکلی، ب٧، ل٢٢٥.

## شێخ ئیسمایلی شیروانی

مەولانا شێخ ئیسمایل، ناسراو بە «امیرُالکُرد»، خەڵکی شیروان لە باکووری کوردستانە کە ساڵی ١٢٩١ ک. م. لە دنیا چووە و لە شاری ئاماسیەدا نێژراوە؛ بە زبانی کوردی و ترکی شێعری گوتووە و دیوانێکی لێ بەجێ‌ماوە.

*مشاهیرالکُرد*.

## شێخ حوسەینی نەقیبی بەرزنجی

شێخ حوسەینی قازی، کوڕی سەید مەحموودی نەقیبی بەرزنجی، ساڵی ١٢٢٥ ک. م. لە یەکێ لە ماڵەگەورەکانی سلێمانییەدا هاتۆتە دنیا و خوێندنی لای عەللامە شێخ مەعرووفی نۆدێییەوە تەواو کردووە

و دواجار بە بۆنەی لێهاتوویی سرشتی و تێکۆشانی زۆر لە بواری تۆژینەوە و دەرس‌گوتنەوەدا، وەکوو مامۆستایەکی زانا و شارەزا ناوی‌دەرکردووە.

شێخ حوسەین ساڵی ١٢٦٩ ک. م. هاوڕێ لەگەڵ خاڵی (حاجی کاک ئەحمەدی شێخ، کوڕی شێخ مەعرووفی نۆدێیی)، چۆتە بەغدا و بوونەتە میوانی مەلا موحەممەدی فەیزی زەهاوی، موفتی بەغدا. شاعیری بەناوبانگی عیراق، عەبدولباقی عومەری، لە شەوی ئاخری مانەوەیاندا، بۆ دیتنی موفتی چووە و دوای ئاشنا بوون لەگەڵ میوانەکانیدا، ڕووی قسەی کردۆتە شێخ حوسەین و ئەم بەیتەی پێدا گوتووە:

شُرْف بغداد كَما شُرْفَ الـ ـعرش بنَعْلَيْ جَدِّكَ المْمُصطفى (ص)

شێخ حوسەینیش دەسبەجێ ئاوای وەرام داوەتەوە:

جسمي بجَميعه بحَق الباقي في الحُبّ،غدا مَنازل الاشواق
أما خَلَدي فَقَدْ غَدا ذا لَهَب من، فرقَتكُمْ، فكيف حالُ الباقي؟

ئەم دوو بەیتەش هی شێخ حەسەنە:

عَشيَّةً بتُّ عُني بابه وَ قَد راى دمعي جَري سائلا
فَقال لا تَبْك عَلي بابنا قُلْتُ لهُ: لا تَنْهَر السّائلا

**لە کتێبەکانی**: «*داستان شیخ صنعان و دختر ترسا*»، بە شیعری فارسی، هۆنراوەی «*لیلی و مجنون*»، بە عەرەبی، «*سراجُ السّالکين*»، بە فارسی، «*میلادی نەبەوی*» بە کوردی.

شێخ حوسەین ساڵی ١٢٩٢ ک. م. کۆچی دوایی کردووە.

لە کتێبی «*تاریخ سُلیمانیّە*»دا، زا و مەرگی شێخ، ١٢٠٥ و ١٢٨٥ ک. م. نووسراوە. مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە «*دەقەکانی ئەدەبی کوردی*»دا، ئەم ساڵانەی ١٢١١ و ١٢٨١ ک. م. فەرمووە؛ کەچی لە «*مێژووی ئەدەبی کورد*»دا، بە ساڵی زایینی، ١٧٩١ و ١٨٧٠ی هێناوە. بەڵام کە شکمان لەوەدا نییە شێخ مەحموودی بابی شێخ حوسەینی نەقیب، ساڵی ١٢٠٠ لە دایک بووە، بێ شک دەبین کە ئەو ساڵانە هەرسێکیان هەڵەن!

*دەقەکانی ئەدەبی کوردی*، ل١٧٩. *تاریخ سُلیمانیّە*، ل٢٤٦. *مێژووی ئەدەبی کورد*، ل٥٤٢.

## مەلا موحەممەدی مینبەری

عارفی دڵئاگا و زاهیدی تەرکەدنیا، مەلا موحەممەدی مینبەری، کوڕی وەیس‌موحەممەد، خەڵکی گوندی «نیەر» لە ناوچەی ژاوەرۆ، ماوەیەکی زۆر لە زێدی خۆی دەرسی گوتووە و خەڵکی ڕێنوێنی کردووە. لە ساڵانی دوایی ژیانیدا کۆچی کردووە بۆ سنە و لە مزگەوتی دارۆغەی ئەو شارەدا ئەرکی دینی و زانستی خۆی بەڕێوە بردووە. خەڵکیش ئەوپەڕی ڕێزیان لەم مامۆستا پایەبەرزە گرتووە و «حاجی مامۆسا»یان پێ

گوتووە.

حاجی مامۆسا پیاوێکی پیرۆز، ئاکارجوان، بەرزەمژ و خۆشەویست بووە و لە باری بێمبالاتی بە دنیا و نەوس کوژیدا، هەموو لەمپەرێکی پەڕاندووە و قەت تێکەڵیی دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندانی نەکردووە.

فەرهادمیرزای «مُعتَمدالدّوله»، مامی ناسرەدین شا ـکە ئەودەم حاکمی سنە بووەـ زۆری حەزکردووە چاوی بە حاجی مامۆسا بکەوێ و چەند جار کەسی ڕاسپاردووە: یان مامۆستا تەشریف بێنێ و گەورەم بکا، یان ڕێ بدا بگەمە خزمەتی و بەهرەیەکم دەس‌بکەوێ. حاجی مامۆسا جوابی داوەتەوە: دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە خۆشە؛ ئەمن دەروێشێکم لە کونجی حوجرەیەکدا دەژیم و شتێکم پێ نییە شیاوی نیشاندان بێ. نە ئەم کونجە تەنگ و تاریکە بۆ میوانداری لە میران دەبێ و نەش خزمەتی دنیاداران چوون، ئەرکی سەرشانی دەروێشانە. لەباتی هاتنە لای من، ئەو خەڵکە هەژارە بحاوێنێتەوە کە هۆی ڕەزای خودا و ئاوەدانی وڵاتە.

فەرهاد میرزا لەسەر ئەم ڕاسپێرییە، فەرمانی داوە چیتر لە خەڵک «دەرمالانە» وەرنەگرن؛ کە ڕەسمێک بووە، دەرکی مالانیان لێداوە و لە هەر خاوەن‌ماڵێک پارەیەکیان تەڵەکە کردووە و هەموو ساڵێک، بە سەعری ئەو سەردەمە، دەوری پازدەهەزا تمەنیان کۆ کردۆتەوە؛ کە پووڵێکی یەکجار زۆر بووە.

ئەو فەرمانە ـکە لەسەر بەردێکی مەڕمەڕ هەڵکەنراوە و لە گۆشەی دیوارێکی مزگەوتی «دارولئیحسان»دا نراوەتە کار ـ ئێستاش ماوە.

حاجی مامۆستا لەو کاتەدا تەمەنی پتر لە حەفتا و مرۆیەکی زۆر بێ‌هێز و لاواز بووە. هەموو هەینییەک بۆ بەشداری لە نوێژی جومعە، لە مزگەوتی دارۆغەوە بە پێیان چووە و لەبەر دووری ڕێگاکە، تەواو ماندوو بووە. فەرهاد میرزا کە ئەمە بیستووە، ئەسپێکی نەرم و خۆش‌ڕەوتی بۆ ناردووە با مامۆستا چیتر بە پێ هاتوچۆ نەکا. ڕاسپاردەی حاکم ئەسپەکە لە دەری مزگەوتەوە ڕادەگرێ و خۆی ئەچێتە ناو و دەبینێ مامۆستا لە بەر دەرکی حوجرەکەی دانیشتووە. سەلام دەکا و مەبەست لە هاتنی ڕادەگەینێ. حاجی مامۆسا دەفەرموێ: ئەسپەکە کوا؟ عەرز دەکا: وا لە دەرەوە بەستوومەتەوە. دەفەرموێ: باشە لەو چەند پلەوە بیهێنە سەر بۆم. کابرا ئێژێ: قوربان شتی وا چۆن دەکرێ؟! ئەفەرموێ: ئەمن لەو حوجرە بەولاوە، نە شوێنێکم هەیە ئەسپی تێدا ڕاگرم، نەش بەم پیری و زورهانییە، مەیتەریم پێ دەکرێ. سەلام و سپاسم ڕاگەینە و بیبەوە. تا بتوانم، بە پێیان دەچم و نەشمتوانی، خوا لە وزە بەدەر، لە بەندەی خۆی ناوێ و دەفەرموی: «لاَیُکَلِّفُ‌اللهُ نَفْساً إلاّ وسْعَها».

کۆچی دوایی حاجی مامۆسای نیەری لە شاری سنە و ساڵی ١٢٩٢ ک. م. ڕووی‌داوە.

بنەماڵەی ئەو پیاوە بەرزە، ئێستا بە «مینبەری» ناسراوەن.

*خاطرات و یادداشت‌های من.*



## یۆسفی شوکری خەرپووتی

کوڕی عوسمان، کوڕی مستەفای حەنەفی خەرپووتی، لە مامۆستایانی زانستە ئیسلامییەکان، بەتایبەت تەفسیر بووە کە ماوەیەکی زۆر لە مەدرەسەی شێخ وەفا لە ئەستەمبووڵ دەرسی گوتووە و ساڵانی دوایی ژیانی، بە کۆچ بۆ مەدینەی پیرۆز چووە و لە قوتابخانەی مەحموودییەدا درێژەی بە دەرس گوتنەوە داوە و سەرەنجام ساڵی ١٢٩٢ ک. م. بەشی لە دنیا بڕاوە.

یۆسف شوکری لە سەرەتای لاویدا ماوەیەک لە خزمەتی مەولانا خالیدی شارەزووری بووە و تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە و بۆتە یەک لە خەلیفەکانی.

**لە کتێبەکانی**: «*قاموُس الا یقان عَلَی البُرهان*»، لە مەنتیقدا، «*رُموُز التوحید*»، لە عەقایددا و «*سلسلةالصّفا لمُحَمَّد المُصطفی*» (د).

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٥٧٠. *لُغت‌نامەی دهخدا*، چاپی ١٣٢٥، پیتی ی، ل٤٠٠.

## سەید فەتاحی جەبباری

سەید فەتاح، کوڕی سەید مستەفا، کوڕی سەید ئیسماعیل و پشتی چوارەمی سەید جەببار، ساڵی ١٢٢٢ ک. م. لە گوندی «بانگوڵ»ی سەر بە کەرکووک لە دایک بووە و دوازدە ساڵان، هەر لەوێ بۆ مەکتەب چووە و لای مەلا ڕۆسەم ناوێک، ڕەشخوێنی قورئان و خوێندن و نووسین فێر بووە و پاشان لە کەرکووک و سلێمانی و هەولێر و ڕواندز و شنۆ، شوێنی خوێندنەکەی گرتووە؛ تا ساڵی ١٢٤٨ ک.م. کە بابی لە دنیا چووە، دەستی لە خوێندن بەرداوە و پیشەی باب و کاڵی (کشت و کاڵ)ی دەسپێکردووە و سەرەنجام ساڵی ١٢٩٤ ک. م. لە تەمەنی ٧٢ ساڵیدا لە گوندی «تاویربەرز» کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەیان بردۆتەوە بانگوڵ و لەوێیان ناشتووە.

سەید فەتاح مرۆیەکی زیرەک و شاعیرێکی قسەزان بووە و زبانی کوردی و فارسی و عەرەبی و ترکی زانیوە و بەم چەند زمانە شیعری گوتووە و نازناوی «مەلا»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

**لە شیعرەکانیەتی**:

| | |
|---|---|
| میرزام! یە وەعدەی نەووەهارانەن | سەرەتای تلمیت خاتردارانەن |
| فەسڵ وەسڵ دۆست سەیر هەردانەن | لەرەی لەرزانەی زەنەخدارانەن |
| زەمزەمەی بوڵبوڵ، دەبدەبەی گوڵەن | نەزارەی هوزار دەروون پڕچڵەن |
| نەقارەی منقار تەیران سوبخێز | بێزەنان نەغمەی نەکیسای پەروێز |
| چریکەی مەلان چوون حەنجەرەی عوود | مەر دەنگ چل‌چەنگ پەنجەی باربوود |
| هووهووی بایەقوش شەو وە هەردەوە | زام دەیریان تازە کەردەوە |

دەنگ قیڕەی قاز سوب لە سەحرای سووس
مەر موزیقەی مەشق شەهەنشای عەرووس

تیپ‌ــتیـپ قوڵـنگان، قـەتارەی قـازان
مـــیرزام! تـــاوەڕۆژ ئـــاوات مـــەوازان

جەرەس وە ئاهەنگ خـوەش قانوونـەوە
دەنـگ وە سـەدای سـاز ئەرغەنوونـەوە

قـومری وە قـانوون قووقـووی وێـشەوە
مـــەل وە تـــەوق زەوق ســـەفارێژەوە

قووقووشەن وە فـەرق شـاخ سـەروەوە
مــەر حــاجی وەرای ســەفا و مــەروەوە

فەرش فەرەحبەخش سەوزەی قـەدەمخێـر
فەرش بیەن وە موڵک سەحرای گەرمەسێر

دەی‌سا جەی دەمدا هەرکەس دڵـش بـۆ
چون بولبول هەوای سەودای گوڵـش بـۆ

یـاخۆ چـون فـەرهاد دڵ ئـاهرین بـۆ
مــەزەی مــەزاقش نــام شــیرین بــۆ

مەبۆ عەزم سەیر سـەوزە و سـارا و کـۆ
دامـانش نـە هـوون دەروون داران کـۆ

نـــەو فـــەیز فتـــۆح نـــەووەهارەوە
نـەو بـەیزای ئـەنوار کـۆی دڵـدارەوە

سەیر سەحرا و دەشت، سـەر دیارانـەن
ناڵـــــەی مـــــورغزار مێرغوزارانـــــەن

دۆســـت لـــە بەهانـــەی دڵـــستانی بـــۆ
لاقەیـــد لـــە جـــواب «لَـــنْ‌تَـــرانی» بـــۆ

شـەو سـەرگەردانان سـەر ئـازاد کـەرۆ
شـــوانان وادی ئیمـــەن شـــاد کـــەرۆ

هەر «مەلا»یش نیشۆ شەو لـە دەیجـووردا
نەو تـیرەی تاریـک سـیای بـێ‌نـووردا

* * *

شــیرین تاتاکــەرد، شــیرین تاتاکــەرد
تای تـوغرای تۆمـار زێـڕش تاتـا کـەرد

کووکوو، کۆی کەلان عەنبەروەلا کـەرد
خەرمەن‌ـخەرمەن میسک خوتـەن وە بـا کـەرد

پەنجە بەرد پەرچین جە هەم جیـا کـەرد
تەخت پیشانیش بـەدری دوجـا کـەرد

حاجیان دوو قەوس پایەی سەما کـەرد
موژان تەور تـیر توشـنەی غـەزا کـەرد

گیسووی سەراوێز چوون بـەڕەزا کـەرد
سەر نە تۆی جامـە و دوگمـە و قـەبا کـەرد

سـاق‌سـتوون سـیم تـازە جـەلا کـەرد
خڕەی خڕخاڵـش خـەلای بـالا کـەرد

دەم نوکتەی مەدهۆش «لایُجَزّی» کـرد
لە وولـەی گەوهـەر لۆلـۆی لالا کـەرد

خەم چەشمەی حەیات کەس نەنۆشا کەرد
چەن کەس چوون یۆسف خەریکی چا کەرد

غەبغەب چوون تورنج کەس نەبۆسـا کـەرد
گەردن سەرای ساف سەبووی سـەبا کـەرد

وەو شنۆی شەوبۆ شەماڵ شـنیا کـەرد
نە سایەی سەمەر لیمـۆش جیـا کـەرد

پاش چەند بەیت، لە کۆتاییدا دەڵێ:

نەمەز پەنجەی پای حوجرەی حـەنا کـەرد
یان وە هوون سورخ جەرگ «مەلا» کـەرد

*مێژووی ئەدەبی کوردی*، چاپی بەغدا، ١٣٧١(١٩٥٢ ز.)، ل٢٧٧ و ٢٧٨.

## شێخ یۆسفی سنەیی

شێخ موحەممەد یۆسف، کوڕی شێخ موحەممەد حەسەن، کوڕی شێخ موحەممەد قەسیم، کوڕی شێخ مەحموود، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامەی تەختی، لە پیاوە زانا و ویژەوان و شاعیرەکانی بنەماڵەی مەردۆخییە کە لە باری زیرەکی و پیتۆڵی و زەوقی یەکجارەوە، هەڵکەوتوو و لای والیانی کوردستانەوە پلە و پایەیەکی بەرزی هەبووە و لە جێی باب و باپیرانیدا، لە مەدرەسەی «دارولئیحسان»، دەرسی گوتۆتەوە.

شێخ یۆسف لە غەزەلێکدا ئاماژە بەوە دەکا کە بابی لە بنەماڵەی زانست و دایکی لە خێزانی گەورەماڵی وەکیلە:

مَنَم که دست فضیلت بر آسمان دارم — منم که نسل ز هر دو سرا از مهان دارم
پدر زدوده‌ی اَقطاب و مادر از وُکلا — ولی نه فخر از این و نه عزّ از آن دارم
ز یُمن نیرو بال هُمای دانش و علم — به شاخ سدْرَه بر از رفعت آشیان دارم
نه از «حَسن» که از اجناس حُسن اخلاقش — هزار بسته‌ی سرمایه در دکان دارم
توان به باغ مدیحش درآمدن حاشا — اگر چو سوسن آزاد صد زبان دارم
نه از «قَسیم» که از آفتاب تربیتش — به کوه سینه هزاران هزار کان دارم

کاتێ کە ڕەونەق ژینامەی «*حَدیقە*»ی کۆتایی پێ هێناوە (١٢٦٦ ک. م.) ئەم هێشتا لاوێکی تازە پێگەیشتوو بووە؛ بەو حاڵەش ئاوای لە بارەوە نووسیوە:

«فاضلی است عزیز و کاملی صاحب تمیز؛ جوانی حبیب و نسیب ونکته‌دانی ادیب و لَبیب؛ در فصاحت سَحبان زمان و در بلاغت فخر اَماثل و اَقران. شغلش تدریس و کارش تقدیس؛ از تقریرش منطق و حکمت پایدار و تحریرش علوم ریاضی را مدار. صرف عُمرش در اَنحای اصول و کلام است و در اوضاع بدیع و بیان صاحب مهارتِ تام... گاهی تتمیماً لِفُنُون الکَلام شعری می گوید و در آن وادی به سمند شیرین‌زبانی راهی می‌پوید».

**واتا**:

« لاوێکی هێژای خۆشەویست و تەواوە؛ خاوەن باوان و قسەزان و ویژەوان و ژیرڤان. بۆ گفتڕەوانی، سەحبانی زەمان و بۆ گوتەجوانی، شانازی دەوروبەرییانە. پیشەی دەرس‌گوتنەوە و ئیشی بەندایەتییە. لە قسەی، مەنتیق و حیکمەتی پتەو دەردەکەوێ و لە نووسینی زانستی ڕیازی دادەمەزرێ. ژیانی لە بواری ئوسووڵ و کەلامدا تێپەڕ دەکا و لە باری بەدیع و بەیاندا، لێزانێکی بێ کەمایەسییە. جاروبارە، بۆ هەمەلایەن کردنەوەی لێهاتوویییەکانی زبانی، شێعرێک ئێژێ و لەو بوارەدا، بە ئەسپی شیرن‌زبانی ڕەوتێک دەکا».

شێخ یۆسف لە دواییەکانی چەرخی سێزدەدا کۆچی دوایی کردووە.

**ئەمەش چەند شیعرێکی یۆسف:**

عَجَب مـدار کـه زاهـد مُریـد جـام نـشد
نخست قسمت خاصان نَصیب عـام نـشد

حدیث زُلف تو گفتم به آرزو شـب دوش
دریـغ صـبح دمیـد و سـخن تمـام نـشد

دمیـد کوکـب طـالع ز بـادەام در جـام
ولی چه فایـده کـاین دولـتم مُـدام نـشد

ز جام بـاده تـوان یافـت سرّ حـق لـیکن
کسی ز میکده واقـف بـه سـرّ جـام نـشد

کبوتر دل مـا را بـه دیـر و کعبـه مخـوان
مجـال پـر زدن مـا بـر ایـن دو بـام نـشد

اگـر چـه نوگُـل خنـدان مـن زُلیخـا بـود
عَجَب که «یوسف» مصرش به جان غلام نشد

* * *

پُشت سُنبل بشکنی، تا چین کاکُـل بـشکنی
چین کاکُل بشکنی، تا پشت سُـنبل بـشکنی

می کُنی از شانه اَفشان زلف درهـم را بـه رو
دانم آخر شانه خواهی بر سر گُل بشکنی

مینـوازی دانـم ای نـاز پـدر آخـر ولـی
طفلی و ترسـم دلـم را از تغافُـل بـشکنی

رشتەی سحر است یا زُلفت بر آن چاه زنـخ
مُشک چین را رُتبه، یا بازار بابل بـشکنی

ای دل آماج دَعا را ناله گر زین سـان کنـی
چـون نـشان تیـر والـی بـیتأمـل بـشکنی

توبه را صدره شکستی «یوسف» از مردی وَلی
خَیل مُژگان را به جان دوست مُشکل بشکنی

*حدیقەی امان‌اللهی*، ل٤٢٢–٤٣٥. *مجمَع‌الفُصحا*، ب٢، ل٥٧٩.

## ئەحمەد بەگی کۆماسی

شاعیرێکی خۆش زەوق و زبان پاراوە کە بە شێوازی گۆرانی شیعری گوتووە و لەگـەڵ شـاعیری بـەناوبانگی کورد، مەولەوی تاوەگۆزیدا، دۆستـی و ئاموشۆ و شیعر گۆڕانەوەیان هەبووە و مەولەوی بە «خالـۆ» و «خالـۆی کۆماسی» ناوی لێ بردووە و خۆی نازناوی «ئەحمەد»ی لە هێندێک شیعریدا نووسیوە.

زا و مەرگی ئەحمەد بەگ سالانی ١٢١٠ و ١٢٩٤ ک. م. ڕوویداوە.

**چەند شیعری ئەحمەد بەگ:**

چــراخم! شــەوبۆ، چــراخم! شــەوبۆ
شــەوێ جــە شــەوان، چــراخم! شــەوبۆ

هەراس بیم جە داخ شەوبۆی زوڵف تـۆ
ناعەلاج چنـیم دەسـەی شـەوبۆی کـۆ

تا کە بۆی زوڵـفت کـەمێ بـەیۆ لـێش
بەڵــکەم زامــانم کــەمتر کــەرۆ ئــێش

چەنـد وە دڵ نیـام، ئـەو بـۆی شـەوبۆ
بۆ مەدا ئەمما نـەک چـوون زوڵـف تـۆ

فەدای ئەو دەس بام تۆش ئیجاد کـەردەن
زوڵــفانت گــرەو نــە شــەوبۆ بــەردەن

ئەر شـەوبۆی زوڵـفت بـدەم وە شـەوبۆ
دەیری بـوون نـەجـەمع دەیریـان کـۆ

«ئەحمەد» تا زیندەن هەر سەرگەردانەن
پەی شەوبۆی زوڵفت ویڵ هەردانەن

* * *

تا وەسەر یار بۆ، تا وەسەر یار بۆ
یار ئەو خاسەن، تا وەسەر یار بۆ

مەیلش وە وێنەی سەیل وەهار بۆ
دووری یار پەرێش چوون ژار مار بۆ

چوون کوورەی ئاهر بجۆشۆ وەتاو
وە بێیار نەشۆ، شەو نەدیدەش خاو

ئاه سەرد کێشۆ شەوان جە جێدا
بێزار بۆ جەوجا یار نەبۆ تێدا

* * *

دیدەی بێ خەوان، دیدەی بێخەوان
هامدەنگ ناڵەی دیدەی بێخەوان

کەس نیەن بێدار جە نیمەشەوان
مەر باد شەوخێز یا تاف ڕەوان

یەکێ جەوانە منەنان حاڵا
پەیوەستەن تا سوب ناڵەم وە باڵا

غەیر جە باد سوبح تاف ـ تاف نەفەس
نمەیۆم نەگۆش تا سوب سەدای کەس

ئومێدم بە تۆن تاک تەنیای فەرد!
یا هامڕاز، یا مەرگ، یا خۆ دەوای دەرد

ئەم دوو بەیتەی بۆ مەولەوی نووسیوە:

ئەر بۆ پڕووزێ وە مەلاڵەوە
یاوان وەلای تۆ جە شەماڵەوە

ئانە بۆپڕووز سفتەی جەرگمەن
مەعلوومەن مەعدووم! وادەی مەرگمەن

* * *

فەڵەک بەردەنم، فەڵەک بەردەنم
ڕاسەن سوجدەی دەیر تەرسا بەردەنم

مەی نە پای میحراب مەسجد وەردەنم
تەجدید مەزهەب عیسا کەردەنم

گرتەنم نە دۆش خەرقەی ڕوهبانان
کێشانم جاڕووی فەرش بوتخانان

فتوای بەرەهمەن گرتەنم نە گۆش
دینم دان وەمەڵ جە لای مەیفرۆش

ئانە گشت جە وەخت نادانیم بیەن
فەسڵ سەرمەستی و جوانیم بیەن

ئیسەها جە گشت پەشیمانیم بەرد
وادەی پیریمەن جوانیم ویەرد

وادەی پیریمەن یاوانم نەوبە
نەوبەی تەوبەمەن، کەرەمدار تەوبە

ئومیدەم ئێدەن وەنەم نەگیری
بویەری نەجورم وادەی کەمویری

**شین بۆ هاوسەرە بەوەفا و خۆشەویستەکەی:**

گڵکۆی تازەی لەیل، گڵکوی تازەی لەیل
ئارۆ شیم وەسەیر گڵکۆی تازەی لەیل

نەپایەی مەزار ئەو لەیل پرمەیل
نە دیدەم وارا ئەسرینان چوون سەیل

شیم وەسەرینش وە دڵەی پرجۆش
سەنگ مەزارش گرتم نە ئاغۆش

واتم: ئەی دڵسۆز قەیس لۆنگ نەکوڵ
موبارەکت بۆ یانەی تەنیای چۆڵ

سەر هۆردار نەخاک، سەوڵ خەرامان
من مەجنوون تۆم وەی تەور پێم ئامان

کۆچ بێوادەت، کاریێ پێم کەردەن
بێزارم جە گیان، ڕازیم وە مەردەن

گرەی نار عشق دووری باڵای تۆ
کاریێ پێم کەردەن نەونەمام نۆ،

وەختەن چوون قەقنەس ببۆن وە زوخاڵ
شاد بۆ وەگەردم زەلان و شەماڵ

یاخۆ وێنەی قەیس لێوەی پۆس نەکۆڵ
تەن بۆ وە خوەراک وەحشیان چۆڵ

سەوگەند بەو خاڵان فیرۆزەی شەوڕەنگ
بەو دەستەی زوڵفان پەشێویای پای سەنگ

جەو ساوە گەردش چەرخ پڕستەم
من و تۆش وەی تەور جیا کەرد جە هەم

تۆ بەردەن وەخاک سیای تەنگ و تار
من مام پەی سزا و جەفای ڕۆزگار

هەر ڕۆ چون مەجنوون خاتر جە خەم کەیل
هەر لەیل لەیلمەن نە هەردەی دوجەیل

خەمان پەژاران ڕەفیق ڕامەن
چەنی جەفا و جەور دایم سەودامەن

سپای خەم وەی تەور هوجووم ئاوەردەن
قافڵەی فامم وە تاراج بەردەن

زامانت سەختەن نەی دڵەی پەرێش
چوون جای مارانگاز زووخاو مەشۆ لێش

شەو کەیلەن هووناو وەلای جێگەمدا
کافر بەزەییش مەیۆ پیەمدا

یانەم وێرانەن دەردم دێویان
چوون ئاهووی وەحشی سەرلێم شێویان

شەوان زاری و شین، ڕوان ڕۆڕۆمەن
یەکجار وەسواسەی تەنیایی تۆمەن

حاڵ تۆ چۆنەن؟ شای وەفاداران!
هامڕازت کێیەن؟ سەبا و ئێواران

چ تەور مەویاری، چوونەن قەرارت؟
کیەن هامڕەفێق لەیل و نەهارت؟

نەو سەرای تاریک پڕخەوف و خەتەر
مودارات چوونەن لەیل نازپەروەر

جەباتی باهۆی قەیس غەمگینت
کام سەنگ سیا هانە سەرینت

داخم ئەو داخەن لەیل خاتر تەنگ
ئەو دەستەی زوڵفان سەودایی سێوەنگ

بەو شانەی چلچەنگ تۆ تاتای مەکەرد
ئیسە پەشێویان چوون ڕەیحان هەرد

تۆخەریک قەبر سیا سەردەنی
تەمام حەسرەتان وەخاک بەردەنی

سا پەی چێش سۆمای دیدەم تار نەبۆ
زیندەگی وەلام ژار مار نەبۆ

من تەنیا چوون قەیس لیوەی خەم خەڵات
زندە مەگێڵون نەڕووی سەر بیسات

وەلحاسڵ هەرچەند شین و زاریم کەرد
نەپای قەبر لەیل بێقەراریم کەرد

نە جوابێ دا پێم، نە زەڕڕەی دەنگ کەرد
یەکجار بڵێسەم نە گەردوون ویەرد

یە پەی چێش مەیلم جە لات سەرد بیەن
مەر عەهد دیرین جە یادت شیەن

مـــن وەی دڵـــەی زار بـــێقـــەرارەوە
وەی جامـــەی ســـیای یەخـــە پـــارەوە
هـــام نـــە ســـەرینت زارزار مەناڵـــۆ
خـــاک یانـــەی نـــۆت وەچـــەم مەماڵـــۆ
تۆ هـیچ نیـت وەقەیـد بـێقـەراری مـن
جەی ئەلوەدای بـەرز شـین و زاری مـن
نمەدەی جواب نوختەی خـاڵ بـێگـەرد
مەعلوومەن جە لات مەیلم بیـەن سـەرد
دیم سـەدایێ نـەرم جـە تـۆی خاکـەوە
جـەو یانـەی تاریـک حەسـرەتناکـەوە
ئامـا نـە گۆشـم چـوون هـەردە جـاران
واتـش ئـەی مـەجنوون ویـڵ کۆسـاران
سـەوگەند بـە واحـد فـەرد بـێهـەمتا
وە بـێوادە کـەرد مـن جـە تـۆ جیـا
ڕای جـــواو نیـــەن، دڵ بـــێقـــەرارەن
خەیلێ سەنگ و خاک وە جەستەم بـارەن
هەرچەنـد پـەری مـن زاری مەکـەری
هەرچەند سـەنگ سـەرد سـیا مـەوەری
هەرچەنـد پـەری مـن تـۆ ئەلوەداتـەن
ئـاخر سـەرەنجام ئـەم جاگـە جاتـەن
فایـدەش نییـەن سـوود نـەدارۆ پێـت
بـشۆ زاری کـەر پـەری بـەخت وێـت
هەرکەس دڵشاد بۆ پـەی دونیـای بیپـۆ
ئـاخر پەشـیمان مـەبۆ، ڕەنجـەڕۆ
«ئەحمەد» دمای کۆچ شـای جـەمینجامـان
ڕەستاخیز کـەرۆ تـا مـەرگ بـێسـامان

*پیرشالیار*، ل ٨٠. چەند جونگی دەسنووس.

## مەحاکی فونوونی

مەحموود، کوڕی ئەحمەد، نازناو «فُنونی»، لە هۆزی زەنگەنەیە کە لە دەور و بەری کەرکووک دەژین؛ بـەڵام مەحاک چۆتە نێو قەبیلەی داوودەی لای کرماشان، لە پاڵداوێنی کێـوی «ئومـەرمل» و هـەر لـەوێ ساڵـی ١٢٩٥ ک. م. لە دنیا چووە.

«مەحاک» هەر «مەحموود»ە و لە زبانی کوردیدا ئەم شـێوە دەستـێبردنانـە بـاوە و هـەر مـەحموودیان، «مچە» و «خولە»ش گوتوە.

محاک شیعریشی گوتووە و هێندێکی ماوەوەتەوە؛ ئەمەش یەکیان:

هەردەم خەیاڵـەن، هـەردەم خەیاڵـەن
پـەژارەی لـەیلم، هـەردەم خەیاڵـەن
دڵ مایـل وە شـەوق شـۆخ نەوهاڵـەن
حـۆری لـەقایێ، کـەمسـنوساڵـەن
دوو دیدەش نە تەرح دیدەی غەزاڵـەن
گۆنای گوڵ شێوەش ئامێتـەی خاڵـەن
تاتـای کلافـەی وێنـەی پـەڕ داڵـەن
گرێبەنـد پـێچ پـای دستماڵـەن
کلافـان ئـاوێز سـەحن جەماڵـەن
جەماڵـش گۆیـای عـەقـڵ و کەماڵـەن
لەب غونچەی گولان پای چەمچەماڵەن
سرشـتـەی قـودرەت زات بـێزەواڵـەن

سەرتاپای حوسنەن، یەکسەر جەماڵەن
لەی دونیا چوون ئەو کەس تر مەحاڵەن
نەسەر سینەی ساف دوو لیمۆی کاڵەن
باڵا چون عەرعەر، پەنجەی شمشاڵەن
هەزار چوون مەجنوون پەرێش عەوداڵەن
«فونوونی» نە وەسف، زبانش لاڵەن

گۆڤاری *دەنگی گیتی تازە*، ژ١١، ل ٢٣ و ٢٤. جونگێکی دەسنووس.

## مەلا عەلی قزڵجی

مامۆستای هێژا، عەللامە مەلا عەلی قزڵجی تورجانی، ساڵی ١٢٢٥ ک. م. لە گوندی «قزڵجە»ی سەر بە پێنجوێن هاتە دنیا و پاش پێگەیشتن و خوێندن، چوو بۆ «تورجان»ی لای سەقز و تا کۆتایی ژیان (دووشەمبە چوارەمی زیحەججەی ساڵی ١٢٩٥ ک.) هەر لەوێ خەریکی دەرس‌گوتنەوە و تۆژینەوە و نووسین بوو.

مەلا عەلی لە زانایانی گەورەی کوردستانە کە وتوویژ و کێشەی لەگەڵ عەللامە حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشی هەورامانی، لە مەڕ وردەکارییەکانی ئوسوول و فیقهەوە مەشهوورە.

عەللامەی قزڵجی خاوەن هۆش و زیرەکییەکی تایبەت و بیر و زەینێکی یەکجار بەهێز بووە و لە مێشکیدا دنیایەک زانست و زانیاری کۆوە ببۆوە.

**لە کتێبەکانی**: پەراوێز بۆ: «*جمع الجوامع*»، لە ئوسوولی فیقهـ «*تحفةُ المُحتاج*»، لە فیقهـ و «*تقریبُ المَرام، شَرح تهذیب الکلام*» لە ئوسوولی دین و حیکمەتدا، نامیلکەیەک لە «*مَقولات عَشر*»دا، هۆنراوەیەک بە ناوی «*مَحذوفات*»، هەڵبەستێک لە فەرائیز و هۆنراوەیەک لە تەجویددا.

قزڵجی پیاوێکی پارێزکار و مبارەک بووە؛ بەڵام خۆی بە هێچ تەریقەتێک نەسپاردووە؛ لە دڵەوە بڕوای بە شێخ عوسمان سیراجەدین بووە و ساڵێ جارێک بۆ زیارەتی، لە تورجانەوە بۆ تەوێڵێ چووە. هەروەها شێخ سیراجەدینیش ئەوی خۆش‌ویستووە و زۆری ڕێزلێ گرتووە. دەڵێن هەموو جارێک ئەگەر قزڵجی لە ماڵی خۆیەوە بۆ چاوپێکەوتنی شێخ، کەوتۆتە ڕێ، شێخ بە دەوروبەرەکانی گوتووە: بەم زووانە مەلا عەلی دەبێتە میوانمان!

خوالێ‌خۆشبوان مەلا موحەممەدی تورجانی‌زادە، مامۆستا لە بەغدا و ئەحمەدی تورجانی‌زادە مامۆستای زانستگای تەورێز، کوڕەزای مەلا عەلی بوون.

وەرگیراو لە پەراوێزی قزڵجی لەسەر *گلَنبَوی بُرهان*، چاپی میسر. *مشاهیر الکرد*، ب٢، ل٧٨.

## مەلا نەزیری تەوێڵێ

حاجی مەلا نەزیر، کوڕی مەلا ئیبراهیم، کوڕی مەلا مەحموود، کوڕی سۆفی ئەحمەد، زانایەکی پارێزکـار و ئەهلی تەریقەت و خاوەن کەرامەت بووە کە لە گوندی «تەوێڵێ» هاتۆتە دنیا و دوای تـەواو بـوونی دەرس و دەور و وەرگرتنی ئیجازە لای مەلا قاسمی شەرەکان، ماوەیەک دەرسی گوتۆتەوە.

ساڵانێکی لەودوا بە بۆنەیەکەوە سەفەرێکی بوخارای کـردووە و لـەوی یـەک لـە پیـاوانی خـوا بـە نـاوی دەروێش موحەممەد، مەشهوور بە «شاەساحیب»ی دیـوە و سـەری پـێ سـپاردووە چۆتـە نـاو تەریقـەتی نەقشبەندیوە و پاش ماوەیەک سەیر و سولووک، گەڕاوەتەوە زێدی خۆی.

مەلا نەزیر باپیری یەکێک لە مامۆستایانی بەناوبانگ بە ناوی مەلا سـاحیبە کـە لـە مزگـەوتی گـەورەی تەوێڵێدا دەرسی گوتووە و ئەهلی تەریقەتیش بووە. موحەممەد بەهائـەدین نووسـەری کتـێبی «*پیرشالیار و ضمائم آن*»، کوڕی ئەم مەلا ساحیبەیە.

زا و مەرگی مەلا نەزیر لە ساڵانی ١٢٠١ و ١٢٩٦ ک. م. ڕووی‌داوە.

*پیرشالیار و ضمائم آن*، چاپی بەغدا، ١٩٦٨ ز. ل ٨٨ و ٨٩.

## شێخ موحەممەد «بەهائەدین»

قوتبی عارفان، شێخ موحەممەد بەهائـەدینی نـەقـشبەنـدی ، نازنـاو و کەسـناو «اَبولبَهـا»، کـوڕی شـێخی تەریقەت، عوسمان سیراجەدینی نەقشبەندی، لە هەشتەمی مانگی ڕەبیعی‌سـانی ساڵـی ١٢٥٢ ک. م. لـە گوندی تەوێڵێ هاتە دنیا. مەلا حامیدی بێسارانی لەم بارەوە دەڵێ:

غـوث آفـاق، شـیخ عثمـان آنـکْ — قُطـب عـصر و پنـاه دوران اسـت
عـالم و هرچـه هـست در عـالم — همـه چـون قالبنـد او جـان اسـت
گُلـی از بـاغ دولـتش بـشکُفت — زینـت بوسـتان عرفـان اسـت
شـد مُـسَمّی بـه نـام خیـر رُسُـل — آن محمـد کـه جـان جانـان اسـت
هـشت مـاه ربیـع‌الاخـر کـرد — جلـوه آن گُـو چـو مـاه تابـان اسـت
هـاتفی گفـت: بهـر تـاریخش — «ایـن گُـل گلستان احسان اسـت»[1]

شێخ بەهائەدین ٤٦ ساڵ ژیاوە و ڕۆژی هەینی پێنجەمی ڕەبیعول‌ئەوەڵی ساڵی ١٢٩٨ ک. م. لە گونـدی «گوڵپ»، ڕۆحی بەرزی ڕووی لە جیهانی هەتایی کردوە.

ساڵی ١٢٨٣ ک. م. پاش کۆچی دوایی بابی پایەبەرزی، لە تەمـەنی ٣١ سـاڵاندا، بـە بۆنـەی هێژایـی و

١. بە حیسابی ئەبجەد ئەبێتە ١٢٥٢.

لێهاتوویی خۆی و ڕاسپێری باوکییەوە، لە سەر کورسی ئیرشاد دانیشت و تا دوا کاتی ژیانی، ماوەی ١٤ ساڵ، ڕێبەرایەتی مریدانی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستانی لە ئەستۆ بوو. لەو نێوانەدا ساڵی ١٢٩١ ک. م. سەفەرێکی حەج ڕۆی و پاش بەجێهاوردنی مەناسیک و زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان، گەڕایەوە تەوێڵێ.

شێخ بەهائەدین ـ وەک نووسیویانە ـ لە ژێر چاوەدێری باوکیدا، هەموو قۆناخەکانی تەریقەتی یەک لە دووی یەک، ناوەتە پشتی سەر و لە بواری «فەنا»وە گەیشتۆتە دواقۆناغی «بەقای ئەتەم» و کەشف و کەرامەتی زۆریان لێ گێڕاوەتەوە. شێخی سمرانی لە کتێبی «*بارقاتُ السّرور*»دا، چاوکەیەک لەوانەی باس کردووە.

شێخ جیا لە باری مەعنەوی و عیرفانی، لە بواری وێژەوانیشدا دەستی هەبووە و جاروبار شیعریشی گوتووە. ئەم دوو غەزەلە هی ئەوەن:

جلوه کُنان ماه من صبح گر آید به بام — مهر ز شرم رُخش روی نَهَد سوی شام
باد تو را ای صبا نقد دل و جان فدا — باری اگر آری از جانب یارم پیام
یار چنین نازنین صاحب عزّ و نگین — باد بر اهل قبول سَطوَت او مُستدام
گُل خَوی خجلت بریخت، سَرو ز رفتار ماند — کرد چو شمشاد ما سوی گلستان خرام
باد صفا می‌وَزد از طرف کوی دوست — رَو که نصیبت شود از کف ساقی دو جام
یافت مُراد دلش آنکه بدو بگروید — بنده شدش «بُوالبها» بو که بیابد مرام

* * *

از صفا و بهجت دوران کسی دلشاد نیست — غیر آن کو رَسته از خود، در جهان آزاد نیست
در نخستین گام ترک سر باید کرد، از آنک — صَید را آزادگی از دام آن صیّاد نیست
جلوه‌ای بنمای ای سر خیل خوبان تا شود — تازه آن عهدی که عهد لیلیش در یاد نیست
روی زیبا، چشم شهلا، قَدّ رعنای تو بس — حاجت ما را به سرو ناز یا شمشاد نیست
ای دل از من این نصیحت گوش کن، آرام باش! — شیوه‌ی عشاق کویش، شکوه و فریادنیست
«بوالبها» گر زانکه خواهی کشف راز عشق را — از سراجُ الدین طَلَب، چون وی کسی استاد نیست

*بارقاتُ السّرور*، *معدن النور*، شیخ سمرانی.
*سراج الطالبین*. یەک ـــ دوو جونگی تر.

## شێخ عوسمانی دیاربەکری

شێخ عوسمان پاش تەواو کردنی دەرس و دەور، ماوەیەکیش بۆ گرتنی ئیجازە، لە شام خوێندوویە و پاشان بۆ مەدینەی پیرۆز چووە و لەوێ مەنزڵی کردووە. ماوەیەک لەودوا تەریقەتی نەقشبەندی لە عارفی پارسا، شێخ ئەحمەد سەعیدی نەقشبەندی (؟-١٢٧٧ ک.م.)وەرگرتووە و سەرەتێک گۆشەنشینی کردووە تا لە



پلەی خەلافەت سەرکەوتووە و سەرەنجام لە دواییەکانی چەرخی سێزدەدا دنیای بەجیٚ‌هێشتووە.

*مناقب احمدّیه و مقامات سعیدّیه*، شیخ محمّد مظهر مجدّدی، ل٣١٢.

## حەسەنی قووزانی

شێخ حەسەن لە کوردانی باکوور و خەلیفەی مەولانا خالیدی نەقشبەندییە کە پیاوێکی هێزا و عارفێکی پارسا بووە و خەتی جوان نووسیوە و بەم بۆنەوە بە ناوی«خطّاط» شۆرەتی دەرکردووە و لە بڕانەوەی چەرخی سێزدەدا لە دنیا چووە.

*الانوارُ القُدسیّه*.

## عاکیفی وانی

مستەفا ئەفەندی، نازناو «عاکِف»، لە کوردانی وان و لە بنەماڵەی زانست و ئیفتایە کە ساڵی ١٢٥٢ ک. م. لە لایەن دەوڵەتی عوسمانیوە، مەقامی ئیفتای وانی پیٚ دراوە و ساڵی ١٢٦٢ لە ئەستەمبووڵ دەستی لە دنیا براوە. عاکیف پیاوێکی زانا بووە و لە شیعر و وێژەوانیش سەری دەرچووە.

لە دایک بوونیان ساڵی ١٢٢٧ ک. م. نووسیوە.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٤٥٩. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل١٩٤.

## فەسیح ئەفەندی حەیدەری

فەسیحەدین ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری، کوڕی سیبغەتوڵڵا ئەفەندی دووەم، کوڕی موحەممەد ئەسعەد سەدرەدین، لە بنەماڵەی بەناوبانگی حەیدەری و لە تۆرەمەی سیبغەتوڵڵا ئەفەندی یەکەمی حەیدەری حوسەین‌ئابادی ماوەرانی، ساڵی ١٢٣٥ ک. م. لە بەغدا هاتۆتە دنیا و ١٢٩٩ هەر لەو شارە لە دنیا چووە.

فەسیح ئەفەندی لە وێژەوانانی ناوداری عیراقە کە ژیانی بە خوێندنەوە و تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە و نووسین ڕابواردووە و ماوەیەکیش بریکاری دیوانی دادی بەغدا بووە و پێڕای دەرس‌گوتنەوە، بەو کارەش ڕاگەیشتووە.

**لە کتێبەکانی**:

١. *امْداد القاصد فی شرح المَقاصد*
٢. *شَرح دیوان اَبی تَمّام*
٣. *شرح دیوان مَعَرِّی*
۴. *اسْعانُ الطُّلّاب فی الأسْطُرلاب*
۵. *المجدُ التّالد فی مَناقِبِ مولانا خالد*

٦. *احسنُ الکَلام فی مَدیَنه السَّلام*
٧. *اَعْلی الرُّتبه فی شرح النُّخبه*
٨. *عنْوانُ المَجْد فی بیان احوال بغداد و البصرة و النَّجد*
٩. *اصولُ الخیْل وَ الابِل الجَیدَة و الرَّدیَّة*
١٠. *احسَنُ المَقال فی شرح رسالَة خلق الاعمال لِمولانا خالد النقشبندی*

*الاداب العربیّه*. *الأعلام*، ب١، ل٣٧. *مشاهیرالکرد*، ب٢، ل٤٢.

## نەعیمی خەرپووتی

حاجی عومەر ئەفەندی، کوڕی ئەحمەد، کوڕی موحەممەد سعیدی خەرپووتی، نازناو «نَعیمی»، لە زانایان و وێژەوانان و مامۆستایانی ناوداری شاری خەرپووتە کە ساڵی ١٢١٦ لە دایکبووە و ١٢٩٩ ک. م. لە دنیا چووە.

لە بەرهەمەکانی: «*شرحُ الاظهار*»، «*شرحُ الفریده*»، «*عَصیدةُ الشَّهدة فی شرح قصیدة البُردة*» و چەند کتێب و نامیلکەی تر.

*هدیةالعارفین*، ب٢، ل٨٠١. *ایضاح المکنون*، ب٢، ل٢٢٩.

## مەلا حامیدی بێسارانی

کۆی پاکی و مرۆڤانی، مەلا حامیدی بێسارانی، دەوری سالانی ١٢٣٠ ک. م. چاوی بە دنیا هەڵێنا و پاش تێپەر کردنی ژیانی منداڵی و کرچ و کاڵی، لە زێدی خۆی، «بێساران»ی سەر بە ناوچەی ژاوەرۆدا خوێندنی دەسپێکرد و پاش خوێندنێکی سەرەتایی، چوو بۆ سنە و لەوێ ـ وەک خۆی دەڵێ ـ لە تەمەنی بیستساڵاندا عارفی پارێزکار، حاجی موحەممەد سدیقی سنەیی، کە لە مریدانی پێشووی مەولانا خالیدی شارەزووری بوو، ناسی و هەر لە یەکەم چاوپێکەوتندا، دڵی لای ئەو یارە خوداییەوە دانا و سەری پێ ئەسپارد و تەریقەتی نەقشبەندی لێ وەرگرت و پای نایە ڕێگای سەیر و سولووکەوە. ساڵی ١٢٥١ ک. م. کە تاوی ژیانی حاجی حەمەسدیق ئاوا بوو، ئەمیش ڕووی لە ڕۆژئاوا نا و لە کوردستانی بەردەستی عیراقدا، خوێندنەکەی دەسپێکردەوە. هەر لەم سەروبەندانەش، پیتی ئاشنایەتی لەگەڵ شێخ عوسمان سیراجەدیندا ڕوویتێکرد و بەو بۆنەوە، پەیمانی لەگەڵ تەریقەتی نەقشبندیدا تازە کردەوە. ماوەیەک لەودوا گەڕاوە بۆ سنە و دیسانەکە دەرس و مەدرەسەی ئاشت کردەوە؛ بەڵام تاوی ئەوینی پیری تەریقەت، دەرەتانی لێ بڕی و بەرەو «دارُالارشاد»ی تەوێڵێ ڕایکێشا و بە ڕێگادا کە بەرەو مورشیدەکەی دەڕۆیشت، ئەم شیعرەی دانا:

ای خوش آن دم ره و رسم طلب از سر گیریم
پای سر کرده ره پیر مغان در گیریم

عُمر بی‌فائده در کسب کمالات گذشت
چند روزی دگر آیین قلندر گیریم

خاطر از وسوسه‌ی علم و اَدب پاک کنیم
زنگ تردید از آیینه‌ی دل بر گیریم

جای درس و جَدل و بحث شب و سعی سَحَر
بربط و چنگ و رباب و می و ساغر گیریم

عاشق شیفته را سبحه‌ی صددانه چه سود
سبحه از زلف خَم اندر خم دلبر گیریم

«حامدا» سوی شه مَسند ارشاد رویم
تا زخاك در وی بهر سر افسر گیریم

شیخ عثمان مهین قبله‌ی ارباب کمال
کَز قبولش خط مقبولی داور گیریم

از مُقیمان دَرَش حُکم خدایی پرسیم
وز مُریدانشْ ره و رسم پیَمبر گیریم

که گەیشتە خزمەتی شێخیش، ئەم غەزەلەی خوێندەوە:

چمَن رشك بُستان خُرّم جنان است
به کوه ودمَن اَبر گوهرفشان است

ز لُطف هوا شد فضا عنبرآلود
زمین را بسی فضل بر آسمان است

ز بانگ سحاب کَرم اندر اینجا
فضای جهان پُرخروش و فغان است

خروشان و نالان و گریان تو گویی
که قلب مریدان قُطب جهان است

مهین شیخ عُثمان که بر تخت عزّت
روان حکم او بر قلوب و روان است

اَلا ای شه تخت تمکین که اَمرت
چو حُکم قَضا بَر مُریدان روان است

به این درگه انداختم خویشتن را
که این درگه امروز کهف امان است

خدایا تو این گُلبن معرفت را
که زینت‌ده هر گل و گلستان است

نگهدار از آسیب باد خزانی
به هم تا برابر بهار و خزان است

ملا حامید ئەم جارە ئیدی بازبازانی وەلا نا و دەستی لە هەموو شتێک بەردەدا و لە کونجی خانەقا، لێی دانیشتە سەیر و سولووک و لە ماوەیەکی کورتا چاوی دڵی کراوە و فەنای نەفسی دەسکەوت و لە ژێر چاوەدێری شێخەکەیدا، گەیشتە ئەوپەڕی ئاواتی و ئەوجار سیراجەدین پاش بەخشینی ئیجازە و خەلاتی خەلافەت، کردیە ئاوەدەنگ و ئینشابەندی تایبەتی خۆی و فەرمانی دا لەوە بەولاوە «کاتبُالاسرار»ی پێ بێژن.

مەلا حامید چەند کتێب و نووسراوەشی هەیە؛ یەکیان شەرحێکە لەسەر مەسنەوی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی. سەرەتای ئەم کتێبە پارچە شیعرێکە هەر لەسەر کێشی مەسنەوی، کە دوو بەیتی ئاخری، مێژووی دانانی کتێبەکەیە:

چون پی تاریخ سال ابتدا
نکته‌ای خوش‌معنی و شیرین ادا

خواســـتم از عقـــل، گفتـــا: معنـــوی «شـــرح کُنـــه مثنـــوی مولـــوی»[١]

دوای ئەو چەند بەیتە، بە پەخشان شوێنی قسەکەی دەگرێ و دەڵێ:

«امّا بعد ـ حقیر فقیر بی‌بضاعت، بندەی سرافکندەی قلیل‌الاستطاعه، گمشدەی بیدای بی‌سروسامانی، ملا حامد بن ملا علی المشهور به بیسارانی، بعد از آنکه روزگاری بە لهو و لَعب صرف کردم گرانمایه عنفوان جوانی را، قاید توفیق مرا به سعادت دریافت قبول شهریار مَسند وصول، حضرت پیر روشن‌ضمیر، کامل و مُکمّل عثمانی ثانی رسانید و با این نااَهلی مقیم آستان علیه‌اش گردانید. الان که تاریخ سال ١٢٨١ هجری است؛ از سی‌سال چیزی کم یا زیادت، در این آستان ـ که آشیان راستان است ـ شرَف سکونت دست داده؛ اگرچه به کار شکاری نیایم، طُفَیلِ سگانش کنم زندگانی...»

یەکێکی تر لە بەرهەمەکانی مەلا حامید، کتێبێکە بە ناوی «*ریاضُ‌المُشتاقین*»؛ بریتی لە پێشەکییەک و سێ بەش، کە بۆخۆی «*روضه*»، واتا «بەهەشت»ی ناو ناوە. پێشەکی لەمەڕ چۆنیەتی گەیشتنە خزمەت مورشیدی نووسەر و وەرگرتنی تەریقەت، بەشی یەکەم باسی ژیان و بەسەرهاتی مەولانا خالیدی شارەزووری، بەشی دووهەم شێخ سیراجەدین و بەشی سێهەم هێنانەوەی بەڵگە بۆ سەلماندنی ڕاست و درووست بوونی تەریقەت و ڕەت کردنەوەی بەرهەڵستیی نەیاران و دوژمنان و لە کۆتاییدا قسە لە شان و شکۆی ئیمامی ڕەببانی، نوێکاری هەزارەی دووهەمی کۆچی.

ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٣٢٧ ک. ھ. )١٩٤٨ ز.)، دەسنووسێکی ئەم کتێبەم دەسکەوت کە ساڵی ١٣١٤ ک. م. نووسرابۆوە. داخەکەم دەسنووسەکە یەکجار شپرز و شێواو بوو. ڕوونووسکارەکە بەخۆیەوە لە هێندێک شوێن شت‌هایەکی لێ زیاد کردبوو؛ بڕێ ڕستەشی هەر گۆڕابوو! هەرچۆنێک بێ، سەرەتای کتێبەکە ئاوا دەسپێدەکا:

«زینت طُغرای دولت ابدیّه و زیور سرلوحەی کتاب سعادت سَرمَدیّه، سپاس و ستایش حضرت آفریدگاری است جَلَّ شأنُهُ که مَحامد حامدان مَلاء اعلی از نسخەی جامعەی مقاماتش حرفی است؛ بلکه نقطه‌ای و معارف عارفانِ حلقەی اصطفا از دریای ذَخّار کراماتش ظرفی است؛ بلکه قطره‌ای...».

دیسان لە کارەکانی مەلا حامید، شەرحێکی فارسییە بەسەر هۆنراوەی «*گلشن راز*» و شەرحێک بو هەڵبەستی «*ابن ارسلان*» بە فارسی و هەروەها هۆنراوەیەکی کوردی لە عەقایددا.

پارچە شیعرێک لە کتێبی *ریاضُ‌المُشتاقین*:

پُر شد جهان ز شورش و غوغای نقشبند — یا حَبَّذا طریقەی غَرّای نقشبند
مرآت‌وَش به طاق فلک مهر خاوری — حَیران شد از اشعّەی سیمای نقشبند

---

١. بەرامبەرە بە ١٢٨١.

آنـان کـه در بحـار حقیقـت شـناورند — غَرقنـد جُملـه در تـک دریـای نقـشبند
دانــشوران مدرســهی علــم و معرفـت — نــسبت گرفتــهانــد ز امــلای نقــشبند
گردنکــشان دهــر هــم از روی راسـتی — گــردن کَچَنــد از پــی طغــرای نقـشبند
ترکیب صـورتش ز عناصـر نبـود، بَلْکْ — از محــض نــور بــود هیــولای نقـشبند
مـرغ خـرد بـه قلـهی آن قـافمنزلـت، — یعنی بـه وصـف رُتبـهی عُلیای نقـشبند،
کی میرسد که هست فزون از هزار سال — برتـر ز چـرخ، پایــهی سُـفلای نقـشبند
میزیبد ار ز عـزت و رفعـت کننـد فخـر — اُفتادگــان ســدرهی اعــلای نقــشبند

ئەم دوو بەیتەش هی ئەوە:

امــین حــق زمــین حلــم و تمکــین — دُر دُرج حیــــا عُثمــــان ثــــانی
کمــــالش زیــــور طغــــرای پیــــری — جمــــالش رشــــک ایــــام جــــوانی

پێشەکی *ریاضُ المُشتاقین*. شەرحی *مەسنەوی مەولەوی*، مەلا حامید.

## مەهجووری کوردستانی

سەید عەبدولحەکیمی «گەونتوو»، نازناو «مەهجووری»، لە ساداتی گـەورەی باینچۆیـە کـە بـە چەنـد پـشت دەگاتەوە عارفی گەورە، باوەشێخ ئەحمەدی باینچۆ.

سەید حەکیم ساڵی ١٢١٠ ک. م. هاتۆتە دنیا و کە پێگەیشتووە، لە قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان خوێندوویە و ماوەیەک لە خزمەتی مەولانا خالید بەهرەی بردووە و هەر لەو سەردەمانە، لەگـەڵ شێخ عوسمان سیراجەدین یەکیان ناسیوە و بوونەتە هەواڵ.

سەید لە گەڕانەوەیدا، چۆتە گوندی «کۆڵەسارە» و خزمەتی مەولانا ئەحمەدی کەمانگەر گەیشتووە و پاش سەرەتێک خوێندن، ئیجازەی لێ وەرگرتووە و ئەوجار گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و لە ناوچەی حوسەینئابادی سەر بە شاری سنە، تا ماوە بە خزمەتی ئایینی و عیرفانی و هەروەها ڕێنوێنی خەڵکەکەوە خەریک بووە.

مەهجووری هاوکاتی مەولەوی تاوەگۆزییە و پێکەوە نامە و شیعر گۆڕینەوەیان هەبووە. زۆربەی شیعرەکانی ناسک و جوان و هەموو سۆفیانە و بە زاراوەی گۆرانین.

سەید عەبدولحەکیمی مەهجووری لە کۆتایی چەرخی سێزدەدا لە دنیا چووە.

دوو نموونە لە شیعرەکانی:

پـــــیر مەیخانــــــە! پیرمەیخانـــــە! — ئیلتیجـــــام وەتـــــۆن پیرمەیخانـــــە!
جامــیٚ جـــەو بـــادە بکـــەر پەیمانـــە — بـــدەر وە مـــەجنوون ڕســـوای زەمانـــە
بــەڵام جامەکــەت خــەیلیٚ گــران بــۆ — باعیس حەسـرەت ڕەشـک یـاران بـۆ

«مەهجوور» نەزارەن پەرێ وادەی تۆ　　مەجنوون مەزانۆ قەدر بادەی تۆ
جە سەبا و مەسا دڵتەقریرشەن　　ئارەزووی دیدار جیلوەی پیرشەن
بەڵکە وە نەشئەی پیاڵەی ئەحمەر　　مەست حوزوور بۆ تا «یومُ‌المَحشر»

* * *

پەی بەدبەختی وێم بدەم وە سەردا　　با بەو ناڵەوە بشۆن وە بەردا
یا چون «مەهجووری» فیراقم بەرز بۆ　　یا بە سۆز ناڵەم جە هەزار تەرز بۆ
خەو و خوەراکم شین و زاری بۆ　　مەتای مایەکەم بێ‌قەراری بۆ
ساقی چەن وەختەن جامم خاڵییەن　　زەوق چاشنی کامم، تاڵییەن
حوجرەی مامەڵەم خەڵوەت و چۆڵەن　　موشتەری مەتام عیفریت و غۆڵەن
مایەم نارەوا، سوودم بۆ زیان　　مەتای بازارم پارچەی بۆریان
سا بەشق عەشقت بدیە بدیە لامەوە　　جە نۆ جیلوە دەر تۆ وە جامەوە
جامێ جە بادەی پەروەردەی قەدیم　　ئیحیا کونەندەی عیزام رەمیم
بدەر وە «مەهجوور» خاتر بێ خەبەر　　با وێنەی جاران عەشق بۆ نە سەر

دیوانی مەهجووری کوردستانی، ئامادەکردنی جەمیل نەقشبەندی، چەند جونگی دەسنووس.

## میرزا عەبدوڵلای خەتاتی مونشی

کوڕی میرزا جەعفەری خەتاتی سنەیی، لە خۆشنووسانی هێژای نەسخ و نەستەعلیق و نزیکان و ئینشابەندی ئامانوڵلا خانی دووەم، دوایین والی ئەردەڵان بووە و دوای ئەویش پێشکاری عەلی‌ئەکبەرخانی شەرەفولمولکی کردووە؛ کە لە سەردەمی حوکمەتی فەرهاد میرزا موعتەمەد دەوڵە لە کوردستاندا (١٢٨٤ ک. م.)، حاکمی جوانڕۆ بووە.

میرزا عەبدوڵلا مرۆیەکی درووستکار، ئەمین و سەرپەتی بووە و بە خەتی جوانی خۆی چەند کتێبی نووسیوەتەوە؛ دوو لەوانە، لە کتێبخانەی یەکێ لە پیاو ماقووڵانی شاری سنەدایە: یەکیان «*بوستان سعدی*»یە کە ساڵی ١٢٨٤ لە نووسینەوەی بۆتەوە و ئەوی‌تریان جونگێک بووە هی مەلا لوتفوڵای شخولیسلامی سنەیی و میرزا عەبدوڵلا لە ساڵی ١٢٩٠ ک. م. لە لاپەڕەی ١٦٥ تا ١٧٩ی نووسیوە.

میرزا عەبدوڵلا بابی میرزا شوکروڵای سنەیی، کەسناو «فَخرالکُتّاب»ە؛ کە لە داهاتوودا باسی ئەویش دەکەین.

ئەگەرچی ئەمن شیعری میرزا عەبدوڵڵام نەدیوە، بەڵام وەک دەڵێن، شاعیر بووە و نازناوی «عیرفان»ی

هەڵبژاردووە و لە کۆتایی چەرخی سێزدەدا کۆچی یەکجاری کردووە.

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.

## شێخ ئەحمەد ئەفەندی گۆرانی

عەللامەی فەلسەفی، شێخ ئەحمەد ئەفەندی گۆرانی، مامۆستایەکی ئیفتا و دەرس‌گوتنەوەیە کە لە بەغدا ژیاوە و هێندێک نووسراوەشی هەبووە؛ یەکیان تەقریزێکی زانایانەیە لەسەر کتێبی «*تفسیر روح‌المعانی*».

لە کتێبی *خاطرات و یادداشت‌های من*.